Hiwa Foundation
Enable creativity and perfection

نوسەری پڕفرۆشترین بڵاوکراوەکانی نیویۆرک تایمز

ستیڤن ئار. کۆڤی

# هەشتەمین خوو

## لە کاریگەرییەوە بەرەو مەزنیی

# هەشتەمین خوو

نوسینی: ستیڤن ئار. کۆڤی

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: د. شێرکۆ عەبدوڵڵا

Hiwa Foundation
Enable creativity and perfection

Hiwa Foundation
Enable creativity and perfection

ناوی کتێب: هەشتەمین خوو

ناوی نوسەر: ستیڤن ئار. کۆڤی

ناوی وەرگێڕ: د. شێرکۆ عەبدوڵڵا

تایپ و دیزاین: سیروان خەلیل

بابەت: پەروەردەیی

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپ: چاپخانەی شڤان، چاپی یەکەم - ٢٠١٦

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٦٧٨)ی ساڵی (٢٠١٤)ی پێ دراوە.

لە بڵاوکراوەکانی هیوا فاوندەیشن

تەلەفۆن: ٠٧٧٠٩٥١١١١١

ئیمەیل: info@hiwafoundation.org وێبسایت:
www.hiwafoundation.org

نرخ ( ٨٠٠٠ ) دینار

## لە بارەی "هیوا فاوندەیشن"ەوە

دامەزراوەیەکی قازانجنەویستی سەربەخۆی ئەهلییە، رۆژی ٢٠١٣/٣/٦ لەلایەن بەڕێز (هیوا رەوف)ەوە لە شاری سلێمانی هەرێمی کوردستانی عێراق دامەزراوە. هیوا فاوندەیشن کار دەکات بۆ گەشەپێدانی تواناکانی خەڵك لە رێگەی بڵاوکردنەوە و پشتگیریکردنی بابەتی داهێنەرانەی پەروەردەییەوە، ئەمەش بە وەبەرهێنان دەزانێت لە سەرمایە مرۆییەکانی کۆمەڵگاکەمان. ئامانجیش لەم کارە گەیشتنە بە ئەنجامی ئەرێنی لە ئەوەکانی داهاتودا و یارمەتیدانی تاکەکانی کۆمەڵگەیە بە ژن و پیاوەوە بۆ پێشخستنی تواناکانیان و گەیشتن بە ئامانجە بەنرخەکانیان.

## ناوەرۆک

# بەشی یەکەم

## ئازار

گوێ لەم دەنگانەی خوارەوە بگرە:

"لە ژیانی خۆم وەڕسم"

"تامی ژیان نازانم چییە. تەواو ماندوم و هێزم تێدا نەماوە"

"کەس ڕێزم ناگرێ و حسابم بۆ ناکات. بەڕێوەبەرەکەم هیچ شتێک دەربارەی تواناکانم نازانێت"

"وا هەست دەکەم کەس پێویستی پێم نەبێت. نە منالە بچوکەکانم، نە منالە هەرزەکارەکانم، نە هاوسەرەکەم، نە هاوسێکانم، تەنانەت کۆمەڵگاکەیشم. منیان هەر بۆ ئەوە دەوێت پارەکە پەیدا بکەم بۆیان."

"من نائومێد و تێکشکاوم"

"ئەوە دەچێت ئەوەی من دەیکەم بەشی ئەوە ناکات بمگەیەنێتە ئامانجەکانم، وا هەست دەکەم هەرگیز پێش ناکەوم"

"لەوانەیە من توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکم نەبێت"

"ناتوانم هیچ شتێک بگۆڕم"

"لە ناخی خۆمدا هەست بە بەتاڵی دەکەم. ژیانم مانای تێدانەماوە، شتێکم نوقسانە"

"من تووڕەم و زەندەقم چووە. بەرگەی ئەوە ناگرم کارەکەم لەدەست بچێت"

"من تەنیام"

"هەست بە ماندوێتی دەکەم، کارەکان هەمویان پەلەن"

"بەڕێوەبەرەکەم خۆی لە هەمو شتێکدا هەڵدەقورتێنێت، هەست دەکەم خەریکە دەخنکێم"

"من بێزارم لەو هەمو سیاسەتەی کە بریتین لە ریاکاری و خەنجەرلێدان لە پشتەوە"

"هەست بە بێزاری دەکەم، هەمو ئەو کارانەی کە ئەنجامیان دەدەم تەنیا بۆ کات بەسەربردنن، زۆربەی ئەو بابەتانەی کە دڵخۆشم دەکەن پەیوەندییان بە کارەکەمەوە نییە"

"ئەو کارەی دەیکەم کارێکی زۆرەملێیە، لەبەرئەوە هەست بە گوشارێکی زۆر دەکەم، کورت و کرمانجی نە فریای ئەو هەمو ئیشە دەکەوم و نە سەرچاوەی پێویستیشم لەبەردەستدایە."

"هاوسەرەکەم ئامادە نیبە لێک حالی ببین، منالەکانیشم نە گوێ دەگرن و نە بە قسەی کەس دەکەن. لەسایەی ئەوانەوە مالەوە وای لێهاتوە بە قەدەر شوێنی کارەکەم ناخۆش بێت"

"هیچ گۆرانکارییەکم پێ ئەنجام نادرێت"

ئەو رستانەی سەرەوە قسەی دلی مرۆڤگەلێکن کە لە مالەوە یاخود لە شوێنی کارەکانیان دەیانکەن. قسەکان دەنگی ملیۆنەها باوک و دایک و کرێکار و کارمەندی خزمەتگوزاری و بەرێوەبەر و پیشەوەری جیاجیای سەرتاسەری دنیان، دەنگی کەسانێکە لە پێناوی دروستکردنی واقیعێکی نوێدا خەبات دەکەن و تێدەکۆشن. ئازارەکە ئازارێکی قول و شەخسییە، رەنگە تۆش یەکێك بیت لەوانەی بەشی زۆری ئەو رستانە دووپات دەکەنەوە. (کارل رۆجەرس) لە شوێنێکدا دەلێت: "ئەو مەسەلانەی کە ئێمە زۆر بە شەخسی و تایبەتی دەزانین لە هەمو مەسەلەکانی دیکە بەربلاوترن".

هەلبەتە خەلکانێك هەن کە لە کارەکانیاندا چالاك و دلخۆش و سەرقالن بەلام ژمارەیان زۆرکەمە. زۆرجار کە موحازەرە دەلێمەوە ئەم پرسیارە لە بەشدارەکان دەکەم: چەند کەس لە ئێوە باوەری وایە زۆربەی هاوکارەکانی قەدریان نەزانراوەو مافی خۆیان پێنەدراوە؟ زۆربەی زۆری بەشدارەکان دەست هەلدەبرن. ئەم حالەتە لە هەر شوێنێکی دنیادا کە من موحازەرەم تێدا وتبێتەوە هەمیشە دووبارە دەبێتەوە.

دیارە هۆکاری سەرەکی و رون و ئاشکرای ئەم ئازارە، شکستهێنانی دەزگاکانە. دەزگاکان نەیانتوانیوە ریزبەندی ئەرکەکانیان بکەن و بەپێی گرنگییان جێبەجێیان بکەن. ماوەیەك لەمەوبەر لەرێی بەکارهێنانی ئەوەی پێی دەوترێت "پرسیارەکانی زیرەکی لە جێبەجێکردندا" دەزگای "هاریس ئینتەر ئەکتیڤ" دەستپێشخەریی لە لێکۆلینەوەیەکدا کرد کە ٢٣ هەزار هاولاتی ئەمریکایی گرتەوە لەوانەی کە کارمەندی (فول تایم)ن لە پیشەسازی و فەرمانگە بنەرەتییەکاندا. ئەمانەی خوارەوە هەندێك لە ئەنجامەکانی لێکۆلینەوەکەن:

- تەنیا ٣٧٪یان بەروونی لەو ئامانجانە تێگەیشتون کە دەزگاکانیان هەوڵی بەدەستهێنانیانی دەدا و دەیانزانی لەبەرچی ئەو ئامانجانە هەڵبژێردراون.
- تەنیا ٥٪یان زۆر ئارەزومەندی ئامانجەکان بون و هاوکارەکانی خۆیان بەدڵ بووە.
- تەنیا ٢٠٪ی ئەو خەڵکە بەرچاویان روون بووەو بە باشی زانیویانە ئەرکەکەی ئەوان چۆن دەتوانێت خزمەتی ئامانجی دەزگاکە و تیمەکەی خۆیان بکات.
- تەنیا نیوەیان لەو کارە رازی بون کە تا کۆتایی حەفتە ئەنجامیان داوە.
- تەنیا ١٥٪ هەستیان بەوە کردووە دەزگاکەیان هاوکاریی تەواویان دەکات بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە بنەڕەتییەکان.
- تەنیا ١٥٪ هەستیان بەوە کردووە لە ژینگەیەکدا کاردەکەن پڕ لە متمانەو بڕوا.
- تەنیا ١٧٪ هەستیان بەوە کردووە دەزگاکەیان ئەو پەیوەندیە کراوەیەی پێ خۆشە کە ڕێز بۆ بیروڕا جیاوازەکان دادەنێت و بیرۆکەی تازە بەرهەم دەهێنێت باشتر لە بیرۆکەکانی کە ئێستا هەن.
- تەنیا ١٠٪ هەستیان کردوە دەزگاکەیان تۆباڵی ئەنجامەکان دەخاتە ئەستۆی کارمەندەکان.
- تەنیا ٢٠٪ متمانەی تەواویان بەو دەزگایە هەبوو کە کاریان تێدا دەکرد.
- تەنیا ١٣٪ پەیوەندییەکی تۆکمەیان هەبووە لەگەڵ کۆمەڵ و بەشەکانی دیکەدا. پەیوەندییەکی بەرزی دامەزراو لەسەر بنەمای متمانەو هاوکاری.

ئەگەر وای دابنێین تیمێکی تۆپی پێ ئەم ئەنجامانەی بەدەست هێناوە، ئەمە مانای وایە لەکۆی یانزە یاریزان تەنیا چوار دانەیان زانیویانە گۆڵەکە لەکوێدایە. دوو کەسیان یارییەکەیان بەلاوە گرنگ بووە، هەروەها هەمو یاریزانەکانیش بێجگە لە دوانیان، ئامادەییان تێدایە لەجیاتی ئەوەی دژی تیمەکەی بەرامبەر یاری بکەن، دژی تیمەکەی خۆیان یارییەکە بکەن (گۆڵ لەخۆیان بکەن).

ئەم زانیاریانە وا لە مرۆڤ دەکەن رابچەنێت. من خۆم بەپێی ئەو ئەزمونەی کە لەگەڵ خەڵکی جیاجیای دەزگاکانی سەرتاسەری جیهاندا بەدەستم هێناوە، باوەڕم وایە زانیارەکان راست و دروستن.

تێبینییەکی سەیرە ئەگەر بڵێین سەرباری دەستکەوتە تەکنیکیەکان و دەستپێشخەرییەکان لە بەرهەمهێنان و بازاڕە جیهانییەکاندا کەچی هێشتا زۆربەی

خەڵکەکە شانبەشانی ئەو دەزگایانە گەشە ناکەن کە تیایاندا کار دەکەن. جگە لەوەی نە لە کارەکانیان رازین و نە شەوق و زەوقیشیان هەیە بۆی، بەڵکو نائومێد و تێکشکاون و هەست دەکەن کە دەست‌وپێ بەستراون و گۆڕانکارییان پێناکرێت. ئایا دەزانیت ئەم حاڵەتە چ زیانێک بە دەزگاکان و بە خەڵکەکەش دەگەیەنێت؟ با پێت بڵێم کە شکستهێنان لە دروستکردنی شەوق و ئارەزودا لە هێزی بەرهەمهێن و هەروەها بێتوانایی لەوەی هەمو وزەو زیرەکییەکە سەرمایەگوزاری بکات لە دەزگاکەدا، زیانێکی وای لێ دەکەوێتەوە زۆر زیاترە لە قەبارەی هەمو باجەکان و هەمو سودی بانکەکان و بڕی تێچونی کارەکە بەسەریەکەوە.

## هەشتەمین خوو بۆچی؟

ساڵی ١٩٨٩ کتێبێکی گرنگ بڵاوکرایەوە کە بریتییە لە کتێبی (حەوت خووەکەی کەسانی پێشەنگ). لەو ساڵەوە دنیا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو ئاڵۆزی و ململانێ جۆراوجۆرانەی کە لە ژیانی تایبەتماندا لەسەر ئاستی پەیوەندییە پیشەیی و خێزانی و کۆمەڵایەتییەکانمان لە دەزگاکانماندا ڕووبەڕوویان دەبینەوە، هەمان بایەخ و گرنگییەکەی جارانیان نییە و ڕیزبەندییەکی دیکەیان وەرگرتوە.

زۆرکەس دەپرسن ئایا حەوت خووەکە هێشتا ئەمڕۆش لەم واقیعە نوێیەدا بەکەڵکن. وەڵامەکەی منیش هەمیشە ئەوەبوە: هەتا گۆڕانکارییەکان زۆرتر و بەرفراوانتر بن و ململانێکان زەحمەتتر بن، حەوت خووەکە سودمەندتر دەبن. دەتوانیت ببینیت کە چۆن حەوت خووەکە خەریکن دەبنە خاوەنی کاریگەرییەکی بەرز و چوارچێوەیەکی تەواو دروست دەکەن لە بنەما جیهانییە ئەمرەکان بۆ دیاریکردنی هێزی کەسایەتی و چالاکییە مرۆڤایەتییەکان. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا کاریگەربوون بۆ دەزگاکان و تەنانەت بۆ مرۆڤەکانیش تەنیا ئەگەرێک نییە لە ئەگەرەکان کە بتوانیت ئازادبیت لە هەڵبژاردنیدا، بەڵکو ئەگەر کاریگەرو چالاک نەبیت ناتوانیت بچیتە گۆڕەپانی یارییەکەوە. بەڵام ئایا هەر هێندە بەسە؟ بە دڵنیاییەوە نەخێر بەس نییە. مانەوەو گەشەکردن و داهێنان و سەرکەوتن و گەیشتنە پۆستە سەرکردایەتییەکان لەناو ئەم واقیعە نوێیەدا پێویستیان بە شتێکە زیاتر لە کاریگەریی. ئەم سەردەمە داوامان لێ دەکات و بە پێویستی دەزانێت بگەینە مەزنی. سەردەمی ئەمڕۆ سەردەمی ئەوەیە

ئیشەکەمان بەختەوەرییمان پێببەخشێت و بە جۆش و خرۆشەوە ئەنجامی بدەین و بەشداریی گرنگمان هەبێت لە ژیاندا. هەر یەکێك لەم چەمکانەش دەکەونە ڕەهەندێکی جیاوازەوە. جیاوازیی بنەماکان جیاوازییەکی چۆنایەتین. واتە بنەماکانی ئەمڕۆ لەڕوی چۆنایەتییەوە لە بنەماکانی ڕابردوو جیاوازن. گەیشتن بە ئاستی بڵندتر لە جۆش و خرۆش و داهێنان. ئەوەی کە دەتوانین ناوی لێ بنێین دەنگ- پێویستی بە شێوازێکی نوێی بیرکردنەوە هەیە. پێویستی بە شارەزایی تازەو بە گەرمەسەی تازەو بە خووی تازە هەیە.

هەشتەمین خوو، بە تەنیا هەر زیادکردنی خوویەکی نوێ نییە بۆ حەوت خووەکە، کە هەندێك جار بیربچێتەوە، بەڵکو پەیوەستە بەوەی هێزێکی ڕەهەندی سێیەم ببینین و بیخەینە پاڵ حەوت خووەکەوە بەجۆرێك بتوانێت وەڵامی ململانێکانی ئەم سەردەمە نوێیە بداتەوە کە سەردەمی کرێکارانی زانیارییە.




شێوەی ١—١

ئەم هەشتەمین خووە ڕێگایەکە کە دەمانگەیێنێتە لایەنە دڵنیاکەرەوەکەی واقیعی ئەمڕۆ. هەشتەمین خوو بە ئاشکرا ڕووبەڕوی ئەو ئازارو تێکشکانە دەوەستێت کە ئەختێك لەمەوپێش باسم کرد. ئەم خووە لەڕاستیدا واقیعێکە زەمەن سنوری بۆ دانانێت و ئەو دەنگە زوڵاڵەی ڕۆحی مرۆڤە کە لێوانلێوە لە هیواو زیرەکی. خوویەکە سروشتێکی نەرمی هەیە و لە خزمەتکردن و خێرو چاکەکاریدا توانایەکی بێسنوری هەیە.

ئەم دەنگە بەهەمان شێوە ڕۆحی ئەو دامەزراوانەش دەگرێتەوە کە لە داهاتودا دەمێنن و گەشە دەکەن و بەشێوەیەکی ئاشکرا کار دەکەنە سەر ئایندەی جیهان.




شێوەی ١ — ٢

دەنگەکە بایەخێکی تایبەت و بێ هاوتای هەیە، ئەو بایەخەی کە تەنیا کاتێك بەرجەستە دەبێت کە ئێمە لە ژیاندا ڕوبەڕوی ململانێ هەرە گەورەکان دەبینەوەو وامان لێ دەکات بەتوانابین لە ڕوبەڕووبونەوەی ئەو ململانێیانەدا. وەك لە شێوەی (١-٢) دیارە، دەنگ دەکەوێتە شوێنی یەکانگیربونی چوار بابەتی گرنگ، کە بریتین لە بەهرە (بەهرەکانت و ئەو خاڵە بەهێزانەی کە لەدایکبونتەوە خاوەنیانیت) و عیشق و (ئەو شتانەی بەهێزت دەکەن و دەتجوڵێنن و سەرنجت ڕادەکێشن و ئیلهامت پێدەبەخشن)

پێویستی (بەو پێویستیانەی جیهانیشەوە کە شایستەی ئەوەن هەوڵیان بۆ بدەیت) و ویژدان (ئەو دەنگە هێمن و کزەی خۆمان کە بابەتە راستەکانمان نیشان دەدات و داوامان لێ دەکات ئەنجامیان بدەین).

تۆ کاتێک کە سەرگەرمی ئەنجامدانی کارێکی وا دەبیت کە بەهرەکانت بخاتە گەڕو جۆش و خرۆشت تێدا دروست بکات و پێویستییەکی گرنگی دنیاکەی دەوروبەرت جێبەجێ بکات و هەست بکەیت ویژدانت پێی خۆشە و پاڵت پێوە دەنێت کارەکە بکەیت، ئەوکاتە تۆ دەنگی خۆت دەدۆزیتەوە. دەنگی ناخی خۆت دەدۆزیتەوە. کلیلی رۆحت دەدۆزیتەوە.

لەناخی هەریەکێکماندا ئارەزوویەکی خۆڕسکی قوڵ هەیە کە بە وشە ناتوانین باسی بکەین -پاڵمان پێوە دەنێت لەم ژیانەدا بە دوای دەنگی تایبەتی خۆماندا بگەڕێین- بەهێزترین دیاردە لە دیاردە هاوچەرخەکانی ئەم راستییە تۆڕی ئینتەرنێتە کە بەشێوەیەکی شۆڕشگێڕانەی وا تەقییەوە، لە گرانەوەی هێزی توان (٢)ەکان دەچێت لە ماتماتیکدا.

رەنگە ئینتەرنێت سیمبولێکی گونجاو بێت بۆ جیهانی نوێی ئەمڕۆ و بۆ ئەو ئابورییەی پشتی بە کرێکارانی زانست و زانیاری بەستووە و هەروەها بۆ تێگەیشتنی گۆڕانە دراماتیکییەکانی کە روویان داوە. (لۆک Locke) و (لیفین Levine) و (سیرەلز Searls) و (واین بێرگەر Wein berger) ساڵی ١٩٩٩ لە کتێبەکەیاندا (مانیفێستی شەمەندەفەرە نهێنیەکە) زۆر باشی بۆچوون کە دەڵێن:

ئێمە سەرلەنوێ، جارێکی دیکە، دەنگەکانی خۆمان دەدۆزینەوە. ئێمە فێردەبین چۆن لەگەڵ یەکتریدا بپەیڤین. گفتوگۆی ئەمڕۆ هەم لەناوەوەیە هەم لە دەریشەوە. ئەم جۆرە گفتوگۆیە ٥ ساڵ لەمەوپێش نەبو. هەروەها لە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشی پیشەسازییەوە هەرگیز وەکو ئێستا ئاشکرا نەبون.

ئەمڕۆ لەسایەی تۆڕی ئینتەرنێتی جیهانییەوە کە بەشەکانی گۆی زەمینی پێکەوە بەستوە، ئەو گفتوگۆیە هێندە فراوان و فرە روخساری لێ دەرچووە کە تێگەیشتن لێی نزیکی مەحاڵە. ئەو گفتوگۆیانە دەربارەی ملیاردێک ساڵ ئاوات و خۆزگەو ترس و خەونی مرۆڤە کە لە DNAیەکانیدا بەشێوەی رەمز عەمبار کراون. واتە گەڕانەوەیە بۆ هەمو ئەوشتانەی کە لە توخمە سەرسوڕهێنەرەکەی ئێمەی مرۆڤدا کۆبونەتەوە.

شتێکی زۆر زۆر نامۆ هەیە، زۆر کۆن و پیرۆز و گرنگ، هەندێك جاریش زۆر پێکەنیناوی، کە لەناو وایەرو بۆریەکانی سەدەی بیستەمدا بزر بون.

رایەڵەکانی ناو ئەم گفتوگۆیە لە ملیۆنەهاو ملیۆنەها داو پێك هاتوە، بەڵام لەمسەروئەوسەری هەمو تاڵێکدا، هەمو هێڵێکدا، مرۆڤێك هەیە.

ئەم ئارەزوە بەهێزە بۆ بەکارهێنانی ئینتەرنێت نیشانەی سۆزێکی هێندە قوڵە، کە پێمان دەڵێت ئێمەی مرۆڤ لەم ژیانەدا شتێکمان نوقسانە. ئەو شتەش دەنگی مرۆڤە. وا هەست دەکەین ئینتەرنێت هێندە سەرنجی رۆحمان رادەکێشێت کە دڵنیامان دەکات ئەو دەنگەمان بۆ بگێڕێتەوە.

ئیتر لەجیاتی درێژەدان بە وەسفکردنی دەنگەکە، رێگەم بدەن لەرێی ئەم چیرۆکە راستەقینەیەوە بۆتان باس بکەم:

محەمەد یونسی دامەزرێنەری (بانکی گرامین) کە رێکخراوێکی بێهاوتایەو تەنیا بۆ ئەو مەبەستە دامەزرێنراوە ژمارەی قەرزە بچوکەکان زیاد بکات کە دەدرێن بە خەڵکە هەرە هەژارەکەی بەنگلادیش. من کە چاوم بە محەمەد یونس کەوت لێم پرسی: کەی و چۆن ئەم بیرۆکەیەت لەلا گەڵاڵە بو؟ وەڵامی دامەوە، وتی: سەرەتا کە دەستم پێکرد هیچ پرۆژەو بیرۆکەیەکم نەبو. هەمو مەسەلەکە ئەوەبو کەسێکی موحتاجم بینی و منیش هەوڵم دا یارمەتی بدەم. بەم جۆرە بیرۆکەکە لەلام گەشەی کرد. هەوڵدان بۆ جیهانێک هەژاری تێدا نەبێت، ئەوکاتە لای محەمەد یونس سەری هەڵدا کە بە رێکەوت لە یەکێک لە شەقامەکانی بەنگلادیشدا بە چاوی خۆی روداوێکی بینی. من کە دەمویست وتارێک دەربارەی سەرکردایەتیکردن بنوسم، چاوپێکەوتنێکم لەگەڵ محەمەد یونسدا کردو ئەویش چیرۆکەکەی بە دورودرێژیی بۆ گێڕامەوە:

"بیستوپێنج ساڵ لەمەوبەر، من لە زانکۆی بەنگلادیش وانەی ئابوریم دەگوتەوە. ئەوکاتە وڵات بەدەست برسێتییەوە دەیناڵاند. بارودۆخەکە وای لێکردم هەست بە پەژارەیەکی زۆر بکەم، چونکە من لە پۆلدا تیۆرییە ئابورییە نایابەکانم بۆ خوێندکاران روون دەکردەوەو بەو بڕوانامەی دکتۆرایە دڵخۆش بوم کە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان وەرمگرتبو، کەچی کە لە پۆل دەچومە دەرێ خەڵکە هەژارەکەم دەبینی هەر پێستو ئێسقانەکەیان مابوەوەو چاوەڕوانی مردن بون. هەستم کرد هەرچییەک فێری بوم و هەر دەرسێک دەیڵێمەوە بریتین لە کۆمەڵە چیرۆکێکی دەستکردو درۆ و هیچ کاریگەرییەکان

لەسەر ژیانی خەڵکەکە نییە. لەبەرئەوە هەوڵم دا بزانم دانیشتوانی گوندەکەی نزیک حەرەمی زانکۆ چۆن چۆنی دەژین. ویستم بزانم ئایا من وەکو مرۆڤێک کارێکی وام لەدەست دێت ژیانی تاقە کەسێک لە مردن رزگار بکات یاخود هەر هیچ نەبێت مردنەکەی دوابخات. وازم لەوە هێنا وەکو باڵندەیەک لە بەرزاییەوە تەماشای بارودۆخەکە بکەم و لاسایی ئەو کرمەم کردەوە کە هەوڵ دەدات هەمو شتەکان لە نزیکەوە بۆن بکات و ببرێت و بەریان بکەوێت تا بزانم ئایا هیچم پێدەکرێت بۆ ئەو خەڵکە هەژارە.

پاشان رووداوێک رویدا کە ئاراستەیەکی تازەی پێبەخشیم! ژنێکم بینی کە لە حەیزەران کورسی دروست دەکرد. دوای گفتوگۆیەکی دووردرێژ لەگەڵیدا بۆم دەرکەوت کە ئەم ژنە رۆژانە ئەدوا سەنتی ئەمریکی دەست دەکەوێت. نەمدەتوانی باوەڕبکەم کەسێک هێندە خۆی ماندو بکات و بتوانێت لە حەیزەران کورسی جوان دروست بکات، کەچی لە کۆتاییدا قازانجێکی زۆر زۆر کەمی بۆ بمێنێتەوە. ژنەکە لە قسەکانیدا بۆی باس کردم کە ئەوەندە پارەی نییە بتوانێت حەیزەرانی پێویستی پێ دابین بکات لەبەر ئەوە ناچار پارەکە لە بازرگانێک قەرز دەکات. ئەویش بە مەرجی ئەوە قەرزەکەی دەداتێ کە کورسییەکان بەو نرخە بفرۆشێت کە ئەو دیاری دەکات. لەبەرئەوە رۆژی ئەدوا پێنس زیاتری دەست ناکەوێت و خاوەن قەرزەکە کارێکی کردوە ئەم ژنە دەستڕەنیگنە وەکو کۆیلە ئیشی بۆ بکات.

لێم پرسی: حەیزەرانەکە بایی چەندە.

وەڵامی دامەوە: نزیکەی بیست سەنت

لە دڵی خۆمدا وتم؛ ئایا ماقوڵە مرۆڤ لەپێناوی بیست سەنتدا هێندە بچەوسێتەوەو ئایا کەسێک نییە بتوانێت یارمەتییان بدات؟ لەمەوە بیرۆکەیەکی ترم بۆ هات، بیرۆکەی ئەوەی ناوی هەمو ئەو کەسانە بپرسم کە پێویستیان بەو هەندە پارەیە هەیە.

خوێندکارێکم لەگەڵ خۆمدا بردو چەند رۆژێک بە گوندەکەدا سوڕاینەوەو لە ئاکامدا توانیمان لیستێک دروست بکەین بەناوی چلودوو کەسەوە. کە پارەکەم کۆکردەوە، توشی گەورەترین شۆکی ژیانم بوم. هەمو پارەکە بیستو حەوت دۆلار زیاتر نەبو. هەستم بە شەرمەزارییەکی زۆر کرد، چونکە سەر بە کۆمەڵگایەکم ناتوانێت بیستوحەوت دۆلار دابین بکات بۆ چلودوو کرێکاری شارەزا و ئیشکەرو دەستڕەنگین.

بۆ ئەوەی لەو شەرمەزارییە دەربچم، بڕە پارەکەم لە گیرفانمدا دەرهێناو دامە دەست خوێندکارەکە وتم بڕۆ بیدە بەو چل‌ودو کەسە کە چاوپێکەوتنمان لەگەڵدا کردن و پێیان بڵێ ئەمە قەرزە، هەرکاتێک تواناتان هەبو دەتوانن قەرزەکە بگێڕنەوەو سەربەستیشن لەوەی بەرهەمەکانتان بە نرخێکی باش بفرۆشن.

> "شەیتان بۆ سەرکەوتنی خۆی تەنیا پێویستی بەوەیە کە پیاوچاکەکان دابنیشن هیچ نەکەن"
>
> - ئیدمۆندز بۆرك

ئەو پارەیەی کە وەریان گرت زۆر دڵخۆشی کردن و دڵخۆشییەکەی ئەوان وای لێکردم بیربکەمەوە و لە خۆم بپرسم بڵێم ئەی ئێستا دەتوانم چی بکەم؟. یەکسەر لقی ئەو بانکەم هات بە خەیاڵدا کە لەناوچەرەمی زانکۆدا بو. چومە لای بەڕێوەبەرەکە و پێشنیارم بۆکرد پارە بە قەرز بدات بەو هەژارانەی کە لە گوندەکەدا بینیمن.

بەڕێوەبەرەکە بە سەرسامییەوە لێی پرسیم؟ تۆ شێت بویت؟ شتی وا مەحاڵە. چۆن دەتوانین پارەی قەرز بدەین بە خەڵکی هەژار. ئەوانە شایستەی قەرزپێدان نین. لێی پاڕامەوە وتم تکایە با هەوڵ بدەین پارەکە بڕێکی زۆر نییە. وەڵامی دامەوە وتی: نەخێر، یاساو ڕێنماییەکانمان ڕێ بەوکارە نادەن. چۆن دڵنیابین کە ئەوان قەرزەکە دەدەنەوە؟ چ گەرەنتییەک هەیە؟ دوای ئەوە پارەیەکی هێندە کەم هی ئەوە نییە قەرزی بۆ بکرێت. پاشان پێشنیاری بۆ کردم بڕۆم لە سەنتەری سەرەکی بانکەکە لە پایتەختدا لێپرسراوی گەورەتر ببینم.

بە قسەی بەڕێوەبەرەکەم کردو سەردانی زۆر کاربەدەستی گەورەی بانکەکانم کرد، بەڵام هەمو جارێک هەمان وەڵامم دەستگیر دەبو. لە ئاکامدا و پاش شکستهێنانی هەوڵەکانم، بڕیارم دا خۆم ببم بە کەفیلی خەڵکەکەو پێم وتن هەرچییەکتان دەوێت بۆتان ئیمزا دەکەم بەو مەرجەی پارەکەم بدەنێ و منیش دەیدەم بە هەژارەکان.

ئەمە سەرەتاکە بو. چەندین جاریش ئاگاداریان کردمەوە کە ئەو خەڵکە پارەکە وەردەگرن و قەرزەکەت چاوپێناکەویتەوە، پێم وتن: "قەی چیکا، تاقی دەکەینەوە". ئەنجامە چاوەڕوان نەکراوەکە ئەوەبو کە دوا فلسی قەرزەکانیان گەڕاندەوە. ئەم هەڵوێستەی ئەوان زیاتر هانی دام و چومە لای بەڕێوەبەرەکە وتم ئاگات لێیە هیچ

کێشەیەک ڕوی نەداو هەمو قەرزەکانیان دایەوە؟ بەڕێوەبەر گوتی وریابە، ها. ئەوە ئەمینت دەکەنەوە. چاوەڕوانن قەرزی زیاتریان بدەیتێ بۆ ئەوەی بیخۆن و نەتدەنەوە. من قەرزی زۆرم دانێ و ئەوان دوافلسیان هێنایەوە. بەڕێوەبەر گوتی ڕەنگە خەڵکی ئەم گوندە سەرڕاست بن. بیکەی بە دوو گوند وا دەرناچێت. یەکسەر لە دوو گوندا تاقیم کردەوەو هیچ کێشەیەک نەقەوما.

بەم شێوەیە مەسەلەکە بو بە جۆرە ڕکابەرییەک لەنێوان من و بەڕێوەبەری بانک و هاوکارە باڵادەستەکانیدا. ئەوان هەر سوربون لەسەر قسەی خۆیان و دەیانگوت زیادکردنی ژمارەی گوندەکان، بۆ نمونە ئەگەر بیکەی بە پێنج گوند شکستی پڕۆژەکەی لێ دەکەوێتەوە. لەسەر قسەی ئەوان ئەزمونەکەم لە پێنج گوندا تاقی کردەوە، ئەنجامەکەش ئەوەبو کە هەمویان پارەکانیان گێڕایەوە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەڕێوەبەرو هاوکارەکانی تەسلیم نەبون و وتیان بیکە بە دە گوند، پەنجا، سەد گوند. مەسەلەکە شێوازی بۆڕبۆڕێنێکی وەرگرت لەنێوان من و ئەواندا. من لەم ئەزمونەدا کۆمەڵە ئەنجامێکم دەستکەوت کە ئەوان تکۆڵییان لێ دەکرد. ئەو پارەیەی من دەمدا بە هەژارەکان پارەی خاوەنەکانی بانکەکە بو، کەچی هەر ئامادە نەبون ئەنجامەکە قبوڵ بکەن لەبەرئەوەی هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕە ڕاهێنرابون کە مرۆڤی هەژار جێگەی متمانە نییە. خۆشبەختانە من بەوجۆرە ڕانەهێنراوم و دەمتوانی تەنیا باوەڕ بە شتێک بکەم کە بە چاوی خۆم دەیبینم. بەڵام ئەقڵ و بینایی کارمەندانی بانکەکە ئەو زانیارییە هەڵەیە دایخستبون کە پێشتر خنرابووە مێشکیانەوە.

دواجار ئەم بیرۆکەیەی خوارەوە هات بە مێشکمدا:

بۆچی هەوڵ بدەین قەناعەتیان پێ بهێنین؟ من تەواو دڵنیام کە هەژارەکان دەتوانن پارەکە وەربگرن و لەکاتی دیاریکراویشدا قەرزەکە بدەنەوە، کەواتە بۆچی بانکێکی سەربخۆ دانەمەزرێنین؟ بیرۆکەکە سەرنجی ڕاکێشام و پلانی پڕۆژەکەم نوسی و چوم بۆلای لایەنی پەیوەندیداری حکومەت بۆئەوەی مۆڵەتی دامەزراندنی بانکەکەم بدەنێ. بە دووساڵ ئینجا توانیم حکومەت ڕازی بکەم.

لە ٢ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٣دا بوینە بانکێکی ڕەسمی و سەربەخۆ. کارەکە بۆ هەمویان مایەی خۆشحاڵی بو چونکە ئێستا ئیتر خاوەنی بانکی تایبەتی خۆمانین و دەتوانین بە ئارەزوی خۆمان کارەکەمان فراوان بکەین و لەڕاستیدا هەرواشمان کرد.

کە ئیلهامی ئامانجێکی مەزن یاخود پرۆژەیەکی نائاسایت پێ دەبەخشرێت ئیتر مێشکت سنورەکانی تێدەپەڕێنێت و بیرۆکەکان کۆت و پێوەندەکان دەشکێنن و تێگەیشتن بە هەمو ئاراستەکاندا فراوان دەبێت و خۆت لە دنیایەکی تازەی مەزن و سەرنجڕاکێشدا دەبینیتەوە.

لە حیکمەتەکانی یۆغا - پانتاجالی

ئێستا چالاکییەکانی بانکی گرامین زیاتر لە ٤٦ هەزار گوندی بەنگلادیشی گرتۆتەوە. لە ڕێگەی ١٢٦٧ لقی جۆراوجۆر و ١٢ هەزار کارمەندەوە. ئەو بانکە تا ئێستا زیاتر لە ٤،٥ ملیار دۆلاری بە قەرز داوەتە خەڵك. قەرزەکانیش لەنێوان ١٢ تا ١٥ دۆلاردان و بە تێکڕا لە ٢٠٠ دۆلار تێپەڕناکات، ساڵی نیو ملیار دۆلار قەرز دەدەن. ئەو قەرز پێدانە تەنانەت سواڵکەرەکانیش دەگرێتەوە بەمەبەستی پارمەتیدانیان بۆ ئەوەی سواڵکردن واز لێ بهێنن و دەست بدەنە ئیشێك. هەروەها قەرزی خانوبەرەش دەبەخشن بۆ کڕینی خانو، پێشینەکەشی نزیکەی ٣٠٠ دۆلارە. دیارە ئەم ژمارانە بەلای ئێمەومانانەوە کە لە دنیای کۆمپانیاو بازرگانیدا کاردەکەین ژمارەی بچوکن، بەلام ئەگەر بیر لە دەوروتەنسیرەکەی بکەینەوە لەسەر ژیانی خەڵکەکە دەبینین کارێکی مەزنە چونکە بانکی گرامین هەمو ساڵێك پێنجسەد ملیۆن دۆلار قەرز دەداتە ٣،٧ ملیۆن مرۆڤ کە لە ٩٦٪یان ژنن. قەرزەکە وای لێکردون بڕیار بدەن هەنگاوی گەورە بنێن بە ئاراستەی چاککردنی ژیانی خۆیان و خێزانەکانیان. ٣،٧ ملیۆن مرۆڤ پێویست بو بڕیار بدەن گۆڕانکاری دروست بکەن، ٣،٧ ملیۆن مرۆڤ کە بەو قەرزە بچوکە توانیان لەسەرپێی خۆیان بوەستن و لەناویشیاندا کۆمەڵێك ژن هەڵکەوتن کە هەندێکیان بە تەنیاو هەندێکی دیکەشیان بە کۆمەڵ توانییان لە ماڵەکانی خۆیان و هاوسێکانیاندا کەلوپەلی وا بەرهەم بهێنن کە لەڕوی ئابورییەوە سەرکەوتنی گەورەی بۆ دەستەبەرکردن. ئەو ژنانە دەنگی خۆیان دۆزییەوە.

لەڕێی لێکۆڵینەومو چاوپێکەوتنەکانەوە لەگەڵ زۆربەی سەرکردەکانی جیهاندا ئەوەم بۆ دەرکەوتوە کە ئەوان بە هێواشی و پلە بەپلە دەنگی تایبەتی خۆیانیان دۆزیوەتەوە. دڵنیام ئەم یاسایە چەند حاڵەتێکی شازیشی تێدەکەوێت. واتە خەڵك هەبە زۆر کتوپڕ بەو ئەنجامە گەورەیە گەیشتون. بەلام بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤ هەتا

هەست بە پێویستییەکی مرۆڤایەتی ئەکات و بەقسەی داواکارییەکانی ویژدانی خۆی ئەجوڵێتەوە بیرۆکەی باشی بۆ نایەت. تۆ کاتێك ئەو پێویستییە مرۆڤانەیە جێبەجێ دەکەیت پێویستییەکی دیکە دەبینیت و ئەویش جێبەجێ دەکەیت و یەکسەر لەدوای ئەوە پێویستییەکی دیکە دەبینیت و دیسان ئەویش جێبەجێ دەکەیت و وردە وردە دەگەیتە قۆناغێك کە هەستکردن بەو پێویستییانە دەگشتێنیت و بیر لەرێگای گونجاو دەکەیتەوە بۆ دروستکردنی دەزگای تایبەت کە چالاکی و هەوڵ و تەقەلاکانت رێك بخات بۆ ئەوەی بتوانیت بەردەوام بیت لە بەخششدا.

محەمەد یونس نمونەی ئەو کەسەیە و رێك ئەو کارەی ئەنجام داوە کە لەسەرەوە باسمان کرد. سەرەتا هەستی بە پێویستییەکی مرۆڤانە کردو بەپێی فەرمانەکانی ویژدانی خۆی هەڵوێستی وەرگرت و هەمو بەهرەو تواناکانی خۆی بۆ بەدیهێنانی ئەو پێویستییە خستە کار. سەرەتا بەشێوەیەکی شەخسی. دواتر دەستی کرد بە بنیاتنانی متمانەو گەڕان بەدوای رێگاچارەی گیروگرفتەکان بەشێوەیەکی داهێنەرانە، دواجاریش دەزگایەکی دروست کرد پێویستییەکانی کۆمەڵگا فەراهەم بکات. محەمەد حسێن دەنگی تایبەتی خۆی دۆزییەوەو ئیلهامی بەخشی بە خەڵکانێك کە ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە. ئێستا ئەم مەسەلەی قەرزە بچوکانە بۆتە مەسەلەیەکی جیهانی و هەمو دنیای گرتۆتەوە.

> کەم کەس دەتوانێت کاری مەزن ئەنجام بدات، بەڵام هەمومان کاری بچکۆڵەی وامان لەدەست دێت کە دەتوانین لەئەنجامدانیاندا هەست بە خۆشەویستییەکی مەزن بکەین
>
> - دایکە تێریزا

## ئازار – کێشە – چارەسەر

کتێبەکەمان بە باسی ئەو ئازارە دەستی پێکرد کە هێزی کار پێوەی دەناڵێنێت.

ئازارەکە پەیوەندی بە ئاستێکی دیاریکراو و بە دەزگایەکی تایبەتەوە نییە. مرۆڤ لەهیچ ئاستو لە هیچ دەزگایەکدا پارێزراو نییە لەم ئازارەی کە لەناو خێزان و کۆمەڵەو گروپ و بەشێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکاندا بڵاوبونەتەوە.

ئامانجی ئەم کتێبەم ئەوەیە نەخشە ڕێگایەکت پێشکەش بکات لە ئازارو تێکشکانەوە ڕێنمایت بکات و بتگەیەنێتە رازیبوون و ئاسودەیی راستەقینەو ئەو باوەڕەت لا بچەسپێنێت کە تۆ کەسێکی گرنگیت و بەکەڵکیت و بەشداریکردنت لە دروستکردنی جیهانی ئەمڕۆدا تەنیا لەڕێی کارەکەت و دەزگاکەتەوە نییە بەڵکو لەڕێی ژیانتەوەیە. بەکورتییەکەی ئەم کتێبە ڕێنماییت دەکات بۆ ئەوەی لە هەر پۆستو پلەوپایەیەکدا بیت، ببیتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ ئەو کەسانەی کە بەلاتەوە گرنگن. هەروەها بەسەرچاوەی ئیلهامیش بۆ پیشەکەت و دەزگاکەت بەو ئاراستەیەی کە دەنگی خۆیان بدۆزنەوەو تواناو چالاکییەکانیان برەو پێدەن و دەورو تەئسیریان زیاترو زیاتر بکەن.

بە خوێندنەوەی کتێبەکە بۆت روون دەبێتەوە کە دەوروتەئسیرو هێزی رابەرایەتیکردن هیچ پەیوەندیان بە پۆستێکی دیاریکراو و بە پۆلێبەندییەکی تایبەتەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەوەوە هەیە کە تۆ چی هەڵدەبژێریت .. دیارە باشترین ڕێگاش –کە هەندێک جار تاقە ڕێگەیە- بۆ رزگاربوون لە ئازارەکەو گەیشتنە چارەسەرێکی هەمیشەیی ئەوەیە کە پێش هەمو شتێک لەو گیروگرفتە سەرەکییە تێبگەیت کە هۆکاری ئازارەکەیە.

لەم حاڵەدا بەشێکی زۆری کێشەکە لەو رەفتارەدا خۆی حەشار داوە کە دەرەنجامی تێگەیشتنێکی هەڵەو ناتەواوە دەربارەی سروشتی مرۆڤ. کێشەکە لەو گۆشە نیگایەدایە کە مرۆڤ وا لێ دەکات خۆی بەکەم بزانێت. ئەم خۆبەکەم زانینە دەبێتە کۆتو پێوەندو دەناڵێتە بەهەرەو تواناکانی مرۆڤەوە.

چارەسەری ئەم کێشەیە - وەك ئەوەی لە زۆربەی داهێنان و دۆزینەوە مەزنەکانی مێژوی مرۆڤایەتیدا رودەدات، بریتییە لەوەی بەشێوازێکی نوێ بیربکەیتەوە تەواو جیاواز بێت لە هەمو بیرکردنەوە کۆنەکان.

ئەم کتێبە بەڵێنت دەداتێ وردە وردە کاریگەرییەکانت لەناوەوە بە ئاراستەی دەرەوە گەشە بکەن و دەنگی تایبەتی خۆت بدۆزێتەوەو ببێتە سەرچاوەی ئیلهام بۆ گروپ و دەزگاکەت، تا ئەوانیش دەنگی خۆیان لەم جیهانەدا بدۆزنەوە کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. جێبەجێکردنی بەڵێنەکان ئەنجامێکە بە دڵنیاییەوە تۆ بەدەستیان دەهێنیت بەمەرجێك پشووت درێژبێت و ئامادەبیت لەپێناوی تێگەیشتنی کێشە بنەڕەتییەکەدا درێغی نەکەیت و بڕیاریش بدەیت بەپێی بنەما بەرزەکان بژیت کە لەم کتێبەدا وەکو چارەسەر باسیان کراوە.

لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا بەکورتی ئاماژەم کرد بۆ بارودۆخە بەئازارەکەی ئێستا.

بەشی دووەم، کێشە بنەڕەتییەکە دیاری دەکات. ئێمە ئەگەر لە کێشە سەرەکییەکە تێبگەین کە رەگو ریشەیەکی قوڵی هەیە ئەوا رۆشناییەکی زۆر بەهێز دەخەینەسەر ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە لە ژیانی تایبەتی خۆماندا و لە پەیوەندیەکانی ناوخێزان و شوێنی کاردا دێنە رێمان.

بۆ تێگەیشتنی ئەو کێشەیە پێویستە لە پانزە بیست لاپەڕەی داهاتودا خۆت ماندو بکەیت و مێشکت بگوشیت. ئەو لاپەڕانەی ئاماژەم پێکردن تەرخانن بۆ باسکردنی کێشە سەرەکییەکە. بەڵام باقی کتێبەکە بۆ سەرمایەگوزاریکردنە لەو هەوڵو تەقەلایانەی کە پێویستن. لای هەمومان ئاشکرایە کە دامودەزگاکان تێکڕا لە سەدەی رابردوودا زنجیرە رووداوێکیان بەخۆیانەوە بینی کە تێگەیشتن و شیتەڵکردنەوەیان دەتوانێت ببێتە رێنماو رێساو هێز بۆ روبەڕوبونەوەی ململانێ و هەڕەشەکانی ئێستا. لەبەرئەوە تکام وایە بەشی دووەمی کتێبەکە بەخێرایی نەخوێنیتەوە، چونکە بەشێکە شایستەی ئارامی و بیرلێکردنەوەی قوڵە.

بەشی سێیەم، بەشێوەیەکی گشتی تیشک دەخاتە سەر ئەو رێگاچارەیەی کە خووی ژمارە هەشت دابینی دەکات و ئێمە لە بەشەکانی دیکەی کتێبەکەدا باسی دەکەین. هەروەها بڕگەیەکی کورتکراوەشی تێدایە بۆت روون دەکاتەوە چۆن بتوانیت بە باشترین شێوە سود لەم کتێبە وەربگریت.

## فیلم: شوێن دەست

پێش ئەوەی بچینە بەشی دووەم داوات لێ دەکەم تەماشای فیلمی (شوێن دەست) بکە کە فیلمێکی سێ خولەکییە.

لە ماوەی چەند خولەکێکدا بوارت دەبێت بیر لەو توخمە سەرەکییانە بکەیتەوە کە دەنگی تایبەتی هەر یەکێك لە ئێمە پێك دەهێنێت. چوار دانە پێویستی گرنگ هەن کە بایەخێکی گەورەیان بۆ مرۆڤ هەیە. ئەو چوار پێویستییە بریتین لە ژیان و خۆشەویستی و فێربوون و بەجێهێشتنی نیشانەیەك لەپاش خۆت. فیلمەکە بەشێوەیەکی خۆش و سەرنجڕاکێش وێنەی مرۆڤی نمونەییتان بۆ دەکێشێت. ئەو مرۆڤەی کە ئامانجی سەرەکی کێشەکەیەو لە بەشی داهاتودا بە وردی باسی دەکەین.

لە زۆربەی بەشەکانی ئەم کتێبەدا ئاماژە بۆ فیلمێکی کورتی هاوشێوەی ئەم فیلمە دەکەم کە هەوڵێکە بۆ فێرکردنی ناوەڕۆکی مەبەستەکەی ئێمە. فیلمەکان (کە زۆربەیان خەڵاتی بەناوبانگی ناوچەیی و جیهانییان بەدەستهێناوە). خراونەتەسەر CD و وەك بەشێك لە کتێبەکە دەفرۆشرێت.

ئەو فیلمانە، چ ئەوانەی خەیاڵین و چ ئەوانەشی کە بەڕاستی رویان داوە، فیلمی بەهێزن و لێوانلێون لە سۆز و هەستی مرۆڤانە. دڵنیام تۆ بە بینینیان روانینێکی باشتر و هەستێکی بەهێزترت لەلا دروست دەبێت و چاکتر لە بابەتەکە تێدەگەیت. هەروەها چێژێکی زۆریشیان لێ دەبینیت. بەڵام ئەگەر حەزت لە تەماشاکردنی فیلم نییە، مەیکە بە کێشە. واز لە CD یەکە بهێنەو بەردەوام بە لەسەر خوێندنەوەی کتێبەکە.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە (ئەگەر ئارەزوت لێیە) تەماشای فیلمەکە بکەیت، فیلمی شوێن دەست.

# بەشی دووەم

## کێشە

کاتێک کە ژێرخانەکە وەردەچەرخێت هەمو شتەکان دەهەژێن

- ستان دافیس

ئێمە ئەمڕۆ لە قۆناغی گۆڕانکارییەکداین کە بە یەکێک لە گۆڕانکارییە هەرە گرنگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی ئەژمار دەکرێت. پیتەر دراکەر Peter Drucker – کە یەکێکە لە بیرمەندە کارگێڕییە هەرە مەزنەکانی ئەم سەردەمە- گۆڕانکارییەکە بەم شێوە وەسف دەکات: "پاش سەدان ساڵی دیکە، کاتێک مێژووەکەمان لە روانگەی مەودایەکی زەمەنی درێژەوە دەنوسرێت، پێم وایە مەزنترین رووداو کە سەرنجی مێژونوسەکان رادەکێشێت نە بریتی دەبێت لە تەکنیک و نە لە ئینتەرنێت و نە بازرگانی ئەلکترۆنییش دەبێت. بەڵکو ئەوەی سەرنجیان رادەکێشێت ئەو گۆڕانکارییە بێ پێشینەیە دەبێت کە لە سروشتی مرۆڤدا هاتۆتە ئاراوە. لەڕاستی لانادەین ئەگەر بڵێین ئەمە یەکەمجارە لە مێژوودا کە زۆربەی خەڵکەکە چەندین ڕێگاو هەڵبژاردنیان بۆ مەیسەر بووە. ژمارەکەش بەخێراییەکی سەرنجڕاکێش لەزیادبوندایە. سەردەمی ئێستا سەردەمێکە پێویستە خەڵکەکە خۆی خۆی بەڕێوەببات لەکاتێکدا کە کۆمەڵگا هیچ ئامادەییەکی تێدا نییە لەم رووەوە.

بۆ تێگەیشتن لە کێشە سەرەکییەکەو لە مانا گەورەکانی پێشبینییەکەی دراکەر، پێویستە پێش هەمو شتێک تەماشای رەوتی مێژو بکەین، بەتایبەت تەماشای پێنج چاخەکەی دەنگی شارستانیی! ئەو پێنج چاخەش بریتین لە: یەکەم: چاخی راوو شکار و کۆکردنەوە، دووەم: چاخی کشتوکاڵ، سێیەم: چاخی پیشەسازی، چوارەم: چاخی کرێکارانی زانست و زانیاری و پێنجەمیش سەرهەڵدانی چاخی حیکمەت.

وای دابنێ کە تۆ گەڕاویتەوە سەردەمی جاران و ئێستا ڕاوچییەکیت و خۆراک کۆدەکەیتەوە. هەمو ڕۆژێک بەخۆت و چەکە سەرەتاییەکەتەوە دەچێتە دەرێ و چەکەکەش یان تیروکەوانە یاخود تێلایەکە یاخود پارچە بەردێکە، بۆ بەدەستهێنان و کۆکردنەوەی خۆراک بۆ خۆت و خێزانەکەت و لەم کارە زیاتر هیچ کارێکی دیکە نازانیت و ناتوانیت و لەپێناوی پاراستن و مانەوەی خۆتدا ئەنجامی دەدەیت. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت، ئەگەر لەو قۆناغەدا کەسێک هاتە لات و زۆر لەگەڵتدا خەریک بو بۆ ئەوەی قەناعەتت پێبکات ببیتە جوتیار، ئایا تۆ چۆن وەڵامی دەدەیتەوە؟




شێوەی ٢ — ١

گریمان ئەو هاتو بە بەرچاوی تۆوە کەوتە زەوی کێڵان و پاشان هەندێک تۆوی پێوەکرد، کەچی تۆ هیچ نابینیت. پاشان دەستی کرد بە ئاودانی زەوییەکەو خزمەتکردن و بژارکردن و تۆ دیسان هیچ نابینیت. بەڵام لە کۆتاییدا بەسەرسوڕمانەوە زەرعاتێکی زۆر دەبینیت و تێدەگەیت کە ئەو جوتیارە پەنجا هێندەی تۆی ڕاوچی و کۆکەرەوەی خۆراک، بەروبومی دەست کەوتووە، ئەگەرچی تۆ ڕاوچییەکی شارەزاو بەتواناشیت. ئایا لەو حاڵەدا تۆ چی دەکەیت؟ ڕەنگە لە دڵی خۆتدا بڵێیت: تەنانەت ئەگەر بمەوێت واز لە ڕاوچێتیش بێنم و وەکو ئەو دەست بکەم بە جوتیاریی، هەرگیز وەکو ئەوم پێناکرێت چونکە نە هێندەی ئەو شارەزای ئیشەکەم و نە کەلوپەل و کەرەسەی پێویستیشم هەیە.

گەوهەری مەسەلەکە ئەوەیە تۆ لە جوتیاریی تێناگەیت و نازانیت ئەو ئیشە چۆن بەڕێوەدەچێت. دواتریش دەبینیت جوتیارەکە بۆتە بەرهەمهێنێکی وا کە بەشی ئەوە پارەی دەست بکەوێت منداڵەکانی بخاتە بەرخوێندن و هەلی باش و مەزنیان پێ ببەخشێت، لەکاتێکدا ئەوەی تۆی راوچی پەیدای دەکەیت بەشی ژیانێکی مەمرەو مەژییە. وردە وردە ئارەزوی ئەوەت لەلا دروست دەبێت بە خێرایی فێری پیشەی جوتیاری ببیت و منداڵەکانیشت وا پەروەردە دەکەیت خۆیان و نەوەکانت ببنە جوتیار. لە مێژوی کۆندا رێك ئەمە روی داوە. ژمارەی راوچییان و کۆکەرەوەکانی خۆراك بە رێژەی ٩٠٪ کەمی کردو ئیشەکەیان لەدەست چو.

ئینجا دوای چەند نەوەیەك چاخی پیشەسازی سەری هەڵدا. خەڵکەکە وردە وردە دەستیان دایە دروستکردنی کارخانەی جۆراوجۆر. هەروەها فێری پسپۆڕی و کارپێسپاردن و گەشەکردن بون. فێری ئەوەبون چۆن کەرەسە خاوەکان بەتواناو شارەزاییەکی زۆرتر بخەنە هێڵی پیشەسازییەوە.

ئاستی بەرهەمهێنان لە چاخی پیشەسازیدا پەنجا هێندەی ئەو ئاستە بەرزبوە کە باخ و بێستانەکەی خێزانی جوتیار بەرهەمی دەهێنا. گریمان تۆ جوتیارێك بیت پەنجا هێندەی مرۆڤی راوچی و خۆراك کۆکەرەوە بەرهەمت هەبێت، کەچی کتوپڕ کارگەیەك دەبینیت بەرهەمەکەی پەنجا هێندەی ئەوەیە کە خێزانێك لە باخەکەیاندا دەستیان دەکەوێت. ئایا تۆ لەو حاڵەدا چی دەڵێیت؟ رەنگە ئێرەییان پێ ببەیت یاخود وا هەست بکەیت هەڕەشەیەکی گەورەت هاتۆتەسەر. بەڵام ئایا ئەگەر بتەوێت ببیتە یاریکەرێکی چاخی پیشەسازی پێویستت بەچی دەبێت؟ بەدڵنیاییەوە پێویستت بە سیستمێکی نوێی کەرەسەو شارەزایی دەبێت. لەوەش گرنگتر، پێویستت بە سیستمێکی ئەقڵیی تازە دەبێت. واتە بە جۆرێکی تازەی بیرکردنەوە. کارەکە لەسەردەمی پیشەسازیدا پەنجا هێندەی باخ و بێستانەکەی خێزان بەرهەمی هەبووە. ئەمەش کارێکی وای کردوە ٩٠٪ی جوتیاران واز لە پیشەی خۆیان بهێنن و رێژەکەیان لە کۆمەڵگادا کەم ببێتەوە. ئەوانەش کە لە پیشەی جوتیاریدا مانەوە سودێکی مەزنیان لە چەمکی چاخی پیشەسازی وەرگرت و (کێڵگەی پیشەسازکراو)یان داهێنا. ئێستا تەنیا ٣٪ی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتوەکان لە بواری کشتوکاڵدا کاردەکەن کەچی بەو رێژە کەمەشەوە دەتوانن بۆ هەمو دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتوەکان و بەشێکی زۆری دانیشتوانی جیهان خۆراك بەرهەم بهێنن.

ئایا تۆ لەو باوەڕەدایت کە سەردەمی کرێکارانی زانست و زانیاری (ئەو سەردەمەی کە بۆی دەچین) پەنجا هێندەی سەردەمی پیشەسازی بەرهەمی دەبێت؟ بەڵێ من لەو باوەڕەدام و لە ئێستاشەوە نیشانەکانی ئەو زیادبونی بەرهەمە دەبینین.

لە ئایندەدا بەرهەمی چاخی زانست و زانیاری پێشی بەرهەمی چاخی پیشەسازی دەداتەوەو پەنجا هێندەی ئەوی لێ دێت. نەک دو هێندە یاخود سێ هێندە یاخود دە هێندە، بەڵکو پەنجا هێندە. (ناثان مایهرڤۆڵد Nathan Myhrvold) کە فەرمانبەرێکی گەورەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتە لە بواری تەکنیکیدا لەم بارەیەوە دەڵێت: گەشەپێدەری بەرنامە نوێیەکان بەرهەمەکانیان دە هەزار جاری بەرهەمی گەشەپێدەری بەرنامە ئاساییەکانن. نەک دە ڤات و سەد ڤات و هەزار ڤات، بەڵکو دە هەزار ڤات.

لەڕاستیدا کارێک کە پشتی بە جۆری زانیاری بەستبێت، نەک بە چەندایەتی، کارێکی زۆر بەنرخە. جڵەوشلکردن بۆ ئەو توانایانەی کە لەگەڵ ئەم جۆرە کارانەدان هەل داهێنانی گرنگ گرنگ بۆ دەزگاکە دەخولقێنێت. ڕاستی ئەم مەسەلەیە هەق وایە هانمان بدات بیر لە بایەخی جڵەوشلکردن بکەینەوە. جڵەوشلکردن بۆ ئەو تواناو بەهرانەی کە نەوەکانی ئایندە خاوەنیانن. ئەو کارەی کە پشتی بە زانیاری بەستبێت ئاستی تێکڕای سەرمایەگوزارییەکانی دەزگاکە (خێزانەکە) بەرزدەکاتەوە. لەڕاستیدا کرێکارانی بواری زانست و زانیاری ڕۆڵی ئەوە دەبینن کە هەمو سەرمایەگوزارییەکانی دەزگاکە پێکەوە دەبەستنەوە. کرێکارانی بواری زانست زامنی وردبونەوەو داهێنانی زیاترن و ئاستی ئەو ڕێگایانەش بەرز دەکەنەوە کە لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجەکانی دەزگاکەدا سەرمایەگوزارییەکانی تێدا بەکاردەهێنرێت.

ئایا تۆ لەو باوەڕەدایت کە چاخی کرێکارانی زانیاری لەکۆتاییدا هێزی کاری چاخی پیشەسازی بەڕێژەی ٩٠٪ کەم دەکاتەوە؟

من خۆم لەو باوەڕەدام، سود وەرگرتنی ئێستا لە سەرچاوە بیانییەکان و ئاڕاستەکانی بێکاریی تەنیا بەشە ئاشکراکەی شاخە سەهۆڵەکەیە. لەڕاستیدا هەرچەندە ئاڕاستە تازەکانی بێکاری بونەتە مەسەلەیەکی گەرمی سیاسی، بەڵام گەوهەری کێشەکە کەمتر پەیوەندی بە سیاسەتەکانی حکومەت و ڕێکەوتنە بازرگانییەکانەوە هەیە. کێشەی بێکاری لەم ڕۆژگارەدا زیاتر پەیوەندی بەو گۆڕانکارییە کتوپڕەوە هەیە کە بەسەر ئابورییەکەماندا هاتووە لە چاخی کرێکارانی زانیاریدا.

ئایا تۆ لەو باوەڕەدایت کە فێربونی سیستەمێکی ئەقڵیی تازەو سیستمێکی نوێی شارەزای کەرەسەی تایبەتی ئەم چاخە نوێیە دەتوانێت هەرەشە دروست بکات بۆسەر ئەو هێزی کارەی کە ئەمڕۆ هەیە؟

تکایە بیر بکەرەوە بزانە بەدیهێنانی ئەم مەسەلەیە پێویستی بە چییە؟ بزانە مرۆڤ ئەگەر بیەوێت ببێتە پارێزانێکی ئەم چاخە پێویستە چی بکات. چۆن بێت؟ بیهێنەرە بەرچاوی خۆت بزانە دەزگاکەت پێویستی بە چییە؟

بەراوردکارییەکەی دراکەر لەنێوان کرێکارانی چاخی زانیاری و ئەو کرێکارانەی لە چاخی پیشەسازییدا دەستیان بەکاردەهێنا بەم شێوەیەیە:

((گرنگترین و تاقە دەستکەوتی کارگێڕی لە سەدەی بیستەمدا بە کردەوە تەنیا ئەوەبو بەرهەمی کرێکاری دەستیی پەنجا هێندەی جاران زیادکرد. گرنگترین بەشدارییش کە کارگێڕیی پێویستە لە سەدەی بیست‌ویەکەمدا بەدەستی بهێنێت زیادکردنێکی لەو جۆرەیە لەئاستی بەرهەمەکانی کاری زانیاری و کرێکاری زانیاریدا.

لە سەدەی بیستەمدا بەنرخترین ماڵو موڵکی کۆمپانیا بریتی بو لە کەرەسەکانی بەرهەمهێنان، بەڵام لە سەدەی بیست‌ویەکەمدا بەنرخترین بەشی کۆمپانیا چ لەبواری کاردا و چ لە هەر بوارێکی دیکەدا بریتی دەبێت لە خودی کرێکارەکانی زانیاری و لە بەرهەمەکانیان.))

مێژونوسی مەزن (ئارنۆڵد تۆینبی) دەڵێت: دەتوانین زۆر بە باشی مێژوی کۆمەڵگاو دەزگاکانیشی لەم چەند وشەیەدا کورت بکەینەوە: (هیچ شتێك هێندەی سەرکەوتن، شکست ناهێنێت). بە واتایەکی دیکە مرۆڤ کاتێك تەحەدایەکی دێتە رێو هاوتەریبی ئەومش کاردانەوەی دەبێت، ئەوە سەرکەوتنە بەڵام کە تەحەدایەکی نوێ سەرهەڵدەدات ئەوکاتە نیتر کاردانەوە کۆنەکەی کە جاران سەرکەوتوبو، لەم حاڵەدا گرنگیی نامێنێت. ئێمە ئێستا لە چاخی کرێکارانی زانیاریدا دەژین، بەڵام هێشتا دەزگاکان بەشێوە کۆنەکە بەڕێوە دەچن. واتە شێوەی چاخی پیشەسازی. ئەمەش رێ لە ئازادبون و تەقینەوەی توانا مرۆییەکان دەگرێت. دەنگەکە هێشتا ئامادە نییەو ئەمەش ئەنجامێکی سەرنجڕاکێشە.

ئەو سیستمی بیرکردنەوەیەی کە لە چاخی پیشەسازیدا باڵادەست بووەو تا ئێستا کۆنترۆڵی شوێنەکانی کاری کردوە، چی دیکە لە چاخی کرێکارانی زانیاری و لەم ئابورییە نوێیەدا کەڵکی نابێت و ناژی.

بەداخەوە ئێمە ئەم شێوازە کۆنەی بیرکردنەوەمان بردۆتە ناوماڵەکانیشمانەوە، لەبەرئەوە دەبینین ئەو شێوازە کۆنە کۆنترۆڵی پەیوەندییەکانی کردوە. لەگەڵ هاوسەرەکانماندا و هەر بەو شێوازەش هەوڵ دەدەین منداڵەکانمان پەروەردەو ئامادە بکەین.

## ئەقلییەتی چاخی سەرمایەداریی پشت بەستو بە سەرمایە و ئامێرەکان

لە چاخی سەرمایەداریدا پێکهێنەرو هاندەرەکانی رابونی ئابوریی بریتی بون لە سەرمایەو ئامێرەکان، واتە لە شتەکان نەك لە مرۆڤ. مرۆڤ پێویست و گرنگ بون بەڵام دەتوانرا دەستبەرداریان ببن و لەجیاتی ئەم کرێکارە کرێکارێکی دیکەت دابنایە. خاوەن کار دەیتوانی کۆنترۆڵی کرێکارە نەشارەزاکان بکات و بە توندی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بێ ئەوەی زیانی زۆری لێ بکەوێت چونکە هەمیشە زیاد لە پێویست کرێکار هەبووەو پەیداکردنی جەستەی بەتواناو قبولکەری رێوشوێنی توندیش کارێکی ئاسان بوو. واتە لەو چاخەدا مرۆڤیش وەکو شتەکانی دیکە مامەڵەکردن لەگەڵیدا ئاسان بووە. کاتێك کە نیشەکەت تەنیا جەستەی کەسەکەی پێویستە نەك ئەقڵ و رۆح و دڵی (ئەمە خەسڵەتێکی جیاکەرەوەی سەردەمی ئامێرە.) ئەوکاتە ئیتر مرۆڤەکەت مەسخ کردووەو کردوتە بە شتێك (کە مرۆڤ نییە).

کەواتە بە شێکی زۆری هەڵسوکەوتە ئیدارییەکانی ئێستامان هی چاخی پیشەسازیەو لەو سەردەمەوە بۆمان ماوەتەوە. دیارە مەبەستمان لەو هەڵسوکەوتانەیە کە پاڵمان پێوە دەنێن وا هەست بکەین پێویستە حوکمی خەڵکەکە و کۆنترۆڵەکەیان بەدەست ئێمە خۆمانەوە بێت.

هەڵسوکەوتەکان پاڵمان پێوە دەنێن ئەوان تەنیا وەکو ژمارە ببینین. تەنیا بەوچاوە سەیریان بکەین کە بەشێکن لە ماڵ و موڵك و لە مەسرەفەکانی سەرشانی ئێمە. سەیرکەن چەند کارەساتە!! لە نەخشەکانی بودجەدا ئامێرەکان دەخرێنە خانەی سەرمایە گوزارییەوە کەچی مرۆڤ دەخرێتە خانەی خەرجییەکانەوە.

هەڵسوکەوتەکان پاڵمان پێوە دەنێن فەلسەفەی تێلاو گێزەرەکە پەیرەوبکەین، ئەو فەلسەفەیەی کە دەڵێت گوێدرێژەکە پاداشت بکە بەوەی گێزەرێکی نیشان بدەیت و بیدەیتێ و بەوەش سزای بدە کە لەپشتەوە تێلای پێدا بکێشێت، ئەگەر مانی گرتو نەڕۆیشت (پاداشت لەلایەك و ترسو سزادانیش لەلایەکی دیکەوە).

هەڵسوکەوتەکان پاڵمان پێوە دەنێن بودجەی ناوەندیی بەکاربهێنین، ئەوەی کە

ئاراستەکانی ئاینده دەخوێنێتەوەو بیرۆکراسی و دەسەڵاتە هەرەمییەکان دادەمەزرێنێتەوە بۆ بەدەستهێنانی ژمارە چاوەڕوانکراوەکان –دیارە ئەمەش پرۆسەیەکی تەواو نەرێنییە چونکە پشت بەو فەلسەفەیە دەبەستێت کە دەڵێت (با ئەمساڵ خەرجی بکەین ئەگینا ساڵێکی دیکە لەکیسمان دەچێت). لەم شێوە بودجەیەدا گرنگترین ئامانج بەلاتەوە ئەوە دەبێت چۆن پشتی هۆبەکەی خۆت و بەشەکەی خۆت بگریت.

تێکڕای ئەم هەڵس‌وکەوتانە و زۆرێکی دیکەش لە چاخی پیشەسازییەوە بۆمان هاتون، واتە هی ئەوسەردەمەن کە پشتی بە کرێکاری دەستی بەستبو. گیروگرفتەکە ئەوەیە کە بەڕێوەبەرەکانی ئەمڕۆ ئەم شێوازی حوکمکردنەی چاخی پیشەسازی بەسەر کرێکارانی زانیاریدا جێبەجێ دەکەن.

باشە بۆچی کاربەدەستان هەر بەو شێوازە خەڵکەکە بەڕێوە دەبەن کە ئامێرو کەرەسەکانی پێ بەڕێوە دەبەن؟ هۆکارەکە ئەوەیە زۆربەی کاربەدەستەباڵاکان نرخی راستەقینەی خەڵکەکە و تواناکانیان نازانن. هەروەها بە باشییش لە سروشتی مرۆڤ حاڵی نەبون. تێنەگەیشتن لە سروشتی مرۆڤ وا لەو کاربەدەستانە دەکات نەتوانن پارمەتی خەڵکەکە بدەن بۆئەوەی تواناو بەهرە شاردراوەکانیان بخەنە گەڕ.

ئەگەر مرۆڤی ئەم سەردەمە وەکو ئامێرێك مامەڵەی لەگەڵدا کرا چی رودەدات؟ هەستی بریندار دەبێت و کارەکەی لەلا سوك دەبێت و لەبەرچاوی دەکەوێت و لەئاکامیشدا کەلتوری دووبەرەکی و دردۆنگی و نەمانی متمانە بەرجەستە دەبێت. تۆ خۆت ئەگەر وا مامەڵە لەگەڵ منداڵە هەرزەکارەکانتدا بکەیت کە لەگەڵ ئامێرو کەرەسەکاندا هیچ جیاوازییەکیان نییە هەمان ئەنجامت دەستگیر دەبێت. منداڵەکان هەستیان بریندار دەبێت و لێت دوردەکەونەوەو پەیوەندییە گرانبەهاکانی ناو خێزانیان لەلا سوك دەبێت و ئەمەش ناکۆکی و نەمانی متمانەو یاخیبونی لێ دەکەوێتەوە.

## لولپێچی داکشاوی ئەم شوێنییەککەوتنە دووسەرەیە

چی رودەدات ئەگەر مرۆڤ وەکو ئامێر و کاڵا بەڕێوەببرێت؟

ئەوکاتە ئیتر باوەڕ بەوە ناهێنن کە سەرکردایەتیکردن بەدەست خۆیانەو هەڵبژاردنێکە لە هەڵبژاردنەکان. زۆربەی خەڵکەکە وا تەماشای سەرکردایەتی دەکەن کە پلەو پایەیە، لەبەر ئەوە هەرگیز خۆیان وەکو سەرکردە نایەتە بەرچاو.

سەرکردایەتی شتێکە وەکو پیانۆلێدان وایە. واتە ئازادییەکە پێویستە خۆت فێری ببیت و بەدەستی بهێنیت. ئەگەر لەمە تێگەیشتین ئەوکاتە تێدەگەین کە سەرکردایەتیکردن هەڵبژاردنێکە وەک هەڵبژاردنەکانی دیکە.

هەتا لەم راستییە تێنەگەین هەر لەسەر ئەو باوەڕە هەڵەیە دەمێنینەوە کە دەڵێت تەنیا خاوەن پلەوپۆستە بالاکان بۆیان هەیە بڕیار بدەن پێویستە چی بکەیت و چی نەکەیت. خەڵکی لەوجۆرە، پێبزانن یان نەزانن، لە ناخی خۆیاندا رازین وەک ئامێرو کالا مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.

تەنانەت ئەگەر پێویستیان بە کارێکی دیاریکراویش هەبێت، خۆیان هیچ دەستپێشخەرییەك نانوێنن، بەڵکو چاوەڕوان دەبن تا خاوەن کارەکە فەرمانیان پێدەکات چی بکەن و ئەوانیش فەرمانەکە جێبەجێ دەکەن. خەڵکی لەوجۆرە، ئەگەر ئەنجامەکە باش دەرنەچو، لۆمەی سەرکردە فەرمییەکان دەکەن و ئەگەریش ئەنجامەکە باش دەرچو دەیکەن بە پیاوەتی و ئازایەتی سەرکردەکەو ئەویش سەبارەت بە هاوکاری و پشتگیریکردنیان سوپاسیان دەکات.

ئەم خۆ دورەپەرێزگرتنە هەڵوێستێکی بلاوەو زۆربەمان ناوێرین دەستپێشخەری بکەین و سەربەخۆ رەفتار بنوێنین. ئەمەش ئەو هەستە لای سەرکردە رەسمییەکان دەچەسپێنێت کە پێویستە ئەمان ژێردەستەکان بەڕێوە ببەن و ئاراستەیان بکەن ئەگینا هیچ کارێك ئەنجام نادرێت. لەئەنجامیشدا ئەم بازنەیە بە خێرایی دەبێتە پاشکۆیەتییەکی دووسەرە. ئەم پشت بەو دەبەستێت و ئەویش پشت بە یەکێکی دیکەو ئیتر خاڵە لاوازەکانی هەمو تیمێك بەرجەستە دەبێت و دەکرێتە بیانویەك بۆ رەفتاری تیمێکی دیکە. دەسەڵاتی بەڕێوەبەر هەتا گەورەترو پتەوتر بێت هانی پتەوبونی ئەو رەفتارانە دەدات کە داوای دەسەڵات و کۆنترۆڵی زیاتر بۆ بەڕێوەبەر دەکات. بەمجۆرەش کەلتوری پاشکۆییەکی دووسەرە دەبێتە کەلتورێکی دامو دەزگایی وا کە هیچ کەس بەرپرسیارێتییەکە ناگرێتە ئەستۆی خۆی. بە تێپەڕبونی کات دەگەینە ئاستێك کە سەرکردەکان و ژێردەستەکان لە پەیماننامەیەکی پتەوی نەنوسراودا رۆڵە جیاجیاکانی خۆیان دەستنیشان بکەن. ئەوان بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لە بازنەیەکدان کە هەر لایەنێك خۆی بێدەسەڵات دەکات، چونکە باوەڕی وایە هەتا لایەنەکەی دیکە نەگۆڕێت بارودۆخەکە باشتر نابێت. ئەم پەیوەندییە لەناو ماڵیشدا، لەنێوان باوك و فرزندەکاندا دەردەکەوێت.

ئەم كودەتا بێ دەنگە لە هەمو شوێنێكدا بەردەوامە بەڵام كەم كەس ئازایەتی ئەوەی تێدایە تەماشای خۆی بكات بۆ ئەوەی كاریگەرییەكانی كودەتاكە ببینێت. هەركاتێك بیرۆكەیەكمان گوێ لێ دەبێت، یەكسەر خۆمان پێناگیرێت و تەماشای دەرەوە دەكەین، تەماشای دەوروبەرمان. من هەمو جارێك كە ئەم بابەتە بە موحازەرە دەڵێمەوە بۆ خەڵكێكی زۆر، دوای چەند سەعاتێك پاش قسەو شەرح و ئەمانە ئەم پرسیارەیان لێ دەكەم: كێ لە نێوە حەزی لە بابەتەكەیە بەڵام باوەڕی وایە ئەوانەی پێویستیان پێیەتی لەم هۆڵەدا نین؟

زۆرجار خەڵكەكە دەدەنە قاقای پێكەنین بەڵام زۆربەی زۆریشیان دەست بەرز دەكەنەوە. رەنگە تۆش باوەڕت وابێت كە زۆربەی ئەو كەسانەی بەڕاستی پێویستیان بە كتێبێكی لەم جۆرەیە، ئەوانەن كە نایخوێننەوە. ئەم بیركردنەوە بەربڵاوە خۆی لەخۆیدا پاشكۆیەتییە دووسەرەكەیە. ئەگەر لە خاڵە لاوازەكانی خەڵكانی دیكە وە تەماشای ئەم بابەتە بكەیت ئەوا خۆت لاواز دەكەیت و كارێك دەكەیت لاوازیی خەڵكەكەی دیكەیش بەردەوام بێت لە ئەهێشتنی دەستپێشخەری و بزواندن و وزەبەخشین بە ژیانت.

## فیلمی : ماكس و ماكس

بەرلەوەی زۆرتر قوڵ ببینەوە پێم خۆشە لەڕێی كورتەفیلمێكی نایابەوە سروشتی ئەو كێشەیەتان بۆ رون بكەمەوە كە باسمان كرد. فیلمی (ماكس و ماكس) چیرۆكێكی خەیاڵییە دەربارەی دوو (ماكس). (ماكس)ێكیان ناوی سەگێكی راوە. ماكسەكەی دیكە كارمەندی بەشی خزمەتگوزارییە لە كۆمپانیایەكدا. (هارۆڵد) ناوی بەڕێوەبەری دەزگاكەیە كە رەفتاری لەگەڵ هەمو كارمەندەكاندا بەهەمان شێوەی هەڵسوكەوتیشی لەگەڵ سەگەكەدا چۆنە لەگەڵ كارمەندەكانیشدا وایە).

شوێنی روداوی فیلمەكە شوێنی نیشكردنی ماكسو هارۆڵدو كارمەندەكانە. بەڵام بیرت نەچێت هەر كەسەو شوێنی كاركردنی تایبەتی خۆی هەیە.

خوێندكاران و مامۆستاكان شوێنی كاركردنیان خوێندنگایە. شوێنی كاركردنی خێزان ناوماڵە، هی خەڵكی دیكە رەنگە فەرمانگە و مزگەوت و كەنیسە بێت. كەواتە فیلمەكە زیاتر لەوەی دەربارەی كارەكە بێت، دەربارەی پەیوەندییە مرۆییەكانە. دەربارەی كارلێكی نێوان ئەو خەڵكەیە كە ئامانجێكی هاوبەش كۆیان دەكاتەوە. من پێم

بەتایبەت باشە تۆی خوێنەر ناوەڕۆکی فیلمەکە بگوێزیتەوە بۆ هەموو بوارەکانی ژیانت، بۆ ئەو بوارەی کە خەڵکی دیکە هاوبەشن لەگەڵتدا.

زۆرجار کاردانەوەی خەڵك بەرامبەر فیلمەکە کاردانەوەیەکی شەخسییە یاخود لەسەر ئاستی دەزگاکەیە.

داوات لێ دەکەم ئێستا (C.D)ی سەر بەرگی ناوەوەی کتێبەکە بخەرە ئامێرێکی نمایشەوە و فیلمی (ماکس و ماکس) هەڵبژێرە.

ئێستا بیر لەو فیلمە بکەرەوە کە بینیوتە. ماکس هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئێمەوماناندا نییە کە کارێکی نوێ و پیشەیەکی تازە دەست پێدەکەین. ماکس کەسێکی گورج‌وگۆڵ و وردبەرز و پڕجۆش‌و خرۆشە. کاتێك کە ماکس ویستی لەپێناوی ڕاکێشانی کڕیار و هێشتنەوەیاندا دەستپێشخەرییەك بکات یەکسەر هارۆڵدی بەڕێوەبەر کێشەی بۆ دروست کرد. گیروگرفتەکانی کە بۆی دروستکران و ئەو هەوڵ‌و ئەملاوئەولایانە کە دەدران بۆ کۆنترۆڵکردنی ماکس، ورەو و هیوای ئەو پیاوەیان شکاندو گیانی دەستپێشخەرییان تێدا مراندو کردیانە کەسێکی شەرمنی وا کە نە بتوانێت ئامانج و تواناکانی خۆی ببینێت و نە جورئەتیش بکات هیچ شتێك هەڵببژێریت. ماکس لەم ئەزموونەدا دەنگی خۆی بزرکردو سوێندی خوارد چیتر لە هیچ مەسەلەیەکدا دەستپێشخەریی نەکات.

ماکس لەگەڵ (هارۆلد)دا پێکەوە چوونە ناو سیستمی بیرکردنەوەی پشتبەستو بە پاشکۆیەتی. واتە ئەم بو بە پاشکۆی ئەوی دیکەو وردە وردە (ماکس)ت بینی شتێکی لێ دەرچو ڕێك وەکو سەگەکەو هەمیشە چاوەڕێی ئەوەبو کەسێك فەرمانی پێ بکات.

ڕەنگە تۆ لەم مەسەلەیەدا لۆمەی هارۆلد بکەیت، بەڵام مەسەلەکە لەوە قووڵترە. ئەم شتە وردانە وەکو پەتا بەخێرایی لەناو دەزگاکاندا بڵاو دەبنەوە. تێکڕای کەلتوری کۆمپانیاکە لەسەر پاشکۆیەتی دووسەرە دامەزراوە. هەرلایەك دەبینێت پاشکۆی لایەکی دیکەیە. هیچ کەس بەکردەوە سەرکردە نییە [نە لەڕوی دەستپێشخەرییەوەو نە لەڕوی دەورو تەنسیرەوە] هۆکارەکەش ئەوەیە هەموویان وا دەزانن سەرکردایەتی پۆستێکی دیاریکراوەو هیچتر. لەڕاستیدا زۆربەی دەزگاکان جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەقڵییەتی ماکس و هارۆلدا نییە. تەنانەت دەزگا هەرەباشەکانی کە لەماوەی چل ساڵی ڕابردودا کارم تێدا کردون، ئەوانیش پڕن لە کێشە. ئازارو دەرەنجامە

خراپەکانی ئەم کێشەو گیروگرفتانە بەهۆی گۆڕانکارییەکانی جیهانەوە لەجاران توندوتیژتر دەبن. گیروگرفت و ململانێکان وەك ئەوەی لە فیلمی ماکس و ماکس دا بینیمان دەگرێن بە سێ بەشەوە: ململانێکان لەسەر ئاستی دەزگا، ململانێ لەسەر ئاستی پەیوەندیی نێوان خەڵکەکەو ململانێ شەخسییەکان.

لەسەر ئاستی دەزگاکە ئەوەیە کە فەلسەفەی کارگێڕی دەزگاکەمان بەجۆرێك پەیوەندی و زانیاری و خەڵات و سزاو راهێنان و فەرمانەکان بەڕێوە دەبات کە دەنگی مرۆڤ و بەهرەکانی تێدا دەفەوتێت.

ڕەگو ریشەی ئەم فەلسەفەی حوکمکردنە لە چاخی پیشەسازیدایە و بۆتە سیستمی بیرکردنەوەیەکی هێندە زاڵی ئیداری کە دەسەڵاتی دەڕوات بەسەر خاوەن پۆستە باڵاکانی هەمو پیشەو پیشەسازییەکاندا. من جارێکی دیکە ئەمە ناو دەنێمەوە سیستمی بیرکردنەوەی تایبەت بە چاخی پیشەسازیی.

لەناو زۆربەی دەزگاکاندا ئەم کەلتوری پاشکۆیەتییە دووسەرەیەو لەسەر ئاستی پەیوەندییەکانیش باڵادەستە. متمانەکردن بەیەکتری زۆر لاوازە، زۆربەشیان توانا و شارەزاییان کەمەو ناتوانن راستگۆ و دەستپێشخەرانە مامەڵە لەگەڵ جیاوازییەکانیاندا بکەن. کێشەی گەورەی ئەم پاشکۆیەتییە لەسەر ئاستی پەیوەندییەکان لەوەدایە کە زۆربەمان وا پەروەردە کراوین لە ماڵەوە خۆمان لەگەڵ خوشك و براکانماندا بەراورد بکەین و لە خوێندن و وەرزش و شوێنەکانی دیکەشدا پێشبڕکێ بکەین. کاریگەرییە بەهێزەکانی ئەم کەلتورە وا دەکەن زۆربەمان بە سەرکەوتنی خەڵکانی دیکە دڵخۆش نەبین.

لەسەر ئاستی کەسەکانیش دەبینین دەزگاکان هەرچەندە سیخناخن لە خەڵکی زیرەك و بلیمەت و داهێنەر لەئاست و بواری جیاجیادا، بەڵام هەموویان وا هەست دەکەن کە کۆتوبەندیان بۆ دانراوە و هیچ کەسێك نرخ و بایەخیان نازانێت و هانیان نادات.

## هێزی پارادیم

(جۆن گاردنەر John Gardner)ی نوسەر لە شوێنێکدا دەڵێت: زۆربەی دەزگا نەخۆشەکان نابینابیەکی ئیدارریی وایان بەرەو پێداوە کە ناتوانن خەوشەکانی خۆیان ببینن. دامودەزگاکان بەدەست ئەوەوە ناناڵێنن کە ناتوانن گیروگرفتەکانیان چارسەر بکەن، بەڵکو بەدەست ئەوەوە کە ناتوانن گیروگرفتەکان ببینن. (ئەنیشتاین)یش زۆر بە

جوانی گوزارشی لەم مەسەلەیە کردوەو دەڵێت. (کێشە گرنگەکانی کە روبەڕویان دەبینەوە ناتوانین بەو ئاستی بیرکردنەوەیە چارەسەریان بکەین کە ئێمە کێشەکانمان پێ خوڵقاند). ئەگەر ویستت ئەم قسانە یەکێکن لەو دەرسە قوڵانەی کە لە ژیاندا فێریان بوم. ئەگەر ویستت پلەپلە گۆڕانی بچوك بهێنیتە ئاراوە پێویستە کار لەسەر رەفتارو شێوازو ستایلەکان بکەیت، بەڵام ئەگەر ویستت گۆڕانی گەورە و گرنگ روبدات کار لەسەر پارادیمەکان بکە.

وشەی پارادیم (paradigm) لە وشەی (paradigma)ی یۆنانییەوە هاتووە کە لە رەچەڵەکدا وشەیەکی زانستییە بەڵام ئێستا بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکاردەهێنرێت و چەند واتایەکی نزیك بەیەك لەخۆ دەگرێت، لەوانە، تێگەیشتن و گریمانەو تیۆری چوارچێوەو ئەو هاوێنانەی (زەرەبینانەی) کە دنیایان پێ دەبینین. پاردایم وەکو نەخشەی شارێك و شوێنێك وایە. مرۆڤ چەند خۆی ماندو بکات و بەباشی بیر بکاتەوە، بەڵام ئەگەر نەخشەکەی نەخشەیەکی راست نەبێت هەرگیز ناگاتە ئامانجەکە. بەڵام ئەگەر نەخشەکە راست بو، ئەوکاتە کاری جددی و هەڵوێستی باش کەڵکیان دەبێت. بەڵام دیارە لە هەموی گرنگتر نەخشەکەیە.

بۆ نمونە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا مرۆڤیان بەچی چاك دەکردەوە؟ بە کەڵەشاخ. گۆشمنیگا یاخود پاردیمی بەربڵاوی ئەو رۆژگارە بریتی بو لەچی؟ خەڵك لەو رۆژگارەدا باوەڕیان وابو کە توخمە خراپو گەندەڵ و زیانبەخشەکان لەناو خوێندان و ئەوەی کە پێویستە ئەنجامی بدەیت تەنیا دەرکردنی ئەو توخمانەیە.

تۆ ئەگەر ئەم پارادیمە نەخەیتە ژێر پرسیارەوە، چی دەکەیت؟ کەڵەشاخگرتنەکە زیاترو زیاتر برەو پێ دەدەیت و هەر گۆڕان و گەشەکردنێکیش ئەنجام بدەیت هەر لە چوارچێوەی کەڵەشاخگرتنەکەدا دەبێت. رەنگە هەوڵ بدەیت شێوازەکەی گەشە پێبدەیت و وای لێ بکەیت ئازاری نەبێت یاخود کەرەسەی جوانتر و چاکترو هەرزانتری بۆ دروست دەکەیت و دەیخەیتە بازاڕەوە. بەڵام لە کۆتاییدا کارەکە هەر یەك شتە. هەر کەڵەشاخگرتنە، ئیتر شێوازی بەرهەمهێنان و ریکلام و خستنە بازاڕەوە هەرچییەك بێ گرنگ نییە.

ئایا دەزانیت دۆزینەوەی تیۆری میکرۆبەکان چ ئاڵوگۆڕێکی هێنایە ئاراوە؟! کاتێك (سیمیلویس)ی هەنگاری و (پاستۆر)ی فەرەنسی و گەورە زاناکانی دیکە بۆیان دەرکەوت کە میکرۆب هۆکاری نەخۆشییەکانە چی روی دا؟ ئەم دۆزینەوەیە زۆر مەسەلەی بۆ لێك داینەوە. بۆ نمونە ئەوەی کە بۆچی لە گۆڕەپانەکانی جەنگدا خەڵکەکە زیاتر بە

هەوکردن و بەتاکان دەمردن نەك بە گوللەی تفەنگەکان. نەخۆشییەکە لەرێی میکرۆبەکانەوە دەگوازرایەوە هێلەکانی پشتەوە. دۆزینەوەکە هەروەها هۆکاری ئەوەشمان بۆ روون دەکاتەوە کە بۆچی ژنان پێیان باش بو لەسەردەستی مامانەدا منالیان ببێت، چونکە مامانەکان پاکوتەمیزتربون. تیۆری میکرۆبەکان کۆمەڵێك ئاسۆی تازەی بەرووی توێژینەوە زانستییەکاندا کردەوەو هەر ئەمیش چاودێرییە تەندروستییەکانی گەیاندە ئاستی ئەمڕۆ.

ئەمەیە هێزو توانای پارادیمی راستەقینە. لەپێشەوە بابەتەکە روون دەکاتەوە پاشان رێنمایی پێشکەش دەکات .. بەڵام کێشەکە لەوەدایە پارادیمیش وەکو نەریت وایە بە ئاسانی نامرێت. مێژوو پێمان دەڵێت چەندین سەدەش پاش دۆزینەوەی پارادیمی باشتر پارادیمە کۆنەکان هەر بەردەوام بون و نەفەوتاون. بۆ نمونە، هەرچەندە کتێبەکانی مێژوو نوسیویانە جۆرج واشنتۆن بەهۆی هەوکردنێك لەناو دەمیدا گیانی لەدەست داوە، بەڵام زۆر رێی تێدەچێت بەهۆی کەڵەشاخەوە مردبێت. هەوکردنەکەی ناودەمی ئەو، نیشانەی نەخۆشییەکی دیکە بو، بەڵام پارادیمی باو لەوسەردەمەدا ئەوە بو کە گوایە توخمە خراپەکان ئەوەتان لەناوخوێندا. لەبەرئەوە لەماوەی بیستوچوار سەعاتدا چەند قاپێك خوێنیان لێ گرت. دیارە ئەو برە خوێنەش زۆربوو. چونکە ئێستا دەزانین مرۆڤ ئەگەر تەندروستیشی باش بێت ناکرێت هێندە خوێنی لێ وەربگیرێت. پێویستە برە خوێنەکەی کە وەری دەگریت لە ماوەی دوو مانگدا لە بوتڵێك زیاتر نەبێت.

پارادیمی چاخی کرێکارانی زانیاری پارادیمێکی تازەیەو زۆر جیاوازە لەو پارادیمی (شت)ەی کە چاخی پیشەسازی پێبنیات نرابو. با ئەم پارادیمە ناوبنێین پارادیمی مرۆڤی رووەو کامڵبوون.

## پارادایمی مرۆڤی رووەو کامڵبوون

هۆکاری ئەوەی کە بۆچی زۆربەی خەڵك لە ئیشەکانی خۆیان نارازین و بۆچی زۆربەی دەستگاکان ناتوانن وا لە کرێکار و کارمەندەکانیان بکەن هەموو تواناو بلیمەتی و داهێنانێکیان بخەنە گەڕو بۆچی دامەزراوەکان ناتوانن ببنە داموەدەزگای مەزنی تەمەن درێژ؟ هۆکاری ئەمانە هەموی مەسەلەیەکی زۆر سادەو بنەڕەتکیەو ئەوەیە کە لە گۆشنیگایەکی ناتەواوە تەماشای سروشتی مرۆڤ دەکەین.

ڕاستیـیە بنەڕەتیەکە ئەوەیە مرۆڤ شتێك نـیـیـە بەئاسانی گۆنترۆڵ بکرێت یاخود بخرێتە کار. مرۆڤ لە چوار رەهەند پێکهاتووە کە بریتین لە جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆح.




شێوەی ٢ — ٢

چاوخشاندن بە هەمو فەلسەفەو ئاینە خۆرهەڵاتی و خۆرئاواییەکاندا هەر لە سەرەتای مێژووەوە تا رۆژی ئەمڕۆ بەشێوەیەکی بنەڕەتی بەرجەستەکردنی چوار رەهەندەکەن:




شێوەی ٢ — ٣

جەستەیی/ ئابوری و ئەقڵی و کۆمەڵایەتی/ سۆزداری و رۆحی. زۆرجار وشەی جیاواز جیاواز لە شوێنی ئەو چوار رەهەندە بەکار دەهێنرێت بەڵام لە جەوهەردا هەمویان تەنیا هەر ئەو چوار رەهەندەن کە لە ژیانی هەریەکێکماندا بەبێ جیاوازی جێبەجێ دەبن. رەهەندەکان لەهەمان کاتیشدا نیشانەی پێداویستی و چوار هاندەرە سەرەکیەکەی ژیانن کە لە فیلمە سینەماییەکەی تایبەت بە بەشی یەکەم روون کرابونەوە: پێویستی ژیان (مانەوە)، پێویستی خۆشەویستی (پەیوەندییەکان) و پێویستی فێربوون (گەشەو پێشکەوتن) و پێویستی بەجێهێشتنی شوێن دەست (ماناو هاوکاری). تکایە تەماشای شێوەی ٢-٣ بکە.

## خەڵك رێگای زۆری لەبەردەمدایە

کەواتە ئەو پەیوەندییە راستەوخۆیە چییە کە لەنێوان پارادایمە زاڵەکەی شتەکەدا هەیە (بەشێك لە مرۆڤەکە) لە شوێنی کاری ئەمرۆداو لەنێوان شکست هێنانی بەرێوەبەرو دامودەزگاکان لەوەی کارمەندەکان هان بدەن باشترین تواناو بەشداری خۆیان پێشکەش بکەن؟ وەڵامەکە ئاسانە:

مرۆڤ تەنیا یەك رێگەی لەبەردەمدا نییە. تۆ کە بڕیار دەدەیت چەندێك لەخۆت پێشکەشی کارەکەت بکەت لەو روانگەیەوە بڕیار دەدەیت کە ئایا لە کارەکەتدا چۆن رەفتارت لەگەڵدا دەکرێت و تا چ ئەندازەیەك بوارت پێدەدرێت هەرچوار پێکهاتەکەی سروشتت بخەیتە کار. رێگاکانی تۆ چەند ئەڵتەرناتیڤێك لەخۆ دەگرن هەر لەوەی یاخی ببیت و کارەکەت جێبهێڵیت تاکو ئەوەی بەشێوەیەکی داهێنەرانە بەشداری تێدا بکەیت.

ئێستا ماوەی خولەکێك بیربکەرەوە لە هەریەك لەو شەش هەڵبژاردەیەی کە لە وێنەی (٢-٤)دا روون کراونەتەوەو کە بریتین لە یاخیبوون و بەجێهێشتنی کارەکە، گوێڕایەڵی کردن بە رق و کینەوە، گوێڕایەڵی کردن بە دڵێکی سافەوە، هاوکاریکردن بە دڵخۆشییەوە، پابەندبونی راستگۆیانە، بەشداریی داهێنەرانە.




شێوەی ٢ – ٤

ئینجا بیر لەم سیناریۆیانەی خوارەوە بکەرەوە:

سیناریۆی یەکەم: ئەو کاتەیە کە دادپەروەرانە رەفتارت لەگەڵدا ناکرێت. دەستگاکەت سیخناخە لە گەمەی سیاسی و دەستەگەرێتی. سیستەمی موچە تیایدا سیستەمێکی دادپەروەرانە نییە بەتایبەت موچەکەی تۆ لەچاو ماندوبونەکەتدا شتێکی کەمە. ئایا تۆ لە سیناریۆی وادا چی هەڵدەبژێریت.

سیناریۆی دووەم ئەوەیە کە لەرووی موچەوە دادپەروەرانە مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت بەڵام هیچ خۆشەویستییەکی تێدا نییە. واتە بە رێزەوە مامەڵەت لەگەڵدا ناکەن و رەفتاری بەڕێوەبەرەکەت لەگەڵ تۆدا بەپێی مەزاجی خۆیەتی و هەموو جارێك وەکو یەك نییە، ئایا تۆ لە حاڵی وا چ کاردانەوەیەك هەڵدەبژێریت؟ سیناریۆی سێیەم ئەوەیە کە هەم موچەکەت دادپەروەرانەیە و بەدڵی خۆتەو هەم بەسۆزیشەوە مامەڵەت لەگەڵدا دەکەن. بەڵام کاتێك کە پێویستە رای خۆت دەربڕیت کەس گوێت لێ ناگرێت. بە واتایەکی دیکە دەزگاکە رێز لە دڵ و جەستەت دەگرێت بەڵام رێز لە ئەقڵت ناگرێت. لە حاڵی وادا تۆ چی هەڵدەبژێریت؟

سیناریۆی چوارەم ئەوەیە کە هەم موچەکەت بەدڵی خۆتەو دادپەروەرانەیە (جەستە) هەم خۆشەویستانەش رەفتارت لەگەڵدا دەکرێت (دڵ) هەم بەشداریی بە داهێنانەکانت دەکرێت (ئەقڵ) بەڵام داوات لێ دەکەن دەڵێن ئەو چاڵە هەڵبکەنە و

دوایش پێت دەڵێن پڕی بکەرەوە یاخود سەرقاڵت دەکەن بە راپۆرت و نوسینی جۆراوجۆرەوە کەچی دوایی کەس نایان خوێنێتەوەو بەکاریان ناهێنێت.

بە واتایەکی دیکە نیشەکەت هیچ مانایەکی نییە (ڕۆح) لە حاڵەتی وادا تۆ چی هەڵدەبژێریت؟ سیناریۆی پێنجەم ئەوەیە کە موچەکەت دادپەروەرانەیەو بەسۆزیشەوە مامەڵەت لەگەڵدا دەکرێت و بەشداری بە داهێنانەکانیشت دەکرێت لە کارێکدا کە نرخ و واتای هەیە بەڵام لەناو دەزگاکەدا هەست دەکەیت فێڵو درۆی زۆر دەکرێت لەگەڵ کارمەندەکانی دیکە و کڕیارەکاندا (ڕۆح) لە حاڵەتی وادا تۆ چی هەڵدەبژێریت؟ ئەگەر تێبینیت کردبێت ئێمە لە سیناریۆکانی سەرەوەدا هەر چوار بەشە پێکهێنەرەکەی پارادایمی مرۆڤی پێگەیشتومان باس کردوە. واتە هەم بەناو جەستەدا رۆشتوین، هەم بەناو ئەقڵدا و هەم بەناو دڵی مرۆڤیشدا. سەبارەت بە رۆحی مرۆڤیش ئێمە لەو نمونانەدا کردومانە بە دوو بەشەوە. بەشێکیان ئەوەیە کە کارەکە هیچ واتایەکی نەبێت بەشەکەی دیکەشیان ئەوەیە کە کارەکە نامەبدەئییانە جێبەجێ بکرێت.

مەسەلەکە ئەوەیە بۆت رون ببێتەوە کە فەرامۆشکردنی هەر بەشێك لەو چواربەشەی کە سروشتی ئینسان پێکدەهێنن وا دەکات کە تۆ وەکو مرۆڤ تەماشای بەرامبەرەکەت ناکەیت، بەڵکو بە چاوی ئامێرو کاڵایەکی بێگیانەوە رەفتاری لەگەڵدا دەکەیت. واتە تۆ لە بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵکردنیاندا فەلسەفەی تێلاو گێزەرەکە بەکار دەهێنیت.

لە سەرتاسەری دنیاداو لە زۆرحاڵەتی جیاوازیشدا من ئەو پێنج پرسیارەی سەرەوەم لە زۆر کەس کردوە کە لە پلەو پۆستی جیاجیادا بون. زۆربەی وەڵامەکانیش سیانەکەی خوارەوە بوون واتە زۆربەیان لە وەڵامدا یاخیبوون و وازهێنان و گوێڕایەڵیکردنیان بە رقەوە هەڵبژاردوە. ئەگەر زۆر دۆخەکەیان بەدڵ بوبێت وەڵامی سێیەمیان هەڵبژاردوە کە گوێڕایەڵی کردنە بە دڵێکی سافەوە. بەڵام لە ئەمڕۆی چاخی زانیاری و زانستدا تەنیا ئەو مرۆڤەی کە هەست دەکات وەکو مرۆڤێکی پێگەیشتوو رێزی دەگیرێت واتە موچەیەکی دادپەروەرانە وەردەگرێت و بە سۆزەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت و توانا داهێنەرانەکەی دەخرێتە بواری جێبەجێکردنەوەو بواری پێ دەبەخشرێت وەك کەسێکی خاوەن بنەما خزمەتی مرۆڤ بکات هەر ئەو مرۆڤە یەکێك لە سێ هەڵبژاردنەکەی سەرەوە هەڵدەبژێرێت کە بریتین لە هاوکاری کردنی دڵپاکانەو پابەندبونی راستگۆ و بەشداری داهێنەرانە (تکایە جارێکی دیکە تەماشای شێوەی ٢-٤ بکە).

## دیاریکردنی ناسنامەکەت دیاریکردنی چارەنووستە

هیـوادارم ئێسـتا تێگەیشـتبیت کـە چـۆن کێشـە سـەرەکیەکانی شـوێنی کـارو چارەسەرکردنەکانیشیان هەر لـەو پارادایمـەدان کـە ئێمـە تەماشـای سروشـتی مرۆڤـی پێدەکەین. پارادایمەکەی چاخی پیشەسازی کە تەماشای مرۆڤی دەکـرد وەك ئـەوەی شتێکی بێگیان بێت و هەروەها دەرئەنجامـەکانی ئـەو پارادایمـەش رێـك لـەو پـارادایمی کەڵە شاخە دەچێت کە لە چاخەکانی ناوەڕاستدا زانستی پزیشکی لەسەر بنیـات نرابوو، ئێمـە لـە بەشی شەشـەمی کتێبەکەوە بـە درێـژی باسـی ئـەو چوار کێشـە درێژخایەنـە دەکـەین کـە دەزگاکـان پێـوەی دەنـاڵێنن و دەرەنجـامی فەرامۆشـکردنی چواربەشـە پێکهێنەرەکەی سروشتی مرۆڤن، هەروەها باسی رێگاچارەکانیشیان دەکەین. بەڵام ئێستا با باسی چارەسەرو چۆنیەتی وەڵامدانەوەی ئازارەکان بکەین.

# بەشی سێیەم

# چارەسەر

هیچ شتێک لەو بیرۆکەیە بەهێزتر نییە کە کاتی هاتووە

- فیکتۆر هۆگۆ

قسەیەکی هینری (دەیڤید ثۆریۆ) هەیە، زۆر جوانە، دەڵێت: هەزار تەور بکێشیت بە لق و پۆپی درەختەکانی خراپەدا بەقەدەر ئەوە سودی نابێت تەورێک بکێشیت بە رەگەکەیدا.

مەبەست لە ئامادەکردنی ئەم کتێبە بڕینی رەگ و ریشەی ئەو کێشە بنەڕەتییانەیە کە پێوەیان دەناڵێنین. ئێمە کتێبەکەمان بە باسکردنی ئازار دەستپێکرد، ئینجا بەدوای کێشە سەرەکییەکەو رەگ و ریشەکانیدا گەڕاین و بۆمان دەرکەوت کە باردایم و نەریت و شتە باوەکانی شوێنی کار چەندە لە مێشکی خەڵکەکەدا چەسپیون. ئێستاش با ئەو رێگایەتان بدەمێ کە لەم کتێبەدا دەیگرینەبەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە.

ماوەی چل ساڵی رەبەق من لە ناوچە جیاجیاکانی جیهاندا کارم کردووەو پەندو عیبرەت و دەرسم لەو ئەنجامانە وەرگرتوە کە خەڵکی زیرەك و بلیمەت لەئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆربەی دەزگاکاندا پێیان گەیشتون. زۆربەی ئەو گۆڕانکارییە کەلتورییانەی کە دەزگای مەزنیان دروستکردووەو بونەتە مایەی مانەوەو نەشونماکردن و گەشەسەندنی ئەو دەزگایانە، هەمویان تێکڕا بە بڕیاری یەك کەس دەستیان پێکردووە. هەندێك جار ئەو کەسە سەرکردەی رەسمی دەزگاکە بووە — سەرۆکی دەزگاکە یاخود بەڕێوەبەری جێبەجێکار- بەڵام زۆر جاری دیکە گۆڕانکارییەکە کەسێکی دیکە دەستی پێکردووە. ئەوکەسە ئیتر یان پسپۆڕی بوارێك بووە، یاخود بەڕێوەبەری بەشێکی بچوك بووە یاخود یاریدەدەری کەسێکی دیکە بووە. پلەو پۆستی ئەو کەسانە

گرنگ نین، گرنگ ئەوەیە یەکەمجار گۆڕانکارییەکانیان لە ناخی خۆیاندا ئەنجام داوە لەناوەوە بۆ دەرەوە. پێش هەموشت کەسایەتی و تواناو لێهاتویی و دەستپێشخەرییەکانیان. واتە دەسەڵاتە ئەخلاقییەکانیان- مایەی ئیلهامبەخشین بووە بەوانی دیکە و هەر ئەو دەسەڵاتە بەرزیکردونەتەوە بۆ ئاستە باڵاکان.

ئەم کەسە دەستپێشخەرانە متمانەیەکی پتەویان بە ئاسنامەکانی خۆیان هەبووە و توانیویانە بەهەرەو خاڵە بەهێزەکانی خۆیان بدۆزنەوەو لە خزمەتکردنی دەوروبەر و بەدەستهێنانی ئەنجامی مەزندا بەکاریان بهێنن. خەڵکەکەش زوو تێیان گەیشتون و بەرپرسیاریەتی زۆرترو گەورەتریان خستونەتە ئەستۆو ئەمانیش دووبارە ئەنجامی زیاتریان پێشکەش کردون. وردە وردە خەڵکەکە زیاتر بایەخی ئەم جۆرە کەسانەیان بۆ دەرکەوتوەو بەرپرسە باڵاکانیش هەوڵیان داوە بیرۆکەکانیان وەربگرن و لێیانەوە فێرببن.

کەلتوری ئەم جۆرە کەسانە بەم شێوەیە تێکەڵی گۆشەنیگاو تەنانەت تێکەڵی خودی بەرپرسەباڵاکان بووە.

هەمو هێزە نەرێنی و نائەخلاقی و زیانبەخشەکانی ناو دەزگاکە کۆببنەوە ناتوانن دڵی ئەوجۆرە کەسانە ساردبکەنەوەو ورەیان دابەزێنن. مایەی سەرنجێکی گەورەیە کە حاڵی دەزگاکانیان لەسەرەتادا لە حاڵی دەزگاکانی دیکە چاکتر نەبووەو وەك ئەوان پڕ بووە لە بێسەروبەرەیی. کەسە دەستپێشخەرەکانیش زانیویانە کە چاوەڕوانیکردن باش نییەو ئەمان ناتوانن دانیشن بزانن کەی سەرۆکەکەیان و دەزگاکەیان گۆڕانکاری دەست پێدەکات. واتە ئەمان لەناو دەریایەك کەسی ئاساییدا وەکو کۆمەڵە دورگەیەکی سەرکەوتو وابون و دواتر پەتاکە خەڵکی دیکەشی گرتۆتەوە. ئاخۆ سەرچاوەی ئەو هێزە ناوخۆییە چی بێت کە مرۆڤ وا لێ دەکات بە پێچەوانەی ئاراستەی روبارەکەوە مەلە بکات و خۆی بەرامبەر ئەو تەماعکارییە خۆپەرستانە سوك وچروکانە رابگرێت و روبەڕوی کەلتورە باو و خراپەکان رابوەستێت و سەرباری ئەمانەش باوەڕ و بڕیارێکی مەزن پەرەپێبدات و بیانپارێزێت؟!

نهێنی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەو کەسانە بەهەرەو سروشتی راستەقینەی خۆیانیان بۆ دەرکەوتووەو بەکاریانهێناون بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان. ئەوان حەکیمانە دەستپێشخەرییان نواندوە و بە راستیش لە پێویستییەکان و فرسەتەکانی دەوروبەری خۆیان تێگەیشتون و کاریان لەسەر ئەو بابەت و داواکاری و پێویستیانە کردوە کە لەگەڵ

تواناوبەهرەکانیانـدا دەگـونجێن و هانیـان دەدەن لـەپێناو دنیایـەکی جیـاوازدا فیـداکاری بنوێنن. بەکورتییەکەی دەتوانین بڵێین نهێنی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئـەو کەسـە هەڵکەوتوانـە دەنگـی تایبـەتی خۆیانیـان دۆزیوەتـەوە. هـەروەها جۆرە پرنسیپێکیان جێبـەجێ کـردوە کـە نەشونماکردنی مـرۆڤ و دامودەزگاکان ئاراستە دەکات، ئـەو پرنسیپانەی کە بـەرزترین و باشـترین پێکهاتـەی مرۆڤـی پێگەیشـتو (واتـە جەسـتە و ئـەقڵ و دڵ و رۆح) وا لێ دەکـات باشترین وزەو تواناو بەهرەی خۆی پێشکەش بکات. خاڵێکی دیکەش کە هێندەی خاڵەکانی پێشو گرنگە ئەوەیـە ئـەم جۆرە مرۆڤانـە بڕیاریـان داوە ببنـە مایـەی ئیلهامبەخشین بـە خەڵکانی دیکەو دەیانەوێت دەوروتەنسیرێکی وایـان هـەبێت لەسـەر خەڵکەکە کـە لـەڕێی جێبەجێکردنی ئەو سەرەتایانەوە بتوانن دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە.

چارەسەرەکە لە دوو بەش پێك هاتوە. بەشـێکیان دەڵێـت دەنگـی خـۆت بـدۆزەرەوەو بەشەکەی دیکەشیان دەڵێت ئیلهام ببەخشە بە خەڵکی دیکەش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە. ئەم چارەسەرە وەکو نەخشە ڕێگا وایە بۆ هەرکەسێك لەهەر ئاستێکی بەرپرسـیاریەتی ناو دەزگاکەدا بۆ ئەوەی هەستی رازیبوون و کارکردنە سەر ئەوانی دیکەیان تیادا چـەند بەرابەر ببێت و بتـوانن بیانکەنـە بەشداری راسـتەقینەی وا کـە دەسـتبەرداربون لێیـان مەحاڵ بێت و ئەمانیش لەڕێی خۆیانەوە دووبارە ببنە ئیلهامبەخشی تیمەکەو دەزگاکەیان.

کەواتە ئەم کتێبە لە دووبەش پێك دێت:

١. دەنگی خۆت بدۆزەرەوە.

٢. وا لەوانی دیکەش بکە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە.

ئێستاش ڕێگەم بدەن هەر بەشێك لەم بەشانە بەکورتی باس بکەم.

## دەنگی خۆت بدۆزەرەوە

شێوەی ١-٢ دوو ڕێگەی تـەواو جیـاوازی ژیـان روون دەکاتـەوە. وێنەکـە نەخشـەیەکی سادەی خووی ژمارە هەشتە. دەنگی خۆت بدۆزەرەوەو ئیلهامیش ببەخشە بـەوانی دیکـە دەنگـی خۆیـان بدۆزنـەوە، لەسـەرەتای هـەمو بەشـێکی کتێبەکـەدا هـەتاکو بەشـی چواردەهەم ئەو هێڵکارییە دەبینینەوە کە بابەتی گرنگی ئـەو بەشـەی بـە هێڵێکـی تـۆخ تێدا بەرجەستە کـراوە. بـەم شـێوەیە تـۆ پێگـەی ئێسـتای خـۆت دەبینیـت و هـەروەها دەشزانیت لەکوێ بویت و بۆ کوێ دەچیت.

> لە دالە ستانەکەدا گەیشتمە دووڕیانێک و ئەو ڕێگەیەیانم هەڵبژارد کە زۆرکەس نایگرنەبەر. ئەمە ئەو هەڵبژاردنە بو کە هەمو شتێکی گۆڕی.
>
> - ڕۆبێرت فرۆست

هەر مرۆڤێك پیر بێت یان گەنج، هەژار بێت یاخود دەوڵەمەند، ژن بێت یان پیاو لە ژیانیدا یەکێك لەم دوو ڕێگەیە هەڵدەبژێرێت. ڕێگەیەکیان ڕێگە پانەکەیە کە زۆرکەس گرتوێتییە بەرو مرۆڤ دەگەیەنێتە ژیانێکی ئاسایی. ڕێگەکەی دیکەش ڕێگەی مەزنی و ماناداربونە. شەبەنگی جیاوازییەکانی ناو ئەم دوو ئامانجە لە هەمەڕەنگیدا وەکو ئەو هەمەڕەنگییە وایە کە لە بەهرەو کەسایەتی و توانا جۆراوجۆرەکانی مرۆڤدا هەیە. بەڵام جیاوازییەکانی نێوان دوو ئامانجەکە وەکو جیاوازی نێوان تاریکی و ڕوناکیی وایە.




شێوەی ۲–۱

دیارە ئەو ڕێگەیەی دەمانگەیەنێتە ژیانی ئاسایی ڕێگەیەکە توانا مرۆییەکان سنوردار دەکات، بەڵام ڕێگاکەی مەزنی، سەربەست و ئازادیان دەکات. ژیانی ئاسایی پشت بە چاکسازیی خێرا دەبەستێت، بەڵام ڕێگەی (مەزنی) گەشەکردنێکی شێنەیییە لەناخی مرۆڤەکەوە دەست پێدەکات و پاشان رودەکاتە دەرەوە. ڕێبوارانی ڕێگاکەی خوارەوە کە دەیانگەیەنێتە ژیانێکی ئاسایی بەجۆرە کەلتورێك پرۆگرامکراون کە پشتی بە (خود) بەستووەو نوقمی چێژەکان دەبێت و ئەقڵیەتی ناوازەیی و بەراوردکاریی و پێشبڕکێی تیادا زاڵەو پێی خۆشە ڕۆڵی قوربانییەکان ببینێت. بەڵام ڕێبوارانی ڕێگاکەی سەرەوە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە مەزنی، خۆیان بەرزتر رادەگرن لەو کەلتورە نەرێنییە و کارێك دەکەن خۆیان ببنە هێزی خوڵقێنەری ژیانی خۆیان. تەنیا هەر یەك وشە دەتوانیت گوزارشت لە ڕێگای مەزنی بکات ئەویش وشەی (دەنگ)ە.

ئەوانەی بڕیاریان داوە لەسەر ئەم ڕێگایە بڕۆن ئەو کەسانەن کە دەنگی تایبەتی خۆیانیان دۆزیوەتەوەو بونەتە پێشەنگێك بۆ خەڵکی دیکەش کە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە. بەڵام ئەوانەی ڕێگاکەی دیکەیان هەڵبژاردووە هەرگیز کاری واناکەن.

## گەڕانی ڕۆح بەدوای واتادا

هەمو کەسێك لەناخی خۆیدا بەدڵ ئارەزوی ئەوە دەکات ژیانێك بژی پڕبێت لە مەزنیی! ژیانێك کە بەڕاستی بمانکاتە کەسایەتی گرنگ و گۆڕانکاریی راستەقینە لەم جیهانەدا بەدی بهێنین.

ڕەنگە گومانمان هەبێت لە خۆمان کە نەتوانین کارێکی وا بکەین، بەڵام من باوەڕێکی تەواوم هەیە کە تۆ دەتوانیت بەوشێوەیە بژیت. لەناخی خۆتدا توانای کارێکی لەوجۆرەت تێدایە. هەمومان ئەو توانایەمان هەیە. ئەمە مافێکە هەر کە لەدایك بوین و هاتینە ئەم دنیایەوە یەکسەر بەدەستی دەهێنین.

ڕۆژێکیان فەرماندەی بنکەیەکی سەربازیی سەردانی کردم کە بەڕاستی کەوتبووە ناو ململانێیەکی سەختەوە چونکە بەڵێنی دابو لەناو دەزگاکەی خۆیدا گۆڕانکاریی کەلتوریی گەورە بەرپا بکات. ئەم سەرکردەیە لەناو سوپادا ماوەی سی ساڵ خزمەتی هەبو، گەیشتبووە پلەی (کۆلۆنێل) و دەیتوانی ئەو ساڵە داوای خانەنشینی بکات. چەند مانگێك پاش ئەوەی کە دەستی دایە وانەوتنەوە و مەشق پێکردن لەناو دەزگاکەیدا، لێم

پرسی بۆچی بڕیاری دا بمێنێتەوەو ئەم دەستپێشخەرییە مەزنەی نواند! دەستپێشخەرییەك کە ناچاری کرد پێچەوانەی تەوژمەکە بکەوێتە مەلە. دژی هێزگەلێکی گەورەی نەریت و بێ متمانەیی و کەمتەرخەمی و تەمبەڵیی. پێم وت: تۆ لەجیاتی ئەم خۆماندوکردنە دەتتوانی ئیسراحەت بکەیت. موچەیەکی باشی خانەنشینی وەردەگریت و هاوڕێکان و خۆشەویستەکانت ئامادەبون ئاهەنگی فەشەنگت بۆ بگێڕن.

کۆڵۆنێلەکە ماوەیەکی درێژ بێدەنگی لێ کرد، پاشان بە جددیەوە کەوتە قسەو بڕیاری دا ئەزمونە هەرە تایبەت و ناوازەکەی خۆیم بۆ ئاشکرا بکات. پێی وتم دەمێك نیە کە باوکی مردوە. وتی: باوکم لە سەرەمەرگدا من و دایکمی بانگ کرد بۆ ماڵئاوایی. زۆر بەزەحمەت قسەی بۆ دەکرا. بە درێژایی ماوەی سەردانەکە ژنەکەی دەگریاو کۆڵۆنێلەکەی کوڕی سەری بردە نزیك باوکییەوە، ئەویش بە چرپە پێی وت: کوڕی خۆم بەوشێوەیەی کە من ژیام تۆ ئاوا مەژی. من بەرامبەر بە تۆو بە دایکت کاری باشم نەکردو گۆڕانکارییەکی راستەقینەم بەدی نەهێنا. کوڕە شیرینەکەم تکایە بەڵێنم بدەرێ کە وەکو من ناژیت.

ئەمە دوا وشەی باوکی کۆڵۆنێلەکە بو کە بە کوڕەکەی وت و پاش ماوەیەکی کەم مرد. کۆڵۆنێلەکە ئەم وشانەی وەك گرنگترین دیاری و میراتێك حساب کرد کە باوکی بۆی جێهێشتبێت. ئینجا بڕیاری دا لە هەمو رەهەندەکانی ژیانی خۆیدا گۆڕانکاریی بەرپا بکات.

دواتر کۆڵۆنێلەکە بەتایبەت هاتە لام و پێی گوتم کە پێش قسەکانی باوکی بڕیاری دابو خۆی خانەنشین بکات و بحەسێتەوە. راستییەکەی ئەوەبو کە ئەم کابرایە لە دڵی خۆیدا هیچ پێی خۆش نەبووە جێنشینەکەی هێندەی خۆی شارەزابێت و حەزیشی دەکرد هەموکەس بزانێت کە خۆی زۆر لە جێنشینەکەی چاکتر و لێهاتوترە. بەڵام کاتێك کە ئامۆژگارییەکەی باوکی گوێ لێ بو، بڕیارێکی دیکەی خستە بواری جێبەجێکردنەوە. ئەو نەك هەر بڕیاری دا ببێتە هاندەرێك گۆڕانی وا بهێنێتە ئاراوە کە بنکە سەربازییەکە لەسەر بناغەی بنەماو چەمکی مەزن ببات بەڕێوە، بەڵکو بڕیاری ئەوەشی دا جێنشینەکەی وا لێ بکات لە خۆی سەرکەوتوتر بێت. خەباتی ئەم ئەفسەرە لەپێناوی گۆڕینی بنەماکانی سەرکردایەتیکردندا بۆ کەلتورێکی دامەزراوەیی وا کە رۆبچێتە ناو تەواوی پێکهاتەو سیستەمەکانی ئەو دەزگایەو بڕیارەکانی، کارێکی وا دەکات کە کاریگەرییەکانی ئەم گۆڕانکارییە لە نەوەیەکەوە بگوازرێتەوە بۆ نەوەیەکی دیکە.

کۆلۆنێل پێی ڕاگەیاندم کە تاکو کاتی ئەزموونەکەشی لەگەڵ باوکیدا، ئەو هەر ڕێگا ئاسانەکەی هەڵبژاردبوو. هەر دەیویست وەك پارێزەرێکی نەریتەکانی ڕابردو ڕەفتار بکات و ڕێگای ژیانە ئاسانەکەی گرتبوەبەر. بەڵام پاش ئەوەی گوێی لە وەسێتەکەی باوکی بوو، بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا بڕیاری دا بە خۆی کە ژیانێکی مەزن بژی، بەشداریکردنی ڕاستەقینەو ژیانی هەڵکەوتن و ژیانی دروستکردنی گۆڕانکاریی ڕاستەقینە.

هەر یەکێك لە ئێمەش دەتوانێت هۆشمەندانە بڕیار بدات واز لە ژیانی ئاسایی بهێنێت و لەناوماڵدا و لە شوێنی کارو لەناو کۆمەڵگادا بە مەزنی بژی.

مرۆڤ لەهەر بارودۆخێکدا بێت دەتوانێت بڕیاری لەوجۆرە بدات. ئەو بڕیارە مەزنە دەگرێت بۆ ئەوەبێت ببێتە خاوەنی گیانێکی مەزن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی نەخۆشییەك کە چارەسەری نییە، یاخود گۆڕانێك دروست بکەین لە ژیانی منداڵێکدا و هەستی ئەوەی تیا بچەسپێت کە تواناکانی خۆی بناسێت و نرخی خۆی بزانێت، یاخود دەگرێت بڕیارەکە بریتی بێت لەوەی لە دەزگاکەماندا گۆڕانکارییەك بهێنینە ئاراوە، یاخود لە مەسەلەیەکی ناو کۆمەڵگادا دەستپێشخەریی بکەین. هەمومان دەتوانین بڕیار بدەین بە مەزنی بژین. دەتوانین وابکەین هەمو ڕۆژێکی ژیانمان نەك هەر باش بێت و بەس، بەڵکو ڕۆژێکی مەزن بێت. گرنگ نییە ئێستا تەمەنت چەندە. مرۆڤ لە هەمو تەمەنێکدا دەتوانێت ڕێگاکەی بگۆڕێت و لە ژیانێکی ئاساییەوە بچێتە سەر ڕێگای ژیانی مەزنەکان. واتە هێشتا بوار ماوەو دەتوانین دەنگی تایبەتی خۆمان بدۆزینەوە.

کاتێك مرۆڤ ئەو ڕێگایە هەڵدەبژێرێت (کە زۆر کەس پیایدا ناڕۆن) ئیتر مەسەلەی دۆزینەوەی دەنگی تایبەتی خۆی بریتی دەبێت لە:

١. **ناسینی دەنگی خۆی:** واتە پێویستە ئەو کەسە سروشتی ڕاستەقینەی خۆی تێبگات –من ناوم لێ ناوە سێ دیارییە مەزنەکەی کە لەگەڵ مرۆڤەکەدا لەدایك دەبن (دیارییە زگماکییەکان) (بەشی چوارەم) و بە ئەمانەتەوە هەوڵی پێشخستن و بەکارهێنانی یەك بەیەکی ئەو چوار پارچەیە بدات کە سروشتی مرۆڤەکەیان لێ پێکهاتوە.

٢. **دەربڕینی دەنگەکە:** لەڕێی بەرەودان بە بەرزترین دیاردەکانی زیرەکی مرۆڤ. ئەوانیش بریتین لە – تێڕوانین و دیسپلین و سۆز و ویژدان (بەشەی پێنجەم).

## فیلم: دۆزینەوەی کەسایەتییەک

دەمەوێت چیرۆکێکی راستەقینەی کاریگەرتان نیشان بدەم کە ئەو پرۆسەیە بەرجەستە دەکات مرۆڤ لەرێیەوە دەنگی خۆی دەدۆزێتەوە.

چەند ساڵێک لەمەوبەر دەزگاکەمان بە هاوبەشی لەگەڵ کەناڵێکی ناوخۆییدا (لۆکاڵی) فیلمێکی ڤیدیۆی پەخش کرد کە لە بریتانیا بەرهەممان هێنابو.

کەسایەتییە سەرەکییەکەی ئەو چیرۆکە سەرنجڕاکێشە پیاوێکی ئینگلیز بو کە قۆناغی منداڵیی خۆی بە هەژاری و دەربەدەری بردبووە سەر، دواتر بوبووە نوسەرێکی سەرکەوتوی خاوەن ماڵێکی خنجیلە و بەختەوەر. چیرۆکەکە باسی ئەوە دەکات کە چۆن نوسەرەکە وردە وردە هێزی دەربڕینی وشک دەکات و هیچی پێ نامێنێت و بەرەبەرە قەرزی دێتە سەرو گوشاری دەزگاکانی بڵاوکردنەوە لەسەری زیاد دەبن و رۆژ لەدوای رۆژ خەمۆکییەکەی پەرەدەستێنێت و ترسی ئەوەی لێ دەنیشێت منداڵەکانی بکەونە سەرجادە، ئەمەش جارانی منداڵیی خۆی دێتەوە یاد کە باوکی لەسەر قەرزاری خرابوە زیندانەوەو ئەمیش هەژار و بێ سەرپەرشت و دەربەدەر دەژیا.

ئەمانە بە تەواوی هیوای لێ دەبڕن و تەنانەت توانای خەوتنیشی نامێنێت و شەو تا بەیانی بە شەقامەکانی لەندەندا دەسوڕێتەوە. لەو سوڕانەوەیەدا دیمەنە دزێوەکانی هەژاری دەبینێت و ئەو بارودۆخە نامرۆڤانەیە دەکەونە بەرچاوی کە لە کارگەکاندا رووبەڕوی منداڵە کرێکارەکان دەکرێنەوە. رەنج و تەقەلای ئەو باوکانە دەبینێت کە لە پێناوی پارویەک نانی منداڵەکانیاندا دەیدەن.

ئەم واقیعە وردە لە ناخەوە دەیهەژێنێت (چاوبرسێتی و خۆپەرستی و تەماعی تەماعکاران). بیرۆکەیەک لە دڵ و مێشک و دەروونیدا سەرهەڵدەدات. هەست دەکات دەتوانێت کارێکی تایبەت ئەنجام بدات. کارێک کە ئەم واقیعە تاڵە بگۆڕێت.

دەگەڕێتەوە سەر کاری نوسینەکەی خۆی. بەڵام بە وزەو جۆش و خرۆشێکی زۆر بەهێزەوە کە هەرگیز شتی وای بە خۆیەوە نەبینیوە. هەست و سۆزی ئەم نوسەرە پاش ئەوە گڕی گرت کە زانی دەتوانێت لە پرۆسەی گۆڕانەکەدا بەشداری بکات. ئیتر نیگەرانی کێشە داراییەکانی نەبو. هەمو ئاوات و مەبەستێکی بو بەوەی چۆن چیرۆکەکەی خۆی بنوسێت و بە هەرزانترین نرخ بیگەیەنێتە دەست زۆرترین خەڵک. بەم شێوەیە ژیانی نوسەرەکە بە تەواوی گۆڕا. دەنگی تایبەتی خۆی دۆزییەوە. ئێستا

من داوات لێ دەکەم ئەو کورتە فیلمە ببینیت کە ئەزموونە سەرنجڕاکێشەکەی ئەم پیاوە نیشان دەدات. تکایە (CD)یەکە بخەرە ناو DVDیەکەی خۆتەوە و فیلمی دۆزینەوەی کەسایەتییەك هەڵبژێرەو دەست بنێ بە (پلەی)دا.

کاتێکی خۆش.

## سەرمەشق بە، با خەڵکی دیکەش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە

تۆ کاتێك کە دەنگی تایبەتی خۆت دەدۆزیتەوە، ئیتر مەسەلەی ئەوەی بازنەی دەورو تەئسیرەکانت فراوانتر بکەیت و زیاتر بەشدار ببیت، بریتی دەبێت لەوەی چۆن ئیلهام ببەخشیت بە خەڵکی دیکەش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە. ئیلهام لە ئینگلیزیدا پێی دەڵێن Inspire و ئەم وشەیەش ڕەچەڵەکەکەی لە وشەی inspirationی لاتینییەوە هاتوە بە مانای هەناسەدان. واتە ئیلهامبەخشین وەك ئەوە وایە بە (فوو) ژیان بکەیتەوە بە بەری خەڵکانی دیکەدا. ئێمە کاتێك کە دەنگی خەڵکی دیکەمان لەلا شتێکی بەڕێز دەبێت و تێدەگەین دۆزینەوەی ئەو دەنگە مەسەلەیەکی گرنگەو دواتر ڕێگای کاریگەر دادەنێین بۆیان کە بتوانن گوزارشت لەو دەنگەیان بکەن لە ڕێی هەر چوار پێکهێنەرەکانی سروشتیان کە بریتین لە جەستەو ئەقڵ و سۆزی کۆمەڵایەتی و ڕۆحی، ئیتر ئەوکاتە بلیمەتی مرۆڤ و هێزی داهێنان و بەهرەو هێزە شاراوەکانی ناخیان ئازاد دەکەین و زەمینەی ئەوە خۆش دەبێت بە جۆش‌و خرۆشەوە بەشداری بکەن لە پرۆسەکەدا.

هەر دەزگایەك کە ڕێژەی خەڵکانی ئاوا ئیلهام بەخشی بگاتە ئاستێك بتوانن گوزارشت لە دەنگی تایبەتی خۆیان بکەن و تواناکان بتەقێننەوە، مانای وایە دەزگاکە لە ئاستەکانی سەرکردایەتی و بەرهەمهێناندا قەڵەمبازێکی گەورە دەدات و لە بازاڕ و لە کۆمەڵگادا دەستپێشخەریی گەورە دەنوێنێت.

بەشی دووەمی کتێبی هەشتەمین خوو لە فەسڵی شەشەمەوە دەست پێدەکات. باسی ئیلهام بەخشین دەکات بە خەڵکانی دیکە بۆ ئەوەی دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە. ئاشکرایە لە جیهانی ئەمڕۆدا زۆربەی کارەکان لە دەزگاکاندا تەواو دەکرێن، لەبەر ئەوە بەشی دووەمی کتێبەکە باسی ئەو بنەمایانە دەکات کە جێبەجێکردنیان بە شێوەیەکی ئەرێنی کاردەکاتە سەر کەسانی دیکەی ناو دەزگاکە (کار، پەروەردە، حکومەت، سوپا، کۆمەڵگاو تەنانەت خێزانیش)

لە خوێندنـەوەی پارچـە جیاجیاکانی ئـەو بەشـەدا رەنگـە پرسیاری لـەوجۆرە بـە خەیاڵدا بێت کە بڵێت (بـەڵێ .. بـەڵام). ئێمـە بـۆ یارمەتیدانی تـۆ لـەم مەسـەلەیەدا لە کۆتایی هەر فەسڵێکدا هەندێک لەو پرسیارانەمان بۆ داناوەن کە باون. وەڵامـەکان وەڵامی منن .. هیوادارم سودیان لێ ببینیت، بەڵام ئەگەر هەستت کرد هیچ سەرنجت راناکێشن، بەلاتەوە ئاسایی بێت وبیانپەڕێنە. بەشی کۆتایی کتێبەکە فەسـڵێکی تـەرخان کـراوە بـۆ هەندێک پرسیارو وەڵامی گشتیی و تێکڕایی.

## چۆن زۆرترین سود لەم کتێبە دەبینین؟

## فێربون لە رێی فێرکردن و جێبەجێکردنەوە

ئەگەر دەتەوێت زۆرترین سود لەم کتێبە ببینیت و گۆڕان و گەشەیەکی بەرچاو لە ژیانی خۆت و لەو دەزگاکەتدا دروست بکەیت کە کاری تێدا دەکەیت، تکایـە ئـەم دوو کـارە ئەنجام بدە. ئەگەر ئەم دوو کارە ئەنجام بدەیت گەرەنتی ئەوەت دەدەمێ کە ئەنجامی چاك بەدەست بهێنیت. یەکەم: ئەوەی کە خۆت فێری بویت فێری خەڵکیشی بکەیت و مەسەلەی دووەمیش: ئەوەی فێری بویت بە شێوەیەکی مەنهەجی جێبەجێی بکەیت.

## خەڵکی دیکەش فێر بکەو بەردەوام لەگەڵ خۆتدا بەشدارییان پێبکە

هەمومان دەزانین کەسێك کـە زانیارییەکـەی فێـری کەسـێکی دیکـە دەکات، خۆیشی باشتر فێری دەبێت. هەروەها ئەگەر زانیاریەکەت لە ژیانی رۆژانەی خۆتدا بەکاربهێنیت دەبێتە بەشێك لە خودی خۆت.

چەند ساڵێك لەمەوبەر، کاتێك لە زانکۆدا وانەم دەگوتـەوە، چاوم بـە مامۆسـتایەکی میوان کەوت لە (سان جوی)ەوە هاتبو لە کالیفۆرنیا. ناوی دکتۆر (واڵتەر کۆنگ) بو.

دکتۆر واڵتەر بە درێژایی وەرزی خوێندنەکەی ئەو ساڵە بەرنامەیـەکی بـە مامۆسـتایانی زانکۆکە دەگوتەوە لەژێر ناونیشانی (چۆنێتی چاککردنی توانـای دەرسگوتنەوە). بەرنامەکـە پشتی بە راستییەکی زانستی بەستبو کە دەڵێت: باشـترین رێگـەی فێربـون ئەوەیـە کەسـەکە بکەیتە مامۆستا. واتە: تۆ ئەگەر بابەتەکە بە خەڵکی دیکە بڵێیتەوە باشتر تێی دەگەیت.

من دەستبەجێ لە ماڵەوە و لە پیشەکەمدا ئەم بنەمایەم جێبەجێ کرد. پێویستە بڵێم کە کاتێك لە زانکۆدا دەستم کرد بە وانەگوتنەوە ژمارەی خوێندکارانی هەر پۆلێك ١٥—٢٠

خوێندکار بو، بەڵام کە پرنسیپەکەی دکتۆر کۆنگم دەست پێکرد بۆم دەرکەوت دەتوانم بە شێوەیەکی باشتر و کاریگەرتر وانەکە بە خوێندکاری زیاتر بڵێمەوە .. لەڕاستیدا ژمارەی خوێندکاری هەندێك پۆلی من گەیشتە نزیکەی هەزار خوێندکار کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئاستی خوێندکارەکان و نمرەی تاقیکردنەوەکانیان لەچاو جاراندا بەرزتر دەبووەوە.

ئەمە بۆچی؟ وەڵامەکەی زۆر بە سادەیی ئەوەیە تۆ کاتێك بابەتێك بۆ کەسێك روون دەکەیتەوە خۆیشت باشتری تێدەگەیت. هەمو خوێندکارێك دەبێتە مامۆستاو هەمو مامۆستایەکیش دەبێتە خوێندکار.

بۆچوونە باوەکە ئەوەیە کە دەڵێت رێژەی مامۆستاکان بۆ خوێندکاران زۆر گرنگە. واتە هەتا ژمارەی خوێندکار کەم بێت ئاستی فێرکردنەکە چاکتر دەبێت. بەڵام تۆ ئەگەر خوێندکارەکانت کرد بە مامۆستا مانای وایە تۆ بە دەستکاریکردنی خاڵی هاوسەنگییەکە توانیوتە هێزی بەرزکردنەوە (توان) چەند بەرامبەری جاران بکەیت. هەروەها کاتێکیش کە خەڵکی فێر دەکەیت یاخود زانیارییەکانی خۆتیان دەخەیتە بەردەست مانای وایە تۆ بێ ئەوەی بە خۆت بزانیت و بە شێوەیەکی نهێنی لە روی کۆمەڵایەتییەوە پابەند دەبێت بەوەی لەگەڵ ئەو زانستەدا بژیت، ئیتر خۆڕسکانە لە جاران زیاتر ئەو کارە دەکەیت. ئەم بەشداریکردنەش فێربون و پاڵنەر و پابەندبونەکان قوڵ دەکات و شەرعییەت دەبەخشێت بە مەسەلەی گۆڕان و هەروەها پشتگیری ئێمەش بۆ ئەو گۆڕانە مسۆگەر دەکات. هەروەها دەشبینیت کە بەشداریکردنەکە پەیوەندیت لەگەڵ خەڵکیدا پتەوتر دەکات، بەتایبەت لەگەڵ منداڵەکانی خۆتدا. هەمیشە داوا لە منداڵەکانت بکە ئەوەی لە خوێندنگادا فێری بون فێری تۆشی بکەن. من و (ساندرا)ی خێزانم بە ئەزمون بۆمان دەرکەوت کە جێبەجێکردنی ئەم کارە سادەیە هێندە کاریگەرە ئیتر پێویستت بە هیچ هاندەرێك نابێت پاڵ بە منداڵەکانتەوە بنێی سەعی بکەن. ئەوانەی کە زانیارییەکانی خۆیان فێری خەڵکی دیکە دەکەن لەڕاستیدا مەزنترین خوێندکارن.

## تکایە ئەوەی کە فێری بویت بیکەرە بەشێك لە ژیانت

بۆ نمونە تۆ دەتوانیت بە خوێندنەوەی کتێبی تایبەت و گوێگرتن لە موحازەرەی خەڵکی شارەزا، یاری تێنس بخوێنیت، بەڵام هەتاکو بە کردەوە خۆت یارییەکە نەکەیت فێری نابیت. زانیاری بەبێ کردەوە وەك ئەوە وایە هیچی لێ نەزانێت.

"باشترین ڕێگەی خۆناسین ئەوەیە کارەکە ئەنجام بدەیت. بیر لێ کردنەوە بە تەنیا هیچ نییە. هەمو تواناکانت بخەرە گەڕ بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکانت و زۆری پێناچێت خودی خۆتت بۆ دەردەکەوێت."

- یۆهان گۆتە

بۆ جێبەجێکردنی ئەو زانیارییانەی کە لەم کتێبەدا فێریان دەبیت چوار ڕێگا هەیە کە بریتین لە:

١. ڕێگای یەکەم: مەبەست لەم ڕێگایە بە ئاسانی ئەوەیە کە کتێبەکە هەموی بخوێنیتەوە پاشان بڕیار بدەیت چی لە ژیان و کاری خۆتدا جێبەجێ دەکەیت. زۆربەی خەڵك بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ کتێبەکەدا دەکەن و ڕەنگدانەوەی ئەوەیە کەسەکە تا چەند پێویستی بە دەمەزەردکردنەوەی هەست و بۆچونی خۆی هەیە لەڕێی زانیارییە زۆرەکانی ناو کتێبەکەوە.

٢. ڕێگای دووەم: بریتییە لەوەی جارێك کتێبەکە بخوێنیتەوە، پاشان پاڵنەرەکان و تێگەیشتنەکانی کە لە ناخی خۆتدا کەڵەکە بون، بەکاربهێنیت بۆ خوێندنەوەی دووبارەی کتێبەکە. بەڵام ئەمجارەیان بە نیازی جێبەجێکردنی ئەو شتەی کە دەیخوێنیتەوە. ئەم ڕێگایە زۆر کەس پەسەندی دەکات.

٣. ڕێگای سێیەم: کە خۆم باوەڕم وایە باشترین ئەنجامی لێ دەکەوێتەوە — بریتییە لەوەی کتێبەکە بکەیتە بەرنامەی یەك ساڵی خۆت بۆ گەشەکردن و پێشخستنی خودی خۆت. هەر بەشێك لە دوانزە بەشەکەی کە ماونەتەوە مانگێکی بۆ تەرخان بکە. دەست بە خوێندنەوەی بەشی داهاتو بکە تا کۆتایی ئەم مانگە بابەتەکە بە خەڵکی دیکەش بڵێ و بۆیان ڕوون بکەرەوە. ئەگەر بەڕاستی بڕیار بدەیت بەش بەش کتێبەکە بخوێنیتەوە و هەر بەشێکیش مانگێکی بۆ تەرخان بکەیت بۆ خوێندنەوەو شەرح کردنی، دڵنیابە لە بەشەکانی داهاتودا هەست بە بەرچاوڕوونییەکی زۆر دەکەیت.

٤. ڕێگای چوارەم: هەر هەمان پەیڕەوکردنی ڕێگای سێیەمە بەڵام نەك لە ماوەی ساڵێکدا، بەڵکو ماوەکە خۆت دیاری دەکەیت. خوێنەری وا هەیە حەز دەکات ئەم بەشە مانگێك زیاتری بۆ تەرخان بکات و بەشەکەی دیکە مانگێك کەمتر.

خۆت بڕیار بدە هەر بەشەو چەند کاتی بۆ تەرخان دەکەیت. مەرجیش نییە ماوەکان چون یەك بن. ئەم ڕێگەیە لەسەرێکەوە هێز و کاریگەریی ڕێگەی سێیەم دەپارێزێت و لە سەرێکی دیکەشەوە دەستکراوەت دەکات لەوەی چۆن وای لێ بکەیت لەگەڵ بارودۆخی تایبەتی خۆت و ئارەزووەکانتدا بیگونجێنیت. من لە پێناوی یارمەتیدانی تۆدا لە مەسەلەی جێبەجێکردنی بنەماکانی ناوکتێبەکەدا پێگەیەکی تایبەتم لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دروست کردوە، پڕە لە ڕاهێنان و کەرەسەو ئامرازی جێبەجێکردن و گرنگ نییە، کام ڕێگایەت لە بەکارهێنانی کتێبەکەدا گرتۆتە بەر. سەردانی پێگەی ئەلکترۆنی www.The 8habit.com کارێکی ئاسانەو دەتوانیت داوای پرسیار و کەرەسە و ئامرازەکان بکەیت بە ئیمەیل پێت دەگەن. هەروەها دوو لاپەڕەی کۆتایی کتێبەکەم تەرخان کردوە بۆ خشتەیەکی تایبەت کە ئامانج لێی تەواوکردنی ئەو بابەتەیە کە ناوم لێ ناوە (تەحەدا کردنی خووی هەشتەم). تەحەداکەت لەچەند هەنگاوێك پێکهاتون و پێویستە بۆ هەر بەشێك:

١. بەشەکە بخوێنیتەوە
٢. لانی کەم دوو کەس لە هاوڕێکانت یاخود لە ئەندامانی خێزانەکەت یاخود لە هاوکارەکانت فێری بابەتەکە بکە
٣. هەوڵ بدە لە ماوەی مانگێکدا بە شێوەیەکی کورتکراوەو بە خەستی لەگەڵ بنەماکانی ناو ئەو بەشەدا بژیت.
٤. ئەنجامی خاڵەکانی سەرەوە لای خۆت تۆمار بکەو نیشانی کەسێکی متمانەپێکراوی بدە (هاوڕێ و کەس‌وکار، هاوکار)

ئێستاش کە دەگەیتە بەشی یەکەم؛ دەنگی خۆت بدۆزەرەوە، قسەکانی (ئەبراهەم لینکۆلن)ت بیر بێت کە دەڵێت:

(بیروباوەڕەکانی دوێنێی هێمن بەکەڵکی ڕووبەڕووبونەوەی ئەمڕۆی پڕ لە زریان نایەت. پێویستە بە شێوازێکی نوێ بیربکەیتەوە. تەنیا ئەوە بەس نییە کە سیستمێکی تازەی بیرکردنەوە دابمەزرێنیت، بەڵکو پێویستیشە سیستمێك بۆ کۆمەڵە شارەزاییەکی تازەو سیستمێك بۆ کۆمەڵە کەرەسەیەکی تازە گەشە پێ بدەین کە لە سیستمی بیرکردنەوە تازەکەوە هەڵقوڵابێت.

گەوهەری ململانێ تازەکە تەنیا بریتی نییە لەوەی پارێزگاریی لە خۆت بکەیت، بەڵکو پێویستە لە واقیعە تازەکەدا بە شێوەیەکی راستەقینەش گەشە بکەیت.

ئەم ململانێیە پێویستی بە کاردانەوەیەکی نوێیە، بە خوویەکی نوێ.

بیرت نەچێت (خوو) بریتییە لە پانتایی بەریەککەوتنی زانست و هەڵوێست و لێهاتوویی. کاتێك مرۆڤ گەشە بەو سێ رەهەندە دەدات کە پەیوەستن بە هەشتەمین خووەوە، راستەوخۆ توانای خۆی زیاد دەکات لە مەسەلەی روبەڕوبونەوەی ململانێ تازەکەو سود وەرگرتن لەو گشت بوار و هەلە بێ سنورانەی کە هاتونەتە ئاراوە.




وێنەی ٣—٢

## بەشی چوارەم

## دەنگی خۆت بدۆزەرەوە –
## نیعمەتە زگماکییە دەست لێ نەدراوەکان




شێوەی ٤–١

توانـای دۆزینـەوەی دەنگـی شـاردراوەی نـاخی خۆمـان. توانایەکـە هـەر لەسـاتی لەدایکبونمانــەوە لەناخمانـدایـە. تــۆوی مــەزنی بــە گەشــەنەکردویی لــە ســاتی لەدایکبونمانەوە لە ناخماندا چێنراوە و بریتین لە (نیعمەتی) بەهرەو تواناو زیرەکـی و خەسـڵەت و ڕێکەوتـەکان (هـەل‌و فرسـەتەکان). بـەڵام ڕەنگـە ئـەم دیارییانـە هـەر بـە داخـراوی بمێننـەوە ئەگـەر ئێمـە بڕیـاری کردنـەوەیان نـەدەین و خۆمانیـان بـۆ مانـدو

نەکەین. لەڕاستیدا ئێمە بە وردیی نازانین تواناو بەهرەکانی هیچ کەسێک بریتین لەچی. ئەو منالە شیرەخۆرەی کە ئێستا لاوازترین دروستکراوی ناو گەردونە، ڕەنگە پاش چەند ساڵێکی دیکە ببێتە مەزنترین مرۆڤ. مرۆڤ چەندێک سەرگەرمی بەکارهێنان و بەهێزکردنی بەهرەکانی ئێستای بێت تواناو بەهرەکانی زیاتر دەبن.

> "گشت منالێک کە لەدایک دەبێت بلیمەتە. لەکۆی ١٠٠٠٠ منالْ ٩٩٩٩ منالْ بەخێرایی و بەبێ مەبەست لەکاتی گەورەبونیاندا ئەو بلیمەتییەیان لێ دادەماڵرێت."
>
> - بوکمینستەر فۆلەر

با ئێستا پێکەوە لەو سێ دیارییە (نیعمەتە) بنواڕین کە گرنگترینن (شێوەی ٤-٢)

یەکەم، ئازادی و توانای هەڵبژاردن.

دووەم، یاسا سروشتییەکان یاخود بنەما نەگۆڕەکانی گەردون.

سێیەم، چوار توانا/ زیرەکییەکانمان، جەستەیی/ ئابوری، سۆزداریی/ کۆمەڵایەتی، ئەقڵی، ڕۆحی. ئەو چوار زیرەکییە بەرامبەرچوار پێکهێنەرەکەی سروشتی مرۆڤ وەستاون کە سیمبولەکانیان بریتین لە جەستەو دڵو ئەقڵ و ڕۆح.

| دیارییە بەنرخە نەکراوەکان کە لەگەڵماندا لەدایک دەبن |
|---|
| ▪ ئازادی و توانای هەڵبژاردن |
| ▪ پرنسیپەکان (یاسا سروشتییەکان)<br>▪ گەردونین (لە هەمو شوێنێک کاردەکەن)<br>▪ هەمیشەیین (هەمو کاتێک کاردەکەن)<br>▪ بەڵگە نەویستن (پێویست ناکات بیانسەلمێنێت) |
| ▪ تواناکان و چوار زیرەکییەکە<br>IQ زیرەکی ئەقڵی — EQ زیرەکی سۆزداریی/ کۆمەڵایەتی<br>PQ زیرەکی جەستەیی (فیزیکی)/ ئابوریی — SQ زیرەکی ڕۆحی |

شێوەی ٤—٢

(ماریانا ویلیامسۆن Marianne Wiliamson)ی نوسەر بە شێوازێکی جوان گوزارشت لەوە دەکات کە چۆن ئێمە زۆرجار هەست بە سام و هەندێك جار بە ترس دەکەین لەو بەهرە خۆڕسکانەی کە لەناخماندا چێنراون. من پێم وایە ترسەکەمان لەوەوەیە کە هەست بە لێپرسراوێتی دەکەین و لەو لێپرسراوێتییە دەترسین کە بەهرەکان دەیانخەنە سەرشانمان. "قوڵترین ترسی ناوناخی ئێمە ترس لەوەنییە کە بێتواناو بێ دەسەڵاتین، بەڵکو ئێمە لەو هێزە بێسنورە دەترسین کە هەمانە. منی مرۆڤ بەچیمەوە بلیمەت و بەهرەدار و سەرنجراکێش و بەتوانابم" لەڕاستیدا پێویستە پرسیارەکە پێچەوانە بکەینەوەو بڵێین ئێمەی مرۆڤ لە چیمان کەمە کە نەتوانین بلیمەت و بەهرەدارو سەرنجراکێش و بەتوانابین. تۆی مرۆڤ ئەو دروستکراوەی کە خودا ڕێزی لێ گرتووە. نارەزووە بچوکەکانت خزمەتی مرۆڤایەتی ناکەن. تۆ بۆ ئەوە دروست نەبویت کە خودی خۆت بەجۆرێك بچوك بکەیتەوە ببیتە مایەی نیگەرانی بۆ دەوروبەرت. خوداوەند ئێمەی بۆ ئەوە دروستکردوە جیهان بڕبکەین لە روناکی. ئێمە هاتوینەتە دنیاوە بۆ ئەوەی گوزارشت لەو ڕێزە بگرین کە خوداوەند لێی گرتوین. ڕێزەکەی خوداوەند تەنیا بۆ بەشێکمان نییە، بەڵکو بۆ هەمومانە. بۆ یەك بەیەکی مرۆڤەکانە. ئێمە کاتێك ڕێگە بە روناکیەکەی ناخی خۆمان دەدەین دەربەڕێت، بە کردەوە هانی خەڵکی دیکەش دەدەین هەمان کار بکەن. کاتێك ئێمە بەسەر ترس‌و نیگەرانییەکانماندا زاڵ دەبین ئەوا بەشێوەیەکی خودکار (ئۆتۆماتیکی) خەڵکانی دیکەش لە ترس‌و نیگەرانی رزگار دەکرێن.

## یەکەمین بەخشش (نیعمەت): ئازادیی هەڵبژاردن

ماوەی نیوسەدەیە من سەرقاڵی کارکردنم لەسەر بابەتی ئەم کتێبەو لە ژینگەی جیاجیای ئەم دنیایەدا. ئەگەر لێم بپرسیت چ بابەت وبیرۆکەو واتایەك گەورەترین کاریگەریی هەیە لەسەر مرۆڤ؟ یاخود ئەوبیرۆکە مەزنە چییە کە زایەڵەکەی لە قوڵایی رۆحی مرۆڤدا لە زایەڵەی تێکرای بیرۆکەکانی دیکە مەزنترە؟ ئەگەر لێم بپرسیت بڵێیت لە هەمو ئاروەزوخێکدا گرنگترین و گونجاوترین و کردنیترین بیرۆکە چییە؟ خێراو بێ هیچ ئەملاولاو دودڵییەك و بە قەناعەتێکی تەواوەوە وەڵامت دەدەمەوە دەڵێم بیرۆکەی ئەوەی کە ئێمە ئازادین لەوەی چی هەڵدەبژێرین. ژیان گرنگترین شتە. لەوە بگەڕێتەوە یەکسەر ئەم ئازادی هەڵبژاردنە گرنگترین نیعمەتی دیاری تۆیە. ئەم

توانـاو سەربەستییە رێك پێچەوانەی ئـەو سیستمی بیرکردنەوەیـە راوەستاوە کە لـە کۆمەڵگاکانی ئەمڕۆدا باوەو پشتی بەوە بەستوە گلەییەکان بخاتە ئەستۆی ئەوانی دیکەو خۆی وەك قوربانییەك نیشان بدات.

ئێمەی مرۆڤ بەشێوەیەکی سەرەکیی بەرهەمی هەڵبژاردنەکان نین (بڕیارەکان) نەك هی سروشت و (هۆکارەکانی بۆمـاوەیی) نـەك هـی چۆنێتی پـەروەردەکردنمان (ژینگـە). گومـانی تێـدا نـییـە کـە هۆکارە بۆماوەییـەکان و کـەلتور کاریگـەریی بـەهێزیان هەیـە لەسەرمان بەڵام تا ئەندازەیەك نا کە چارەنوسمان دیاری بکەن.

> مێژوی مرۆڤە ئازادەکان هەرگیز بەرێکەوت نەنوسراوە
> بەڵکو خۆیان هەڵیانبژاردوە.
>
> - دواین ئایزنهاوەر

گەوهەری سروشتی مرۆڤ لەوەدایـە کـە بتوانێـت خـۆی ژیـانی خـۆی ئاڕاسـتە بکـات. مرۆڤ خۆی رەفتاری خۆی هەڵدەبژێریت بەڵام ئاژەڵ و رۆبۆت توانای هەڵبژاردنیان نـیـە و تەنیا کاردانەوەیان هەیە. مرۆڤ بەپێی بنەمامەکانی خۆی بڕیارەکان هەڵدەبژێرێت.

توانای هەڵبژاردنی ئاڕاستەی ژیانـت بـواری ئـەوەت دەداتـێ خـۆت دروسـت بکەیتـەوەو ئاینـدەت بگۆڕیـت و کاریگەرییـەکی گـەورە لەسـەر دەوروبەرەکـەت جێبهێڵێـت. ئـەم توانایـە دیارییەکە یارمەتیمان دەدات هەمو دیارییەکانی دیکە بەکاربهێنین. ئەو دیارییە مەزنەیە کە وامان لێدەکات هەمیشە لە ژیاندا بەرزببینەوەو لە لوتکەیەکەوە بڕۆینە لوتکەیەکی بڵندتر.

بەدرێژایی ئەو ساڵانەی کە قسەم بۆ گروپی جیاجیا کـردووە خـەڵك هاتونەتـە لامەو بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پێیان وتوم تکایە زیاتر قسەمام بۆ بکە دەربـارەی ئازادییـەکانی خۆم و دەربارەی تواناکانی هەڵبژاردن. هاتووە پێی وتـوم تکایـە دیسانەوە باسـی نـرخ و بایەخی خۆمم بۆبکەو باسی ئەو توانایانەم بۆ بکە کە وام لێ دەکەن چیتر خۆم بە هیچ کەسـێك بـەراورد نەکـەم. زۆربـەیان پێیـان وتـوم ئـەوەی کـە رۆحـی خرۆشـاندوە ئـەو هەستکردنە بەتامەیە لەناخەوە کە ئازادی بڕیارو هەڵبژاردنـەکان بەدەسـت خۆیانـە. هەستەکە هێندە دڵخۆشکەرو بەتام بووە کە نەیانتوانیوە وەکو پێویست ماوەیـەکی بـاش بەقوڵی بیری لێ بکەنەوە.

توانای هەڵبژاردن مانای وایە کە ئێمە تەنیا هەر دەرەنجامی هۆکارە بۆماوەییەکان و رابردومان نین. هەروەها دەرەنجامی ئەو شێوازەش نین کە خەڵکی مامەڵەمان لەگەڵدا دەکەن. بێگومان دەوروبەر کارمان تێدەکەن بەڵام چارەنوسمان دیاری ناکەن. ئێمە خۆمان لەڕێگەی هەڵبژاردنەکانمانەوە، چارەنوسی خۆمان دیاری دەکەین. ئێمە وازمان لە ئێستامان هێناوە بۆ رابردومان، بەڵام ئایا ناچارین واز لە ئایندەشمان بهێنین.

یەکێك لەو ئەزمونە قوڵانەی کە ژیانمی بەشێوەیەکی راستەقینە گۆڕی و رۆڵێکی بنەڕەتی گێڕا لە دروستکردنی ئەو چەمکانە کە هانیان دام حەوت خووەکە بنوسم، لە (هاوایی) رویدا. من بۆ بەسەربردنی مۆڵەت چوبومە ئەوێ و بە رێکەوت رۆژێکیان لەسەر رەفەی کتێبخانەیەکی ئەوێ کتێبێکم تەماشا کرد. ئەوساتەوەختە من لە حاڵەتی بیرکردنەوەو قوڵبونەوەدا بوم و سێ رستەی ناو ئەو کتێبە لە ناخەوە هەژاندمی:

لەنێوان هەر کارلێکەرێک و کاردانەوەکەیدا پانتاییەک هەیە. ئازادی ئێمە و توانای هەڵبژاردنی جۆری کاردانەوەکەمان لەو پانتاییەدایە.

گەشەکردن و بەختەوەریشمان لەدوتوێی هەڵبژاردنەکانماندان.




من پێشتر بە لێکدانەوەی خۆم و لەڕێی سەرچاوەکانەوە دەمزانی کە ئێمەی مرۆڤ سەربەستین بە چ شێوەیەك وەڵامی روداوەکان دەدەینەوە. بەڵام رێك لەو رۆژەداو لەژێر کاریگەریی ئەوبارە مەزاجی و فیکرییەداو لەو حەسانەوە رۆحییەدا مەسەلەی پانتایی نێوان روداوەکان و کاردانەوەکانمان توشی شۆکی کردم. وەك ئەوە وابو یەك تەن خشتم بەسەردا رۆبکەن. لەوکاتەوە بۆم دەرکەوتوە باوەڕی تەواوم وایە کە گەورەیی و بچوکیی پانتاییەکە پەیوەندیەکی مەزنی بە سێ بابەتەوە هەیە. یەکێکیان کارلێکەرەکانە واتە سروشتی تایبەتی کەسەکەیە، دووهەمین بابەت ئەو شێوازەیە کە پێی پەروەردە کراوین، سێیەمین بابەتیش بارودۆخە هەنوکەییەکەیە.

لای ئەو کەسانەی لە ژینگەیەکی ئازادو پڕخۆشەویستی و پشتگیریی بێ قەیدو شەرتدا ژیاون پانتاییەکە پانتاییەکی گەورە دەبێت و لای کەسانی دیکەش زۆر بچوک و تەنگەبەر دەبێت لەئەنجامی هۆکارە بۆماوەیی و ژینگەییە جیاوازەکاندا. ئەمە زۆر گرنگ نییە. بیرۆکە بنەڕەتییەکە ئەوەیە کە ئەم پانتاییە راستەو هەیەو لەڕێگای بەکارهێنانیشیەوە رەنگە بتوانین فراوانی بکەین. هەندێك لەو کەسانەی کە خاوەنی پانتاییەکی زۆر گەورەن لەکاتی روبەڕوبونەوەی بارودۆخە سەختەکاندا رەنگە هەرەس هێنان هەڵبژێرن و بەمەش ماوەی نێوان کارلێکەرەکەو کاردانەوەکە بچوک دەکەنەوە. هەندێکی دیکەش لەوانەی کە خاوەنی پانتاییەکی بچوکن رەنگە بە پێچەوانەی رەوتەکەوە بکەونە مەلەو روبەروی کارلێکەرە بۆماوەیی و کۆمەڵایەتی و کەلتورییە بەهێزەکان بوەستن. ئەمانە مەودای ئازادییەکەیان فراوانتر دەبێت و بەخێرایی گەشە دەکەن و لەناخەوە هەست بە کامەرانی دەکەن.

نمونەی ئەو کەسانەی کە لەحاڵەتی یەکەمدا باسمان کردن زۆربەی ئەو دیارییە بەنرخانە هەڵناپچڕن کە لەگەڵیاندا هاتونەتە دنیاوە و وردە وردە ئەرکەکەیان لەم ژیانەدا پەیوەست دەبێت بە بارودۆخەکەیانەوە نەك بە تواناو بەهرەکانیانەوە. بەڵام کەسانی نمونەی دووەم هەوڵێکی مەزن و نەگۆڕ دەدەن و ئەو دیارییە مەزنە دەکەنەوە کە بریتییە لە ئازادیی هەڵبژاردن و ئەو هێزە گەورەیە دەدۆزنەوە کە هەمو بەخشش و نیعمەتەکانیان بۆ دەکاتەوە کە لەگەڵ لەدایکبونیاندا پێیان بەخشراوە.

دەرونناسی یاخیبوی بەناوبانگ ئار. دی. لاینگ بەم وشانە بۆمان باس دەکات کە چۆن شکستهێنان لە تێبینیکردنی ئەو پانتاییەدا توانای ئەوەمان تیادا لەناو دەبات کە گۆڕانکاری لە خۆماندا بەدیبهێنین. تەنیا مرۆڤ دەتوانێت لە خودی خۆی تێبگات. ئەم بڕگەیەی خوارەوە بخوێنەرەوە، ئینجا بیری لێ بکەرەوەو پاشان سەرلەنوێ بیخوێنەرەوە.

> لەوەی کە توانای ئیش و بیرکردنەوەمان سنوردار دەکات شکستهێنانە لە تێبینیکردندا. جا لەبەرئەوەی ئێمە هەمیشە لە تێبینیکردنی ئەو شکستهێنانەدا شکست دەهێنین، ناتوانین گۆڕانکاریی لە ناخی خۆماندا دروست بکەین مەگەر تەنیا تێبینی ئەوەبکەین کە چۆن شکست دەهێنین لە تێبینیکردنی کردەوەو بیرکردنەوەکانماندا.

مرۆڤ کە هەستی کرد بڕیاری هەڵبژاردنی شتەکان لەدەستی خۆیدایە ئیتر نیگەرانی و بێقەراریی تێدا دروست نابێت چونکە ئیتر هەست بەو تواناو ئەگەرو دەرفەتانە دەکات کە خراونەتە بەردەمی. بەڵام ڕەنگە هەستکردن بە ترسی تێدا دروست ببێت وبگرە ژەندەقیشی بچێت لەبەرئەوەی هەست بە لێپرسینەوە دەکات و دەزانێت تەنیا خۆی بەرپرسیاری حاڵو وەزعی خۆیەتی. لە ساڵانی ڕابردوودا کە ئەم ڕاستیەمان نەدەزانی، بەئاسانی دەمانـ... کێشەو گیروگرفتەکانمان بخەینە ئەستۆی بارودۆخی ئێستاو ڕابردومان، بەڵام ... ەوە بە شێوازێکی دیکە مەسەلەیەکی تۆقێنەرە چونکە ئیتر هیچ بروبیانویەکمان بەدەستەوە نامێنێت شکستو کەموکوڕیەکانی خۆمانی بخەینە ئەستۆ.

ڕوداوەکانی ئایندەو ئێستاو ڕابردو، بە هەموجیاوازییەکانیانەوە لەوخاڵەدا هاوبەشن کە هەمیشە لەنێوان ڕوداوەکەو کاردانەوەدا پانتاییەك هەیە .. پانتاییەکە ئەگەر لە چرکەیەکیش کەمتر بێت هێشتا هەر گرنگە، چونکە بڕی ئەو توانایە دەردەخات کە ئێمە لە هەڵبژاردنی جۆری کاردانەوەکەماندا هەمانە. بێگومان هەندێك بابەت و ڕوداو هەن کە هیچ بڕیارێکی ئێمەی تێدا نەبوە. بۆ نمونە پێکهاتە بۆماوەییەکانمان. هیچ کەسێك لەئێمە خۆی دەستی نەبوە لە هەڵبژاردنی پێکهاتە بۆماوەییەکانیدا بەڵام دەتوانێت لەشێوازی کاردانەوەیدا بەرامبەر بەو پێکهێنەرانە ڕۆڵی هەبێت. مرۆڤ ئەگەر لەڕوی بۆماوەییەوە ئامادەیی توشبونی نەخۆشیێکی دیاریکراوی تێدابێت ئەمە مانای وانییە کە ١٠٠٪ نەخۆشییەکە دەگرێت. تۆ ئەگەر خۆت بناسیت و خاوەنی ویستێکی بەهێزبیت لە پەیڕەوکردنی سیستمێکی گونجاوی ڕاهێنان و خواردن و ئامۆژگارییە پزیشکییەکاندا، دەتوانیت خۆت لە زۆربەی ئەو نەخۆشییانە بپارێزیت کە کۆتاییان بە ژیانی باووباپیرانت هێناوە. من ئەو کەسە ناودەنێم (کەسی وەرچەرخێن) کە بتوانێت تواناکانی ناخی خۆی و ئازادیی هەڵبژاردنەکانی برەو پێبدات. کەسی وەرچەرخێن کەسێکە پرۆسەی گواستنەوەی خەسڵەتە خراپەکانی نەوەی پێشو بۆ نەوەکانی ئاینده ڕادەگرێت.

دەزگای دەستپێشخەریی نیشتمانی بۆ باوکایەتی بەم دواییە خەڵاتی باوکی نمونەیی پێبەخشیم و قسەی یەکێك لەو هاوکارانە زۆرکاری تێکردم کە (ئەویش خەڵاتەکەی پێ بەخشرا) لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتەکەدا کردی. ئەو هاوکارەم وتی لەناو تێکڕای ئەو خەڵات و ڕێزلێنانەی کە لە ژیانمدا پێم بەخشراون، ئەم خەڵاتە باوکایەتییە

گرنگترینیانەو لە گشتیان زیاتر هەستی شانازیی تێدا دروست کردوم. ئەو گوتی کە خەڵاتەکانی دیکە نیشانەی سەرکەوتنم بون لە پیشەکەمدا، بەڵام ئەم خەڵاتی باوکایەتییە مەزنترین بەڵگەی سەرکەوتنە بەرەهایی. لە برگەیەکی قسەکانیدا وتی: من باوکی خۆم نەناسیوەو باوکیشم باپیرمی نەناسیوە، بەڵام کوڕەکەم باوکی دەناسێت. بەڕاستی ئەم برگەیە گوزارشت لە مەزنترین و سەرنجڕاکێشترین سەرکەوتن دەکات لە ژیانی مرۆڤدا. گرنگتر لەوەش ئەوەیە کە ئە[illegible] مرۆڤێکی وەرچەرخێن دەوروتەنسیرێکی ئاشکراو ئەرێنی و بێسنوری دەبێت [illegible] نەوەکانی ئایندە.

مرۆڤ دەتوانێت لەو دەزگایەشدا ببێتە کەسێکی وەرچەرخێن کە کاری تێدا دەکات. بۆ نمونە، لەوانەیە بەڕێوەبەری کارەکەت کەسێکی بێزارکەر بێت، یاخود بارودۆخی کارەکەت پڕبێت لە ناڕەحەتی و ناعەدالەتی. بەڵام ئەگەر تۆ ئازادیی هەڵبژاردنت حەکیمانە بەکارهێنا، دەتوانیت بارودۆخەکە بەتەواوی بگۆڕیت و کاریگەریی قووڵیش لەسەر بەڕێوەبەر دروست بکەیت، یان هەر هیچ نەبێت خۆت لەوە بپارێزیت لاوازیی ئەوانەی دیکە کارت تێبکات. بیرت نەچێت کاتێک کە تۆ ژیانی سۆزداریی خۆت دەخەیتە ژێر کاریگەریی خاڵە لاوازەکانی کەسێکی دیکە ئەوا تۆ هەمو هێزەکان لەخۆت دادەماڵیت و خاڵی لاوازییەکانی ئەوکەسە بەهێز دەکەیت بۆ ئەوەی درێژەبدات بە وێرانکردنی ژیانت. دیسانەوە پێت دەڵێمەوە ئایندەت مەخەرە ناو قەفەزی رابردوتەوە.

ئەمەی خوارەوە چیرۆکێکی راستەقینەیە بەئاشکرا توانای هەڵبژاردن روون دەکاتەوە. چیرۆکەکە بە پێنوسی کەسێکی ئازاو ئیلهامبەخشی وا نوسراوە کە نەک هەر فێربووە چۆن کاریگەرێتی دروست بکات، بەڵکو زانیویەتی چۆن کارێك بکات ئەم ببێتە سەرۆکی سەرۆکە خراپەکەی:

"کاتێک کە پۆستی بەڕێوەبەری سەرچاوە مرۆییەکانم وەرگرت، زۆر چیرۆکی ترسناکیان بۆ گێڕامەوە دەربارەی سەرۆکی دەزگاکەمان. جارێکیان بە بەرچاوی منەوە لە نوسینگەکەی خۆیدا زۆر خراپ لە کارمەندێک تورەبو.

ئەوکاتە بڕیارم دا هەرگیز لایەنە خراپەکەی سەرۆک نەوروژێنم، لەبەر ئەوە کە لە رارەوەکاندا دەمبینی زۆر بە ئەدەب و روخۆشییەوە قسەم لەگەڵ دەکرد. راپۆرتەکانم لەکاتی خۆیدا دەدایەو ئەوپەڕی توانام دەخستەگەر لە دەوام دوانەکەوم. تەنانەت بڕیاریشم دا یاری گۆلفی لەگەڵدا نەکەم نەبادا لێی ببەمەوە.

پاش ماوەیەکی کەم تێگەیشتم ئەم ترسنۆکییەم گەیاندومێتیە کوێ. زۆربەی کاتی خۆمم بەو کاروبارانەوە خەسار دەکرد کە نەمدەتوانی کۆنترۆڵیان بکەم و توانا داهێنەرە بەنرخەکەشم لە چارەسەرکردنی گیروگرفتی وادا بەفیڕۆ دەدا کە هێشتا رویان نەداوە. ترسنۆکیەکەم وای لێکردم نەوێرم باشترین بەخششی خۆم پێشکەشی کۆمپانیاکە بکەم. بە کورتییەکەی من نەمتوانیبو ببمە هۆکاری گۆڕانکاری لەناو کۆمپانیاکەدا. تاقە گۆڕانکارییەک کە ئیسراحەتی پێدەبەخشیم ئەوەبو واز لەو کۆمپانیایە بهێنم. لەبەرئەوە بەدوای کارێکی دیکەدا گەڕام و تەنانەت کات‌وشوێنی چاوپێکەوتنەکەشیان بۆ دیاری کردم.

ئەم هەوڵە وای کرد شەرمم بەخۆمم بێت. چاوپێکەوتنەکەم هەڵوەشاندەوەو بەڵێنم دا بە خۆم کە ماوەی نەوەد رۆژ بەردەوام تەنیا جەخت بکەمە سەر ئەو شتانەی کە دەتوانم کاریگەرییم هەبێت لەسەریان. یەکەم بڕیارم ئەوەبو کە پەیوەندییەکی پتەو لەگەڵ سەرۆکەکەمدا دروست بکەم بۆ ئەوە نا کە ببینە دو هاوڕێی گیانی بەگیانی، بەڵکو تەنیا تا ئەو ئاستەی کە بتوانین وەکو دوو هاوکار مامەڵە لەگەڵ یەکتریدا بکەین.

رۆژێکیان سەرۆک هاتە نوسینگەکەم و پاش گفتوگۆکردن و دوای ئەوەی کە چەند جارێک قسەکانم لە مێشکمدا تاوتوێ کرد، پێم گوت: بەڕاست، من دەتوانم چی بکەم بۆ ئەوەی پارمەتیت بدەم دەوروتەئسیری زیاترت هەبێت لێرە؟ بە سەرسوڕمانەوە لێی پرسیم: مەبەستت چی‌یە؟ بێ ترس پێم گوت: چیت پێباشە بیکەم بۆ ئەوەی هەندێک لەباری شانت سوک بکەم؟ ئەرکی من ئەوەیە وابکەم کارەکانت بەئاسانی لەبەر بڕوات. بە تێکچونی روخساری بۆم دەرکەوت سەرۆک بە قسەکانم نارەحەت بوە. ئەمە سەرەتای پەیوەندییەکانی نێوانمان بو. لەوسەرەتایەوە ئەرکی سادەو بچوکی پێسپاردم بۆ نمونە ئەم نوسراوە چاپ بکەو زەحمەت نەبێ تەلەفۆنێک بۆ فلانە شوێن بکەو ..تاد. بەڵام شەش حەفتە دوای ئەوە هاتەلام و پێی وتم: بیستومە تۆ کۆمپانیاکانی دڵنیایی دەناسیت و شارەزایی باشت لەو بوارەدا هەیە. زەحمەت نی‌یە ئیش لەسەر ئەوە بکەیت؟ ئێمە حاڵی حازر کرێیەکی زۆریان دەدەینێ. بزانە لەم رووەوە چیت پێ دەکرێت؟!

ئەمە یەکەم جاربو داوای لەنجامدانی کارێکم لێ بکات کاریگەرییەکی گەورەی هەبێت لەسەر کۆمپانیاکە. من توانیم کرێی بیمەی دڵنیایی ساڵانە لە ٢٥٠ هەزار دۆلارەوە کەم بکەمەوە بۆ ١٩٨ هەزار دۆلار جگە لەوەش بە گفتوگۆکردن لەگەڵ کۆمپانیاکانی دڵنیایدا ایمەا سەبارەت بە هەندێک مەسەلەی چارەسەرنەکراو سیانزە هەزار دۆلاری دیکەم

گێڕایەوە بۆ کۆمپانیاکەمان.

ئەگەر لەسەر مەسەلەیەکیش ناکۆکی بکەوتایەتە نێوانمان، من ئەو ناکۆکییەم بە نهێنی دەهێشتەوەو نەمدەهێشت هیچ بەش و کارمەندێک پێی بزانێت

خێرا بـۆم دەرکـەوت ئـەم هەڵبـژاردنی ئـەوەند ڕۆژە وا لـە ئێسـتاوە ئەنجامەکـەی دەردەکەوێت. پەیوەندییەکانم گەشەیان کردو دەوروتەنیسیرم چەند هێندەی جارانی لێ هـات بۆ بەدەستهێنانی گۆڕانکـاری لـە ژینگـەی کارەکەمـدا. ئێسـتا متمانـەی نێـوان من و سەرۆکەکەم زۆر بەرزەو هەست دەکەم بەڕاستی بەشدارم لە کۆمپانیاکەدا

> هەرچەندە ئاراستەی ابااکە یەک ئاراستەیە کەچی کەشتییەک بەرەو خۆرهەڵات دەڕوات و کەشتییەکی دیکە بەرەو خۆرئاوا. ئـەوەی ئاراستەکانی ئێمە دیاری دەکات ئاراستەی زریانەکە نییە، "لەم گەشتەی ژیانـدا. ئـەوەی ئامانجەکان دیاری دەکـات چۆنێتی ئاراستەکردنی چارۆکەکەیە. چارۆکەکە ئەگەر بەباشی ئاراستە بکرێـت کەشتیەکە وا لێ دەکـات بگاتـە ئامانجەکـەو گوێ نەداتە ئەوەی زریان هەڵیکردوە یاخود دنیا کش ومـاتە
>
> - ئیلا ویلەر ویلکوکس

من پێم باشە زۆر بەقوڵی بیر لەم یەکەمین دیارییە بکەیتەوەو سەرنج لەوپانتاییە بـدە کە لەنێوان کارلێکەرو کاردانەوەکەدا هەیـە. هـەروەها پـێم باشـە زۆر حەکیمانـە پانتاییەکە بەکاربهێنیت بۆ ئـەوەی سەربەسـتیی زیـاترت دەسـت بکـەوێت و بـەردەوامی ببەخشێت بە گەشەکردن و فێربونی خۆت و بەشدارییەکی ئەرێنیشت هەبێت لە ژیانی دەوروبەرەکەتدا. لەکۆتاییشیدا، حەزدەکەم پێت بڵێم: بـەکارهێنانی ئـەم توانایـە کارێـك دەکات لە ئایندەدا کاردانەوەکەت هێنـدە بـەهێز بێـت کـە ئـەو کارلێکەرەکـە دابڕێـژێت. واتە لە ئایندەدا وات لێ دێت تۆ ئەو جیهانە دروست دەکەیت کە تیایدا دەژیت. ویلیام جیمسی دەروونناس و فەیلەسوفی ئەمریکایی زۆر چاکی پێکاوە کە دەڵێت ئێمـە کاتێك بیروباوەڕەکانمان دەگۆڕین ژیانیشمان دەگۆڕێت.

## دووەمین دیاری ( نیعمەت ) کە لەگەڵماندا لەدایك بووە: یاسا سروشتییەکان یاخود پرنسیپەکان.

لە لاپەڕەکانی پێشودا باسی بەکارهێنانی حەکیمانەی ماوەی نێوان کارلێکەرو کاردانەوەمان کرد! واتە باسی ئازادی هەڵبژاردنمان کرد. بەڵام ئایا کە دەڵێین بەکارهێنانی حەکیمانە، مەبەستمان چییە؟ حیکمەتەکە لەکوێدایە؟ حیکمەت لە بنەڕەتدا بریتییە لەوەی بەپێی پرنسیپ و بنەماو یاسا سروشتییەکان بژیت نەك ئەوەی لەگەڵ ئەو کەلتورە باوەدا مل بنێیت کە پشتی بەستوە بە چاکسازیکردنی خێرا.

ئەنیشتاین هەر لە تەمەنی چوار ساڵییەوە کە چاوی کەوت بە دەرزیی قیبلەنما ئیتر هەستی بەوەکرد (شتێکی شاراوە لەپشتی شتەکانی دیکەوە لە قوڵاییدا هەیە). ئەمە هەمو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە. پرنسیپەکان کۆمەڵێك خەسڵەتی هاوبەشیان هەیە. خەسڵەتێکیان ئەوەیە کە گەردونیین، واتە پەیوەست نین بە کەلتورو سنورێکی دیاریکراوی جوگرافییەوە بەڵکو هەمو شوێنێك دەگرێتەوە. خەسڵەتێکی دیکەی سەرەتاکان ئەوەیە کە هەمیشەیین واتە هەمیشە نەگۆڕن. بۆ نمونە سەرەتاکانی عەدالەت و راستگۆیی و رێزو دڵسۆزی و .. تاد. بەڵام کەلتورە جیاوازەکان ئەم سەرەتایانە وەردەگێڕنە سەر رەفتاری جیاجیاو بە تێپەڕبونی کات و لەئەنجامی خراپ بەکارهێنانی ئازادییەکە رەنگە ئەو سەرەتایانە دیارنەمێنن. بەهەرحاڵ سەرەتاکان هەن و بەردەوام لە کاردان وەکو یاسای کێشی زەوی.

مەسەلەیەکی دیکە سەبارەت بەم سەرەتایانە ئەوەیە کە بەڵگەنەویستن. شتێك نین قابیلی مشتومڕ بن. بۆ نمونە ئەگەر تۆ شایستەی متمانە پێکردنێکی هەمیشەیی نەبیت، خەڵك متمانەت پێناکات. تکایە بیری لێ بکەرەوە. ئەمە یاسایەکی سروشتییە. جارێکیان من بومە رابەری گروپێکی (٣٠) کەسی و فێری خۆڕزگارکردنم دەکردن. پاش ئەوەی کە بیست‌وچوار سەعاتی بەردەوام بەبێ خواردن و خواردنەوەو خەوتن رۆیشتین، بە شاخێکدا سەرکەوتین. ئینجا دواتر بە ناچاریی دەبوایە روبارێکمان ببڕیایە بۆ ئەوەی بگەینە بەری ئەوبەر کە خواردن‌و خواردنەوەی لێبو. لە بەرزیی روبارەکەوە پەتێك رایەڵ کرا بۆ بەری ئەمبەرەوە و لەوێ پەتەکە بە درەختێکەوە پێچرابو. بەرچاییەکە لەوێ ئامادەکرابو. یەکەم کەس من چومە پێشەوە بە پەتەکەدا خۆم بگەیەنمە ئەوبەر. سەرەتا وام دەزانی کارەکە بۆ کەسێکی وەکو من ئاسانە، لەبەرئەوە

دەستم کرد بە هەڵبەزو دابەزو کردمە گاڵتەو پێکەنین، لەجیاتی ئەوەی هەمو توانای خۆم چڕبکەمەوە لەوەی چۆن توند توند دەست بگرم بە پەتەکەوەو وردە وردە بپەڕمە ئەوبەرەوە. پاش ماوەیەك کە هەستم بە هیلاکییەکی زۆرکرد، کەوتمە پەلەقاژێ پەڕینەوە بەڵام تەواو هێزم لێ بڕابو. هێندە بێ هێزبوبوم کە ئەگەرچی هەمو شارەزایی و توانـاو ئەزمونـەکانم خستەکار، پاش چەند خولەکێکی کەم تـەواو بڕستم لێ بـڕاو کەوتمە ناوەکەوە. دواتر بە مەلەکردن پەڕیمەوە ئەوبەرو لەسەر زەوییەکە پاڵکەوتم. خوێندکارەکان بە پێکەنین و گاڵتەوە هاتن بەلامەوە و تـەعلیقیان لێ دەدام کە پێش ئەوەی بکەومە ناوەکەوە چەندێك لەخۆم ڕازی بوم. جەستە سیستمێکی سروشتییە. یاسا سروشتییەکان حوکمی دەکەن و مـرۆڤ ئەگەر دنیایـەك وەرەو غیرەتـیش بخاتـە بەرخۆی، ناتوانێت توانای ماسولکەکانی خۆی تێبپەڕێنێت.

قسەیەکەی سی. ئێس. لویس دەربارەی ئەوکەسـانەی نکۆڵی دەکـەن لـە بنـەما سروشتییەکان سەرسامی کردوم!

"ئەو کەسەی کە دەڵێت بڕوای بەوە نییە هەڵەو ڕاستی بونیان هەبێت، پاش خولەکێك لـە قسەکەی خۆی پەشیمان دەبێتـەوە. تـۆ بەلاتـەوە ئاسـاییە بـەڵێنێك نەبەیتەسـەر کـە بـە کەسێکت داوە، بـەڵام ئەگـەر کەسێك پەیمانەکـەی لەگـەڵ تـۆدا نەباتەسـەر زۆرت پێنـاخۆش دەبێت و بـە ناهـەقی و زوڵمـی دەزانیت. لەسـەر ئاستی دەوڵەتانیش وایە. بۆ نمونە فڵانە دەوڵەت دەڵێت پەیماننامەکان گرنگ نین. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم خۆی بە درۆ دەخاتەوەو دەڵێت فڵانـە پەیماننامـە هەڵدەوەشـێنمەوە چونکە عەدالەتی تێدا نییە. بەڵام ئەگەر پەیماننامەکان گرنگ نین، یاخود ئەگەر هەڵەو بوون و ڕاستی و مانایەکیان نەبێت –واتە ئەگەر یاسا سروشتیەکان بوونیان نەبێت کەواتە ئیتر جیاوازی چییە لەنێوان پەیماننامەیەك و پەیماننامەیەکی دیکەدا.

کەواتە پێویستە ئێمە باوەڕبهێنین بەوەی هەڵەو ڕاستی بوونیان هەیە. مـرۆڤ وەك چۆن لە کۆکردنەوەو لێدەرکردنـدا هەڵـە دەکات، ئاواش ڕەنگە لـە دیاریکردنی ڕاستو هەڵەدا، بکەوێتـە هەڵەوە. مەسـەلەکە لەمـەدا پەیوەست نییە بـە بیروباوەڕ و زەوقو ئارەزوی کەسەکەوە، بەڵکو پەیوەستە بەوەی کە حساب باش نازانێت. لێرەدا دەمـەوێت ڕادەگێنشیت باوەڕی وایە کە پێویستە بە شێوازێکی دیاریکراو ڕەفتار بکات و ناتوانێت

لەو شێوازە رزگاری ببێت. دووەم خاڵیش ئەوەیە کە لە راستیدا بەو شێوازە هەڵس‌وکەوت ناکات. واتا یاسا سروشتییەکە دەزانن کەچی پێشێلی دەکەن. ئەم دوو هەقیقەتە، ئەو دوو پایە گرنگە پێك دەهێنن کە بەبێ ئەوان ناتوانین بەباشی لەخۆمان و لەم گەردونە تێبگەین کە تیایدا دەژین.

## دەسەڵاتی سروشتی و دەسەڵاتی ئەخلاقی

مەبەست لە دەسەڵاتی سروشتی باڵادەستبونی یاسا سروشتییەکانە. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت یاسا سروشتییەکان پشتگوێ بخات و هیچ رێگەیەکی دیکەی لەبەردەمدا نییە جگە لەوەی کە بەپێی ئەو یاسایانە رەفتار بکات. هەمو رەفتارێك ئەنجامی خۆی هەیە و ئەنجامەکە گوێنەداتە ئەوەی کە بە دڵی ئێمەیە یاخود نا. تۆ کە جەمسەری پارچە تەختەیەك بەرزدەکەیتەوە، جەمسەرەکەی دیکەش بەرز دەبێتەوە. هەروەها کاتێك لە نهۆمی دەیەمی بینایەکەوە خۆت فڕێ دەدەیتە خوارەوە، ناتوانیت لە نهۆمی پێنجەمدا بۆچونت بگۆڕیت، چونکە یاسای کێشی زەوی رادەکێشێتە خوارێ. ئەمە خەسڵەتی سروشتە.

سروشت ئازادی و توانای هەڵبژاردنی بەخشیوە بە مرۆڤ و دواتر مرۆڤ وای لێهاتووە ببێتە خاوەنی دەسەڵاتە سروشتییەکەو باڵادەستی بەسەر هەمو دروستکراوەکانی دیکەدا. ئەو زیندەوەرانەی کە مەترسییان لەسەرە بە تەواوی لەناودەچن و لەو هەڕەشەیە رزگاریان نابێت ئەگەر ئێمە رازی نەبین. خۆیان ئازادی و توانای هەڵبژاردنیان نییە، تەنانەت خۆیشیان ناناسن و ناشتوانن سەرلەنوێ خۆیان دروست بکەنەوە. واتا بەتەواوی کەوتونەتە ژێر کۆنترۆڵی مرۆڤەوە، ئەو مرۆڤەی کە خۆی دەناسێت و ئازادیی و توانای هەڵبژاردنی هەیەو دەتوانێت سەرلەنوێ خۆی دروست بکاتەوە.

دەسەڵاتی رەوشتی چییە؟ بریتییە لەوەی کە ئێمە ئازادیی و توانای هەڵبژاردن بەپێی پرینسیپ و بنەماکان بەکاربهێنین. بە واتایەکی دیکە ئێمە ئەگەر لە پەیوەندیەکانماندا لەگەڵ یەکتریدا سەرەتاکان پەیڕەو بکەین، سروشت دەسەڵاتی رەوشتیمان پێ دەبەخشێت. یاسا سروشتییەکانی (وەك کێشی زەوی) و پرنسیپەکانی (وەك رێز و دڵسۆزی و یەکسانی) چارەنوسی هەڵبژاردنەکانمان دیاری دەکەن. کە بەردەوام دەستدرێژیمان کردە سەر ژینگە بە دڵنیاییەوە ئاو و هەواکەمان پیس دەبن. متمانەش هەمان شتە. تۆ ئەگەر بە خراپی مامەڵە بکەیت و هەمیشە هەوڵی خەڵەتاندنی دەوروبەرەکەت بدەیت، بە دڵنیاییەوە

متمانە لەدەست دەدەیت. ئەو مرۆڤە بێ فیزو سادەیەی کە ئازادیی و توانای هەڵبـژاردن بەپێی پرنسیپەکان و بێ فیزانە بـەکاردەهێنیت، دەبێتـە خـاوەنی دەسـەڵاتی ئـەخلاقی لەنێو خەڵك و کەلتورو دەزگاو تەواوی کۆمەڵگادا.

بەهاکانمان بـریتین لـە ڕێکخـەرە کۆمەڵایەتییـەکان. لـە ناوەڕۆکیشدا پەیوەسـتن بـە هەستو سۆزەوەو قابیلی ئەوەشن گفتوگۆیان لە بارەوە بکرێت. هـەمو مرۆڤێـك بنـەماو بـەهای تایبـەت بـەخۆی هەیـە. تەنانـەت تاوانکارەکـانیش هەیانـە. بـەڵام پرسـیارەکە ئەوەیە: ئایا بنەماکانت پەیوەستن بە پریسنیپەکانەوە.

وەك پێشتر باسمـان کـرد سـەرەتاکان بـریتین لـە کۆمـەڵێك یاسـای سروشـتی و ئـەو یاسایانەش راستەقینەو نەگۆڕو بابەتین و پەیوەندییان بە کەسێکی دیاریکراوەوە نـییە. دەرەنجامـەکانیش پرنسـیپەکان دیاریـان دەکـەن. رەفتـاریش بـەهاکان دیارییـان دەکـات. لەبەر ئەوە پێویستە نرخی پرنسیپەکان بزانین.

ئەو کەسانەی کە شەیدای ناوبانگ و دەرکەوتنن لەو جۆرە مرۆڤانەن کە بەهاکانیان پەیوەسـت نـین بەپرنسـیپەکانەوە. نـاوو ناوبـانگ و میللیبـوون پێگە ئەخلاقییـەکانیان دادەڕێژن. مرۆڤی لەو جۆرە نە خـۆی دەناسـێت و نـە لـە دەوروبەرەکەیشیی شـارەزایە. ئازانێت ئەو پرنسیپانە چین کە پێویستە پەیڕەویان بکات چونکە ژیـانی تـەنیا لەسـەر بـەها کۆمەڵایەتییـەکان وەسـتاوە. ئـەم جـۆرە مرۆڤـە کەوتۆتـە نێـوان دوو بەرداشـەوە. بەرداشێکیان خۆناسـین و ناسـینی کۆمەڵگەیـە! بەرداشـەکەی دیکـەش بریتییـە لـە یاسـا سروشـتییەکان و لـە پرنسـیپەکان. لـەو سـەرگێژەیە دەچـێت کـە هەنـدێك جـار لـەناو فڕۆکەدا دوچاری دەبیت و هیچ پەیوەندییەکت بە زەوییەوە (پرنسیپەکان) نامێنێت و بەتەواوی بزر دەبیت. ژیانی زۆر کەس بریتییە لە سەرگێژەو بزربونی رەوشـتی. ئێمـە هەریەکێکمان یەك دوو کەسی وا دەناسین. ناومان بیستون و لوتمان تەقیوە بە لوتیاندا. جێگیرکردنی بەهاکان بە دەوری پرنسیپە نەگۆڕەکاندا کارێکە باجی خۆی هەیە. ئـەمان ئەو باجەیان نـەداوە. ئەرکـە سـەرەکیەکە لێـرەدا ئەوەیـە ئاڕاسـتە خـوازراوە کـە دیـاری بکەین بزانین لەکوێدایە، پاشان هـەمو ژیانـت بـەرەو ئـەو ئاڕاسـتەیە وەربگێـڕە. ئەگـەر وانەکـەیت روبـەڕوی کۆمـەڵێك ئـەنجامی خـراپ دەبیتـەوە کـە ناتوانیـت خۆتیـان لێ لابدەیت. بۆیە دەڵێم ناتوانیت خۆتیان لێ لابدەیت چونکە ئەوەی دەرەنجامی رەفتارەکان دیاری دەکات پرنسیپەکانە، بەپێچەوانەی رەفتارەوە کە بەهاکان دیارییان دەکەن.

دەسەڵاتی رەوشتیی وا دەخوازێت مرۆڤ واز لە بەرژەوەندییە تەسکە خودپەرستییەکە بهێنێت و ئازایەتی ئەوەی تێدابێت بەها کۆمەڵایەتییەکان بخاتە ژێر کۆنترۆڵی پرنسیپەکانەوە. ئەو شوێنەی کە پرنسیپەکانی تێدا کۆبونەتەوە ویژدانە.

## فیلمی: یاسای دروێنە

ئێستا کاتی ئەوەیە بانگهێشتت بکەم بۆ بینینی فیلمێك بەناوی "یاسای دروێنە"وە. ئەم فیلمە لەسەر سیدی ناو کتێبەکە هەیە و زۆر بەجوانی ئەو پرۆسەیەمان بۆ روون دەکاتەوە کە سروشت چۆن یاسای درۆێنەمان فێر دەکات. تێکڕای ئەنجامە هەمیشەییەکان یەك لەدوای یەك دروست دەبن و شێوازی گەشەکردنیشیان لەناوەوە بۆ دەرەوەیەو تەنیا پرنسیپەکانیش دیارییان دەکەن. کە فیلمەکە دەبینیت بیرت نەچێت سروشتی مرۆڤیش هەمان شتە. هەر ئەو (یاسای دروێنە)یە. رەوشتی مرۆڤ و گەورەیی و پەیوەندییەکانی دیاری دەکات. ئەم یاسای دروێنەیە رێك پێچەوانەی کەلتوری چاکسازی خێراو خۆ بەقوربانیزان و لۆمەکردنی ئەوانی دیکەیە.

## دیاری (نیعمەتی) سێیەم کە لەگەڵماندا لەدایك بووە:
## چوار زیرەکییەکە/ توانا سروشتییەکانمان

مرۆڤ وەك پێشتریش باسمان کرد لە چواربەشی سەرنجڕاکێش پێکهاتووە کە بریتین لە جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆح. هەربەشێك لەم بەشانە تواناو زیرەکی تایبەت بە خۆی هەیەو هەمو مرۆڤێك ئەو چوار زیرەکییەی تێدایە. زیرەکیەکانیش بریتین لە؛ زیرەکی جەستەیی (فیزیکی) PQ، زیرەکی ئەقڵی IQ، زیرەکی سۆزداری EQ، زیرەکی رۆحی SQ، ئەم چوار زیرەکیە سێیەمین دیاری پێك دەهێنن کە لەگەڵماندا لەدایك دەبێت.




شێوەی ٣-٢

## زیرەکی ئەقڵی IQ

ئێمە کە رۆژانە باسی زیرەکی دەکەین، بەشێوەیەکی گشتی مەبەستمان لە زیرەکی ئەقڵییەو بریتییە لە توانای شیتەڵکردن و لێکدانەوەو بیرکردنەوەی ئەبستراکت و بەکارهێنانی زمان و دۆزینەوەی هۆکار. بەڵام ئەم پێناسەیە بۆ چەمکی زیرەکی پێناسەیەکی تەسکە.

## زیرەکی جەستەیی (فیزیکی) PQ

زیرەکی جەستەیی PQ جۆرێکی دیکەی زیرەکییەو ئێمە لە ناخەوە ئاگامان لێیەتی بەڵام زۆر بایەخی پێنادەین. تەنیا بیر لەو ئەرکانە بکەرەوە کە جەستەی تۆ ئەنجامیان دەدات بەبێ ئەوەی تۆ هۆشیارانە هیچ رەنجێکی بۆ بدەیت. ئەم جۆرە زیرەکییە کۆئەندامە گرنگەکانی وەك هەناسەدان و سوڕی خوێن و دەمار و ئەوانی دیکە بەڕێوەدەبات. بەردەوامیش چاودێری ژینگەی دەوروبەری مرۆڤەکە دەکات و زانیاری لەسەر کۆدەکاتەوە. هەروەها خانە نەخۆشەکان لەناو دەبات و لەپێناوی ژیان و مانەوەدا تێدەکۆشێت.

"جەستەی مرۆڤ تا سنوری موعجیزە سەرسورهێنەرە. نزیکەی حەوت تریلیۆن خانەو هاوئاهەنگییەکی ئێجگار وردو سەرسورهێنەری فیزیاوی و کیمیاوی کە جەستە پێویستی پێیانە بۆ ئەوەی بتوانێت ئیش‌وکاری جۆراوجۆر بکات هەر لە کۆکینەوە تا هەڵدانەوەی لاپەڕەی کتێبێک یاخود لێخوڕینی ئوتومبێلێک. ئێمە ئەگەر بیر لەوە بکەینەوە کە جەستەمان چۆن خۆبەخۆو بێ بڕیاردانی ئێمە کاردەکات، توشی سەرسوڕمانێکی گەورە دەبین. ئایا بڕیاری لێدانی دڵت بەدەستی خۆتە! خۆت بڕیار دەدەیت سییەکانت گرژ ببن و بچنەوە یەک؟ تۆ بە ئەندامەکانی کۆئەندامی هەرست گوتوە لەکاتی گونجاودا ماددە کیمیاوییەکان بڕژێن؟ بێگومان لەهەر چرکەساتێکی ژیانماندا کۆمەڵێک کاری بێ شومار لە جەستەماندا ئەنجام دەدرێن بەشێوەیەک کە ئێمە ئاگامان لێیان نییە، بەڵام لەپێناوی ژیانی ئێمەدایە. ئەوە زیرەکییە کە تێکڕای سیستەمەکە بەڕێوەدەبات بەشێوەیەک کە زۆربەی جار ئاگام لێی نییە"

- دۆک چیڵدەر و بڕۆس کرایەر

پزیشك لە هەمو کەس باشتر دەزانێك کە جەستە خۆی خۆی چاك دەکاتەوە. ئەرکی زانستی پزیشکی زۆر بە سادەیی بریتییە لە یارمەتیدانی پرۆسەی چاکبونەوەکەو هەروەها (رەنگە) لابردنی تەنگوچەڵەمەکانی بەردەمی. بەڵام ئەم زانستی پزیشکییە رەنگە هەر خۆی ببێتە رێگرێکی بەردەم چاکبونەوە ئەگەر بە پێچەوانەی زیرەکی جەستەیی کاری کرد.

ئایا جەستە چۆن دەتوانێت هاوسەنگی و هەماهەنگیی دروست بکات لەنێوان ئەرکی مێشك کە ئەقڵی تێدایە و ئەرکی دڵ کە سیمبولی زیرەکی سۆزدارییە؟

جەستەی مرۆڤ ئامێرێکی ئێجگار بلیمەتەو هیچ کۆمپیوتەرو ئامێرێکی بلیمەت نایگرێتەوە. توانای مرۆڤ لە کۆنترۆڵکردنی رەفتارو بیروباوەڕو هەست‌و سۆزی خۆیداو لە کارکردنەسەر روداوەکان زۆر زۆر گەورەترە لەتوانای هەمو زیندەوەرەکانی ئەم سەرزەمینە. لێکۆڵینەوە تازەکانی ناو تاقیگان لەمبارەیەوە کۆمەڵێك نیشانەو ئەنجامیان دەستکەوتوە کە بەڵگەی ئەوەن لەنێوان جەستەو دڵ و ئەقڵدا پەیوەندییەکی توندوتۆڵ هەیە.

<table><tr><td>
لە کارۆلینای باکور تابلۆی سەردوکانی ناو گوندێك لێی نوسرابو:<br>
دەماغ گوتی من زیرەکترین ئەندامی جەستەم<br>
دڵ لێی پرسی کێ پێی گوتیت؟
</td></tr></table>

## زیرەکی سۆزداری EQ

زیرەکی سۆزداری بریتییە لەوەی مرۆڤ خۆی بناسێت و لە هەستو سۆزی خۆی تێبگات و توانای هەبێت هەست بە مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان بکات و سەرکەوتوانە پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی دیکەدا دروست بکات.

زیرەکی سۆزداریی واتا ئەوکەسە لەکاتی گونجاودا هەڵوێستی کۆمەڵایەتی گونجاو نیشان بدات، هەروەها ئازایانە ددان بە خاڵە لاوازەکانی خۆیدا بنێت و جیاوازییەکانی نێوان خۆی و ئەوانی دیکە نیشان بدات و رێز لەو جیاوازییانە بگرێت. پێش ئەوەدەکانی سەدەی رابردو، کاتێك کە مەسەلەی زیرەکی سۆزداریی بەگەرمی باسی دەکرا، دەگوترا کە ئەم جۆرە زیرەکییە بەشێکە لە تواناکانی نیوەی لای راستی مێشك، بە پێچەوانەی نیوەی چەپی مێشك کە وا دادەنرا زیاتر پەیوەست بێت بە لێکدانەوەو زمان و لۆجیك و بیرکردنەوەی هێلکاریی. واتە نیوە مێشکی لای راست زیاتر توانای بیرکردنەوەی داهێنەرانەی هەیەو سەنتەری هەستو تواناو بۆچوون و پێشبینییەکانە. گرنگ ئەوەیە بایەخ و رێز بۆ هەردووبەشەکەی مێشك دابنرێت و مرۆڤ فێربکرێت بەردەوام مەشق و راهێنان ئەنجام بدات بۆ گەشەدان بە توانای هاوتاکانی و بەکاریان بهێنێت. ئێمە ئەگەر هەستو بیرکردنەوە کۆبکەینەوە دەتوانین هاوسەنگییەکی زیاتر دەستەبەر بکەین و بریارو حوکمی راست لەسەر شتەکان بدەین.

> زەین و سەلیقەی ئەقڵی بیرکەرەوە رێنمایی دەکات بۆ ئەو شوێنە کە پێویستە لە هەنگاوی داهاتودا لێی بێت.
>
> - دکتۆر جۆناس سولك، دۆزەرەوەی ڤاکسینی ئیفلیجی منداڵ

دەرەنجامی لێکۆڵینەوە زۆرو زەوەندەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لەمەودای دورخایەندا زیرەکی سۆزداری رۆڵی گرنگتر دەگێرێت لەو رۆڵەی کە زیرەکی ئەقڵی دەیبینێت لە بوارەکانی دروستکردنی پەیوەندیەکان و سەرکردایەتیکردنی خەڵکانی دیکەو درێژەدانی سەرکەوتوانە بە پەیوەندییەکان.

نوسەری کتێبی زیرەکی سۆزداریی (دانێل گۆلمان) دەڵێت: بۆ سەرکەوتن لە هەمو بوارو پیشەکاندا توانای سۆزدارییمان دووقاتی توانا زانیارییەکان گرنگن بۆ سەرکەوتن

لەناستە باڵاکان و پۆستەکانی سەرکردایەتیدا، زۆربەی هەرە زۆری رۆڵەکە رۆڵی تواناسۆزدارییەکانە. زیاتر لە ٢|٣ی نیمەتە سەرکەوتوەکان هی توانا سۆزدارییەکانە لەبەرئەوە مەسەلەی دۆزینەوەی ئەو جۆرە خەڵکە گرنگن کە توانای وایان هەیە بۆ ئەوەی تواناکانیان بەرەو پێ بەرن. ئەمەش پێویستە ببێتە بناغەی ئەرکە سەرەکییەکەی دام‌ودەزگا جیاوازەکان. ئەم قسەیە تا چەند راستە؟

لەنێوان خاوەن پیشە سادەکانی وەك کرێکارو فرۆشیاردا، رێژەی ئەوانەی لەچاو هاوکارەکانیاندا توانای سۆزداریی زیاتریان هەبو، بریتی بو لە ١٪. بەڵام بەرهەمی ئەم (١٪)ە سێ هێندەی ئەوانی دیکە بو.

لەناو خاوەن پیشە مامناوەندەکانی وەك کارمەندانی بەشی فرۆشتن و میکانیك و .. تاد، بەرهەمی ئەوانەی خاوەن زۆرترین تواناو لێهاتویی سۆزداری بون ١٢ هێندەی بەرهەمی ئەوانی دیکە بو.

ئەم تیۆرییەی زیرەکی سۆزداریی، جێ‌بێی ئەو کەسانە لەق دەکات کە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن پشتیان بە زیرەکی ئەقڵی دەبەستن. رەنگە کەسێکی دیاریکراو لە زیرەکی ئەقڵیدا (١٠) لە (١٠) بهێنێت بەڵام رەنگە لە زیرەکی سۆزداریدا تەنیا (٢) لە (١٠) بهێنێت و رەنگە نەزانێت چۆن پەیوەندییەکی باش لەگەڵ خەڵکیدا درێژە پێبدات. بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەم ناتەواوییە، رەنگە ئەم جۆرە کەسانە پەنابەرن بۆ زیرەکییە ئەقڵییەکەیان و هەروەها هێزی پۆستە رەسمییەکەیان وەربگرن بەڵام بەم کارەیان زۆرجار هەم خۆیان لاواز دەکەن و هەم خەڵکانی دیکە. دواتریش هەوڵ دەدەن بە زیرەکییەکەیان بیانو بۆ رەفتارەکانیان بهێننەوە.

| |
|---|
| هێز قەرزکردن لاوازیی دروست دەکات لە خۆت و خەڵکی و پەیوەندییە مرۆییەکاندا. |

یەکێك لە ململانێ گەورەکان کە لە ناستە جیاجیاکاندا روبەڕوی باوکان و سەرکردەکان دەبێتەوە چۆنێتی گەشەدانە بە زیرەکیی سۆزداریی.

## زیرەکی رۆحیی SQ

چوارەمین زیرەکی، زیرەکی رۆحییە. زیرەکی رۆحی وەکو زیرەکی سۆزداری زیاتر پەیوەستە بە پرسیارە زانستییەکان و بە گفتوگۆ فەلسەفی و دەرونناسییەکانەوە.

لەناو هەمو زیرەکییەکاندا زیرەکی رۆحی گرنگترین و ناوەندیترین زیرەکییە چونکە سەرکردایەتییان دەکات. زیرەکی رۆحی هەوڵ و تەقەلای ئێمە بەرجەستە دەکات کە دەیدەین بۆ دۆزینەوەی واتاکان و بۆ پەیوەندیکردن بە شتە بێسنورەکانەوە (ریچارد وۆلمان Richard Wolman)ی نوسەری کتێبی (بە رۆحت بیربکەرەوە) سەبارەت بەم زیرەکییە دەڵێت:

"مەبەستم لە زیرەکی رۆحی هەوڵی بەردەوام و لەمێژینەی مرۆڤە بۆ پەیوەندیکردن بە شتێکی مەزنترو شایستەتر لە خودی خۆمان. واتە پەیوەندیکردن بە رۆحی خۆمان و رۆحی خەڵکانی دیکەوە. بە جیهانی سروشت و مێژووەوە. هەوڵی مرۆڤە بۆ پەیوەندیکردن بە مەیلە هەمیشەییەکانی رۆح و بە نهێنی ئەم زیندوبونەمان".

زیرەکی رۆحی یارمەتی مرۆڤ دەدات پرنسیپە راستەکان درك پێ بکات کە بەشێکن لە ویژدانی ئێمەو وەکو قیبلەنما وان. قیبلەنما نمونەیەکی باشە بۆ تێگەیشتن لە پرنسیپەکان چونکە هەمیشە رووەو باکورە. مرۆڤ بۆ ئەوەی پارێزگاری بکات لە دەسەڵاتە ئەخلاقییە باڵاکە پێویستە هەمیشە رووی لە پرنسیپەکانی باکور بێت.

> رۆحی مرۆڤ پریشکێکە لە نوری خودا
>
> (وتەکان ٢٠- ٢٧)

تەماشای ئەم برگەیە بکە لە کتێبەکەی (دانا زوهار Danah Zohar) و (ئیلیان مارشاڵ Ian Marshall) :SQ (چۆن پەیوەندی گرێ بدەین لەگەڵ زیرەکییە رۆحییەکەماندا)

(بە پێچەوانەی زیرەکی ئەقڵییەوە IQ کە کۆمپیوتەریش هەیەتی و EQ کە شیردەرە باڵاکانیش هەیانە، SQ تەنیا تایبەتە بە مرۆڤ و لە هەرسێ زیرەکییەکەی دیکە گرنگترە. زیرەکی رۆحی پەیوەستە بە پێویستی مرۆڤ بۆ واتاکان، کە لە ریزی پێشەوەی بایەخدانەکانی ئەقڵی مرۆڤە. زیرەکی رۆحی ئەو زیرەکییەیە کە ئێمە بەکاری دەهێنین بۆ گەشەدان بە تواناو ئارەزوی تێگەیشتنی واتاکان و بەهاکان و تێروانینەکان. زیرەکییەکە توانای خەیاڵ و خەوبینینمان پێدەبەخشێت. زیرەکی رۆحی کەوتۆتە پشت ئەو بابەت و مەسەلانەوە کە بڕوامان پێیانەو کەوتۆتە پشت ئەو رۆڵەوە کە بیروباوەڕەکانمان دەیانگێڕن. بە کورتییەکەی ئەو گەوهەرەیە کە ئێمەی کردوە بە مرۆڤ.

## ماناناسی و سروشتی بەرزی زیرەکی رۆحی

بۆ تێگەیشتن لە مەسەلەی زیرەکی، بڕێکی زۆر خوێندنەوەو تێبینی و لێکۆڵینەوە ئەنجام دراون، بەتایبەت لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا. هەر لەم بوارەشدا چەندین کتێب و بڵاوکراوە چاپکراون. زۆرجار بۆ پێناسەکردنی شتێکی دیاریکراو چەندین زاراوە بەکاردەهێنرێن. هەندێك لەوەی کە من ناوی لێ دەنێم زیرەکی رۆحی، رەنگە کەسێکی دیکە پێیان بڵێت زیرەکی سۆزداری و بە پێچەوانەشەوە. من دەزانم کە رەنگە ئەم فرە زاراوەییە بۆ پێناسەکردنی یەك بابەت گرفتی لێ بکەوێتەوە، لەبەرئەوە داوات لێ دەکەم ئەی خوێنەری بەڕێز کە زاراوەکان نەکەیتە کێشەو بە بەردەوامی بەشوێن واتا شاردراوەکاندا بگەڕێ.

کتێبی (چوارچێوەکانی ئەقڵ) کە (هواردگاردنەر Howard Gardner) نوسیویەتی و دەربارەی تیۆریی زیرەکییە جۆراوجۆرەکانە، لەڕاستیدا چارەسەرکردنێکی بلیمەتانەیە بۆ چەمکی زیرەکییە جۆراوجۆرەکان، کە هەم لە یەکتری جیاوازن و هەم بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێشیش چون بەناویەکدا. من بۆ تێگەیشتن لە زیرەکیی سۆزداریی سودێکی زۆرم لە کارەکانی (رۆبەرت کوپەر Cooper) و (دانیێل گۆڵمان Daniel Goleman) وەرگرتوە.

پێشتریش چێژێکی زۆرم بینی لە زۆربەی موحازەرەکانیان و دەزانم کە ئەنجامە بەدەستهاتووەکانیان گشتگیرن و پشتیان بە لێکۆڵینەوەی زانستی بەستووەو هەندێك لەو بابەتانە لەخۆ دەگرن کە لەژێر ناونیشانی زیرەکی رۆحیدا من باسم کردون.

هەندێك سەرچاوە پێیان وایە زیرەکییە ئابوری و دەستپێشخەری و لۆجیکی و هونەری و شیکاری و بینراو و گوتارییەکان لەیەکتری جیاوازن. من رێزێکی زۆرم هەیە بۆ هەوڵ و بەشداریی نوسەرانی ئەوجۆرە کتێب و سەرچاوانە، بەڵام باوەڕم وایە تێکڕای ئەو زیرەکییانە دەخرێنە چوار بەشە سەرەکییەکەوە (جەستەو دڵ و ئەقڵ و رۆح) کە چوار رەهەندەکانی ژیان بەرجەستە دەکەن.

هەرگیز ئەو ئەزمونەم بیرناچێتەوە کە لە (هاوایی) لەگەڵ رێکخراوی سەرکردە گەنجەکاندا بەدەستم هێنا:

ژمارەیەك بەڕێوەبەری کۆمپانیا لە نانی بەیانیدا کۆبونەوەیەکیان رێکخست لەگەڵ هەندێك کەسایەتی بەناوبانگی بواری کارگێڕی و سەرکردایەتیدا، بەتایبەت ئەوانەی کە خاوەنی پڕ فرۆشترین کتێب بون و لەناو کۆمەڵگادا زۆر رێزیان لێ دەگیرا. لە کۆبونەوەی

ئاوادا ئامادەبوان بە ڕێزی زۆرەوە قسە دەکەن. یەکێك لە سەرکردەکان بەوپەڕی بێ فیزییەوە وتی: "بەڕێزینە ئایا هەموتان یەك شت نالێن". دیارە دەیانزانی کە هەمویان هەمان شت دەلێنەوە. ڕاستە هەریەکەیان زاراوەو پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە. زۆربەشیان روانینێکیان هەیە کە ئەوانی دیکە گوزارشتی لێ ناکەن، بەلام لە مەسەلەی پێکهێنەرە بنەڕەتیەکاندا هەمویان هاوبەشن. بۆیە زۆربەی قسەکانیان پرنسیپە بنەڕەتیەکانیان دەگرتەوە نەك رەفتارو چۆنێتی جێبەجێکردن.

لەو چرکە ساتانەدا کە هەست بەهێزی جوانی دەکەین، جۆرە ئیحساسێك لە ناخماندا دەمان جولێنێت کە دەتوانێت رەقترین دڵ بتوێنێتەوەو ئیندۆرفین لە جەستەماندا بڕێژێت و لە دڵەڕاوکێ رزگارمان دەکات و وامان لێ دەکات هەم لە ناخی خۆمانداو هەم لە دەرەوەش پەیوەندی بەردەوام دروست بکەین لەگەڵ سەرچاوەکانی وزەدا.

ئەم ئەزمونە تەنیا ئارامی و بێدەنگیمان پێ نابەخشێت بەڵکو هێزی سروشت و گەردون و داهێنانەکانیشیان لەخۆ دەگرێت. بۆ خۆپاراستن لە گیروگرفتی زاراوەکان واپێویستی دەکرد خۆم زۆر ماندو بکەم و هەمیشە بەدوای واتا شاراوەکانی پشت ئەو زاراوانەدا بگەڕێم. بەلام من باوەڕم وایە رەهەندێکی دیکەی زیرەکی هەیە کە لە هیچ کتێبێکی دیکەدا بە قوڵی توێژینەوەی لەسەر نەکراوە، ئەویش رۆڵی زیرەکی رۆحییە لە ئاراستەکردن و سەرکردایەتیکردنی زیرەکییەکانی دیکەدا. لەم چەمکەوە بۆمان دەردەکەوێت پلەی زیرەکی رۆحی لە پلەی زیرەکیەکانی دیکە بەرزترە.

> ئێمە کاتێک هۆشمەندانە لە چرکەساتەکانی پەیوەندیدا سەرگەرمی کارکردن و داهێنانین، بە کردەوە ماسولکەکانی رۆح و زیرەکی رۆحیی خۆمان گەشە پێدەدەین. مەبەستم چییە لە رۆحیی؟ رۆحیی بە سادەیی بریتییە لە حەقیقەتە تەواوەکە. بریتی‌یە لەو رەهەندەش کە گەورەتر و بەهێزتر و حەکیم ترو ئاڵۆزتر و داهێنەرتر و میهرەبانترو دوربینترە لە بونە مادییەکەی رۆژانەی مرۆڤ. ئەم پێناسەیەی رۆحیی، نە لە زانستی لاهوتدا هەیە نە لە سیستمی بیروباوەڕەکاندا.
>
> – ویلیام بلوم

بۆ رونکردنەوەی ئەو هۆکارەی وای لێکردوم کە زیرەکی رۆحیی بە گرنگترین و بەرزترین تواناکانی مرۆڤ لەقەڵەم بدەم، رێگەم بدەن ئەزمونێکتان بۆ بگێرمەوە. من زۆر سەرسامم بە کارەکەی سەرۆکی کۆچکردوی میسر ئەنوەر سادات و ئەو هەوڵ و تەقەلایەی کە لەگەڵ سەرۆکی پێشووی ئەمریکا؛ جیمی کارتەر و سەرۆك وەزیرانی پێشوی ئیسرائیل (مەناحیم بیگن) بۆ بەدیهێنانی رێککەوتنی ئاشتی نێوان میسرو ئیسرائیل، دایان (رێککەوتنی کامپ دەیڤید)

کاتێك بە سواری ئوتومبێلی وەرزشییەوە لەگەڵ سەرۆکی پێشوی ئەمریکادا بەناو کامپ دەیڤیددا گەڕام، ئەو شوێنەی نیشاندام کە رێکەوتننامەکەی تێدا ئیمزا کرا. بەلای منەوە ئەو ئەزمونە ئەزمونێکی گەورەیە. ئەنوەر ساداتم وەك کەسایەتیەك هاتە بەرچاو کە زانیبوی بایەخی ماوەکەی نێوان کارلێکەرو کاردانەوە چیە.

سادات لە تەمەنی لاویدا ئەوکاتەی لە ژوری ژمارە ٥٤ی زیندانی ناوەندی قاهیرە زیندانی کرابوو بە ئەزمونێکی گرنگدا رۆی کە وەك ئەوە وابوو سەرلەنوێ لەدایك بوبێتەوە. لەو ئەزمونەدا سادات ماوەکەی نێوان کارلێکەرو کاردانەوەی فراوانتر کرد. گوێ بگرە لە زمانی خۆیەوە بزانە گەیشتۆتە چ تێگەیشتنێکی قوڵ:

"ئەو مرۆڤەی کە نەتوانێت هزری خۆی بگۆڕێت هەرگیز ناتوانێت واقیعەکە بگۆڕێت و لەئەنجامیشدا هەرگیز ناتوانێت یەك هەنگاو بچێتە پێشەوە"

> کاتێك کە بەشێوەیەکی کۆتایی مێژووی جیهان و دەزگاکان و کۆمەڵگاکان و خێزان و دەستە کۆمەڵایەتیەکان و مرۆڤەکان دەنوسرێت پێویەکە ئەوە نابێت خەڵکەکە تا چ ئەندازەیەك بەپێی ویژدانی کۆمەڵایەتی خۆیان ژیاون بەڵکو ئەوەیان بۆ دەکرێتە پێوەر کە تا چ ئەندازەیەك بەپێی ویژدانی خودایان ژیاون، مەبەست لەو ویژدانەیە کە حیکمەتە خۆرسکەکە بەرجەستەی دەکات و ئەو پرنسیپ و یاسا سروشتییانەی تێدایە کە ئاینە سەرەکیەکان و فەلسەفە جۆراوجۆرەکان فێرمان دەکەن. بابەتە سەرەکییەکە نە ئابوری دەبێت و نە جیۆپۆلۆتیکی و نە دەربارەی حکومەتەکان و نە دەربارەی جەنگەکان و نە دەربارەی هونەر و کەنیسەو کەلتورە کۆمەڵایەتیەکانیش دەبن، تەنیا ئەوە ئەژمار دەکرێت کە ئەومرۆڤەو ئەو دەزگایەو ئەو کۆمەڵگایە چۆن پرنسیپەکانی پەیوەست بە هەڵەو راستی جێبەجێ کردووە. ئەمە رەهەندە ئەخلاقی و رۆحیەکەیە و هەر ئەوەش دەبێتە ئەو هێزە کاریگەرەی کە هەمو لایەك بەرپۆەدەبات.

سادات پێش ئەوەی هەڵوێستی خۆی بەرامبەر ئیسرائیل بگۆڕێت خاوەنی جەماوەرێکی بەرفراوان بوو، دڵسۆزیش بوو بۆ مەسەلە گەورەکەی عەرەب. سادات بە شارو شارۆچکەکانی میسردا دەگەڕاو لە گوتارە سیاسیەکانیدا جەختی لەوە دەکردەوە کە هەرگیز ئامادە نییە تەوقە لەگەڵ ئیسرائیلیەکاندا بکات و هەتا بستێك خاکی عەرەبیان داگیرکردبێت دەست ناخاتە دەستیانەوە. ئەو هاواری دەکرد: "هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز، جەماوەرەکەش پاش ئەو دەیانگوتەوە هەرگیز، هەرگیز، هەرگیز"

ئێمە خاتو (جیهان)ی هاوسەری ساداتمان بانگهێشت کرد لە رێکخراوە جیهانیەکەماندا ببێتە وتەبێژی سەرەکی و شەرەفی ئەوەشم پێبدا نانی ئێوارەی لەگەڵدا بخۆم. من باسی ژیانی خۆیم لێپرسی لەگەڵ ئەنوەر ساداتدا بەتایبەت لەو ماوەیەدا کە سادات دەستپێشخەرییە ئازاکەی راگەیاندو سەردانی کەنیسەی ئیسرائیلی کرد لە قودسدا (مەبەست پەرلەمانی ئیسرائیلە) ئەو هەنگاوەی کە رێکەوتننامەی کامپ دیڤیدی لێکەوتەوە. جیهان سادات پێی وتم پاش ئەو هەمو کردارو گفتارانە هەرگیز باوەڕم نەدەکرد سادات بەو شێوەیە بگۆڕێت و بۆی باس کردم کە چۆن جارێك لە ژوری میوانی کۆشکەکەی خۆیاندا بەئاشکرا روبەڕوی بۆتەوەو پێی وتوە:

+ وابزانم دەتەوێت سەردانی ئیسرائیل بکەیت.

- بەڵێ راستە

+ پاش ئەو هەمو قسانەی کە کردونت چۆن دەتوانیت شتی وا بکەیت؟

- من پێشتر هەڵە بوم، کاری راست ئەوەیە سەردانی ئیسرائیل بکەم

+ بەڵام ئیتر نە دەتوانیت سەرکردایەتی جیهانی عەرەبی بکەیت و نە پشتگیریشت دەکەن.

- هەرچەندە بڕواناکەم شتی وا روبدات، بەڵام ئەو ئەگەرەشم لەبەرچاو گرتوە.

+ رەنگە پۆستەکەشت لەدەست بدەیت و لە سەرۆکی لات ببەن.

- بە دوری نازانم.

+ رەنگە تیاشیدا بچیت (وەك دەزانن دواتر تیرۆر کرا)

- چارەنوسی مرۆڤ نوسراوەو من ناتوانم یەك خولەك لەوەی بۆم نوسراوە کەمتر یاخود زیاتر بژیم.

کە ئەمەی وت، جیهان باوەشی پیادا دەکات و دەڵێت تۆ مەزنترین مرۆڤیت لە ژیانمدا ناسیبێتم.

پاشان من لە خاتو جیهان ساداتم پرسی، کاتێك سادات لە ئیسرائیل گەڕایەوە کاردانەوەی خەڵکی میسر چۆن بو؟

جیهان وتی ڕێگەی نێوان فڕۆکەخانە بۆ کۆشکەکەی ئێمە لەکاتی ئاساییدا ٢٠ خولەك دەخایەنێت بەڵام ئەو ڕۆژە ٢ سەعاتی خایاند. جادەو ڕێگاوبانەکان بەرنەدەکەوتن، سەدان هەزار کەس هاتبون بۆ پێشوازیی سڵاولێکردنی سادات و پشتگیریکردنی ئەو هەنگاوەی. ئەوانە هەر ئەو کەسانە بون کە حەفتەیەك پێشتر بۆ پشتگیریکردنی هەڵوێستێکی پێچەوانەی ئەم هەڵوێستە چەپڵەیان بۆ لێ دەدا. خەڵکەکە دەیانزانی سادات ئەوکارە ئەنجام دەدەت کە بەڕاستی دەزانێت. زیرەکی ڕۆحی نیعمەتێکە لە نیعمەتەکانی زیرەکی سۆزداری. ئەم جۆرە مرۆڤانە دەزانن کە ناتوانن لە جیهانێکدا گۆشەگیر ببن کە خەڵکەکەی پشتیان بەیەکدی بەستووە.

سادات کارێکی کرد کە خودی خۆی و زیرەکییە سۆزدارییەکەی بکەونە ژێر کۆنترۆڵی زیرەکییە ڕۆحییەکەیەوە، واتە کارێکی کرد کە هەستی کۆمەڵایەتی و مەیل‌و شارەزاییە کۆمەڵایەتییەکانی بکەونە ژێر کۆنترۆڵی ویژدانییەوە. بەم کارەش ئەنجامێکی بەدەستهێنا کە دنیای هەژاند. سادات جڵەوگەی رادەستی زیرەکی ڕۆحی کردو بەمەش ئاستی زیرەکییەکانی دیکەی خۆی بەرزکردەوەو بو بە کەسایەتیەك کە خاوەنی دەسەڵاتێکی ڕەوشتی بەرز بێت. پەروەکردنی ئەو ڕێگەیەش کە مرۆڤ دەگەیەنێتە دەسەڵاتی ڕەوشت وای لێ بکات کاریگەریی باش لەسەر دەوروبەرەکەی دروست بکات‌و لە خودی خۆی ڕازی ببێت مەسەلەیەك نییە تەنیا هەر سەرکردە مەزنەکان بتوانن بیگرنەبەر.

هەر یەکێك لە ئێمە دەتوانێت دەسەڵاتێکی ڕەوشتیی هێمن و سادەو مەزن بهێنێتەدی.

## گەشەپێدانی چوار زیرەکییەکە

لەبەرئەوەی چوار ڕەهەندەکە بەتەواوی چون بەناویەکدا، ئێمە ناتوانین تەنیا لەسەر تاقە (یەك) ڕەهەند کاربکەین بێئەوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەر ڕەهەندێکی دیکە بکەوین. بەکارهێنانی ئەم زیرەکییانەو پەرەپێدانیان وا لە مرۆڤەکە دەکەن متمانە بەخۆبوونیی بۆ دروست ببێت و لەناخەوە هەست بە هێزێکی گەورەو بە ئاسایش و هێمنی بکات. لەهەمان کاتیشدا ئازایەتی تێدا دروست دەکات و وای لێ دەکات

ڕێز لە دەوروبەر بگرێت و ڕەچاویان بکات و هەروەها دەسەڵاتێکی ئەخلاقی تایبەتیش پێدەبەخشێت. تۆ ئەگەر هەوڵ بدەیت ئەم زیرەکییانە لە خودی خۆتدا برەو پێبدەیت، ئەوا بەڕێگاو شێوازی جۆراوجۆر دەوروتەئسیریت لەسەر دەوروبەرەکەت زیاد دەکات و ئیلهامیان پێدەبەخشیت کە ئەوانیش دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە.

من بۆ هاوکاریکردنت لە گەشەپێدانی چوار زیرەکییەکەتدا، لەکۆتایی ئەم کتێبەدا ڕێنماییەکم بۆ ئامادەکردویت کە چەند ڕێگەیەکی زانستی باش ئامادەکراوی لەخۆگرتووە بۆ برەودان بە هەرچوار جۆرەکەی ئەو زیرەکییانە.

ڕێنماییەکە لە پاشکۆی ژمارە (یەک)دا؛ پێشخستنی تواناکان و چوار زیرەکییەکە ڕێنماییەکی کردەنی بۆ دەستبەکاربون کە لە لاپەڕە (٤٥١) دەیبینیت و ڕەنگە هەندێک بابەتی ناوڕێنماییەکەت بەلاوە سادەو ئاسان بێت و بڵێیت جا ئەوە چییە، خۆ هەمو کەس دەیزانێت؟! بەڵام بیرت نەچێت کە مەرج نییە ئەو مەسەلە سادەو لۆجیکی و باوانە بە کردەوش هەموکەس پەیڕەویان بکات. من دڵنیات دەکەمەوە کە ئەگەر تواناکانی خۆتت لە برەودان بەو بوارانەدا خەست کردوە ئەوا هێزێکی گەورەو ئاسایشێکی قوڵ بۆ ژیانت مەیسەر دەبن.

> لەپشت هەمو ژیانێکی جوامێرانەوە کۆمەڵە پرنسیپێک هەن ئەو ژیانەیان داڕشتوە
>
> - جۆرج ئێج لۆریمیر

من بە ئەزمونی خۆم بۆم دەرکەوتوە کە ئەگەر چوار گریمانەی سادە بخەینە ژیانمانەوە دەتوانین ڕاستەوخۆ ژیانێکی بەهێزتر و هاوسەنگتر و تەواوتر بژین.

گریمانەکان سادەو ساکارن — هەر گریمانەیەک بۆ بەشێک لە بەشە پێکهێنەرەکانمان. بەڵام بەڵێنت دەدەمێ ئەگەر بەردەوام ئەو گریمانانە جێبەجێ بکەیت ئەوا سەرچاوەیەکی نوێ لە هێز و هاوسەنگی ناوخۆ لە ناختدا دەتەقێتەوەو دەتوانیت لە کاتی پێویستدا هەرچیەکت حەز لێ بو، بە ئاسانی هەڵیبهێنجیت.

١. لە پێناوی جەستەدا — گریمان توشی جەڵتەیەکی دڵ بوین، پێویستە ئیتر بەپێی ئەوە بژین.

٢. لە پێناوی ئەقڵدا: گریمان ئەم پیشەیەت تەنیا بۆ ماوەی دوو ساڵە، پێویستە ئیتر خۆت وا ئامادە بکەیت کە تەنیا دوو ساڵ لەسەر ئەو کارە بەردەوام بیت.

٣. لە پێناوی دڵدا: گریمان خەڵکەکەی دەوروبەرت هەمو شتێکت بە قسە دەکەن. ئیتر پێویستە بەو بڕیە قسە بکەیت.

٤. لە پێناوی رۆحدا: وا دابنێ هەر سێ مانگ جارێك دووبەدوو لەگەڵ خودای خۆتدا روبەڕو دەبیتەوە. کەواتە پێویستە بەجۆرێك بژیت ئامادەی ئەو دیدارە بیت.

## فیلمی: قوتابخانەی ئەی بی کۆمبسی سەرەتایی

ئایا ئێمەی مرۆڤ لە کام قۆناغی ژیانماندا دەتوانین گەشە بدەین بە دەسەڵاتی رەوشتیمان و بەو هێزە ناوخۆییەی کە لە چوار زیرەکییەکەوە سەرچاوە دەگرێت؟ وەڵامی ئەو پرسیارەت لە فیلمەکەدا بۆ باس دەکەم کە پاش کەمێکی دیکە دەیبینیت. فیلمەکە چیرۆکی خانمە بەڕێوەبەرێکی قوتابخانەی (ئەی بی کۆمبس)ی سەرەتاییە (k-5) لە (رالای) لە ویلایەتی کارۆلینای باکور و یەکێکە لە قوتابخانەکانی (ماگنێت Magnet) و ئەرکەکەی بریتییە لە پێگەیاندنی سەرکردەی کۆمەڵگا. فیلمەکە جوانترین کاژێر لە کاژێرەکانی ژیانی ئەو خانمە بەڕێوەبەرە نیشان دەدات کە هەرچەندە من باوەڕم وایە لە ئایندەدا چەندین کاژێری دیکەی جوان دەبینێت. بەڵام بەرلەوەی فیلمەکە ببینیت، با لێت بپرسم بڵێم: باشترین قۆناغی ژیانت کامەیە کە بەرنامەیەکت فێر بکات چۆن دەنگی تایبەتی خۆت بدۆزیتەوە؟ لە ژیانی مرۆڤدا باشترین قۆناغ کامەیە بۆ فێربونی رۆشنبیرییەك وای لێ بکات بە تەواوی لەگەڵ ئەو نیعمەتە بەنرخانەدا بگونجێت کە پێمان بەخشراون؟ وابزانم لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هەمومان دەڵێین گونجاوترین قۆناغی تەمەن بۆ ئەو مەبەستە قۆناغی منداڵی و ژیانی سەرەتایی ناوماڵە. بەڵام ئەی ئەگەر ئەو کەسە بە قۆناغێکی خراپی ژیانی سەرەتایی ناوماڵدا رۆیشت و تەنیا فێری ئەوەیان کرد هەر بۆڵەبۆڵ بکات و رۆڵی قوربانی ببینێت و خۆی بەوانی دیکە بەراورد بکات و بەردەوام رەخنە بگرێت. ئایا قوتابخانە دەتوانێت رۆڵێکی چاکتر بگێڕێت؟ ئایا مامۆستا یاخود بەڕێوەبەری قوتابخانە دەتوانێت جێگەی باوکەکە بگرێتەوە بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەو کەموکوڕییەی کە لە قۆناغێکدا لە ماڵەکەیاندا هەیە کە منداڵەکان بچکۆلەن و بە ئاسانی کاریان تێدەکرێت و هێشتا هەر وەکو پەپولە پاکن و لەرێ لایان نەداوە؟

بەلگە زانستییەکان، بەتایبەت ئەوانەی دەمارناسی (نیورۆساینس Neuroscience) کە تایبەت بە چۆنێتی کارکردنی مێشکی مرۆڤە – دەڵێن منداڵ بە شێوەیەک دارێژراوە و بۆ ئەوە دارێژراوەکە پەیوەندی هەبێت. ئێمە بۆیە ئەم نیعمەتانەمان هەیە بۆ ئەوەی پەیوەندی دروست بکەین لەگەڵ خەلکیدا و لەگەڵ واتا رەوشتی و رۆحییەکان. هەروەها لەگەڵ ئەودیوی رەهەندە مادییەکەی بونیشدا .. پەیوەندیکردن پێویستییەکی بنەرەتی مرۆڤە. مەیسەرکردنی ئەم پێویستییە مەسەلێکی هەرە گرنگە بۆ پاراستنی تەندروستی مرۆڤ و گەشانەوەی ژیانی.
راپۆرتێک بۆ نەتەوە دەربارەی ئەو منداڵانەی کە هەرەشەیان لەسەرە- بەشێک لە ئەرکێکی هاوبەش کە قوتابخانەی پزیشکی دارماون و پەیمانگای بەها ئەمریکییەکان و دەزگای وای ئێس ئێم ئەی پێکەوە ئەنجامیان داوە

دیارە لەمەش چاکتر هەیە. بۆ نمونە هاوئاهەنگی نێوان خێزان و قوتابخانە بەجۆرێك کە هەردولا پەیوەندی و هاوکاریی بەردەوامیان لەگەڵ یەکدیدا هەبێت دەربارەی منالەکە. ئایا دەزانیت رێکخستن و هاوئاهەنگیکردنی پرۆگرامە سەرەکییەکە (Hard ware) لەگەڵ پرۆگرامە پێشکەشکراوەکەدا (Software) لە سالانی یەکەمی ژیانی منالدا چ کاریگەرییەکی دەبێت و بە سود وەرگرتن لە خەسلەتە تایبەتەکانیان و لە تواناو بەهرەکانیان دەتوانن چ ئەنجامگەلێکی مەزن بەدەست بهێنن.

فیلمەکە لەروی هونەرییەوە فیلمێکی باش نییە. زیاتر لە فیلمێکی بەرهەمهێنراوی ناوماڵ دەچێت وەکو لەوەی پیشەوەرانە بەرهەم هێنرابێت.

فیلمەکە سەبارەت بە هاوکارییەکی مەزنی نێوان قوتابخانەکە و ماڵی قوتابییەکانە، ئەو هاوکارییەی کە خاتو (مۆریل تۆماس سومەرز) رۆڵی گرنگی تێدابینی.

خاتو سومەرز باوەرێکی تەواوی بەوە هەبوە کە دەتوانرێت لەرێی پەروەردە و فێرکردنەوە کەسایەتییەك دروستبکرێت پشت ببەستێت بە پرنسیپەکان، ئەمیش لەرێی پرۆگرامێکی تایبەتی قوتابخانەی سەرەتاییەوە (بۆ منالانی تەمەن ٥ تا ١٠ سال) و هەروەها بەشداریکردنی مامۆستاکان و پشکنێرەکان و خێزانەکان بۆ ئامادەکردنی ئەو جۆرە کەسایەتییە. خاتو (سومەرز) بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە حەوت خووەکەی کەسانی هەرە کاریگەری کردە بەرنامەی کاری خۆی.

لە کۆتایی کتێبەکەدا، لەرێی کارکردنەوە، دەبینێت چۆن ئەو حەوت خووە جوارچێوەیەکی بەهێز دروست دەکەن بۆ گەشەدان بە زیرەکییەکان بەتایبەت بە زیرەکی سۆزداریی.

ئەوی راستی بێت تۆزێك شەرم دەکەم فیلمەکەتان پێشکەش بکەم چونکە باسی خووەکانی کۆڤی دەکات (واتە خۆم). لەبەرئەوە کاتێك کە سەردانی قوتابخانەکەم کرد بۆ هەمویانم رونکردەوە کە ئەو خووانە بریتین لە کۆمەڵێك پرنسیپی هەمیشەیی و جیهانی و بۆ هەمو مرۆڤەکانە و رۆڵی من لەو مەسەلەیەدا تەنیا رێکخستنیان بووە لە جوارچێوەی بیرکردنەوەیەکی ریزبەندکراوی کردەنیدا. لێرەدا من ئاماژە بە وتەیەکی (تی. ئێس. ئیلیوت) دەکەم کە دەڵێت: پێویستە بەردەوام خەریکی گەڕان و دۆزینەوە بین. چونکە لە کۆتایی هەمو دۆزینەوەیەکدا دەگەینە خاڵی سەرەتاو سەرلەنوێ بۆ یەکەمجار بابەتەکە دەناسین.

لە ئاهەنگی قوتابخانەکەدا، کە لە فیلمەکەدا دەیبینین، مناڵە بچوکەکان خۆیان ئاهەنگەکەیان رێك خستوەو وتارەکانیان پێشکەش کردوە. ئەو کەسانە تایبەتین کە لە ریزی پێشەوە دانیشتون بەڵام گوێت لە گریانی مناڵ دەبێت، ماناى وایە لەوێن.

فیلمەکە بۆت دەسەلێنێت کە هاوبەشیکردنە راستەقینەکە هاتۆتەدی و بنەماکانی بەرپرسیارێتی و دیاریکردنی ئامانجەکە و پێکەوە گونجان دەستنیشان کراون و بیر لەوە کراوەتەوە سودەکە هەموان بگرێتەوە و هەوڵ بدرێت بەرامبەرەکە درك بکرێت پێش ئەوەی داوای لێ بکەیت تێت بگات. هەروەها هاریکاریکردن و تیژکردنەوەی مشارەکەش خراوەتە پرۆگرامی ئەو قوتابیانەوە.

زۆرکەس باوەڕی وایە هیچ پەیوەندییەکی راستەقینەیی نییە لەنێوان کەسایەتی خوێندکار و مەسەلە ئەکادیمییەکاندا. هەروەها واش هەست دەکەن فێربوون و پرنسیپەکان هیچ پەیوەندییەك پێکیانەوە نابەستێت. بەڵام لێرەدا خاڵێکی گرنگ پێویستە جەختی لێ بکەینەوە کە مەسەلەی ئەوەی مرۆڤ هەوڵ بدات دەنگی خۆی بدۆزێتەوە لەگەڵ ئەو چەمکەدا تەواوکەری یەکترین کە ببێتە سەرمەشق و ئیلهامبەخشی ئەوانەی دیکە بۆ دۆزینەوەی دەنگی تایبەتی خۆیان. ئەم پەیوەندییە زیرەکییەکانمان و تواناکانمان کامڵ دەکات و هێزە شاردراوەکانی ناخمان ئازاد دەکات.

من خۆم لە خانمی بەڕێوەبەرم پرسی کە ئایا راهێنانی قوتابی لەسەر فێربونی

پرنسیپەکان، هیچ کاریگەرییەکی هەبوە لەسەر ئاستی ئەکادیمییان؟ لە وەڵامدا پێی وتم بەڵێ ئەو راهێنانە کاریگەرییەکەی بەرچاوی هەبوە "ساڵ و نیوێك لەمەوبەر رێژەی ئەو قوتابیانەی پلەی (باشە) و بەرەو ژورتریان وەرگرتوە ٧٦٪ بوە، بەڵام ئێستا بەهۆی راهێنانەکەوە ئەو رێژەیە بۆتە ٩٤٪.

تکایە بیر لە گرنگی قسەکانی ئەو خانمە بەڕێوەبەرە بکەنەوە خێزانەکان هەر هەمان خێزانن، ئاسانکارییەکان هەمان ئاسانکاریی جارانن، مەنهەجە سەرەکییەکەو بابەتی وانەکان هەمان مەنهەج و بابەتی پێشون، پۆلەکان هەمان پۆلن. تاقە شتێك کە گۆڕانی بەسەردا هاتوە و تەنیا ماوەی ساڵو نیوێك خراوەتە ناو وانەکان و ناو ژیانی قوتابییەکانەوە، ئەوپرنسیپانەیە کە پێویستە کەسایەتیی مرۆڤییان لەسەر دروست بکرێت.

ئاخۆ ئەو بەرنامە راوەستاوەی سەر پرنسیپ و ئازادیی هەڵبژاردن ئەگەر تێکەڵی ئەو نیعمەتە بەنرخانە بکرێت چ ئەنجامێکی دڵڕفێن و سەرنجڕاکێشی دەبێت، بەتایبەت ئەگەر تێکەڵاوکردنەکە لەناو خێزان ولە قوتابخانە سەرەتاییەکانی سەرتاسەری دنیادا ئەنجام بدرێت کە ئەو منداڵە بچوکانە لەخۆ دەگرن کە دروستکەری ئایندەن. وەڵامەکە وەڵامی ئەو گیروگرفتەشە کە دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری کۆمپانیای ڤیزا ئینتەرناشناڵ (Visa International) باسی دەکات و دەڵێت: کێشەکە ئەوە نییە بیرۆکەی داهێنەرانەی نوێ لە مێشکی خۆتدا بخولقێنیت، بەڵکو لەوەدایە کە بیروبۆچونە کۆنەکان لەکۆڵ بکەیتەوە.

پێش ئەوەی فیلمەکە ببینیت، حەزدەکەم دوا وتەت پێبڵێم. (دیواری عاجباتیەکان) کە باسی دەکەن و داوایان لە من کرد پەردەی لەسەر لابدەم زۆر باش دیار نییە. بەڵام بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە چەندین پارچە سیرامیك پێکهاتوە و هەر پارچەیەکی لەلایەن منداڵێکەوە رەنگ کراوەو دواتر هەمویان بە شێوەیەك ریزکراون کە تابلۆیەکی جوانی لێ دروست بوە: تابلۆکە لە ناوەڕۆکدا باسی چوار پێکهێنەرە سەرەکییەکە دەکات کە بە چوار پێویستییەکە بەرجەستە دەکرێن. پێویستی ژیان و خۆشەویستی و فێربوون و جێهێشتنی شوێن دەست، خۆت کە فیلمەکە ببینیت بۆت دەردەکەوێت، هەر هەموی راستەقینەو خۆڕسکن. نە ئامادەکراوەو نە نمایشکراوە. قوتابخانەکە ٥٦ قوتابی لەخۆ دەگرێت سەر بە نەتەوەو رەگەزی جیاجیا. من کە گەیشتمە قوتابخانەکە تەماشام کرد زۆربەی قوتابیەکان جلوبەرگی میللی تایبەت بە خۆیان پۆشیوەو هەریەکە و ئاڵای وڵاتەکەی خۆی هەڵگرتوە. قوتابخانەی ئەی بی کۆمیس ژمارەیەك خەڵاتی گرنگی بە دەست هێناوە لەوانە:

١. قردێلەی شینی نیشتمانی بۆ قوتابخانەی هەڵکەوتو لەلایەن وەزارەتی پەروەردەی ئەمریکاوە.
٢. خەڵاتی نیشتمانی بۆ قوتابخانە هەڵکەوتوەکان (ماگنێت) بۆ ماوەی سێ ساڵ – لەلایەن دەستەی قوتابخانە نیشتمانیەکانی ماگنێتی ئەمریکییەوە. هەروەها خرایە لیستی باشترین پێنج قوتابخانەوە لەناو هەزاران قوتابخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکاندا چونکە ٩٨٪ی قوتابییەکان پلەی باشە و سەرو باشیان بەدەست هێنا.
٣. خەڵاتی کارۆلینای باکور بۆ قوتابخانەی نایاب سەبارەت بە دەستکەوتە ئەکادیمیەکانی.
٤. خەڵاتی حاکمی باکوری کالیفۆرنیا (سەبارەت بە هەڵکەوتویی لە شێوازی سەرکردایەتیکردن و پەیڕەویکردنی شێوازی سەرکێشی لە فێرکردندا.
٥. خەڵاتی رەوشتی قوتابخانە نیشتمانییەکان.
٦. ساڵی ٢٠٠٤ بانگهێشت کرا لە کۆنگرەی قوتابخانە نمونەییەکاندا.
٧. ساڵی ٢٠٠٤ گەیشتە قۆناغی کۆتایی ئەوپێشبڕکێیە، کە بە خەڵاتی سەدەی بیستویەك ناسراوە وتایبەتە بە دەزگا پەروەردەییە نایابەکان.

کاتێکی خۆش لەگەڵ فیلمەکەدا

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: پێکهێنەری بنەڕەتی کەسایەتی مرۆڤ چییە؟

ئایا سروشتە؟ (خەسڵەتە بۆماوەییەکان) یاخود پەروەردەیە؟ (بارودۆخی دەوروبەرمان و شێوازی پەروەردەبونمان).

وەڵام: لە ناخی ئەم پرسیارەدا گریمانەیەکی هەڵە خۆی حەشارداوە. پرسیارەکە لەوتێڕوانینە (پارادیمە) هەڵەیەوە سەرچاوەی گرتوەو بە هەڵە لە سروشتی مرۆڤ تێگەیشتوە و وادەزانێت مرۆڤ لە ژیاندا (موسەیەرە) و هیچ شتێك بەدەست خۆی نکیە. ئێمەی مرۆڤ نە دەرەنجامی سروشتین و نە دەرەنجامی پەروەردە، بەڵکو دەرەنجامی هەڵبژاردنەکانی خۆمانین چونکە هەمیشە لەنێوان کارلێکەرو کاردانەوەدا ماوەیەك و پانتاییەك هەیە. مرۆڤ ئەگەر بە حیکمەتەوە مەشق لەسەر بەکارهێنانی تواناکانی هەڵبژاردن بکات بەجۆرێك کە پشت بە پرنسیپەکان ببەستێت، پانتاییەکە

گەورەتر دەبێت. منالی بچوک و مرۆڤی بیرکوڵ ڕەنگە ئەو پانتاییەیان نەبێت، بەڵام زۆربەی زۆری گەورە ساڵان هەیانە. هەستکردن بەوەی ئێمەی مرۆڤ موسەیەرین و هیچ بڕیارو کردارێک بەدەست خۆمان نییە، بیروبۆچوونێکە ڕەگی قوڵی لە کەلتور و ڕۆشنبیری ئەمڕۆدا هەیە. مرۆڤ بۆیە خۆی بە خاوەن بڕیار و دەسەڵات (موخەیەر) نازانێت و باوەڕی وایە لە هەمو شتێکدا (موسەیەرە) چونکە هەستکردن بەوەی کە ئێمە ئازادین لە بڕیارو هەڵبژاردنەکانماندا مانای وایە بەرپرسیاری ئەم واقیعەی ئێستاشمانین. مرۆڤ هەتا ئەگاتە ئەو ئاستەی بە ڕاستگۆیی بڵێت (بەڵێ من ئەمەم) و (حاڵی ئێستام ئەنجامی بڕیارو هەڵبژاردنەکانی خۆمە) ناتوانێت بە بڕیار و متمانەی تەواوە بڵێ (شتێکی دیکە هەڵدەبژێرم).

پرسیار: سەرکردەکان لەدایک دەبن یاخود دروست دەکرێت؟ ئایا سروشت و ڕاهێنان دەتوانن سەرکردە دروست بکەن؟

وەڵام: ئەم پرسیارەش، هەروەک پرسیارەکەی سەرەوە، لەسەر گریمانەیەکی هەڵە دروست بوەو لەو گۆشەنیگایەوە سەرچاوەی گرتوە کە مرۆڤ موسەیەرە. بونی ئەو پانتاییەی نێوان کارلێکەروکاردانەوە مانای وایە سەرکردە نە لەدایک دەبێت و نە دروست دەکرێت. بەڵکو خۆی خۆی دروست دەکات لەڕێی ئەو بڕیارو کاردانەوانەی کە هەڵیان دەبژێرێت.

ئەگەر هەڵبژاردنەکانیان لەسەر بنەمای پرنسیپەکان بون و هەمیشە خۆیان لەسەر دیسپلینی زیاتر ڕاهێنا. ئەوا ئازادی هەڵبژاردنیان زیاتر دەبێت.

هەردوو نوسەر (وارن جی. بینیس) و (ڕۆبەرت جی. تۆماس) لە کتێبە هاوبەشەکەیاندا (ڕەفتارە سەیرەکان: بنەماکان و جرکەساتە چارەنوسییەکان و قۆناغە مێژوییەکان چۆن سەرکردەکان دادەڕێژن)دا بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە سەرکردەکان لەدایک نابن بەڵکو دروست دەبن. بیرۆکە سەرەتاییەکەی ئەو کتێبە دەڵێت کە سەرکردە ئەنجامی ئەزمونێکی بەهێزی قۆناغی گواستنەوەیەو بڕیارگەلی وا بەرهەم دەهێنێت کە دەیکەنە سەرکردە.

هەروەک دکتۆر/ نۆئیل تایکی Dr. Noel Tichy دەڵێت سەرکردە لە دایک نابێت بەڵکو فێر دەکرێت.

کەواتە کرۆك و گەوهەری مەسەلەکە ئەوەیە کە سەرکردە بۆیە دەبێتە سەرکردە چونکە فێربونی هەڵبژاردەو بڕیاری داوە رێنماییەکان پەیڕەو بکات.

پرسیار: ئایا پێویست دەکات مرۆڤ هەر چوار زیرەکییەکەی خۆی گەشە پێبدات؟

وەڵام: بەڵێ. چونکە زیرەکییەکان چون بەیەکدا و مرۆڤ ناتوانێت هیچکام لەو زیرەکیانە تا ئاستی پێگەشتنی تەواو گەشە پێبدات ئەگەر هەمویان پێکەوە کارنەکەن. ئەمە پێی دەوترێت رێکخستن. واتە هەموزیانت لەسەر پرنسیپەکان رێك بخەیت. توانای بەرهەمهێنان و چێژوەرگرتن ئەرکێکە رەوشتمان جێبەجێی دەکات و پەیوەستە بەوەی تا چەند راستو راستگۆین. ئەم کارە پێویستی بە ئەرکو تێکۆشانی بەردەوام هەیە بۆ پتەوکردنی تێکڕای ماسولکە جەستەیی و سۆزداری و فیکری و رۆحییەکان.

ئەمیش تەنیا بەوە دەکرێت لە ناوچەی ئیسراحەتی تایبەتی خۆمان بێینە دەرێ و دەست بکەین بە راهێنان کە جاربەجار ئازاریشمان پێدەگەیەنێت. (دڕانی ماسولکەکان) بەڵام دواتر خۆی چاك دەبێتەوەو لە جاران گەورەتر و بەهێزتر دەبێت. تکایە تەماشای کتێبی (هێزی خۆتەرخانکردن) بکە لە نوسینی جیم لوهیر وتۆنی شوارتز (١٨)

پرسیار: رات بەرامبەر خانەنشینی چییە؟

وەڵام: خۆت لە کارەکەت خانەنشین بکە بەڵام هەرگیز دەستبەرداری پرۆژەی باش مەبە کە واتادارن و مانایان هەیە. ئەگەر دەتەوێت زۆر بژیت پێویستە بە قوڵی هەست بە واتای شتەکان بکەیت و بەشداریی بکەیت لە پرۆژەو مەسەلە گرنگەکاندا بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندییان بە خێزانەکەت و بە نەوەکانی داهاتووەوە هەیە.

خۆ ئەگەر دەتەوێت زوو بمریت خۆت خانەنشین بکەو دەست بدەرە تەمبەڵی و خوو بدەرە دەرمانخواردن و کوڕەزاو کچەزاکانت تەنیا هەر جەژناو جەژن ببینە.

برواناکەیت؟ تەماشای کتێبی (دڵەڕاوکێ لەپای هیچ) بکە لە نوسینی هانس سیلی. (Hans Selye)

# بەشی پێنجەم

## گوزارشت لە دەنگی خۆت بکە –دید، دیسپلین، سۆز، ویژدان.

بە تواناترین مرۆڤ ئەو کەسەیە بتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات

- لوسیۆس نامایۆس سینیکا




شێوەی ٥–١

بە وردبونـەوە لـە ژیانی کەسایەتییە مەزنـەکانی مێـژو کە دەستکەوتی گـەورەیان بەدیهێناوە – واتە ئەوانەی کە کاریگەریی مەزنیان لەسەر خەڵکانی دیکە جێهێشتوە و بەشداریی بەرفراوانیان هەبوە لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا و روداویـان دروست کردوە، یەک خاڵی هاوبەش تێبینی دەکەین کە هەمویانی کۆکردۆتـەوە؛ ئـەم مرۆڤـە مەزنانـە لەرێی تێکۆشانی بەردەوام و فیداکارییـەوە چوار زیرەکییـە تایبەتەکـەی خۆیانیان بـە شێوەیەکی گەورە برەو پێداوە. باڵاترین گوزارشت لـە چوار زیرەکییـەکانمان بـەم چوار وشەیە بەرجەستە دەبێت، دید (خـەون) و دیسپلین و عیشق و ویـژدان. دیـد (خـەون) گوزارشتە لە زیرەکی ئەقڵی، دیسپلین گوزارشت لـە زیرەکی جەسـتەیی دەکات و عیشق (جـۆش‌وخرۆش) گوزارشـتە لـە زیرەکـی سـۆزداریی، ویـژدانیش گوزارشـت دەکـات لـە زیرەکی رۆحیی. ئـەم چوار بابەتـە بـەرزترین ئامرازیشـن بـۆ گوزارشـتکردن لـە دەنگی تایبەتی خۆمان.




شێوەی ٥–٢

دید (خەون)؛ بریتییە لەوەی بابەتێک بە چاوی ئەقڵ ببینیت کە دەتوانرێت بەدی بهێنرێت لەناو خەڵکێکدا یاخود لەناو پرۆژەکاندا یاخود لە بوارە جیاجیاکانی کاردا.

دید کاتێك لەدایك دەبێت کە ئەقڵمان دەست دەکات بە کۆکردنەوەی پێویستیەکان لەگەڵ ئەگەرو تواناکاندا. ویلیام بلاك دەڵێت، "ئەوەی ئەمڕۆ بەدی هاتووە دوێنێ بیری لێ کراوەتەوە". مرۆڤ کاتێك دیدی نوقسان دەبێت و توانا ئەقڵییەکانی خۆی گەشە پێنادات بۆ داهێنان، دەبێتە نێچیری ئەو ئارەزووەی کە دەیەوێت ڕۆڵی قوربانییەکە بگێڕێت.

(تەماشای ڕارەوی خوارەوەی شێوەی ٥-١ بکە).

دیسپلین: گۆڕینی هەموخەونێک بۆ واقیع نرخێکی هەیە. دیسپلین لەوەیە نرخەکە بدەیت.

> ئەو کەسەی دەیەوێت ببێتە سەروەر، پێویستە یەکەمجار سەروەری خۆی بێت
>
> فیلیپ ماسینجەر

بە پێناسەیەکی دیکە، دیسپلین مامەڵەکردنە لەگەڵ ڕاستەقینە تاڵەکەی ناو واقیع و بەرگەڕخستنی تەقەلای پێویستە بۆ دروستکردنی ڕوداوەکان. دیسپلین ئەوکاتە دێتەدی کە مرۆڤەکە دید و پابەندبون (ئیلتیزام) پێکەوە کۆبکاتەوە.

دیسپلین و پابەندبون دوو خەسڵەتن پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن قوربانی بدات و پێچەوانەکەشیان نوقمبونە لە چێژو ئارەزوەکاندا، واتە قوربانیدانە بە بابەت و مەسەلە مەزنەکە لەپێناوی چێژێکی کەمخایەندا.

بەڵام عیشق (جۆش‌وخرۆش) گڕتێبەربونی دڵ و خولیای دەرون و ئەوهێزەی بیرو باوەڕە کە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت دیسپلینی هەبێت و بەردەوام بێت لەسەر ئەو دیسپلینە تا خەونەکەی لەسەر واقیع دێتە دی.

جۆش‌وخرۆش ئەوکاتە لە دڵدا کڵپە دەسەنێت کە پێویستیەکی گرنگی مرۆڤایەتی لەگەڵ بەهرەیەکی بێهاوتای مرۆڤەکەدا بەیەك دەگەن. مەشخەڵی جۆش‌وخرۆش کە داگیرسا مانای وایە کەسەکە دەنگی تایبەتی خۆی دۆزیوەتەوەو ئەو دەنگەشی خستۆتە خزمەت ئامانجێکی مەزنەوە. بەڵام کاتێك جۆش‌وخرۆشی خامۆش دەبێت ئیتر کەسەکە چیدی هەست بە ئاسایش ناکات و ڤاووڤیز و غەڵبەغەڵبەکانی ناو کۆمەڵگا گەرم دەکەن. سەبارەت بە دەزگاکانیش پێویستە بڵێین سۆز و خۆشەویستی لە کارو پەیوەندییەکاندا دەبنە پێکهێنەری بەشێکی جۆش‌و خرۆشەکە.

ویژدان ئەو هەستە رەوشتییەی ناخی مرۆڤە کە راستو هەڵەی بۆ جیا دەکاتەوە. ویژدان هەستێکە پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێت ژیانێکی واتاداری وا بژی کە بتوانێت بەشدارییەکی گرنگ پێشکەش بە کۆمەڵ و دەوروبەرەکەی بکات.

> هەر کارێک ببێتە مایەی لاوازکردنی بیرکردنەوەی لۆژیکیت و ویژدانت سڕ بکات و لە خوداوەندت دوربخاتەوەو مەحرومت بکات لە تامکردنی چێژە رۆحیەکان، بە دڵنیاییەوە ئەو کارە لە ریزی گوناهەکاندایە تەنانەت ئەگەر خۆی لە خۆیدا کارێکی فریشتە ئاساش بو.
>
> - سۆزانا ویسلی

دید و دیسپلین و عیشق و ویژدان چوار بابەتن کە زۆر خەسڵەتی دیکەیانی پێوە پەیوەستە بەتایبەت ئەو خەسڵەتانەی کە مرۆڤە کاریگەرەکان هەیانن.

ئێمە لەناو کۆمەڵگاو لە بواری کاری تایبەت و کارە حکومیەکاندا کە وەسفی ئەو کەسانە دەکەین دڵبەستەیانین و پێیان سەرسامین. زۆربەی جیاوازیەکانمان تەنیا لەو وشانەدایە کە بەکاریان دەهێنین و گوزارشت لە (یەك) واتا دەکەن. تەماشای وێنەی (٥-٢) بکە بۆ بینینی ئەو خەسڵەتانەی کە بەشی نەبینراوی شاخە سەهۆڵەکەی دید و عیشق و ویژدان و دیسپلین پێك دەهێنن.




شێوەی ٥ — ٣

سەرکردە باشەکان خاوەن چوار رەهەندن: دید و رەوشت و تێگەیشتنی واقیع و ئازایەتی. سەرکردەی راستەقینە ئەگەر بیەوێت ئامانجی گرنگ بەدەست بهێنێت و پارێزگاری لە ئامانجەکەش بکات پێویستی بەو چوار زیرەکییەو بەو چوار شێوازی تێگەیشتن و پەیوەندییە هەیە ..

سەرکردەی خاوەنی خەونی مەزن بیر لە بەدیهێنانی ئامانجی مەزن دەکاتەوە. بە شێوازێکی نوێ بیردەکاتەوەو بیر لە ئایندەو روداوەکانی دەکاتەوە. سەرباری ئەمانەش و بگرە لەمانەش گرنگتر، پەیوەندییەکی بەردەوام دروست دەکات لەگەڵ قوڵاییەکانی ویژدانی مرۆڤ و لەگەڵ توانا داهێنەرانەکەی خەڵکیدا. پێویستە کۆنترۆڵی ئەو بابەت و نمونانە بکەیت کە کۆنترۆڵی ئەقڵت دەکەن. پێویستە بزانیت چۆن تەماشای دنیا دەکەیت و پێویستە بزانیت تۆ چیت لەدەست دێت و شایستەی چیت. ئازایەتی راستەقینە ئەمەیە.

پیتەر گۆیستن باوم - فەیلەسوفی ئیدارە

## دید و دیسپلین و عیشق ئەو خەسڵەتانەن کە حوکمی دنیا دەکەن

ئەگەر بە وردی سەرنج لە دەوروبەری خۆت و لە کتێبەکانی مێژو بدەیت دەبینیت هەمو ئەوانەی کە کاریگەری گەورەیان هەبوە لەسەر خەڵکی و لەسەر کۆمەڵگاو لەسەر دام‌ودەزگاکان یاخود شوێن دەستیان لە نەوەیەکەوە گواستوەتەوە بۆ نەوەیەکی دیکە یاخود گۆڕانێکی راستەقینەی باش یان خراپیان لەم جیهانەدا بەدیهێناوە، هەمو ئەوانە لە سێ خەسڵەتی گرنگدا هاوبەشن: دید و دیسپلین و عیشق. بە باوەڕی من لە دروستبونی مرۆڤەوە تەنیا ئەم سێ خەسڵەتە حوکمی جیهانیان کردوە. ئەم سێ خەسڵەتە گەوهەری سەرکردایەتی کاریگەرن.

بیر لەم سەرکردە ناسراوانەی مێژوی هاوچەرخ بکەرەوە.

جۆرج واشنتۆن: خەونی ئەوەی هەبو نەتەوەیەکی گەنجی یەکگرتوی ئازادی وا دروست بکات کە دەستێوەردانی دەرەکی قبوڵ نەکات. یەکەم کاری جۆرج واشنتۆن بریتی بو لە دیسپلینکردنی خودی خۆی و ناچارکردنی لەسەر فێربونی ئەو شێوازانەی کە خەڵك بەقسەی بکەن و ببنە سەرباز لە سوپای شۆڕشدا و مەشق بکەن و لە سوپادا بمێننەوە. کە رەفتاری نامرۆڤانەو پڕ لە سوکایەتی پەیڕەو دەکرا دژی ئەفسەری کۆلۆنییەکان هەروەها سیاسەتی بریتانییەکان بەرامبەر بەویلایەتە یەکگرتوەکان کە رێی گەشەکردن و فراوانبونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی دەگرت وایان لە جۆرج واشنتۆن کرد جۆش و خرۆشێکی گەورە بنوێنێت بۆ مەسەلەی سەربەخۆیی.

فلۆرانس نایتینگڵ: دامەزرێنەری بنەماکانی زانستی پەرستیاری هاوچەرخ، ژیانی خۆی لە نەخۆشخانە سەربازییەکاندا لە مەسەلەی پێشخستنی پەرستیاریدا بەخت کرد. خەون و جۆش‌وخرۆشی فلۆرانس نایتینگڵ زاڵ بون بەسەر بێ‌دەنگی و نهێنگرییەکەیدا.

موهانداس گاندی هەرچەندە نە بە هەڵبژاردن و نە بە دامەزراندن خاوەنی هیچ پۆست و مەقامێکی فەرمی نەبو، کەچی رۆڵێکی گەورەی بینی لە دامەزراندنی دەوڵەتی هیندەدا. دەسەڵاتە رەوشتییەکەی گاندی کۆمەڵێك پرنسیپی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی ویژدانە مرۆڤایەتییە کردبو کە لە کۆتاییدا بون بە ویستێکی سیاسی. گاندی درکی بەو لە ناخی بریتانییەکانیشدا بە شاردراوەی مابوەوە. لە ناخی میللەتەکەی و کۆمەڵی نێودەوڵەتی و تەنانەت

مارگێت تاچەر یەکەم ژن بو بتوانێت سەرکردایەتی نەتەوەیەکی پیشەسازی بکات. ئەو سێ جار هەڵبژێردرایەوە بۆ پۆستی سەرەك وەزیرانی بریتانیا و لە سەدەی بیستەمدا هیچ کەس هێندەی ئەو لە پۆستی سەرەك وەزیریدا نەماوەتەوە. دوژمنە سیاسییەکانی تاچەر کەم نەبون، بەلام ئەو بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە هانی هاوڵاتیانی دەدا لە ئاست بەرپرسیاریەتیەکەیاندا بن و پشت بە خۆیان ببەستن. تاچەر پشتگیرییەکی زۆری لە کەرتی تایبەت کردو توانی بریتانیا لە قەیرانی دارایی بپارێزێت.

بەهێزیی وەکو ژن وایە. ئەگەر ناچاربویت بە دەمی خۆت بڵێیت
من ژنم مانای وایە ژن نیت
- مارگێت تاچەر

نیلسۆن ماندێلا: سەرۆکی پێشوی باشوری ئەفریقا، بیست و حەوت ساڵی رەبەقی لە زینداندا بەسەربردو لەوێش بەردەوام هەر خەباتی دەکرد دژی سیاسەتی رەگەزپەرستانە. ئەوەی ماندێلای بەرێوەدەبرد بیرەوەرییەکانی نەبو، بەڵکو خەیاڵ و ئاواتەکانی بو .. ماندێلا لەرێی ئەزمونی خۆی و لەرێی بیرەوەرییەکانی ناو زیندان و ستەم و جەنگە خێڵەکییەکانەوە توانیویەتی بگاتە ئەو دۆخەی کە دنیایەکی جیاواز ببینێت.

لە قوڵایی رۆحی ماندێلادا باوەرێکی پتەو هەبو بە نرخ و بابەتی هەمو هاوڵاتییەکی باشوری ئەفریقا.

دایکە تێرزا: ئازاد و بەبێ مەرج و بەوپەری دڵسۆزییەوە خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتکردنی هەژاران. ئەم پابەندبونەشی بە پاکی و بە هەژاریی کە لە ئاستێکی بەرزی دیسپلینداڕبو، گواستەوە بۆ رێکخراوەکەی کە لەپاش مردنی خۆیشی گەشەی کردو و بەهێزتر بو.

بەرهەمی بێدەنگی نوێژە، بەرهەمی نوێژ بروایە، بەرهەمی بروا خۆشەویستییە،
بەرهەمی خۆشەویستی خزمەتکردنەو بەرهەمی خزمەتکردنیش ئاشتییە
- دایکە تێریزا

Scanned with CamScanner

بیرت ئەچێت من وتم ئەوانەی کە بە چاك‌و بە خراپ گۆڕانی راستەقینەیان دروست کردوە خاوەنی سێ خەسڵەتی هاوبەش بون؛ دید و دیسپلین و عیشق. ئێستا بیر لە کەسێك بکەرەوە کە خاوەنی هەرسێ خەسڵەتەکە بو، کەچی بوە هۆی ئەنجامگەلێکی ترسناك. ئەدۆڵف هیتلەر باوەڕی وابو رەگەزی ئاری لە هەمو رەگەزەکان باڵاترەو رایخی سێیەم، هەزار ساڵ دەژی، ئینجا هات بە جۆش‌و خرۆشێکی زۆرەوە ئەم خەون و باوەڕەی جێبەجێ کرد. کۆمەڵگایەکی پیشەسازی جەنگاوەری وای دروست کرد لە هەمو کۆمەڵگاکان دیسپلینی زیاتر بێت.

> ئەگەر دەسەڵات بگرمە دەست، یەکەمین و
> گرنگترین ئەرکم لەناوبردنی جولەکە دەبێت
> - ئەدۆڵف هیتلەر

هیتلەر خاوەنی زیرەکییەکی سۆزداریی نائاسایی بو. ئەم زیرەکییەی لە وتارە پڕ جۆش‌وخرۆشەکانیدا بەکارهێنا کە دڵی جەماوەری پڕدەکرد لە ترس‌و توندڕەویی. هیتلەر ئەم ترس‌و توندڕەوییەی کرد بە رق‌و وێرانکاریی. بەڵام جیاوازییەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەو سەرکردایەتییەی کە سەرکەوتنێکی کاتی بەدەست دەهێنێت و ئەوەی کە دەمێنێتەوە. تێکڕای ئەو سەرکردانەی کە باسمان کردن بەخشش‌و بەشداریی وایان هەبوە کە تائێستاش دەورو تەئسیریان ماون، جگە لە هیتلەر.

ئەگەر جڵەوی خەون و دیسپلین وجۆش‌وخرۆشت بەدەست ویژدانەوە بێت سەرکردایەتییەکە دەمێنێت و جیهان بەرەو باشتر دەبات.

واتا ئەوەی دەسەڵاتە فەرمییەکە کاریگەر دەکات دەسەڵاتە رەوشتییەکەیە کە دەڵێین بەرەو باشتر مەبەستمان لە سەرکردایەتییەکە (بنیات بنێت و بمێنێتەوە). هیتلەر خاوەنی دید و دیسپلین و عیشق بو، بەڵام ئەوەی پاڵی پێوە دەنا ویژدان نەبو، (خود) بو. خاڵە لاوازەکەی هیتلەر ئەوەیە کە ویژدانی نوقسان بو .. بە پێچەوانەوە ئەوەی خەونی گاندی و دیسپلین و جۆش‌وخرۆشەکەی ئەویان رابەرایەتی دەکرد یژدان بو. لەبەرئەوە گاندی بوە خزمەتکاری مەسەلەکەی خۆی و میللەتەکەی. گاندی تەنیا خاوەنی دەسەڵاتی رەوشتی بو، هیچ دەسەڵاتێکی فەرمی نەبو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بو بە باوك و بە دامەزرێنەری دووەمین گەورە دەوڵەتی دنیا.

کاتێك کە دەسەڵاتی ڕەسمی دێت و خەون و دیسپلین و جۆش و خرۆش ڕابەرایەتی دەکات بەڵام نە ویژدانی هەیەو نە دەسەڵاتێکی ڕەوشتی، ئەوا گۆڕانکاریەکەی بەرەو خراپتر دەبێت نەك بەرەو چاکتر. واتە لەبری ئەوەی شت بنیادبنێ، دەیڕوخێنێت و لەجیاتی ئەوەی بمێنێتەوە لەناو دەچێت.

ئێستاش با بە وردی و لە نزیکەوە تەماشای ئەو خەسڵەتانە بکەین کە بریتین لە دید و دیسپلین و عیشق و ویژدان.

## دید

دید (خەون) تەماشاکردنی ئایندەیە بە چاوی ئەقڵ. خەیاڵێکە دەتەوێت لەسەر زەمینی واقیع جێبەجێی بکەیت. هەمو شتێك دووجار دەخولقێندرێت. یەکەمجار لە ئەقڵدا و پاشان دووەم جار لە واقیعدا.

خولقاندن و داهێنانی یەکەمجار یاخود خەون (دید) لەڕاستیدا واتە دووبارە داڕشتەوەی خودی خۆت یاخود دەزگاکەت. بەرجەستەکردنی خەون و ئامانج و نەخشە و ئاوات و ئارەزوەکانە. بەڵام لەگەڵ فەنتازیادا جیاوازییان هەیە. ئەم خەونە هەقیقەتە بەڵام هێشتا لەسەر زەمینی واقیع بەرجەستە نەبوە. وەك نۆتەی ئەو پارچە مۆسیقایە وایە کە هێشتا لێنەدراوەو لە نەخشەی ئەو خانوە دەچێت پێش ئەوەی دروست بکرێت.

زۆربەمان بێئاگایان لەو تواناو بەهرانە کە هەمانن. ویلیام جیمس دەڵێت: زۆربەی خەڵك لەناوبازنەیەکی زۆر سنورداری توانا ڕاستەقینەکانیاندا دەژین. لە ناخی هەموماندا توانای شاردراوەی دەستپێشخەریی وبلیمەتیی هەیە. بەڵام سودی لێ نابینین چونکە لێیان ئاگادار نین.

هەمو مرۆڤێك تواناو ئیمکانیاتی زۆری هەیە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ ژیانی خۆی دابڕێژتەوە.

لەم چیرۆکەی خوارەوەدا دەبینیت چۆن ژنێکی خەمبار و ماتەمدار توانیوێتی دیدێکی نوێ بۆ ژیانی دابهێنێت:

تەمەنم ٤٦ ساڵ بو کە نەخۆشی شێرپەنجەیان لە مێردەکەمدا دەستنیشان کرد. من یەکسەر بێ هیچ دودڵییەک خۆم خانەنشین کرد (کە هێشتا زۆریشم مابوا بۆ ئەوەی خزمەتی بکەم و لەگەڵیدا بم. هەرچەندە مردنی ئەو ساڵونیوێک دوای

دەستنیشانکردنەکە شتێکی چاوەڕوانکراو بو، بەڵام من نوقمی دەریای خەم‌وپەژارە بوم و خەفەتم بۆ ئەو خەونە هاوبەشانەمان دەخوارد کە نەهاتنەدی. ئەوکاتە تەمەنم گەیشتبوە ٤٨ ساڵ و هیچ ئامانجێکم نەبو لەپێناویدا بژیم.

لەو ماوە خەماوییەدا پرسیارێک هەمیشە لە مێشکمدا دەزرنگایەوە کە بۆچی امەرگ مێردەکەمی هەڵبژارد و منیشی لەگەڵ ئەودا نەبردەوە؟

بەو جۆرە، منی بە جەستەو ئەقڵ و دڵ ماندو، خۆمم بینی بە شوێن واتایەکی تازەدا دەگەڕێم بۆ ژیانم.

ئەو بیرۆکەیە زۆر سەرنجی راکێشام کە دەڵێت شتەکان هەمویان دووجار لەدایک دەبن، یەکەمجار لە ئەقڵداو پاشان دووەمجار لە واقیعدا. پێویست بو لە خۆم بپرسم ئەو بەهرانە چین کە لە مندا هەن. تاقیکردنەوەیەکم بەئەنجام گەیاند بۆ ئەوەی توانا هەرە بەهێزەکانی خۆم بناسم: پاشان بۆ بەدەستهێنانی هەستکردن بە هاوسەنگی، جەختم کردەسەر چوار پێکهێنەرەکەی خودی خۆم. لەسەرئاستی ئەقڵی بۆم دەرکەوت کە حەزم لە مامۆستاییە. لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی و رۆحییش مەبەستم بو بەردەوام بم لەسەر ئەو رێبازەی کە من و مێردەکەم ویستمان بەرجەستەی بکەین. من و ئەو لە دوو رەگەزی لرەنگی پێستـا جیاوازبوین و بە هاوسەرگیرییەکەمان ویستمان پشتگیری لە پێکەوە ژیانی رەگەزە جیاوازەکان بکەین. لەڕوی سۆزداریشەوە بۆم دەرکەوت کە پێویستم بەوەیە خۆشەویستی و میهرەبانی بە خەڵکی ببەخشم. دایکم پێش ئەوەی بمرێت لای لایەی بۆ منداڵە ساواکانی ناو نەخۆشخانەکان دەکرد. دەمویست منیش وەکو دایکم ئیسراحەت بە خەڵکی ببەخشم بەبێ هیچ قەیدو شەرتێک. من لەوە دەترسام شکست بهێنم، بەڵام هەمو جارێک بەخۆمم دەگوت تاقیکردنەوەی شتی تازە هیچ زیانێکی تێدا نییە، وەک تاقیکردنەوەی شەپقەو کڵاوی تازە وایە. ئەگەر زانیم دەرسوتنەوەکەم بەدڵ نییە، وەرزی واهاتو وازی لێ دەهێنم.

من بۆ ئەوەی بتوانم وانە بڵێمەوە بە ناچاری چومە خوێندنی باڵا. خوێندن لە خوێندنی باڵادا کارێکی زەحمەتە. خۆئەگەر خوێندکارەکە لە تەمەنی ٤٨ ساڵیدا بێت ئەوا هەر زۆر زۆر زەحمەتتر دەبێت. من پێشتر وا راهاتبوم نوسینەکانم بدەم بە سکرتێرەکەم بۆم تایپ بکات. سێ مانگی تەواوی پێچو تا فێری ئەوە بوم خۆم کاغەزەکانی خۆم تایپ بکەم. من بەوەدا زانیم کە بڕیارەکەم یەکجارییە، کە تەلەفزیۆنم

بە یەکجاری کوژاندەوەو ئامێری کردنەوەی کەناڵە شفرەکراوەکانمان گەڕاندەوە بۆ کۆمپانیاکە. خوێندنی باڵام تەواو کردو دەستم دایە وانەوتنەوە لە کۆلێژێکدا لە شاری (لیتل رۆک لە ئەرکەنساس) کە پێشتر تایبەت بو بە خوێندکارە ڕەشپێستەکان. هاوکاتیش لەلایەن فەرمانڕەوای ئەو شارەوە خرامە ناو پرۆژەی امارتن لۆثەر کینگ بۆ چاککردنی پەیوەندیی نێوان ڕەگەزەکان. هەرکاتێکیش بوارم هەبوایە، دەچوومە نەخۆشخانەکان و لای لایەم بۆ ئەو منداڵە بچوکانە دەکرد کە توشی نەخۆشی ئەیدز AIDS و ئامێری هەناسەدانی دەستکردیان لێ بەسترابو. دەمزانی من بەم کارەم ئیسراحەتیان پێدەبەخشم لەبەر ئەوە هەستم بە کامەرانیی دەکرد.

من ئێستا لە ژیانی خۆم ڕازیم و دڵنیاشم ڕۆحی مێردەکەم خۆشنودە بەمە. چونکە پێش ئەوەی بمرێت چەندین جار داوای لێکردوم ژیانێک بژیم پڕ بێت لە پێکەنین و بیرەوەریی جوان و شتی باش. من ئەگەر ئەم بانگەوازەم لە ویژداندا بێت ئیتر چۆن دەتوانم تەمەنی خۆم بەهەدەر بدەم. بێگومان ناتوانم. من واهەست دەکەم کە پێویستە لەسەرم بە باشترین شێوە بژیم لەپێناوی ئەو کەسانەی کە خۆشم دەوێن و هەندێکیان لێرەن و هەندێکیان لەوە دنیان."

ئەلبێرت ئەنیشتاین دەڵێت: "خەیاڵ لە زانست گرنگترە". بیرەوەری شتێکی رابردووەو سنوردارە، بەڵام خەون ئایندەیە و بێ سنورە. خەون لە ئەریتە بەسەرچوەکان و لە مێژوش و لەوجێگە بریناندنەش مەزنترە کە ڕابردو جێیان دەهێڵێت. لە ئەنیشتاینیان پرسی ئەگەر بتوانیت یەك پرسیار لە خوداوەند بکەیت ئەو پرسیارە چیە؟ لە وەڵامدا یەکەمجار وتی لێی دەپرسم: گەردون چۆن دەستی پێکرد؟ چونکە هەمو شتەکانی پاش دروستکردنی گەردون یاساکانی ماتماتیك حوکمیان دەکەن، بەڵام دواتر ئەنیشتاین ڕەنی گۆڕی و وتی لەبری ئەوە لێی دەپرسم: بۆچی گەردونت خوڵقاند؟ چونکە ئەگەر ئەوە بزانم ئیتر لە واتای ژیانیش تێدەگەم.

ڕەنگە گرنگترین خەون ئەو خەونە بێت کە خودی خۆت و هەروەها ئەو چارەنوسەت پێ دەناسێنێت کە دروستی دەکەیت. ئەو خەونەی کە پێت دەڵێن تۆ ئەرکێکی بێهاوتات لە ئەستۆدایەو ڕۆڵێکی گرنگت لەم ژیانەدا پێ سپێردراوە .. دیدی ئەوەی کە ئاشنات دەکات بە مەبەست لە ژیان و بە واتا شاردراوەکانی ناوی. مرۆڤ کە بۆ یەکەمجار خەونی تایبەتی خۆی تاقی دەکاتەوە پێویستە ئەم پرسیارە لە خۆی بکات:

ئایا ئەم خەونە گوزارشت دەكات لە دەنگی تایبەتی خۆم و دەتوانێت وزەو بەهرە بێهاوتاكەم ئازاد بكات؟ ئایا دەبێت بەو بانگەوازە رۆحییەی كە هانم بدات خزمەتی مەسەلەیەكی شایستە بكەم؟

هەستكردن بەم واتایانە پێویستی بە رامانی زۆر هەیە و دەبێت بچیتە قوڵایی ناخی خۆتەوەو پرسیاری قوڵ و گەورە لە خۆت بكەیت.

نوسەر و چیرۆكنوسی بەناوبانگی جیهان (لۆرانس ڤان دیربۆست) دەڵێت: ئێمەی مرۆڤ بەبێ خەون توشی كەم زانیاری دەبین. ئێمە كە تەماشای ئەم ژیانە دەكەین زۆر كورتبینانە تەماشای دەكەین چونكە لە هاوێنە تایبەتیەكانی خۆمانەوە و لە جیهانە تایبەتەكانی خۆمانەوە تەماشا دەكەین. دید یارمەتیمان دەدات رابردومان و بیرەوەرییەكانی سەرگوزشتەی تایبەتی خۆمان تێبپەڕێنین. ئەمەش مەسەلەیەكی زۆر گرنگە لە پەیوەندییە مرۆڤایەتییەكاندا چونكە رۆحی مرۆڤەكان پەلكێشی لای یەكتر دەكات.

ئێمە كە باسی خەون دەكەین، گرنگە بزانین كە مەبەستەكە تەنیا بینینی ئەو شتانە نییە كە هەن و یاخود دەتوانین جێبەجێیان بكەین، بەڵكو بینینی ئەو توانایانەشە كە بە شاردراوەی لە خەڵكانی دیكەدا هەن. خەون لەوە زیاترە كە هەندێك كار بكەیت و هەندێك ئەرك رابپەڕێنیت. خەون دۆزینەوەی خەڵكانی دیكەو بەرزكردنەوەی ئاستی متمانە بەخۆكردنیانە. خەون بڕواهێنانە بە خەڵكانی دیكەو یارمەتیدانیان كە وزە شاردراوەانی ناخی خۆیان بدۆزنەوە و لێی تێبگەن. واتە یارمەتیدانیان لەوەی دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە. لە زوربەی كەلتورە خۆرهەڵاتیەكاندا خەڵك ئەگەر بیانەوێ سڵاو لە یەكتری كەن دەستیان بە شێوەیەی رەقەم (٨) دەخەنە سەر سنگیان و بۆ كەسەكەی بەرامبەریان دەچەمێنەوە. ئەم كردارە مانای وایە دەتەوێت پێی بڵێیت (من سڵاو دەكەم لەو مەزنییەی كە لە ناختایە و دیار نییە) یاخود (من سڵاو دەكەم لەو نهێنییە خوداییە كە لە ناختا شاردراوەتەوە). من خۆم خانمێك دەناسم هەمو جارێك كە چاوی بە كەسێك دەكەوێت لە دڵی خۆیدا یاخود بە دەنگێكی بیستراو دەڵێت: "من خۆشم دەوێیت. ناوت چیە". تۆ ئەگەر بەرامبەرەكەت لە هاوێنەی تواناو كردەوە هەرە چاكەكانییەوە ببینیت نەك لە رەفتاری ئێستای و خاڵە لاوازەكانییەوە، ئەوا وزەیەكی ئەرێنی گەورەی تێدا دروست دەكەیت و دەتوانیت لەگەڵیدا بەردەوام بیت و قبوڵی بكەیت. ئەم جۆرە رەفتارە

هاندەرە پەیوەندییە مرۆییە روخاوەکان دروست دەکاتەوەو کلیلی سەرکەوتنی رەفتاری دایك و باوکیشە لەگەڵ منداڵەکانیاندا.

تۆ ئەگەر مرۆڤەکەی بەرامبەرت لە هەڵسوکەوتی جیابکەیتەوە، هێزێکی مەزنی تێدا دروست دەکەیت چونکە بەم کردەوەیەت دڵنیای دەکەیتەوە کە نرخی ئەوی مرۆڤ شتێکی پارێزراوە و هیچ مەسەلەیەك ناتوانێت کەمی بکاتەوە.

> ئەو من بەرزدەکاتەوە و منیش ئەو بەرز دەکەمەوە و
> بەم شێوەیە پێکەوە سەردەکەوین
> - لە قسەی کۆمەڵی کواکەر

هەستکردن بەو توانایانەی کە لە خەڵکانی دیکەدا هەن و ددانانان بەو توانا و ئیمکانیاتە وەکو ئەوە وایە ئاوێتەیەکیان لەبەردەمدا دابنێیت وێنەی شتە هەرە باشەکانیان دەربخات. دیدێکی لەو جۆرە بەرامبەرەکەت ئازاد دەکات و خەسڵەتە باشەکانی بەردەدات و لەهەمان کاتیشدا لەو کاردانەوەیە رزگارت دەکات کە بەرامبەر رەفتارێکی ناپەسەندی ئەو، رەنگە ئەنجامی بدەیت. ئەگەر کەسێك رەفتارێکی نواند کەمتر لەو ئاستەی تواناکانی خۆی، باشترین هەڵوێست و رستە کە متمانە دەگەڕێنێتەوە بۆ ناخیان ئەوەیە پێی بڵێیت "ئەمە تۆ نیت". چەند ساڵێك لەمەوبەر لە یەکێك لە گەشتە جیهانیەکاندا چاوم کەوت بە گەنجێکی ١٨ ساڵ. ئەو گەنجە گیروگرفت و تەحەدایەکی زۆری هاتبوە رێ. لەوانە ئیدمانکردن لەسەر مەی و مادە هۆشبەرەکان. ئەو گەنجەی کە دیم هەرچەندە هاوسەنگی لە ژیانیدا تێك چوبو، بەڵام هەستم کرد زۆر مەبەستێتی ئاراستەی ژیانی خۆی بدۆزێتەوە. هەروەها هەستم کرد مرۆڤێکی مەزنەو لە ناخەوە پڕە لە مەزنی و لە توانای زۆر کە لە روخسار و لە رۆحییەوە شەوقیان دەدایەوە. پێش ئەوەی لێك جیاببینەوە، چاوم بڕییە چاوی و راستەوخۆ پێم وت من باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە دەبیتە مرۆڤێکی خاوەن کاریگەریی مەزن لەم جیهانەداو خاوەنی بەهرەو ئیمکانیاتی نائاسایییت.

بیست ساڵ دواتر ئەم گەنجە بوە یەکێك لە پیاوە هەرە سەرکەوتوەکانی کە من دەیانناسم. بوبوە خاوەنی خێزانێکی جوان و پیشەیەکی وا کە دەستەکەوتی

راستەقینەی پێ بەدیبهێنێت. ماوەیەك لەمەوبەر ئەم گەنجە سەردانی هاوڕێیەكی منی كردوەو لەكاتی گفتوگۆكردنیاندا باسی ئەو ئەزموونەی بۆ كردوە كە پێشتر من ئاماژەم پێدا. گەنجەكە وتویەتی: ئەو كاتژمێرە كاریگەری وای كردە سەر ژیانم كە ناتوانیت باوەڕبكەیت. من پێم گوترا كە مرۆڤێكی هێندە بەهرەمەندو بەتوانام تا ئەودیوی باوەڕكردن. ئەم قسەیە شاگەشكەی كردم و گۆڕانێكی راستەقینەی لە ژیانمدا دروست كرد.

برەودان بەو خووەی كە مرۆڤ متمانە بەخۆكردنی بەرزببێتەوە، بە تایبەت لەو هەرزەكارانەدا كە دووەچاریانە بە قەیرانی ناسنامەدا دەڕۆن كارێكی زۆر گرنگە. ئەم ئامانجەش بەوە دێتەدی كە دڵسۆزانەو بەردەوام پێیان رابگەیەنیت ئێمە بڕوامان پێیانە. ئەم كارە سەرمایەگوزارییەكی بچوكە بەڵام ئەنجامەكانی مەزن و باوەڕنەكردنین.

تۆ خۆت بیهێنەرە بەرچاوی خۆت بزانە لەوساتەوەختەدا كە هیچ بڕوایەكت بە خۆت نییە (مێژووی خۆت)، كەسێك دێت و پێت دەڵێت باوەڕم پێتە (تواناكانت)، ئەو قسەیە چ كاریگەرییەكی گەورە لە ناختدا جێ دەهێڵێت؟

## دیسپلین

دیسپلین لە بایەخدا هیچی لە دید (خەون) كەمتر نییە، هەرچەندە لە ریزبەندیدا دوای ئەوە. دیسپلین لە راستیدا داهێنانی دووەمە. جێبەجێكردن و دروستكردنی رووداوەكان و پێشكەشكردنی ئەو قوربانیانەیە كە گۆڕینی خەون بۆ واقیع داوای دەكات. دیسپلین بەرجەستەكردنی هێزی ئیرادەیە.

> كە گەرمای نیوەڕۆ شوێنی هەوا خۆشەكەی دەمەو بەیان دەگرێتەوە و كاتێك كە ماسولكەكانی قاچت لەژێر باری ماندوێتیدا هاوار دەكەن و كاتێك وا هەست دەكەیت هەڵزنانت بە شاخەكەدا ئەركێكە كۆتایی نایەت. كتوپڕ ئەو بڕدەنگییە بەرقەرار دەبێت كە ئاواتەخوازی بویت. ئەمە ئەو كاتەیە كە پێویستە بێ هیچ دوودڵییەك درێژە بە ئیشەكەت بدەیت.
>
> - داگ هامەرسكجۆڵد

پیتەر دراکەر دەڵێت یەکەمین ئەرکی بەڕێوەبەر دیاریکردنی واقیعەکەیە. دیسپلین یانی ئەوەی لەجیاتی نکوڵیکردن لە واقیعەکە دەستنیشانی بکەیت و بڵێیت راستەو هەیە. دیسپلین یانی دانانان بە واقیعەکاندا هەرچەندە تاڵیش بن و گۆڕینیان قورس و نەکردەنی بێت.

سەرکردایەتی بریتییە لەو توانایەی کە خەون دەکات بە واقیع
- وارن بینیس

سەلماندنی واقیع ئەگەر خەون و ئەگەر هیوای لەگەڵدا نەبێت کارێکی ورە روخێن و خەفەتهێنە. هەندێک جار کامەرانیی وا پێناسە دەکرێت کە دەستبەرداربونە لەو شتەی ئێستا دەتەوێت بۆ شتێك کە لە داهاتوودا دەتەوێت. ئەم قوربانیدانە تایبەتە و ئەم دەستبەرداربونە لە خۆشییەکانی ئەمڕۆ لەپێناو مەبەستێکی مەزنتری دورمەودادا دیسپلینە. زۆرکەس وا دەزانن دیسپلین بریتییە لەوەی واز لە ئازادییەکانت بهێنیت، یاخود دەڵێن دیسپلین ئازادی ناهێڵێت؛ (ناچارکردن دەستپێشخەری دەکوژێت)(کە وتت پێویستە لەسەرمان مانای وایە ئازادی نییە) (دەمەوێت ئەو کارە ئەنجام بدەم کە دەمەوێت ئەنجامی بدەم، ئەمە ئازادییە نەك ئەرك و فەرمان). ئەوی راستی بێت پێچەوانەکە راستە. تەنیا ئەو کەسانە بەڕاستی ئازادن کە بەڕاستی دیسپلینیان هەیە. خەڵکی بێ دیسپلین دیلی ئارەزووەکان و مەزاج و راڕاییەکانی خۆیانن.

ئایا دەتوانیت پیانۆ لێ بدەیت؟

"نەخێر ناتوانم . ئازادی ئەوە نییە پیانۆ لێبدەم. هیچ رۆژێك خۆم بۆ مەشقکردن لەسەر لێدانی پیانۆ رێك نەخستوە. باوکم و مامۆستای مۆسیقا پێیان خۆش بو خۆم فێری پیانۆ بکەم بەڵام من حەزم لەوە بو لەگەڵ هاوڕێکانمدا یاری بکەم. هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە رۆژێك لە رۆژان پیانۆ لێ بدەم بەڵکو حەزم لەوە بو لەگەڵ هاوڕێکانمدا یاری بکەم، هەستم بەوە نەکردوە پیانۆ لێدان چ واتایەکی هەیە. یاخود ئەو ئازادییەی من چ واتایەکی دەبێت ئەگەر لە هونەرێکی مەزندا ببیتە داهێنەر.

ئەی باشە ئازادیی لێخۆشبون چ مانایەکی هەیە؟ ئەی رات چییە بەرامبەر ئازادی لە

خۆشویستنی خەڵکیدا بەبێ هیچ مەرج و ئەگەرێك لەوەی مرۆڤ ببێتە روناکییەك رێ بۆ خەڵکەکە رۆشن بکاتەوە نەك حاکمێك بێت دادگاییان بکات. لەوەی ببێتە نمونەیەك شوێن پێی هەڵبگرن نەك ببێتە رەخنەگرێك سەریان بنێشێنێت؟ ئایا گوزارشت کردن لەم ئازادییانە چ جۆرە دیسپلینێکی دەوێت؟

دیسپلین پانی ببێتە (مورید)ی کەسێك یاخود مەسەلەیەکی دیاریکراو. مامۆستای مەزن (هۆریسمان) دەڵێت: کارێکی بێهودەیە باسی کامەرانی بکەیت بێ ئاماژەکردن بۆ مەرجی پەیوەستبون بە پرنسیپێکەوە بۆ بەدەستهێنانی ئەو کامەرانییە. ئەو کەسەی کە هەرگیز قوربانی نادات بە ئێستا لەپێناوی خێرێکی ئایندەدا و شتی تایبەت ناکات بەسافی شتی گشتی بەو جۆرە لە کامەرانی تێگەیشتوە کە نابینایەك لە رەنگەکان تێگەیشتوە.

من لە تەمەنی پەنجاساڵیدا کە مامۆستای زانکۆ بوم بریارم دا ناوچە هێمن و بێسەرنێشەکەم (کە پیشەی مامۆستایەتی بو) جێ بهێڵم و کارێکی تایبەت بۆ خۆم پێك بهێنم. ئەو بریارە دڵەراوکێ و جۆرە ململانێیەکی لە ناوەوە بۆ دروست کردم. ئەگەر بریارەکەم بۆ ئەوە نەبوایە کە خێرێکی زیاترم لەو خێرە دەست بکەوێت کە لە زانکۆ دەستم دەکەوت، خۆمم ناچار نەدەکرد قوربانیی بدەم و ئەو فیداکاری و خۆنەویستییە بنوێنم کە دامەزراندنی کاری تازە دەیخوازن و بێمە ژێر قەرزێکی زۆرەوە و خۆم تووشی سەرنێشەیەکی تازە بکەم.

تەنانەت گەشتینە ئەو دروشمەی کە دەڵێت (بەختەوەریی بریتییە لە هەڵرژانی ئیجابییانەی پارە) و چەندین ساڵ رەنجی زۆرمان دەدا موچە بۆ کارمەندەکان دابین بکەین. دیارە ئێمە هەرگیز نەماندەتوانی بەرگەی ئەو قۆناغە سەختە بگرین. ئەگەر روانینێکمان نەبوایە بۆ ئەگەرەکانی ئایندە و ئەگەریش دیسپلینی تەواومان نەبوایە.

من باوەرم وایە دیسپلین خەسڵەتێکی هاوبەشی هەمومرۆڤە سەرکەوتوەکانە. زۆر سەرسامم بە (ئەلبێرت ئی ئێن گرەی)ی بەرێوەبەری بیمە کە هەمو تەمەنی خۆی لە هەوڵی ئەوەدا بەسەربرد کۆڵکەی هاوبەشی سەرکەوتن بدۆزێتەوە. دواجاریش گەیشتە ئەم تێبینییە قوڵ و سادەیەی کە دەڵێت: هەرچەندە کاری جددی و بەختی باش و پەیوەندی پتەو لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا هەمویان گرنگن، بەڵام کەسی سەرکەوتو کەسێکە هەمیشە ئەوکارانە ئەنجام دەدات کە خەڵکی شکستخواردو حەزیان لێ ناکات. هەڵبەتە هیچ دور نییە مرۆڤە سەرکەوتوەکانیش ئەنجامدانی ئەو کارانەیان پێ

ناخۆش بێت، بەڵام عیشق و خۆشەویستییان بۆ ئامانجەکە بەسەر ئەو بێناخۆشبوون و رقەدا زاڵ دەبێت.

مرۆڤی بێدیسپلین و قوربانینەدەر کەسێکە لە شوێنی کارەکەی خۆیدا یاری دەکات. چەندین کاتژمێر سەرگەرمی ئی مەیڵ نوسین و جوابدانەوەیە بە تەلەفۆن و بە کورتەنامە سەرقاڵی باسکردنی کارو پرۆژەکانێتی و دەچێتە ناو کۆبونەوەی دورودرێژەوە. واتە زۆری کاتەکەی خۆی بەکاری بێهودە وبە دۆزینەوەی بروبیانوەوە دەکوژێت و هیچ دیسپلین وجەختکردنەوەیەکی نییە. شکستهێنان شتێکە دێتە ڕێی هەمو کەس، بەڵام ئەگبەتییەکە لەوەدایە بیکەیتە هەڵبژێردراوی خۆت.

شکست هەمیشە هۆکاری هەیە بەڵام هەرگیز بروبیانوی نییە

## عیشق (سۆز، جۆش و خرۆش)

عیشق لە دڵەوە هەڵدەقوڵێت و بە گەشبینی و خرۆشان و پەیوەندی سۆزداریی و بڕیاری یەکجارەکی گوزارشت لە خۆی دەکات. پاڵنەرێك لە ناخماندا دەخاتە جوڵە کە وەستاندنی مەحاڵە. عیشق دەرەنجامی بڕیار و هەڵبژاردنەکانمانە نەك هی ئەو بارودۆخە کە دەوری داوین. ئەو کەسانەی کە جۆش و خرۆش و ورەیەکی بەرزیان هەیە باوەڕیان وایە باشترین ڕێگا بۆ پێشبینیکردنی ئاینده، دروستکردنێتی.

لە ڕاستیدا عیشق پێویستییەکی ڕەوشتییە. وا دەکات مرۆڤ ببێتە بەشێك لە چارەسەر نەك بەشێك لە هەستکردن بە نائومێدی و پەککەوتن.

ئەرستو دەڵێت: "تۆ ئەوکاتە گوێت لە بانگەوازەکەی ناخی خۆت دەبێت کە بەهرەکانت لەگەڵ پێویستیەکانی جیهاندا یەکانگیر دەبن". دەتوانیت بڵێیت": ئەوکاتە جۆشوخرۆش کڵپەدەسەنێت و گوێت لە دەنگی تایبەتی خۆت دەبێت" ئەمەش ژیانت پڕدەکات لە وزەو پاڵنەر.

جۆشوخرۆش ئەو سوتەمەنییەیە کە خەون و دیسپلینی مرۆڤ تێر دەکات و دەیگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە تا ئەوپەڕی سنوری پابەندبون پابەندببێت بەو جۆش و خرۆشەوە تەنانەت ئەگەر هەمو دەوروبەرەکەشی داوایان لێ کرد دەستبەرداری ببێت.

جارێکیان ژەلامێك لە پزیشکێکی پرسیوە: حەفتەی چەند سەعات کاردەکەیت؟ پزیشکەش لە وەڵامدا وتوێتی: نازانم، تۆ حەفتەی چەند جار هەناسە دەدەیت؟

ئەگەر ژیان و خۆشەویستی و کارو گەمەو بابەتەکانی دیکە هەمو پێکەوە بە دەوری یەك ئامانج و مەبەستدا سوڕانەوە، ئەوکاتە جۆش‌وخرۆش لە دڵدا کڵپەدەسێنێت.

مرۆڤ بۆ ئەوەی ژیانی خۆی پڕبکات لە عیشق، پێویستی بە کلیلێکی سیحراوییە کە بریتییە لەوەی کەسەکە بەهرە بێوێنەکەی خۆی بدۆزێتەوەو بزانێت لەم ژیانەدا چ رۆڵێکی تایبەت و چ ئامانج و مەبەستێکی هەیە. مرۆڤ پێش ئەوەی بزانێت چی دەوێت، پێویستە خۆی بناسێت. قسەیەکی یۆنانیی بەناوبانگ هەیە کە هەم زۆر حەکیمانە و هەم شێوەی ریزبەندیکردنەکەش زۆر راست ودروستە و دەڵێت: "خۆت بناسە، کۆنترۆڵی خۆت بگرە دەست، بە خۆت ببەخشە". لەم ژیانەدا بەهرەو پەیام و رۆڵی مرۆڤ دروست ناکرێن بەڵکو دەدۆزرێنەوە. لەم بارەیەوە رۆماننوسی بەناوبانگ و نوسەر و بەرهەمهێنی سینەما (لۆرانس ڤان دیرپۆسن) دەڵێت: "پێویستە تەماشای ناوەوە بکەین، تەماشای خۆمان، تەماشای ئەو دەفرەی کە رۆحمانە. پێویستە بڕوانینە ناخی خۆمان و گوێی لێ بگرین. بە واتایەکی دیکە، تۆ ئەگەر نەتوانیت وەڵامی ئەو میوانە بدەیتەوە کە لە تاریکیدا لە دەرگاکە دەدات، ناتوانیت خۆت لە زیندانی خۆت رزگار بکەیت و بگەڕێیتەوە ئەو ئاستەی کە دەسپێشخەرییە مەزنەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت.

هەمو ئەوانەی کە لە ژیاندا کاری مەزنیان ئەنجام داوە، ئەوانەن کە هەرچەندە ترساویشن، بەڵام وەڵامی دەرگا لێدانەکەیان داوەتەوە. ئازایەتی کرۆکی عیشقە و وەك هارۆلد ل جارێکیان پێی وتم: "عیشق جۆری ئەو کردارە راستەقینەیەیە کە لە لوتکەی ئاڤیکردنەوەیدا ئەنجام دەدرێت.

خەڵك بە شێوەیەکی گشتی بەهرەو شارەزاییان لێ تێکەڵ بووە. بەهرە پێویستی بە شارەزاییە. رەنگە تۆ لە بوارێکدا زانیاری و شارەزایی زۆرت هەبێت بەبێ ئەوەی هیچ بەهرەیەکت تێدا هەبێت. هەر دەزگاییش نەتوانێت بەهرەکانی ئەو ئەندامەی خۆی کارا بکات ناتوانێت جۆش‌وخرۆش ئازاد بکات. مرۆڤی لەو جۆرە پێویستی بە هاندان و چاودێریی دەرەکییە. بەڵام ئەگەر ئەندامەکە خۆی جۆش‌وخرۆش و خۆشەویستی بۆ کارەکە هەبو، ئەوا بە باشترین شێوە ئەنجامی دەدات و پێویست بەوە ناکات چاودێری بکەیت. عیشقەکەیان لە ناخەوەیە نەك لە دەرەوە. هاندەرەکەیان ناوەکییە نەك دەرەکی. بیر لەوکاتانە بکەرەوە کە تۆ بەوپەڕی عیشقەوە سەرقاڵی پرۆژەیەکی وایت کە هێندە سەرنجی راکێشاویت ناتوانیت بیر لە هیچ مەسەلەیەکی دیکە بکەیتەوە. ئایا تۆ

لەو کاتانەدا هیچ پێویستت بە چاودێر و بەڕێوەبەر هەبوە؟

بێگومان نەخێر. لەوکاتانەدا بچوکترین ڕێنمایی و ئاگادارکردنەوەت بە سوکایەتیپێکردن حساب کردوە.

تەنیا ئەو جۆرە کارە دەتوانێت هێزە شاردراوەکانی ناخی مرۆڤ بتەقێنێتەوە کە بەهرەو جۆش‌وخرۆشی مرۆڤ یەکانگیر بکات لەگەڵ پێویستییەکی مرۆڤایەتیدا.

## ویژدان

> ویژدان پشکۆیەکی خواییە لە ناختدا، تێبکۆشە
> بە گەشاوەیی بمێنێتەوە
>
> - جۆرج واشنتۆن

لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسی بایەخە گەورەکەی ویژدانم کرد. بەڵگە زۆرن کە دەیسەلمێنن ویژدان – وەك هەستێکی ڕەوشتی یاخود روناکییەکی ناوەکی – دیاردەیەکی جیهانییە.

سروشتی رۆحی و ڕەوشتی مرۆڤ مەسەلەیەکە سەربەخۆیە لە دین و کەلتور و جوگرافیا و نەتەوەو ڕەگەز. هەمو ئایینە سەرەکییەکانی جیهان لە پرنسیپ و بەها بنەڕەتییەکاندا وەکو یەك وان.

(ئیمانۆئیل کانت) دەڵێت: "دوو مەسەلە بەردەوام سەرسامم دەکەن؛ ئاسمانە بە ئەستێرە نەخشێنراوەکانی بان سەرمان و یاسا ڕەوشتییەکەی ناو قوڵایی ناخمان".

ویژدان یاسا ڕەوشتییەکەی مرۆڤە. شوێنی یەکانگیربونی یاسا ڕەوشتییەکەیە لەگەڵ ڕەفتاردا. زۆر کەس وەکو من باوەڕیان وایە ویژدان دەنگی خوداوەندە بۆ بەندەکانی خۆی. ڕەنگە هەندێك کەس باوەڕی بەو قسەیە نەبێت بەڵام دەزانێت کە لە ناخەوە هەستێك هەیە یەکسانی و عەدالەتخوازیمان پێ دەناسێنێت: هەستێك پێت دەڵێت کامە ڕاستەو کامە هەڵەیە، باش چییە وخراپ چییە، جوان کامەیەو ناشیرین کامەیە، چی بنیاتنەرەو چی وێرانکەرە. ئەو قسەیە ڕاستە کە رۆشنبیریی و کەلتورە جیاوازەکان ئەم هەستە ڕەوشتییە بنەڕەتییە وەردەگێڕنە سەر قسەو ڕەفتاری جیاجیا، بەڵام

وەرگێڕانەکە مانای ئەوەیە کە (یەك) هەستی هاوبەشی چاك و خراپ هەست پێدەکات.
من لەناو نەتەوەی جیاجیای خاوەن کەلتور و ئاینی جیاجیادا کارم کردوەو لەناو هەمویاندا یەك ویژدانی جیهانیم بینیوە. بنەماکانی وەك رێز و بەشداریکردن و یەکسانیخوازی و دڵسۆزی لەناو هەمو کەلتورەکاندا هاوبەشن و هەمیشە هەن و نەگۆڕن.
بە کورتی بڵێین ویژدان بابەتێکی هەمیشەیی و نەگۆڕە، بۆ نمونە وەك ئەو راستییەی کە دەڵێت متمانە پێویستی بە کەسانێکە شایانی متمانە بن.

## ویژدان و خود (من)

ویژدان دەنگە نزمەکەی ناو ناخی مرۆڤە. دەنگێکی هێمن و ئاشتیخوازە. بەڵام (خود) (من) ملهوڕەو سەرکوتکەر و خۆسەپێنە.

خود جەخت لەوە دەکاتەوە مرۆڤ خۆی و چێژ و ئارەزوەکانی بپارێزێت بە رەفتاری خۆپەرستانە و بە رەتکردنەوەی ئەوانی دیکە. لەلای خود دوو جۆر مرۆڤ هەیە: ئەوانەی هەڕەشە دروست دەکەن و ئەوانەی هەڕەشە دروست ناکەن. رێك وەکو مناڵ کە خەڵکانی دیکە دابەش دەکات بۆ دوو گروپ جوان و ناشیرین. لە بەرامبەر ئەمەدا ویژدان هەوڵ دەدات (خود) بکات بە دیموکراسی و بەرزی بکاتەوە بۆ ئاستی ئەوەی زیاتر هەست بەوانی دیکە (بە گروپەکان و بە کۆمەڵگا و بە خێری گشتی) بکات. ویژدان وا سەیری ژیان دەکات کە هەوڵ و کۆشش و بەشداریکردنە بۆ بەدیهێنانی ئاسایش و بەختەوەریی بۆ ئەوانی دیکە.

خود روبەڕوی قەیرانە راستەقینەکان دەبێتەوە بەڵام ئەو زەمینەی نییە بزانێت قەیران و هەڕەشەکە تا چ ئەندازەیەك ترسناکن. بەڵام ویژدان زەین و توانا و زیرەکیی ئەوەی هەیە بزانێت مەترسییەکە لە چ ئاستێکدایە. خود ئەنبارێکی گەورەی کاردانەوەکانی لەبەردەستدایە و خاوەنی حیکمەتێکی هێندە قوڵ و زەینێکی ئەوەندە روونیشە کە بتوانێت لە کات و شوێنی گونجاودا بڕیاری گونجاو بدات. بەلای ویژدانەوە ژیان پێکهاتوە لە زنجیرێکی بەردەوام و تێکئاڵاوی روداوەکان و دەشتوانێت لە زەحمەتترین بارودۆخدا خۆی بگونجێنێت. خود ناخەوێت و گەورە و بچوکی کارەکان بەڕێوە دەبات و دەسەڵات لەوانی دیکە دەسەنێت. خود تواناکانی مرۆڤ لاواز دەکات و لە حوکمکردنی خەڵکیدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت. بەڵام ویژدان رێزی خەڵکی

دەگرێت و باوەڕی تەواوی هەیە کە دەتوانن خۆیان بەڕێوە ببەن. ویژدان دەسەڵات دەبەخشێت بە خەڵکی. نرخی هەمو کەسێکی لایەو بایەخیان پێدەدات و هەستی ئەوەیان لا دەچەسپێنێت کە ئازاد بن لە بڕیار و هەڵبژاردندا. بەمەش مرۆڤ توانای ئەوەی تێدا لەدایك دەبێت کە خۆی لە ناوەوە کۆنترۆڵی خۆی بکات نەك لە دەرەوەو لە سەرەوە.

خود هەمیشە لەوە دەترسێت خەڵکەکە خراپ هەڵی بسەنگێنن و سزای ئەو کەسانەش دەدات کە ئەو هەڵسەنگاندنەی پێ رادەگەیەنن. خود چاودێری زانیارییەکان دەکات کە بۆی دەچن و تەنیا ئەوانەی لێ هەڵدەبژێرێت کە بە دڵی ئەون و نکۆڵی لە باقییەکەی دەکات. بەڵام ویژدان رێز لە هەڵسەنگاندن و لەڕای خەڵکی دەگرێت و هەوڵ دەدات راستییەکانی ناو ئەو هەڵسەنگاندنە هەڵبهێنجێت بەبێ گوێدانە جۆری ئەنجامی هەڵسەنگاندنەکە. خود لە زانیارییەکان ناترسێت و دەتوانێت بە شێوەیەکی راست روداوەکان لێك بداتەوە. پێویستی بە چاودێریکردنی زانیارییەکان نییە و بە ئارەزوی خۆیشی باشەکانی لێ هەڵنابژێرێت. خود بە کراوەیی مامەڵە لەگەڵ واقیعدا دەکات و لە هەمو گۆشەنیگاکانەوە لێی دەڕوانێت. خود کورتبینەو تەنیا لەڕێی ئەجیندا تایبەتەکانی خۆیەوە ژیان لێك دەداتەوە. بەڵام ویژدان وەك زانایەکی سۆسیۆلۆجی پەیوەندی نێوان مرۆڤ و دەوروبەر شرۆڤە دەکات و گوێ لە کۆمەڵگا دەگرێت و هەست بە هەمو سیستەمەکە و بە ژینگەی دەوروبەری دەکات. ویژدان جەستە پڕدەکات لە روناکی و دەتوانێت خود بکات بە دیموکراسی وبیگەیەنێتە ئاستێك کە جیهان بە شێوەیەکی راست تێبگات.

## بەرچاورونیی زیاتر لە چەمکی ویژدان

ویژدان قوربانیدانە. وازهێنانە لە خودی خۆت لە پێناوی ئامانجێکی بەرزتردا. لە پێناوی مەسەلەیەك یاخود پرنسیپێکدا. قوربانیدان لەڕاستیدا وازهێنانە لە شتێکی باش لە پێناو شتێکی باشتردا، بەڵام ئەوەی کە قوربانییەکە دەدات پێی وانییە قوربانییە، بەڵکو تەنیا چاودێری دەرەوە بە قوربانیدانی ئەژمار دەکات. قوربانیدان بۆی هەیە شێوازی جۆراوجۆر وەربگرێت و لە هەرچوار رەهەندەکەی ژیانیشدا گوزارشت لە خۆی دەکات. پێشکەشکردنی قوربانییە جەستەیی و ئابورییەکان (جەستە)، بڕەودان بە ئەقڵێکی کراوەی عەودالْ بەدوای حەقیقەت و پاکژکردنەوەی

خود لە دەمارگیری (ئەقڵ)، دەربڕینی خۆشەویستی و ڕێزی قوڵ بۆ خەڵکی (دڵ)، چوارهەمین قوربانیدانیش کە قوربانیدانی رۆحییە ئەوەیە کە مرۆڤ لە پێناوی چاکەیەکی مەزندا ئیرادەی خۆی بخاتە ژێردەستی ئیرادەیەکی بەرزترەوە (رۆح).

> مرۆڤ ئەگەر بیەوێت فەلسەفەیەکی نوێ و ڕێگەیەکی نوێ لە ژیاندا فێر بێت پێویستە نرخەکەی بدات. نرخەکەش هەرگیز نرخێکی هەرزان نییە بەڵکو بە هەوڵ و تێکۆشان و پشودرێژییەکی زۆر دێتەدی.
>
> - فیۆدۆر- دیستۆفیسکی

ویژدان فێرمان دەکات کە ئامراز لە ئامانج جیاناکرێتەوە، لەبەرئەوەی پێشوەخت ئامانجەکان لەناو ئامرازەکاندا دانراون. "ئیمانۆیل کانت" دەڵێت: ئامرازەکان هێندەی ئەو ئامانجانە گرنگن کە ئامرازەکان لەپێناویاندا بەکار دەهێنرێن. (ماکیافیللی)یش ڕێک پێچەوانەکەی ئەومان فێردەکات و دەڵێت ئامانج وەڵامگۆی ئامرازە.

بیر لەو حەوت مەسەلەیە بکەرەوە کە بەپێی ڕێنماییەکانی گاندی. دەتوانن ژیانمان وێران بکەن. شرۆڤەکردنی ئەو مەسەلانە بە وردی و بە هێواشی ڕاستییەکمان نیشان دەدات کە چۆن هەر یەکێک لەو حەوت مەسەلەیە خۆی لە خۆیدا ئامانجێکە بە ئامرازێک هاتۆتەدی کە پشتی بە هیچ پرنسیپێک نەبەستوە، یاخود هیچ نرخێکی نییە.

دەوڵەمەندی بەبێ خۆماندوکردن بێت. بەختەوەری بەبێ ویژدان –زانیارییەک کەسایەتی لەگەڵدا نەبێت –بازرگانییەک ڕەوشتی لەگەڵدا نەبێت –زانستێک بەبێ هەستی مرۆڤایەتی –خواپەرستییەک بەبێ قوربانیدان –سیاسەت بەبێ پرنسیب.

ئایا مەسەلەیەکی سەرنجڕاکێش نییە مرۆڤ بتوانێت لەڕێی ئامرازگەلێکی خراپ و هەڵەوە بگاتە ئەو ئامانجە جوانانە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ لەڕێی بەکارهێنانی ئامرازێکی هەڵەوە بگاتە ئامانجێکی جوان و چاک، ئەوا ئەو ئەنجامە دواجار دەبێتە بڵقی سەرئاو.

مرۆڤ بە مامەڵە و هەڵسوکەوتی ڕۆژانە دەزانێت کێ سەرڕاست و پەیمانپارێزە و کێ فێڵباز و درۆزن و ساختەچییە. بۆیە تەنانەت کاتێک کە ڕێکەوتننامەیەکی یاسایی لەگەڵ مرۆڤی ساختەچی و فێڵبازدا ئیمزا دەکەین گومانمان هەیە کە پەیمانەکە ببەنە سەر.

ئامۆژگارییە سەیرەکان

١. مرۆڤ بەگشتی نامەنتقین و تەنیا بەرژەوەندیی خۆیان لامەبەستە. بەهەر حاڵ تۆ لێیان ببورە.

٢. کاتێک کە میهرەبانی دەنوێنێت، خەڵکەکە تۆمەتی ئەوەت دەخەنە پاڵ کە مەبەستی خۆپەرستانەی شاردراوەت هەیە لەو کارەدا. بەڵام بە هەرحاڵ تۆ کارەکە ئەنجام بە.

٣. سەرکەوتن هاوڕێی ساختەو دوژمنی راستەقینە بۆ مرۆڤ دروست دەکەن. بەڵام بەهەرحاڵ تۆ هەر میهرەبان بە.

٤. ئەو کارە چاکەی کە ئەمڕۆ دەیکەیت. سبەینێ بیردەچێتەوە بەڵام بەهەر حاڵ تۆ هەر کاری چاک بکە.

٥. راشکاویی و راستگۆیی گلەییت دەهێننە سەر. بەڵام بەهەرحاڵ تۆ هەمیشە راستگۆ و راشکاو بە.

٦. مرۆڤە مەزنەکانی خاوەن بیروبۆچونی مەزن رەنگە لەلایەن مرۆڤی گێل و کەمئەقڵەوە رێگرییان لێ بکرێت. بەڵام بەهەرحاڵ تۆ هەمیشە بیروبۆچونی مەزن هەڵبگرە.

٧. مرۆڤ بەگشتی کەسی زوڵملێکراوی خۆش دەوێت، بەڵام شوێنی ستەمکاران دەکەوێت. بەهەرحاڵ تۆ پشتی ستەملێکراوان بگرە.

٨. رەنگە ئەو شتەی کە چەندین ساڵ خەریکی دروستکردنی بویت لە چاوتروکاندنێکا بروخێت بەڵام تۆ هەر بنیات بنێ.

٩. زۆرجار ئەوانەی کە یارمەتییان دەدەیت، پەلامارت دەدەن. بەڵام بەهەرحاڵ تۆ هەر یارمەتیان بدە.

١٠. رەنگە ئەو کەسەی کە گرنگترین شتی خۆتت پێ بەخشیوە خراپەت لەگەڵدا بکات بەڵام بەهەرحاڵ تۆ هەمیشە بەخشندەی شتە گرنگەکانت بە

- کێنت ئێم. ئیث

ویـژدان هەمیشە نرخـی هـەرکام لـە ئامانجـەکان و لـە ئامرازەکانمـان پـێ دەڵێـت و پێشمان دەڵێت کە جیاوازی ناتوانێت ئامـانج لـە ئامرازەکـە جیابکـەیتـەوە. بـەڵام ئـەوە خودە کە دەڵێت ئامانجەکان وەلامگۆی ئامرازەکانن و ئەو راستییە نازانێت کە مەحاڵە مرۆڤ بە ئامرازی ناجوامێرانە بگاتە ئامانجە بەرز و شکۆدارەکان. مەسەلەکە بە رواڵەت وا دەردەکەوێت کە کردنی بێت، بەڵام کۆمەڵە گێروگرفتێکی ئانقەست هەن –کە سەرەتا نایانبینیـت- لـە کۆتاییـدا ئامانجەکـەت وێـران دەکـەن. بـۆ نموونـە تـۆ دەتوانیـت بەسـەر منداڵەکەتدا هەڵشاخێیت بۆ ئەوەی ژورەکەی خۆی پاك بکاتـەوە، بـەڵام دڵنیـات دەکـەم کە ئەم رەفتارە نـەك تـەنیا کارێکی خـراپ دەکاتەسـەر پەیوەندییـەکانت لەگـەڵ منداڵەکەتـدا، بەڵکو ئەگەر چەند رۆژێك لە ماڵ دورکەویتەوە ژورەکە وەکو جاران پیس دەبێتەوە.

> دانایی (حیکمەت) فێرمان دەکات بە چاکترین ئامراز بگەینە چاکترین ئامانج
>
> - فرانسیز هینگسۆن

ویـژدان گـۆڕانی گـەورە لـە دیـد و دیسـپلین و جۆش‌وخرۆشمانـدا بـەدی دەهێنێـت، چونکە دەمانخاتە ناو جیهانی پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانـەوە. ئـەو لـە قۆنـاغی پشـت بەخۆبەستنەوە دەمانگوێزێتەوە بۆ قۆنـاغی هاوکاریکردن لەگـەڵ خەڵکیـدا (هاوکـاریی خوڵقێنـەر، هاوسـۆزیی). کـە ئـەوە هاتـەدی ئیـتر هـەمو شـتێك دەگـۆڕێـت. ئیـتر بـۆت دەردەکـەوێت کـە خەڵکەکـە پـێش ئـەوەی ئامادەییـان تێـدا دروسـت ببێـت دیسـپلینە دامەزراوییەکە قبوڵ بکەن لەو پەیکەر و سیستمانەی کە بنەما هاوبەشەکان بەرجەستە دەکەن، پێویستە تۆ بەشدارییان پێبکەیت لـە دیـد و بنەماکانـدا. ئـەو دیـدە هاوبەشـە وایان لێ دەکات، بێ ئەوەی کە تۆ پێیان بڵێیت خۆیـان دیسپلین و سیستمەکە جێبـەجێ بکەن. دید ئەو بابەتەت بۆ دیاری دەکات کە پێویستە ئـەنجام بـدرێت. ویـژدانیش بـۆت روون دەکاتـــەوە کـــە بۆچـــی ئەنجامـــدانی کارەکـــە پێویســـتە. دیســـپلین چـــۆنێتی ئەنجامدانەکەت بۆ روون دەکاتەوە. جۆش‌وخرۆشیش هەست‌وسۆزی نـاو ئـەو وەڵامانـە بەرجەستە دەکات کە وەڵامی (چی) و (چۆن) و (بۆچی) دەدەنەوە.

ویژدان جۆش‌وخرۆش دەگۆڕێت بۆ هاوسۆزی؛ وا لە مرۆڤ دەکات راستگۆیانە بایـەخ بە خەڵکی بدات و لە هەست‌و سۆزیان تێبگات و سۆزی هەبێت بەرامبەریان، بە تایبەت

لەوەدا کە هەموان هەست بە (یەك) ئازار دەکەن. هاوسۆزی ئەو جۆش‌وخرۆشەیە کە لەکاتی هاوکاریکردنی خەڵکیدا گوزارش لە خۆی دەکات.

لەمبارەیەوە خاتو (جوان سی. جۆنس)ی ئەندامی دەستەی نوسەرانی گۆڤاری (گاید پۆستس) ئەزمونێکی خۆی دەگێڕێتەوە کە چۆن مامۆستاکەی لە زانکۆ فێری کرد لە ڕێنماییەکانی ویژدانەوە فێرببێت و بژی:

"لە دوهەمین مانگی قۆناغی خوێندنی پەرستیاریدا مامۆستاکەمان کۆمەڵێک پرسیاری داینێ. من خوێندکارێکی زیرەک و سەعیکەربوم بە ئاسانی وەڵامی هەمو پرسیارەکانم دایەوە تا گەیشتمە دواپرسیار: ناوی بچوکی خانمە کارگوزاری خوێندگاکە چی‌یە؟ من دڵنیابوم کە مەسەلەکە هەر سوعبەتێکە و هیچی تر. چەندین جار من ئەو ژنەم بینیبو. ژنێکی کەڵەگەتی قژ رەشی تەمەن پەنجا ساڵ بو، بەڵام چوزانم ناوی بچوکی هەیە، وەڵامی ئەو پرسیارەم نەدایەوەو دەفتەرەکەم تەسلیم کرد.

پێش تەواوبونی وانەکە خوێندکارێک پرسیاری کرد کە ئایا دواپرسیاریش وەکو پرسیارەکانی دیکە نمرەی لەسەرە؟ مامۆستاکە وەڵامی دایەوە: بەڵێ بەدڵنیاییەوە. چونکە ئێوە لە ئایندەدا لە ژیانی پیشەییتاندا زۆر کەس دەبینن، کە هەمویان گرنگن و شایانی ئەوەن سەرنجتان رابکێشن و بایەخیان پێبدەن تەنانەت ئەگەر بە سڵاوێک و زەردەخەنەیەکیش بێت. ئەوە بو بە وانەیەکی گرنگ لە ژیانمدا. زانیشم کە ئەو ژنە ناوی (دۆرۆشی)یە".

مرۆڤ ئەگەر هەوڵ بدات بەپێی داواکارییەکانی ویژدانی خۆی بژی، ئەوە هەست بە بێ خەوشی کاروباری و هاوئاهەنگی ناوخۆ دەکات. ویلیام جی. ئێچ بۆتیکەر —وەزیری کەنیسەکان و کەسێکی بە رەگەز ئەڵمانی- لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا کتێبێکی نوسیوە دەڵێت: "بۆ ئەوەی خۆتت لەبەرچاو نەکەوێت باشتر وایە خەڵکەکە ناڕەحەت بکەیت بە ئەنجامدانی کارێك کە تۆ بە راستی دەزانیت، نەك رازییان بکەیت بە ئەنجامدانی کارێك کە تۆ دەزانیت هەڵەیە". رێز لە خۆگرتن و هەستکردن بە هاوسەنگی ناوخۆ دوو خەسڵەتی گرنگن. هەرکەسێك خاوەنی ئەم دوو خەسڵەتە بێت دەتوانێت لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ خەڵکیدا هەم ئازا بێت و هەم خۆشڕو. خۆشڕو بەوەی رێز و بە هەند وەرگرتنی زۆری خەڵکەکە بۆ دید و ئەزمون و بیروباوەڕیان دەربڕێت. ئازاش بێت بەوەی کە بێ ئەوەی هەڕەشە بۆ هیچ کەسێك دروست بکات گوزارشت لە

بیروباوەڕە جیاوازەکان دەتوانێت ئەو بیروباوەڕە تایبەتەکانی خۆی بکات. کارلێکی نێوان بیروباوەڕە جیاوازەکان دەتوانێت ئەو سێ دەرەنجامە بەدەست بهێنێت کە بەدڵنیاییەوە زۆر لەو بیرو باوەڕە باشترن کە لەسەرەتادا هەریەکەمان گریمانەمان کردبو. ئەمەیە هەرەوەزی راستەقینە کە (گشت) لە (کۆی) هەمو (بەشەکان) چاکترە. ئەو کەسانەی بەپێی ویژدانیان نازین هەرگیز هەست بەو هاوناهەنگییە ناوخۆییە و بەم ویژدانە ئاسودەیە ناکەن. کەسانی لەوجۆرە خود (من)ی تایبەتی خۆیان دەبینن کە بەردەوام لە هەوڵی کۆنترۆڵی خەڵکی دیکەدایە و ئەگەر ناوبەناویش جۆرێک لە هاوسۆزی و پیاوچاکی بنوێنن، بەڵام لەڕاستیدا لەژێرەوە بە نهێنی خەریکی کۆنترۆڵکردنی خەڵکن. حاڵەتەکە رەنگە بگاتە ئەو ئاستە کە لە رواڵەتدا تەواو روخۆش و پیاو چاك بێت بەڵام لەڕاستیدا دیکتاتۆر بێت.

سەرڕاستی هەمیشە سەرکەوتنێکی تایبەت بۆ کەسەکە زامن دەکات و ئەم سەرکەوتنە بەردی بناغەی ئەو سەرکەوتنە دەستە جەمعییەیە کە لە دامەزراندنی دید و عیشق و دیسپلینی هاوبەشی هەمو خەڵکیدا دێتە دی. بەمجۆرە دەبینین سەرکردایەتی دەبێتە پێکەوە کارکردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا نەك تەنیا پەیوەندییەکی پێنەگەیشتوی نێوان سەرکردە بەهێزەکان لەلایەك کە خۆپەرستی سەرلەبەری ژیانیانەو پێویستیان بە خەڵکی نییە. لەگەڵ شوێنکەوتوانێك کە نە دەتوانن پشت بە خۆیان ببەستن و نە دەشزانن نارەزایی دەربڕن.

## فیلمی: ستۆن

پیاوێك هەیە لە وڵاتی نۆگەندا بەشێوەیەکی جوان ئەو هێزە روون دەکاتەوە کە مرۆڤ دەتوانێت ببێتە خاوەنی، ئەگەر هاتو رێگەی دا بە ویژدانی خۆی حەکیمانە جڵەوی خەون و دیسپلین و جۆش و خرۆشەکانی بگرێت. ئەم پیاوە ناوی (ستۆن)ەو لە بواری فتبۆڵێندا یاریزانێکی مەزن بو. شیاوی باسە کە لە وڵاتی نۆگەنداو تەنانەت لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقادا خەونی هەمو منداڵێك ئەوەیە زۆر بەچاکی فێری فتبۆڵێن ببێت بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ یانەیەك لە یانە ئەوروپاییەکاندا گرێبەستێك ئیمزا بکات. سامانێکی گەورە لە ئەوروپاوە چاوەڕێی (ستۆن)ی دەکرد، کاتێك ئەو لە یارییەکدا زەبرێکی ئەنقەستی بەرکەوت کە ئەژنۆیەکی شکاندو وای لێکرد چیتر نەتوانێت وەك یاریزانێکی پیشەیی درێژە بە ژیان بدات.

ستۆن دهیتوانی ببێته کهسێکی رقههڵگرو بێجگه له تۆڵهسهندن بیر له هیچی دیکه نهکاتهوه. ههروهها دهشیتوانی ههر خهفهت بۆ رابردو بخوات و لهسهر سهروهرییهکانی جارانی بژی و سود له ناوبانگی وهربگرێت. بهڵام هیچکام لهمانهی نهکردو لهجیاتی ئهوه خۆی کاردانهوهکهی خۆیی ههڵبژارد. ستۆن دید (خهون) و ویژدانی خۆی بهکارهێنا بۆ ئیلهامبهخشین به کارکردنهسهر لاوان و ههرزهکارانی ئۆگهندا (کێشهکه)، ئهو گهنجو ههرزهکارانهی که ئهگهر هیوایهك نهبێت لهپێناویدا بژین و کهسێکی نمونهیی شك نهبهن شوێن پێی ههڵگرن به دڵنیاییهوه بزر دهبن و دهفهوتێن.

داوات لێ دهکهم ستۆن ببینیت لهکاتی کارکردنندا. داوات لێ دهکهم له ناخهوه ههست به رۆح و دڵ و تێڕوانینهکانی بکهیت. دهتوانیت چیرۆکهکهی ستۆن له کورته فیلمێکدا ببینیت که چهندین خهڵاتی بهدهستهێناوهو ئێمهش فیلمهکهمان خسۆته سهر سیدیيهکهی یاوهری کتێبهکه. دهزانم چێژ لهم ئهزمونه دهبینیت. که فیلمهکه تهماشا دهکهیت تێبینی بکه بزانه ستۆن چۆن توانی بهسهر کهلتوری کۆمهڵگهکهیدا زاڵ ببێت که کهلتورێکه داوای تۆڵه دهکات. ستۆن به بهکارهێنانی ئهو دیارییانه که لهگهڵیدا لهدایك بون توانی بهسهر کهلتورهکهدا سهربکهوێت. تێبینی بکه بزانه چۆن خۆی به تهنیا باجی ئهو ههڵوێستهی دا لهرێی دیسپلین و قوربانیدانهوه. ههروهها تێبینی بکه بزانه چۆن توانیویتی بهجۆش و خرۆشێکی زۆرهوه بگاته لاوان و ههرزهکارانی وڵاتهکهی و فێری ئهوهیان بکات ویژدان بکهنه رابهری ژیان و بهرنامهیهك پهیڕهو بکهن که یهکهم ههنگاوی ئهوهبێت ببنه پارێزانی چاكو پاشان لهڕوی ئابورییهوه پشت به خۆیان ببهستن و دواتر که پێگهیشتن هاوبهشی بکهن له بنیاتنانی کۆمهڵگاکهیاندا چ وهك باوك و چ وهك هاوڵاتی. فیلمهکه نیشانی دهدات چۆن ئهو گهنجانه ورده ورده له ستۆن جیابونهوهو بونه کهسانی سهربهخۆی وا که پرنسیپهکانی ویژدان و رێز لهخۆگرتن و مهشق و هاوکاری له ژیانیاندا باڵادهست بێت. لهو فیلمهدا به ئاشکرا دهبینیت که چۆن ستۆن راشکاوانه گهنجهکانی لهوه حاڵی کردووه که ئهو باوهڕی تهواوی به توانا و بههاکانی ئهوان ههیهو ئیلهامی ئهوهیشی پێبهخشیون چۆن خۆیان تواناکانی ناخی خۆیان ببینن.

چهندین ساڵ پاش بهرههمهێنانی ئهم فیلمه، هاوڕێیهکی دێرینی من ستۆنی بینی و ئاوا دواههواڵهکانی ئهوی بۆ باس کردم، "ئهوهی که زۆر زۆر منی سهرسام کرد ئهو

هاوسەنگییە بوو کە لەنێوان جەستەو ئەقڵ و رۆحی ستوندا هەبوو. ئەو لەڕوی جەستەییەوە زۆر چالاکە. رۆژانە مەشق بە گەنجەکان دەکات و بەبێ ئەوەی بێزار ببێت فتبۆڵێنیان فێر دەکات. رۆژی شەشی تیم. هەروەها ئەقڵیشی چالاکە، هەمیشە بیر لە رێگای تازە دەکاتەوە پەیامەکەی خۆی پێ جێبەجێ بکات کە رابەرایەتیکردنی لاوانە بەرەو ئاسۆی تازە.ئەو کەسێکی مەسیحییە بەڵام هاوسێکانی موسڵمانن.

کردەوەی رۆژانەی ستۆن ئاشتی و پێکەوە ژیان دەچەسپێنێت لە ناوچەکەدا. لەڕوی کۆمەڵایەتیشەوە بایەخ بە هەمو کەسێك دەدات، چ منداڵ بێت چ گەورە .. من بە بینینی فیلمەکەی ستۆن چەندین ئاسۆی تازەم بۆ دەرکەوت، بەڵام کە روبەڕوو بینیم، کەسایەتییەکی تایبەت و جۆرە گونجانێکی قوڵی وام بینی کە ئەو لەگەڵ خودی خۆیدا هەیبو کە چەندین ئاسۆی دورتر و سەرنجڕاکێشترم بۆ کرایەوە.

## بەشی یەکەم: دەنگی خۆت بدۆزەرەوە

## کورتەیەك و تەحەدایەکی کۆتایی

وا خەریکین لە کۆتایی ئەم دەروازەیەی کتێبەکە نزیك دەبینەوە کە تایبەتە بە دۆزینەوەی دەنگی تایبەتی خۆت. کەواتە با کەمێك بگەڕێینە دواوەو ئامانجە بنەڕەتییەکانمان بیربکەونەوە.

ئێمە دەزانین کە بۆشاییەکی دژوار هەیە لەنێوان ئەوەی مرۆڤ توانای مەزنی هەبێت و ئەوەی کە بەڕاستی رۆڵی هەبێت بە مەزنیی بژی. لەنێوان ئەوەی مرۆڤ درك بە گیروگرفت و ململانێ گەورەکان بکات کە لە شوێنی کارەکەیدا روبەڕوی دەبنەوەو لەوەی کە هێزی ناوەوەی خۆی و ئەو دەسەڵاتە رەوشتییە گەشە پێبدات کە وای لێ دەکەن لەو گیروگرفتانە رزگاری ببێت و هێزێکی تایبەتیشی پێ دەبەخشن چارەسەری کێشەکانی پێبکات.

جارێکی دیکە ئامۆژگاریت دەکەم بەم رێگە سادەیە تەماشای ژیان بکە: مرۆڤی تەواو (جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆح) چوارپێویستیی بنەڕەتی هەیە (پێویستی ژیان و فێربون و خۆشەویستی و جێهێشتنی کاریگەرییەك دوای خۆی) و خاوەنی چوار تواناو زیرەکیشە (زیرەکیی جەستەیی و زیرەکیی ئەقڵی و زیرەکیی سۆزداریی و زیرەکیی رۆحی) و ئەم چوار زیرەکییەش لەڕێی ئەم خەسڵەتانەوە باشترین گوزارشت لە خۆیان

دەکەن (دیسپلین و دید و عیشق و ویژدان). خەسڵەتەکانیش چوار رەهەندەکەی دەنگ بەرجەستە دەکەن (پێویستی و بەهرەو عیشق و ویژدان).

| مرۆڤی تەواو | چوار پێویستییەکە | چوار زیرەکییەکە | چوار خەسڵەتەکە | دەنگ |
|---|---|---|---|---|
| جەستە | پێویستی ژیان | زیرەکیی جەستەیی PQ | دیسپلین | پێویستییەکان تەماشای (وەڵامدانەوەی پێویستیەکان) بکە |
| ئەقڵ | پێویستی فێربوون | زیرەکی ئەقڵی IQ | دید | بەهرە (جەختکردنی بە دیسپلینەوە) |
| دڵ | پێویستی خۆشەویستی | زیرەکی سۆزداریی EQ | سۆز | جۆش‌وخرۆش (خۆشویستنی کارەکە) |
| رۆح | پێویستی جێهێشتنی شوێن دەست | زیرەکی رۆحی SQ | ویژدان | ویژدان (چاکەکردن). |

رێزگرتن و گەشەدان بەو زیرەکییانەو بەدیهێنانی هاوسەنگیی و تەواوکاریی لەنێوان زیرەکییەکان و دیمەنە باڵاکانیان هاوناهەنگییەکی وا دەهێنێتە ناراوە کە مەشخەڵەکەی ناخی خۆمان دادەگیرسێنێت و دەنگمان دەدۆزینەوە. رەنگە بەلاتەوە گرنگ بێت بزانیت کە یەکەمجار من وشە و بیرۆکەی (مەشخەڵی ناخی خۆت)م بەکارهێنا لە کتێبی (یەکەمجار مەسەلە گرنگەکان) کە رۆجەر وریبیکامیریل هاوکاری کردم لە نوسینیدا. چەند ساڵێك پاش ئەوە لیژنەی رێکخەری یارییەکانی ئۆلمپی زستانە لە شاری (سولت) لە ساڵی ٢٠٠٢دا داوایان کرد رێگەیان بدەم زاراوەی (مەشخەڵەکەی ناخی خۆت دابگیرسێنە) بەکاربهێنن وەك دروشمی سەرەکیی ئەو یاریانە و منیش بێ دوودڵی وەڵامم دانەوە: بێگومان دەتوانن، ئەوە شەرەفێك دەبێت بۆ ئێمە .. داواکارییەکە زۆر خۆشحاڵی کردم چونکە هەستم کرد رستەی (مەشخەڵەکەی ناخت دابگیرسێنە) بەکارهاتووە بۆ وەسفکردنی ئەو توانا مەزنانەی کە رۆحی مرۆڤ هەڵیان دەگرێت. چەند هەفتەیەك پاش کۆتاییهاتنی یارییەکان (ریت رۆمین) سەرۆکی لیژنەی رێکخەر پێی راگەیاندم کە لە مێژوی یارییە ئۆلۆمپیەکاندا

ئەمـە یەکـەمینجارە ڕێکخـەرەکان بتـوانن دروشمێکـی وا سـەرکەوتو هەڵبـژێرن کـە کاریگەرییەکـەی ماوەیـەکی زۆر لـە دڵ و ئـەقڵ و دەرونـی وەرزشکاران و خۆبەخشان و بینەرانی سەرتاسەری دنیادا بمێنێتەوە.




شێوەی ٥—٤

لە فەسڵی یەکەمدا وتمان کە دەنـگ (تەماشای شێوەی ٥-٤) بکـە، دەکەوێتـە شوێنی یـەکتربڕینی بـەهرە (بـەهرە سروشـتییەکان و خاڵـە بـەهێزەکانت) و عیشـق (ئـەو بابەتانـەی کە سـەرنجت ڕادەکێشن و ئیلهامت پێدەبەخشن و هانـت دەدەن و بـەهێزت دەکەن) و پێویستی (بەو شتانەشەوە کە جیهان بەتەواوی پێویستی پێیەتی تاکو لەبری ئەوانە شتێکت بداتێ) و ویژدان (ئەو چرپە هێمنەی ناخمان کە پێمان دەڵێت چی باشە بیکەین و هانیشمان دەدات ئەنجامی بدەین). هەروەها وتیشمان ئەگەر تۆ لـەناو کارێکی پیشـەیدا یاخود لـەناو کارێکی خێزانـی و کۆمەڵایەتیـدا بـەجۆرێك سـەرگەرم و تێکەڵ بویت کە بەهرەو جۆشوخرۆشەکانت تاو بسەنن و بزانیت کە بەو کارو هەڵوێستەی تۆ

پێویستییەکی مەزنی جیهان فەراهەم دەبێت و ویژدانت پاڵی پێوەنایت کارەکە جێبەجێ بکەیت، دڵنیابە ئەوە ئەو شوێنەیە کە دەنگەکەتی لێیە، کە بانگەوازەکەی ناختی تێدایە، کە کۆدی رۆحتی تێدا حەشاردراوە.

لە تەماشاکردنی شێوەی (٥-٥)دا بۆت ئاشکرا دەبێت کە لێکچوونێکی زۆر هەیە لەنێوان ئەو چوار رەهەندی دەنگ و چوار خەسڵەتە تایبەتەکەی کەسایەتی سەرکردە کە لە دید و دیسپلین و عیشق و ویژدان پێك هاتووە. دوان لە زاراوە پێکهێنەرەکانی هەردوو نمونەکە تەواو لەیەکتری دەچن کە بریتین لە ویژدان و سۆز. هەردوو زاراوەی (بەهرە) و (پێویست)یش هاوتەریبی زاراوەکانی دیسپلین و دیدن.




شێوەی ٥—٥

لەڕاستیدا ئەگەر بازنەی ویژدان (لەشێوەی ٥—٥دا) بەرزبکەیتەوە هەمان نمونەت دەست دەکەوێت.

ئەم چوار رەهەندەی دەنگ بەجوانی لە چیرۆکەکەی محەممەد یونس‌دا رونکراوەتەوە. چۆن دەنگی خۆی دەدۆزێتەوە؟ یەکەمجار هەستی بە پێویستییەکی مرۆڤایەتی کرد، پاشان ویژدان ئیلهامی ئەوەی پێبەخشی کە پێویستە کارێك بکات. جا لەبەرئەوەی بەهرەکەی ئەم لەگەڵ پێویستییە مرۆڤایەتییەکەدا دەگونجا، بەهرەکەی وا رێك خست کە چارەسەر پێشکەش بکات. ئەو کارەی کە چارەسەرەکە پێویستی پێی بو

تەنیا هەر بەهرەکانی ئەوی ڕانەکێشا، بەڵکو جۆش‌وخرۆشیشی هەڵساند. ئەوەی کە وادەکات دیدی هێندە مەزن دابهێنرێت کە چەند قاتی توانای مرۆڤ و دەزگاکان بێت پێویستی‌یە و هەر ئەمەشە ئیلهام بە خەڵکەکە دەبەخشێت دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە.

لەکۆتایی وەرزی یەکەمدا [دەنگی خۆت بدۆزەرەوە] بەڵێنێکت دەدەمێ و تەحەدایەکیش دەخەمە بەردەمت. بەڵێنەکە ئەوەیە کە ئەگەر تۆ ئەم چوار بوارە – بەهرە (دیسپلین) و پێویستی (خەون) و جۆش‌وخرۆش و ویژدان- لە هەر ڕۆڵێکی ژیاندا بەکاربهێنیت ئەوا دەنگی خۆت لەو ڕۆڵەدا دەدۆزیتەوە. تەحەدا ساکارەکەش ئەوەیە کە دووسێ ڕۆڵ لەو ڕۆڵە سەرەکییانە بەنموونە وەربگریت. کە لە ژیانتدا دەیانگێڕیت و ئینجا لە هەمو ڕۆڵێکدا ئەم چوار پرسیارە لەخۆت بکە:

١. ئایا خێزانەکەم یان کۆمەڵگاکەم یان ئەو دەزگایەی کاری تێدا دەکەم پێویستی بەو کارە هەیە.

٢. ئایا ئەو بەهرە ڕاستەقینەیەت هەیە کە ئەگەر ڕێك بخرێت و جێبەجێ بکرێت، دەتوانیت پێویستییەکە بهێنیتەدی؟

٣. ئایا هەل وەڵامدانەوەی ئەو پێویستییە، جۆش‌وخرۆشم تێدا دروست دەکات.

٤. ئایا ویژدانم پاڵم پێوە دەنێت کارێك ئەنجام بدەم پەیوەندی هەبێت بە جێبەجێکردنی ئەو پێویستییەوە؟

ئەگەر هەرچوار پرسیارەکەت بە بەڵێ وەڵام دایەوەو خۆت لەسەر گەشەپێدانی ئەخشەیەکی کارکردن ڕاهێنا بۆ جێبەجێکردنی، دڵنیات دەکەم کە دەنگی ڕاستەقینەی خۆت لە ژیاندا دەدۆزیتەوە ژیانێك دەژیت لێوانلێو لە هەستکردن بە مەزنی و قوڵیی.

ئێستاش با بچینە وەرزی دووەمی کتێبەکە:
ئیلهام ببەخشە بەوانی دیکەش دەنگی تایبەتیان بدۆزنەوە.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: ئایا ئەم شێوەی خۆ بەڕێوەبردنە، دەتوانێت یارمەتیم بدات لە زاڵبوون بەسەر گەورەترین کێشەدا کە بە درێژایی تەمەنم لەگەڵمدا بووەو ئەویش بریتییە لەوەی کێشم کەم بکەمەوەو جوانی جەستەم بپارێزم؟

وەڵام: ئەگەر تۆیش وەکو زۆربەی خەڵکەکەیت، کەواتە ناوبەناو بڕیار دەدەیت کێشت لە ئاستێکدا رابگریت. ئەم بڕیارە مانای وایە پێویستە چەند کیلۆیەک دابەزێت. ئەرکە سەرەکییەکە بەدیهێنانی جوانی جەستەییەو ئەوەیە مرۆڤ تەندروستترو بەهێزترو لێهاتوتر بێت. خەون و دیدەکە ئەمەیە.

لێرەدا دیسپلینە پێویستەکە بریتییە لەچی؟ زۆرجار دیسپلینەکە پێک دێت لە پابەندبون بە رێکخستنێکی تایبەت و بە مەشقی وەرزشی و حەوانەوەو چارەسەرکردنی ماندویتی.

جۆش‌وخرۆش یەعنی پاڵنەرو پابەندبونی سۆزداریی و هێزی هەست‌و سۆزەکان. ویژدان پێت دەڵێت بۆچی پێویستە هەوڵبدەیت تەندروستتربیت! بۆ ئەوەی زیاتر بژیت و پشتگیریی خێزانەکەت بکەیت و بەشێوەیەکی گونجاو هاوکاریی بکەیت لە پەروەردەکردنی ئەوەکانتدا، یاخود تەنیا هەر بۆ ئەوەی هەست بکەیت لە ئێستا باشتریت.

دەبینیت ئەگەر پاڵنەرەکە تەنیا دەرەکی بێت –بۆ ئەوەی جوانتر بنوێنیت، یاخود چونکە ئێستا مۆدەی وایە و .. تاد. ئەوا زۆرجار بەهاکەی نامێنێت چونکە هۆکارەکە شایستەی ئەوە نییە خۆت پابەندبکەیت بەو کارە زەحمەتەوە. پێش ئەوەی خواردنێکی بەتام بخۆیت کە قەڵەوت دەکات خۆت لەسەر ئەوە رابهێنە کە بە خواردنەکە بڵێیت: ئەگەر لەماستی تۆدا خۆم بپارێزم و نەمخواردیت ئەوا کێشم دادەبەزێت و کەسایەتیم بەهێز دەکات. لە دنیاشدا هیچ تامێک ناگاتە تامی هەستکردن بە هێزو سەرکەوتن.

زۆرجار مرۆڤ هەست بە شکست و نائومێدی دەکات لەئەنجامی ئەوەی بڕیار دەدات خۆی لاواز بکات و کێشی دابەزێنێت کەچی چەند سەعاتێک یاخود چەند رۆژێک پاش ئەوە لە بڕیارەکە پەشیمان دەبێتەوە. زۆرکەس هۆکارەکە بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە کە ناتوانن پابەندبن و خۆیان بپارێزن. بەڵام بەپێی شارەزایی من کێشە گەورەکە لە پابەندبوندا نییە بەڵکو لە گرێنەدانی هەڵسوکەوتەوەیە بە خەونەکەوەو ئینجا گرێنەدانێتی بە بەهاکانمان و پاڵنەرە قوڵەکانمانەوە (ویژدان) واتە بە شتە هەرە گرنگەکانمانەوە. رێگەم بدەن لێرەدا ئەزمونی هاوڕێیەکی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە: من لە پیشەکەمدا زۆر لێبڕاوانە کارم دەکردو کاتێک تەمەنم گەیشتە ٤٥ ساڵ بەتەواوی سەرکەوتوبوم. کێشم شەست پاوند لە کێشی ئاسایی زیاتر بو. چونکە زۆرم دەخوارد، بەتایبەت لە کاتە ناخۆش‌و زەحمەتەکاندا.

بواری وەرزشکردنیشم نەبو. الۆگانای کورم لە پێنجەمین جەژنی لەدایکبونیدا کتێبێکی پێشکەش کردم دەربارەی ژیانی تەندروست و لەناو کتێبەکەدا بە هاوکاری دایکی بۆی نوسیبوم (بابە، لەپێناوی ئەم جەژنی لەدایکبونەمدا داوات لێ دەکەم سەلامەت بیت، دەمەوێت لەم ژیانەدا ماوەیەکی زۆر لەگەڵمدا بیت، کە ئەو وشانەم خوێندەوە هەستم کرد هەورەبروسکەیەک لێی داوم.

ئەم پاڕانەوەیەی منداڵەکەم تێڕوانینی من بۆ شێوەی ژیانم بەتەواوی گۆڕی. ئیتر لەو ڕۆژەوە زۆر خواردن و تەمەڵیکردن لە وەرزشدا لە بەرنامەمدا نەمان. بەکسەر ئەو کاریگەرییە ناتەندروستەم بینی کە ئەگەر بەردەوام بومایە بۆ منداڵەکانم بەجێهێشت ئەگەر بەو شێوەیە بەردەوام بومایە لەسەر تەمەڵی و زۆرخواردن. من بۆ ئەوان سەرمەشقێک بوم چاویان لێ دەکردم. سەرمەشقێک پێیان دەڵێت جەستەی مرۆڤ گرنگ نییە و خۆ کۆنترۆڵکردن گرنگ نییەو تاقە شتێک کە پێویستە مرۆڤ لەم ژیانەدا بە جددی هەوڵی بۆ بدات پارەو ناوبانگە.

درکم بەوە کرد کە بەرپرسیارێتم بەرامبەر منداڵەکانم تەنیا دابینکردنی پێویستییە جەستەیی و دارایی و سۆزدارییەکان نییە. بەڵکو پێویستە پێشەنگێکی باشیش بم بۆیان و من حاڵی حازر ئەو پێشەنگە نیم. بۆیە خۆم پابەندکرد بەوەی پارێزگاریی لە تەندروستی خۆم بکەم لەپێناوی منداڵەکانمدا نەک تەنیا بۆ تەندروستی خۆم و کەمکردنەوەی کێشم. بۆ من ئەوە کلیلی مەسەلەکە بو. مرۆڤ تەنیا دەتوانێت پابەندی ئەو مەسەلانە بێت کە بایەخێکی ڕاستەقینەیان هەیە بۆی. پێشتر چەند جارێک ڕێجیم و وەرزشم کردبو، بەردەوامیش دەبوم لەسەریان تا ئەوکاتەی بارێکی دەرونی تایبەت ڕوبەڕوم دەبووەوە. دابەزاندنی کێش بەتەنیا نەیدەتوانی ببێتە مەسەلەیەکی ئیلهامبەخش بۆ من، بەڵام منداڵەکانم بەلامەوە زۆر گرنگ بون. هێندە بایەخداربون کە دەمتوانی لەپێناوی ئەواندا بڕیاری تەندروستیی جێبەجێ بکەم.

ئامانجێکم بۆ خۆم دیاری کرد کە بریتی بوو لەوەی کە پێویستە چوست و چالاک بم، هێندە سەرقاڵ و بەتوانابم لەگەڵ هاوڕێکانمدا، لەسەر کارو لەگەڵ منداڵەکاندا لەدوای ئیش یاری بکەم. بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە ڕێجیمێکی تایبەت و بەرنامەیەکی دیاریکراوی وەرزشیم پەیڕەوکرد. کلیلەکە لێرەدا ئەوەبو کە ئامانجەکە ڕێجیم و وەرزشی نەبو، بەڵکو ئامانجەکە ئەوەبو کە لەپێناوی منداڵەکاندا تەندروستیم باش بێت.

ئێمە ئەمڕۆ پێکەوە وەرزش دەکەین. ئێستا وام لێ هاتوە هەمیشە کاتی گونجاو بدۆزمەوە ئامانجەکەمی تێدا جێبەجێ بکەم و دەزانم کەی ئیتر کاتی ئەوەیە دەست لە کارەکە هەڵبگرم و بڕۆم بەلای پێویستییەکانی جەستەمەوە.

ماوەی دوو ساڵە من شێوازی بیرکردنەوەم گۆڕیوە. ئیتر بەزۆر لەناو جێگەکەم نایەمە دەرێ و وەرزشکردن بۆتە خوویەک لە خووەکانم. ئێستا ئیتر وەکو جاران هەر تاوە نا تاوێک واز لە وەرزشکردن ناهێنم. بێگومان جاری واش هەیە هەست بە هیلاکی و سەرئێشە و کرژبونی ماسولکەکان و گەرماو بێ تاقەتی دەکەم؛ بەڵام گەڕانەوە بۆسەر ئەو ڕێگایەی کە خۆم نەخشەم کێشاوە زۆر زۆر ئاسانترە. چونکە ئامانجێکی مەزنترم هەیەو مەسەلەکە لەلام پابەندبونە بە کەسانێک کە لەخۆم زیاترم خۆش دەوێن، لەبەرئەوە دەتوانم بگەڕێمەوە سەر ڕێگاکە.

پرسیار: ئەو شتانەی خوێندومنەتەوە، چۆن دەتوانن یارمەتیم بدەن کارێکم دەست بکەوێت؟

وەڵام: خۆڵاواز کردن و دابەزاندنی کێش لە بنەڕەتدا ئەرکێکی تاکە کەسییەو پێویستی بە هاوکاریی خەڵکانی دیکە نییە. بەڵام دۆزینەوەی کارێک کە تۆ دەتەوێت، پێویستی بە هاوکارییەکی زۆر هەیە لەگەڵ خەڵکانی دیکەداو هەروەها دەبێت کارێک بکەیت دەوروتەنسیرت لەسەر خەڵکەکە زیاتر بێت.

با ئێستا پێکەوە بیر بکەینەوە، مرۆڤ چۆن دەتوانێت لەڕێی چوار خەسڵەتەکەی کەسایەتییەوە کاری دەست بکەوێت، کە بریتین لە: دید و دیسپلین و عیشق و ویژدان؟ گلیلەکە لێرەدا هەرچوار خەسڵەتەکەن پێکەوە؛ ئەگەر یەکێکیان پەراوێز بخەیت، بەزەحمەت دەتوانیت ئەو کارەت چنگ بکەوێت کە دەتەوێت و ئەگەر گریمان دەستیشت کەوت هەرگیز ناتوانیت بەوشێوەیە پابەندبیت پێوەی کە خۆت بڕیارت لێ داوەو کە ئیشەکە دەیخوازێت.

با وای دابنێین کە بازاڕی کار زۆر لاوازەو ئیش بەجۆرێك وەستاوە کە کۆمپانیاکانی ئەو شارەی تۆی تێدا دەژیت و لەو بوارەی کە تۆ دەتەوێت کاری تێدا بکەیت، نەك هەر تۆ دانامەزرێنن بەڵکو، کارمەندە دامەزراوەکانی خۆی دەردەکات، ئایا لە بارودۆخێکی وەهادا چۆن ئەو کارەت چنگ دەکەوێت کە دەتەوێت؟ سەرەتا بۆ ئەوەی خەونێك و دیدێکت هەبێت پێویستە بزانیت چ کارێکت دەوێت. دیسپلین بەکاربهێنە بۆ تێگەیشتنی

کارەکەو بۆ تێگەیشتنی دەزگاکەی کە دەتەوێت کاری تێدا بکەیت و بۆ تێگەیشتنی پێویستیەکانی کارو سروشتی بازاڕ و ئەو هێزانەی کە دەوروتەنسیریان هەیە لەسەری، وەك کێبڕکـێ و حـەزو پێویسـتیی کڕیارەکـان و هـەروەها بـۆ تێگەیشـتنی تایبەتمەندییەکانی ئەو بوارەی کە دەتەوێت کاری تێدا بکەیت و ئاڕاستە باڵادەستەکانی ئەو بوارە. بە کورتییەکەی پێویستە نرخی تێگەیشتنی کێشەکان و تەحەداکان بدەیت کە دامەزراوەکە روبەڕویان بۆتەوە. پاشان ئەو مەسەلانە دیاری بکە کە جۆش‌وخرۆش هەڵدەسـتێنن. بزانـە ئایـا ئیشـەکە لەگـەڵ توانـاو بـەهرەو حـەزو بایەخەکانتانـدا دەگونجێت؟ ئەگەر وایە ئایا ویژدانت پێت رادەگەیەنێت کە ئەم کارە شایستەی ئەوەیە پابەندبیت پێوەی؟

ئەگەر وەڵامەکە بەڵێ بو ئایا دەتوانیـت گۆشـەنیگایەك دروست بکـەیت خۆتی تێدا ببینیت ئەوکارە ئەنجام دەدەیت؟

پاش ئەنجامدانی ئەم هەمو کارە ئامادەکارییانـە دەتوانیت بـەخۆت بڵێیت ئامـادەم بڕۆم بۆ چاوپێکەوتنەکە، نەك وەکو کێشەیەکی دیکە بۆ ئەو کەسەی چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵدا دەکـا، بـەڵکو وەکو چارەسـەرێك بـۆ ئـەو کێشانەی بڕیاربەدەسـتەکان روبـەڕوی دەبنەوە. وا نیشان بدە کە لە کارمەندەکانی ئێستای دەزگاکە باشتر لە گیروگرفتـەکانی ئـەو دەزگایـە تێدەگەیت. لـە کارمەنـدو کرێکارەکـانی ئێستای دەزگاکە زیـاتر عیشق و پابەندبون بە پێویستییەکانی دەزگاکە نیشان بدە. ئەگـەر پێویسـتی کـرد پێشنیار بکە ماوەیەك بە خۆڕایی کاریان بۆ بکەیت وەك تاقیکردنەوە بـۆ ئـەوەی دڵنیـابن کە تۆ لە هەمو کارمەنـدێکی ئێسـتاو لـە هـەمو داواکـارێکی تـازە چـاکتر کێشـەکانیان چارەسـەر دەکەیت، چونکە تۆ هەڵگری خەسڵەتەکانی سەرکردەیت، خۆت دەستپێشخەری دەکەیت بـۆ کـاری چـاك و چاوەڕێ ناکـەیت خـەڵکی دیکە ئـەو دەستپێشخەرییە بکەن، لەکاتی خۆیـدا رەفتـاری گونجـاو دەنوێنێت بـەڵام گێلانـە و ملهوڕانـە نـا. تـۆ زۆر هەسـتیارو روخۆشیت و رێزی خەڵکی دەگریت و زۆر وریاشیت.

پێویستە گەڕانەکەت بەدوای کاردا بەشێوەیەك بێت پشت بەستوبیت بە سەرەتاکان. نـە زیـادەڕۆیی تێـدابێت و نـە فـێڵ و نـە درۆ و نـە دوڕویـی و نـە ریاکـاری و نـە کەمکردنەوەو سوککردنی ئەوانی دیکە.

پێویسـتە زۆر جـەخت بکەیتـەوە لەسـەر پێویسـتی و گیروگرفـت و مەترسـیەکانی

دەزگاکەو لەسەر پێویستی و گیروگرفت و مەترسییەکانی کرپارەکان و بەکارهێنەرەکان، دەبێت بەو زمانە بدوێت. هەرکەسێك لە بەدەستهێنانی کاردا ئەم ڕێگەیە بەکاربهێنێت سەرنجی برپار بەدەستەکان رادەکێشیت و غافلگیریان دەکات بەوەی کە چەندە بەتواناو خاوەن دیسپلینەو چەند حەزی لە قوربانیدانە.

من سالأنێکی زۆر ئەم ئامۆژگارییەم چەندین جار پێشکەشی خەڵکی کردوە. دیارە تەنیا ژمارەیەکی کەمیان بەقسەیان کردوم، بەلام تێکرای ئەوانەی جێبەجێیان کردوە توانیویانە ئەو کارەیان دەست بکەوێت کە ویستویانە.

بۆ تێگەیشتنی ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی چاکتر من هەمیشە پێم باشە دوا چاپی کتێبی (پەرەشتوتەکەت رەنگی چۆنە) بخوێننەوە کە ریچارد بۆلیس نوسیویتی.

پرسیار: ئەوەی خوێندومەتەوە چۆن سودی لێ ببینم بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگی لە ژیانمدا؟

وەلأم: زۆربەی ئامارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە گەورەترین کێشەی خەڵکەکە ئەوەیە ناتوانن هاوسەنگیی لە ژیانیاندا بەدی بهێنن. خەڵك زیاتر بایەخ بە ئیش و بە چالاکیە پێویست و هەنوکەییەکان دەدەن بەجۆرێکی وا کە ئەو پەیوەندی و چالاکییانەی کە بەلایانەوە مانادارو زۆر گرنگن کەمدەبنەوەو دەخرێنەلاوە. زۆربەی خەڵکەکە توشی ئیدمان بون لەسەر کارە پێویستەکان.

ڕێگەم بدەن با ئەم کێشەیە لە چیرۆکێکی پیاوێکەوە روون بکەمەوە کە گیرۆاوی سەرقاڵبوون بە کارە پێویستەکان لەگەڵ خۆیاندا بردبویان. بزانە دواتر کابراکە چۆن راوەستاو بیری لەوشتانە کردوەوە کە بۆ ئەو گرنگترن (ویژدان و خەون و جۆش‌وخرۆش). پاشان ئەم پێوەرانەی بەکارهێنا بۆ ئەوەی رێگایەك بخولقێنێت ژیانی ڕێك بخاتەوە بەو شێوەیەی کە لەگەڵ بایەخەکانیدا بگونجێت (دیسپلین) و هاوسەنگیی بەدی هێنا لە ژیانیدا. هەروەها تێبینیش بکە بە هاوکاری ژنەکەی توانی چارەسەر بدۆزێتەوە. ئەمە چیرۆکەکەیە لە زمانی خۆیەوە:

"هاورێیەتی و پەیوەندییەکی تایبەتیم هەیە لەگەڵ دایکمدا. پێکەوە زنجیرەیەک رووداوی ژیانمان بەرگە گرت کە لە ئەنجامدا پەیوەندییەکی خۆش‌و بەهێز لەنێوانماندا دروست بو. بەلام لە قۆناغێکی دیکەی ژیانمدا بەتەواوی سەرقاڵی ئەو ئیش‌وکارانە بوم کە پەیوەندییان بە ئیشەکەم و خێزانەکەم و کۆمەڵگاوە هەبەو پەیوەندیم لەگەڵ

دایکمدا جۆرێکی دیکەی لێ هات، هەرچەندە خۆشم دەویست و کە لەگەڵیدا دەبوم هەستم بە کامەرانی دەکرد.

سەرقاڵییەکە وای لێ کردبوم چەندین هەفتە تێدەپەڕی بێ ئەوەی بوارم هەبێت تەنانەت بە تەلەفۆنیش هەواڵێکی بپرسم. ئەگەر هەلیشم بۆ هەڵبکەوتایە سەردانی بکەم زۆر بە کەمی قسەمان دەکردو خێرا کاتی ئەوە دەهات بەجێی بهێڵم لەپێناوی کۆبونەوەیەکدا یاخود بۆ ئەنجامدانی کارێک کە پێشتر دیاریم کردبو. پەیوەندیم لەگەڵ ئەم ژنە مەزنەدا کەوتبووە ژێر رەحمەتی رێکەوتەوە. دایکم هیچ کاتێک زۆری لێ نەدەکردم زیاتر سەردانی بکەم، بەڵام خۆم لەناخەوە زۆرم پێناخۆش بو کە پەیوەندییەکەمان گەیشتۆتە ئەو ئاستە. بۆم دەرکەوت کە ئەگەر نەتوانم کاتێک دابین بکەم لەگەڵ دایکمدا بەسەری ببەم مانای وایە کۆنترۆڵی ژیانی خۆمم لەدەست داوە. لەبەرئەوە من و ژنەکەم بیرمان لەوە کردەوە چارەسەرێک بدۆزینەوە. ژنەکەم پێشنیاری کرد هەفتانە کاتێک دیاری بکەم لەگەڵ دایکمدا بەسەری ببەم کە هەم بۆ خێزانەکەم بگونجێت و هەم بۆ دایکیشم. کە سەیری خشتەی ئیش‌وکارەکانمان کرد بینیمان ژنەکەم هەمو ئێوارەیەکی چوارشەممەی داناوە بۆ کارێکی وا کە پێویستی بە من نەبێت، لەبەرئەوە بڕیارمان دا هەمو هەفتەیەک من ئەوشەوە لەگەڵ دایکمدا بەسەربەرم.

دایکم ئێستا دەزانێت کە هەمو هەفتەیەک یان هەر دووهەفتە جارێک من لەو شەوەدا دەچم بۆلای. ئیتر خەمی ئەوەمان نییە کاتەکە بەش ناکات و کەسیش قسەمان پێنابڕێت و وەزعەکەمان لێ تێک نادات. ئەگەر ویستی وەرزش بکات و بجوڵێت پێکەوە پیاسە دەکەین. جارەکانی دیکەش یان چێشتم بۆ لێ دەنێت یاخود بۆ شت کڕین دەچینە جێگەیەکی دوری وا کە خۆی بەتەنیا ناتوانێت بچێت. بە درێژایی ئەو ماوەیە قسەدەکەین و باسی خێزانەکەو روداوەکان دەکەین و بیرەوەرییەکان دەگێڕینەوە.

هەر شەوێک لەو شەوانەی کە لەگەڵ دایکمدا بەسەری دەبەم وەکو سەیرانگایەکی هێمن وایە لە ژیانە جەنجاڵەکەمدا. بە ژنەکەمم وت پێشنیارەکەی ئەو باشترین پێشنیاری بوە کە لە ژیاندا پێشکەشی کردوم.

ئەم کورتە چیرۆکە خۆشە تەنیا نمونەیەکە. ئێمە ئەگەر دڵ و ئەقڵمان بە باشی بخەینە کار دەتوانین زۆر چاکتر بۆ ئەو بابەت و مەسەلانە بژین کە بەلامانەوە گرنگن و ئەمەش هاوسەنگییەکی گەورە بە ژیانمان دەبەخشێت. من کاتێک کە باوکم مرد

بڕیارم دا پەیوەندیم لەگەڵ دایکمدا بپارێزم و بەهێزتریشی بکەم، چونکە بۆشاییەکی تازە چوبووە ژیانییەوە. سوربو لەسەر ئەوەی هەرچۆنێك بوە ڕۆژانە پەیوەندی پێوە بکەم و دوو هەفتە جارێکیش سەرم دەدا، ئەگەر چی ماڵەکەی ٧٠ کیلۆمەتر لە ماڵی ئێمەوە دوربوە. دایکم ١٠ساڵی دیکە ژیاو تا ئێستاش ناتوانم سوپاس و مەمنونیی خۆم دەربڕم بۆ خۆی و بۆ ئەو ماوە خۆشانەی پێکەوە بەسەرمان برد. بە ئەزمون بۆم دەرکەوتوە ئەگەر پەیوەندییەکی ڕێك‌وپێك و بەردەوامت لەگەڵ کەسێکدا هەبێت، وات لێ دێت بە ئاسانی لێی تێبگەیت. بۆم دەرکەوت پەیوەندیە تەلەفۆنییە ڕۆژانەکە زۆر جیاوازی نییە لەو یەکتربینینەی کە دوو هەفتە جارێك مەیسەر دەبو. هەردووکمان هەستمان کرد لەیەکەوە نزیکین و لەگەڵ یەکتریدا کراوەین و باوەڕ بە یەکتری دەکەین، وەك ئەوە وایە پێکەوەبین.

مەسەلەکە وا دەهاتە بەرچاوی هەردووکمان کە لە گفتوگۆیەکی بەردەوامداین لەگەڵ یەکتریدا. ئەمە بۆ من مایەی سەرسامیی بو، چونکە وام دەزانی هیچ شتێك، بە تەلەفۆنیشەوە، ناگاتە ئاستی یەکتربینینی ڕاستەوخۆ.

من زۆر بڕوام بەمە هەیە چونکە هەر گفتوگۆیەك دەوروتەنیسیری گفتوگۆکانی پێشوی هەڵگرتوەو مەسەلەکە تەنیا گێڕانەوەی بیرەوەرییە هاوبەشەکان نییە. پەیوەندی قوڵ یەعنی شۆڕبونەوە بە ناخی بەرامبەرەکەتداو بینینی شتەکانی ناوی.

منیش وەکو پیاوی چیرۆکەکەی پێشو ئەو سودە مەزنەم لەسایەی هاوسەرەکەمەوە دەست کەوت کە تێم دەگات و هانم دەدات و خاوەنی ئەقڵێکی کراوەیە.

(ساندرا)ی هاوسەرم وا سەیری ژیان ناکات کە قاڵبێك شیرینی دیاریکراوەو بواری دیکەی تێدانییە. وای لێك ناداتەوە کە ئەوکاتەی من لەگەڵ دایکمدا بەسەری دەبەم دورکەوتنەوەمیە لەو. ساندرا بۆی دەرکەوتوە کە ئەوکاتەی کە لەگەڵ دایکمدا بەسەری دەبەم دەبێتە هۆی قوڵبونی زیاتری پەیوەندییەکانی نێوان من و خۆی.

کە دایکم مرد، ئێمە دێڕە شیعرێکی شکسپیرمان لەسەر گۆڕەکەی نوسی کە دەڵێت (یادی خۆشەویستی تۆ لە هەمو شتێك تێرم دەکات). من پێم باشە تەواوی شیعرەکە بە وردی بخوێنیتەوەو ڕێگە بدەیت خەیاڵت لە وشە بە وشەی ئەو شیعرە و واتاکانی پاراو ببێت:

کە بەدبەختی یەخەم دەگرێت و کە خەڵکی تەماشام دەکەن

بۆ حاڵی خۆم بەکوڵ دەگریم

بەو گریانەم گوێچکەی ئاسمانیش کەڕ دەکەم
بەڵام سودی نی‌یە
ئینجا سەرنج لە خۆم دەدەم
نەفرەت دەکەم لە چارەنوسم
دەڵێم ئاخ خۆزگە منیش
وەکو ئەو خەڵکە بومایە
وەکو ئەوان هاوڕێی دڵسۆزم هەبوایە
وەکو ئەوان هونەرمەندو
تێگەیشتو
بەختەوەر
چێژم لە ژین وەربگرتایە
لە گەرمەی ئەو خەیاڵ و بێزاری و نائومێدییە
یەکسەر تۆ دێیتە ناوخەیاڵ
خۆم دەبینم
باڵندەیەکم دەخوێنم
بە تەنیایی لە سەحرادا
لە دەروازەکەی ئاسماندا
لایەلایە بۆ خەم دەکەم
یادی خۆشەویستی تۆ
لە هەمو شت تێرم دەکات
وام لێ دەکات
شا بە سەهان نەزانم

ڕەنگە باشترین ڕێگە بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگیی لە ژیاندا خێزان بێت. یەکەمین قۆناغ و گرنگترین قۆناغی گەشەسەندنی کەسایەتی کە پێویستی بە چاودێرییە لەناو خێزاندا رودەدات و ئەمەش قۆناغێکە مەزنترین خزمەت پێشکەشی کۆمەڵگا دەکات.

منیش لەگەڵ ئەو بیرمەندەدا هاوڕام کە دەڵێت گرنگترین و مەزنترین کار ئەوەیە لەناو چواردیواری ماڵەکەی خۆتدا دەیکەیت. (دەیڤید ئۆ. ماکای (David D. Mekay

دەڵێت: "هیچ سەرکەوتنێك قەرەبوی ئەو شکستە ناکاتەوە کە مرۆڤ لە ماڵەوە توشی دەبێت".

باوەڕی من بە گرنگیی خێزان هێندە قوڵ و بەهێزە کە چەند ساڵێك لەمەوبەر کتێبێکم نوسی لەژێر ناونیشانی (حەوت خووەکەی خێزانە هەرە کاریگەرەکان).

گرنگترین بەرپرسیارێتی کە مرۆڤ لە ژیانیدا هەیبێت و ئەوپەڕی چێژو بەختەوەریی پێببەخشێت باوکایەتی/ دایکایەتییە. هەرکاتێکیش لەو باوکایەتییە/ دایکایەتیەدا سەرکردایەتییەکی راستەقینەی خۆی نەنواند، خەون و دیسپلین و جۆش‌وخرۆش و ویژدان لەو باوکایەتی/ دایکایەتییەدا رەنگیان نەدایەوە ئەوا گەورەترین شکست روددەدات.

من بەوە سەرسامم کە چۆن راستکردنەوەی سادە لە ژیانی مرۆڤدا سەبارەت بە خەون و دیسپلین و جۆش‌وخرۆش و ویژدان دەتوانێت ئەنجامگەلی مەزنی هەبێت. وابزانم ئێمە لە ئایندەدا خەفەت بۆ ئەوە دەخۆین کە بۆچی ئەو گۆڕانکارییە بچوکانەمان بەدی نەهێناوە کە دەیانتوانی ئەنجامی مەزن بدەن بەدەستەوە.

بە باوەڕی من زەحمەتترین و چاکترین تاقیکردنەوەی سەرکردایەتی بریتییە لەوەی دایك و باوك لە خێزانەکەیاندا خەونەکە بهێننە دی و بڕوایان بە دەرفەتەکان هەبێت و لەڕێی دیسپلین و قوربانیدانەوە بۆ بەدیهێنانی خەونەکە تێبکۆشن و هەوڵ بدەن ساتەوەختە زەحمەت و ناخۆشەکان تێبپەڕێنن بەوەی کە ئەوپەڕی جۆش‌وخرۆش و پابەندبون نیشان بدەن و پاڵنەری تێکڕای ئەوانەش تەنیا هەر ویژدان بێت، ئەگەر خەونەکە بریتی بێت لە گواستنەوەی کەلتوری خێزان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە، ئەوا تەنیا بەدیهێنانی ئەم مەسەلەیە بەسە بۆ ئەوەی ژیان پڕببێت لە بەختەوەریی و فایل بون، تەنانەت ئەگەر هیچ دەستکەوتێکی دیکەشمان نەبێت. بەڵام ئەگەر لەمەدا شکست بخۆین ئەوا سەرکەوتنی بوارەکانی دیکە قەرەبوی ئەم شکستەی پێ نادرێتەوە.. من هەمیشە بیر لەو وتە کاریگەرەی (جۆن گرینلیف ویتەر) دەکەمەوە. کە دەڵێت: خەمناکترین رستەیەك کە زمان بیڵێت و قەڵەم بینوسێت ئەوەیە بڵێت دەمتوانی وا بومایە. بەڵام مرۆڤی واش هەیە دەڵێت: "هێشتا بواری ئەوەمان لەکیس نەچوە ببین بەو شتەی کە دەتوانین پێی بگەین".

# بەشی شەشەم

## هانی خەڵکی بدە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە
## گیروگرفتەکانی سەرکردایەتیکردن

"ئەوە بەسەر هەمو کەسێکدا دێت رۆژێک لە رۆژان ئاگرەکەی ناخی خامۆش ببێت و پاشان کە بە مرۆڤێکی دیکە دەگات جارێکی دیکە کڵپەبسەنێتەوە.
پێویستە سوپاسی ئەو کەسانە بکەین مەشخەڵەکەی رۆحمان دادەگیرسێنن"

- ئەلبێرت شوێتەرز

لە هەرزەکاریمدا ئەزمونێکم بۆ دروست بو کارێکی قوڵی کردەسەر داڕشتنی هەمو ژیانم. من بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری زیاتری خۆبەخشانە بڕیارم دا بەشێوەیەکی کاتی دەست لە خوێندن هەڵگرم. بانگهێشتنامەیەکم بۆ هات بچم بۆ ئینگلتەرا. چوار مانگ پاش گەیشتنم بە ئەوێ، رۆژێکیان سەرۆکی رێکخراوەکە پێی وتم: "لەمەولا ئەرکێکی تازەت پێدەسپێرم، دەمەوێت بە ناوچە جیاجیاکانی وڵاتدا بگەڕێیت و مەشق بە سەرکردە ناوچەییەکان بکەیت". ئەم داواکارییە غافڵگیری کردم. من کێم تا بتوانم مەشق بەو سەرکردە ناوچەییانە بکەم کە هەریەکەیان دوو– سێ تەمەنی منیان هەیە؟ سەرۆکی رێکخراوەکە هەستی بە گومانەکانم کرد، لەبەرئەوە چاوی بڕیە چاوم و پێی وتم: "باوەڕێکی گەورەم پێت هەیە. دڵنیام کە دەتوانیت ئەو کارە ئەنجام بدەیت، کەرەسەی پێویستت دەدەمێ یارمەتیت بدات وانەکان ئامادە بکەیت و هەروەها ئەوانیش وا لێ بکات ئەوپەڕی چێژ لە مەشق و راهێنانەکان وەربگرن" ئەو سەرۆکی رێکخراوە شتێکی دیاریکراوی لە ناخمدا ئازاد کرد، چونکە متمانەی پێکردم و توانی لە ناخی مندا شتێك ببینێت کە خۆم نەمبینیبو. جگە لەمانەش ئەو بەرپرسیارییەی کە

سەرۆکی ڕێکخراوەکە خستییە سەر شانم پاڵی پێوەنام تواناکانم بێدار بکەمەوە. بۆیە منیش بەرپرسیاریەتەکەم قبوڵ کردو باشترین وزەو بەهرەو توانای خۆمم پێبەخشی.

ئەو ئەزمونە توانا جەستەیی و ئەقڵی و ڕۆحی و سۆزداریەکانمی ئازادکرد. ئەوانی دیکەشم دەبینی گەورەدەبن. لەو ئەزمونەدا چەند نمونەیەکی سەرەتا بنەڕەتییەکانی سەرکردایەتیکردنم بینی. کاتێك کە گەڕامەوە وڵات دەستم کرد بە دیاریکردنی ئەو ئیشەی کە هەمو ژیانمی بۆ تەرخان دەکەم. ئیشەکە بریتی بو لە ئازادکردنی تواناکانی مرۆڤ. بە کورتییەکەی من دەنگی تایبەتی خۆمم دۆزییەوە و ئیلهامبەخشی ئەمەش سەرکردەکەم بو.

بە تێپەڕبونی کات بۆم ئاشکرابو کە سەرۆکی ڕێکخراوەکە، هەر بە تەنیا لەگەڵ مندا ئاوا هەڵسوکەوتی نەکردوە. سەرۆکی ڕێکخراوەکە بەو ڕەفتارەی توانی وامان لێ بکات متمانەی زیاترمان بە خۆمان هەبێت و لە مەسەلەی دۆزینەوەی دید و خەونێکی ئیلهامبەخش و هاندەردا یەك بگرین. ئەو شێوازی ڕەفتارکردنەی سەرۆکی ڕێکخراوەکە لە بەرزکردنەوەی ئاستی تواناکانمان و لە دابینکردنی سەرچاوەی پێویست توانی بمانکات بە سەرکردەی ڕاستەقینەی وا کە بەرپرسیارێتیمان هەبێت و خزمەتی خەڵکی بکەین. کەلتورێك لەسەرتاسەری دەزگاکەماندا بوبوە پرنسیپ لە ڕابەرایەتیکردنی خەڵکی و خزمەتکردنیان. بە شێوازی سەرۆکی ڕێکخراوەکە دەستمان پێکردو ئەنجامگەلێکی گەورەو سەرنجڕاکێشمان بەدەست هێنا. من لەوکاتەوە بۆم دەرکەوت کە پرنسیپەکانی ئەو سەرکردەیە پرنسیپێکن سەرکردە مەزنەکانی دەزگای دیکەش هەیانەو پەیڕەوی دەکەن و مەسەلەکە هیچ پەیوەندییەکی بە ئاست و بە پلەوپایەی سەرکردەوە نییە. ئەزمونی خۆم لە پەروەردەو ڕاوێژکاریی و شارەزاییەکانم لە بواری کاری جیاجیاو لە زانکۆ و کاری خێرخوازیی خۆبەخشداو لە ڕێکخراوی کەنیسەکاندا بەتایبەتیش ئەزمونی خۆم لە خێزانەکەمدا، هەمو ئەمانە پێم دەڵێن کە کاریگەرییەکانی سەرکردایەتیکردن پەیوەندییان بە پرنسیپەوە هەیە. مرۆڤ ئەگەر بەپێی پرنسیپەکان بژی، بەدڵنیاییەوە دەورو تەئسیری زیاتر دەبێت و دەسەڵاتە ڕەوشتییەکەی بەهێز دەکات و دەسەڵاتی زیاتری پێدەبەخشرێت.

چیرۆکەکانی ناو ئینجیل بە باشی ئەوە ڕون دەکەنەوە کە ئەگەر مرۆڤ ئەو هێزو بەهرەو توانایانە بەکاربهێنێت کە لە ناخیدا هەن، ئەوا بەهرەو هێزو توانای زیاتریان دەست دەکەوێت. بەڵام ئەگەر گەشەی پێنەدات و بەکاریان نەهێنێت و پەراوێزیان

بخات ئەوا لەکیس دەچن و گەلێك هەل گرنگیشی لەدەست دەردەچێت و سەرەنجام وای لێ دێت هیچ کاریگەرییەکی نەبێت لەسەر دەوروبەرەکەی.

## پێناسەکردنی سەرکردایەتی

سەرکردایەتی بە سادەیی –لەسەر ئاستی کردەوە- بریتییە لەوەی وا لە خەڵك بکەیت بەشێوەیەکی ئاشکرا هەست بە نرخ و تواناکانی خۆیان بکەن بەجۆرێکی وا کە بتوانن ئەو نرخ و توانایانە لە خۆیاندا ببینن. بیر لەم پێناسەیە بکەرەوە. ئایا ئەمە کرۆکی ئەو جۆرە سەرکردایەتیکردنە نییە کە زۆر دەمێنێتەوەو کاریگەریی دەبێت لەسەر خەڵکی و تۆ ئەگەر وا لە بەرامبەرەکەت بکەیت بە ئاشکراو بە شێوەیەکی بەهێزو بەردەوام هەست بە نرخ و تواناکانی خۆی بکات تاکو بتوانێت ئەو توانایانە لە ناخی خۆیدا ببینێت مانای وایە پرۆسەیەکت چالاك کردوە کە لە سێ قۆناغ پێك دێت: بینین، ئەنجامدان، گۆڕان.

| |
|---|
| سەرکردایەتیکردن ئاگادارکردنی خەڵکییە لە نرخ و تواناکانیان بەشێوەیەکی هێندە ئاشکرا کە بتوانن ئەو نرخ‌و توانایانە لە خۆیاندا ببینن. |

ئەم پێناسەیە بەشێوەیەك لە شێوەکان پێناسەکردنی رۆڵی بێهاوتای باپیرە (بابەگەورە)یە. رۆڵە بنەڕەتییەکەی باپیر ئەوەیە منداڵ و نەوەکانی و نەوەی نەوەکانیش بە جۆرێکی وا هەست بە تواناو نرخی خۆیان بکەن کە بەڕاستی بڕوایان بە خۆیان بۆ دروست ببێت و لەسەر ئەو بنەماو بڕوایە هەڵسوکەوت بکەن. بڵاوبونەوەی ئەم رۆحە لە کەلتور و کۆمەڵگاکەماندا کارێکی مەزن و هەمیشەیی دەکاتە سەر شارستانێتی ئەم جیهانە.

ئێستاش با بە قووڵی باسی ئامرازێك بکەین کە لەپاش پەیوەندییە تایبەتییەکانەوە گرنگترین ئامرازە بۆ ئاگادارکردنی خەڵکەکە لە نرخ و تواناکانیان. ئەو ئامرازەش دەزگایە.

## پێناسەی دەزگا

ئێمە لە دەروازەی دووەمی ئەم کتێبەدا – هانی خەڵکەکە بدە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە- دێینە بوارێکی تازەی سەرکردایەتیکردنەوە. دیارە مەبەستی ئێمە لە

سەرکردایەتی، ئەو سەرکردایەتییە نییە کە پۆستێکی رەسمی هەیە، بەڵکو باسی سەرکردایەتی دەکەین وەك رێگەیەکی هەڵبژاردە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا بەجۆرێك کە هێندە ئاشکرا هەست بە تواناو نرخی خۆیان بکەن بتوانن ئەو نرخو توانایانە لە خۆیاندا ببینن. مادام ئێمە جەخت لەسەر ئەم جۆرە سەرکردایەتیکردنە دەکەینەوە لەناو دەزگادا پێویستە چوار خاڵی سادەتان بۆ روون بکەمەوە:

١. لە بنەڕەتدا دەزگا رێك بریتییە لە پەیوەندییەك کە ئامانجێکی دیاریکراوی هەبێت (دەنگی دەزگاکە)، نە زیاترو نە کەمتر. ئامانجەکە مەبەستێتی پێویستییەك یاخود زیاتری خەڵك یاخود هی بەشدارانی دەزگاکە و خەڵکی پەیوەندیدار جێبەجێ بکات. سادەترین دەزگا بریتییە لە دووکەسی بەشدار لە یەك ئامانجدا؛ وەك شەریکایەتی لە ئیشێکی ساکاردا یاخود وەکو هاوسەرگیری.
٢. هەمو کەسێك بە شێوەیەك لە شێوەکان سەر بە دەزگایەکە.
٣. زۆربەی کاروبارەکانی ئەم دنیایە یان لەناو دەزگادا ئەنجام دەدرێن یاخود لەرێی دەزگاوە.
٤. گەورەترین کێشەی ناو دەزگاکان -بەخێزانیشەوە- ئەوەیە سەرکەوتو بێت لە خۆ ریکخستن و بەڕێوەبردندا بە جۆرێکی وا کە هەر کەسێکی ناو دەزگاکە هەست بەوە بکات کە دەزگاکە رێزی بۆ داناوەو دەتوانێت ببێتە کەسێکی مەزن و بواری تەواوی بۆ رەخساوە بەهەرەو جۆش‌وخرۆشەکانی -دەنگی تایبەتی خۆی- بخاتەگەڕ بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستە سەرەکییەکانی دەزگاکە بە پشت بەستن بە پرنسیپەکان. دەتوانین ئەم تەحەدایە ناوبنێین تەحەدای سەرکردایەتیکردن.

## کارگێڕی و/ یان سەرکردایەتی

لە ماوەی چەند ساڵی رابردودا سەدان کتێب و بابەت دەربارەی سەرکردایەتیکردن نوسراون. ئەمەش نیشانەی ئەوەیە مەسەلەکە مەسەلەیەکی گرنگە. سەرکردایەتی هونەری بەتواناکردنە (تواناسازی - توانابەخشین). ئامانجی خوێندنگاکان و قوتابخانەکانی فێرکردنی منداڵانە. بەڵام ئەگەر سەرکردایەتیکردنەکە خراپ بو، پەروەردەو فێرکردنێکی خراپمان دەست دەکەوێت. ئامانجی زانستی پزیشکی یارمەتیدانی خەڵکییە بۆ ئەوەی تەندروست بن، بەڵام ئەگەر سەرکردایەتیکردنەکە خراپ بێت،

پزیشکێکی خراپ بەرهەم دەهێنێت. دەتوانین نمونە لەدوای نمونە پێشکەش بکەین بۆ روونکردنەوەی ئەو راستییەی کە سەرکردایەتیکردن هونەرێکە لە گشت هونەرەکان بەرزترە، چونکە بوار بۆ هەمو هونەرەکانی دیکە و پیشەکانی دیکە دەرەخسێنێت. ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی تایبەت بەسەر خێزاندا جێبەجێ دەبێت.

من هەمو تەمەنی خۆمم لە نوسین و فێرکردن و وانەوتنەوەدا لە بواری سەرکردایەتی و کارگێڕیدا سەرف کردوە. بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبەش بەو هەمو تیۆریانەدا چومەتەوە کە دەربارەی سەرکردایەتیکردن لە سەدەی بیستویەکەمدا نوسراون و خستومنەتە کۆتایی ئەم کتێبە لە پاشکۆی ژمارە (٢)دا لەژێر ناونیشانی (چاوخشاندنەوەیەك بە تیۆرییەکانی سەرکردایەتی).

لە خوارەوە کورتکراوەی خشتەیەك دەبینیت کە بەراوردکارییە لەنێوان کارگێڕی و سەرکردایەتیکردندا. (خشتەی ٢). خشتە گەورەکە لە پاشکۆی ژمارە (٣)دا لەژێر ناونیشانی (زاراوە پێناسەییەکانی سەرکردایەتی و کارگێڕی) دەبینیت.

| سەرکردایەتی | کارگێڕی |
|---|---|
| سەرکردە ئەو کەسەیە ئیشە چاکەکان دەکات | بەڕێوەبەر کەسێکە ئیشەکان بە چاکی ئەنجام دەدات. |
| وارین بێنیس | |
| سەرکردایەتی خۆگونجاندنە لەگەڵ گۆڕاندا | کارگێڕی خۆگونجاندنە لەگەڵ ئاڵۆزییەکاندا |
| جۆن کۆتەر | |
| سەرکردایەتی واتە هەستکردن بە جموجوڵ | کارگێڕی واتە مامەڵەکردن لەگەڵ کاروبارەکان و پاراستنی سیستەم و حوکمکردن |
| کۆزیس و پۆسنەر | |
| سەرکردە دەپرسێت فڵانە مەسەلە چەندە لای خەڵك گرنگە | بەڕێوەبەر دەپرسێت خەڵك فڵانە مەسەلە چۆن ئەنجام دەدات. |
| ئەبراهام زالزنك | |
| سەرکردە تەلارسازە | بەڕێوەبەر بەننایە |
| جۆن ماریۆتی | |
| سەرکردە جەخت دەکاتەوە لەسەر داهێنانی گۆشەنیگایەکی هاوبەش | کارگێڕی دارشتنی کارەکەیەو بایەخ بە کۆنترۆڵکردن دەدات |
| جۆرج ویزەرسبای | |

چاوخشاندنەوەکە بەو تیۆرییانەدا ئەو بیرۆکەیەی لەلا چەسپاندم کە دەڵێت سەرکردایەتی و کارگێڕیی هەردوکیان گرنگن و یەکێکیان بەبێ ئەوی دیکەیان ناتەواوە. من هەندێک جار دەکەوتمە داوی ئەوەی جەخت لەسەر بایەخی سەرکردایەتی بکەمەوەو بایەخی کارگێڕی فەرامۆش بکەم. دڵنیام هۆکارەکە ئەوەبوە کە بینیومە زۆربەی دەزگاکان -بە خێزانیشەوە- لە کارگێڕییان کەم نەبوە بەڵکو لە سەرکردایەتیکردنیان کەم بوە. ئەم بۆشاییە پاڵنەرێکی گەورەبو بۆ من لە پیشەکەمداو وای لێکردم زیاتر جەخت بکەمە سەر پرنسیپەکانی سەرکردایەتیکردن. بەهەرحاڵ ئێستا من زۆر بەباشی ئاگادارم لەو رۆڵە گرنگەی کە کارگێڕی هەیەتی.

من پاش ئەزمونێکی تاڵ بۆم دەرکەوت کە ماددە بێ رۆحەکان سەرکردایەتی ناکرێن. لەڕاستیدا کۆمپانیەکەی من ئەوکاتە توانی قازانج بکات کە کارگێڕییەکەم دایە دەست (ستیفن)ی کوڕم و تیمێک لەو کەسانەی خاڵی بەهێزی وایان هەبو بتوانن قەرەبوی خاڵە لاوازەکانی من بکەنەوە. لیستەکانی خەرجی و داهات و پارەو ئەمانە سەرکردایەتی ناکرێن، ئیدارە دەکرێن، بۆچی؟ چونکە ئەم شتانە تواناو ئازادیی هەڵبژاردنیان نیە. تەنیا مرۆڤ هەیەتی.

کەواتە تۆ دەتوانیت سەرکردایەتی پرۆسەی تواناسازیی (بەتواناکردنی) خەڵکی بکەیت، بەڵام شتەکان بەڕێوەدەبەیت و کۆنترۆڵیان دەکەیت. لەخوارەوە نمونەی لیستێکی ئەو شتانە دەبینیت کە پێویستیان بە بەڕێوەبردنە.

**ئەو شتانەی پێویستیان بە ئیدارەیە (کۆنترۆڵکردن)**

**ئەو شتانەی ئازادی هەڵبژاردنیان نیە**

| | | |
|---|---|---|
| پارە | پێکهاتەکان | سەرچاوە مادییەکان |
| خەرجییەکان | سیستمەکان | ئاسانکارییەکان |
| زانیاری | لیستەکان | ئامرازەکان |
| کات | رێوشوێنەکان | |

**زۆرجار..** خەڵکەکە پێیان باشە سەرکردەکانیان بەڕێوەیان ببەن (هەندێک لە پیشەوەران و بەرهەمهێنەکان)

پێداچونەوەکە بیری خستمەوە کە چۆن لە ساڵانی رابردودا ژمارەیەك ئەقڵی گەورەو مامۆستای مەزن کاریگەرییان دروست کردوە لەسەرم و من چەند قەرزاربارییانم. بە ئەزمون و لە ئەنجامی وانە وتنەوەکانمەوە گەیشتمە ئەو ئەنجامگیرییەی کە کلیلی تێگەیشتنی رەفتاری دەزگاکان تەنیا هەر شرۆڤەکردنی دەزگاکان نییە، بەڵکو پێویستە لە سروشتی مرۆڤیش تێبگەین و شرۆڤەی بکەین. تۆ ئەگەر توخمە بنەڕەتییە پێکهێنەرەکانی سروشتی مرۆڤ تێگەیشتیت مانای وایە ئەو کلیلەت بەدەست هێناوە کە توانا شاردراوەکانی ناخی مرۆڤ و ناخی دەزگاکان ئازاد دەکات. لەبەرئەوە گۆشەنیگای مرۆڤی تەواو –جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆح- زۆر گرنگە بۆ تێگەیشتن لە دەزگاکان و لە خەڵکەکە. لەڕاستیدا شتێك نییە ناوی (رەفتاری دەزگا) بێت، ئەوەی هەیە رەفتاری خەڵکەکەی ناو دەزگاکەیە کە بەشێوەیەکی دەستەجەمعی گوزارشت لە خۆی دەکات وەکو رەفتاری دەزگاکە. چیتر؟ رەنگە بپرسێت بڵێیت "ئەم تیۆرییە چ سودێکم پێدەگەیەنێت لەڕوبەڕوبونەوەی کێشەکانی ژیانی رۆژانەمدا؟ ئەگەر بمەوێت لە گیروگرفتەکانی خۆم تێبگەم و بەشێوەیەکی باشتر چارەسەری بکەم بۆچی پێویستە دامو دەزگاکان تێبگەم؟

وەڵامە ئاسان و رۆشنەکە ئەوەیە کە رەفتاری تاکە کەسو رەفتاری دەزگاکە کارلێکیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە! ئێمەش پێویستمان بە رێو شێوێنێکە کە کارلێکی لەگەڵدا بکەین بۆ ئەوەی لە خۆمان تێبگەین.

وەك پێشتر باسم کرد، گشت دەزگاکان –تەنانەت هەرە باشەکانیشیان - پڕن لە گیروگرفت. من لەگەڵ هەزاران دەزگادا کارم کردوەو تێبینیم کردوە کە تەنانەت ئەوانەی زۆریش سەرسام بوم پێیان تا رادەیەك بەدەست گیروگرفتەوە ناڵاندویانە. مەسەلە سەرنجڕاکێشەکە ئەوەیە کە لە دەزگا جۆراوجۆرەکاندا گیروگرفتەکان لەیەك دەچن. حەتمەن کەسایەتییەکان و بارودۆخی هەر گیروگرفتێك جیاوازە لە هەر گیروگرفتێکی دیکە، بەڵام کە رۆدەچینە ناو قوڵایی کێشەکانەوە دەبینین زۆربەی گیروگرفتەکان رەگو ریشەی هاوبەشیان هەیە. پیتەر دراکەر لەمبارەیەوە دەڵێت:

"بەدڵنیاییەوە لە دەزگا جیاوازەکاندا کارگێڕیی جیاواز هەیە، چونکە ئەرکەکە ستراتیج دیاری دەکات و ستراتیجیش پێکهاتەکە دادەڕێژێت. بەڵام جیاوازی نێوان کارگێڕی شوێنێکی جوملە فرۆشی و ئیدارەی کۆمەڵەی کەنیسەکان زۆر لەوە کەمترە کە

کارگێڕەکــان هەســتی پێدەکــەن. جیاوازییــەکان بەشــێوەیەکی بنــەڕەتیی لــە جێبەجێکردندایە نەك لە پرنسیپەکاندا. بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکانی ئـەو دەزگایانـە -بۆ نمونـە- لـە چارەسـەرکردنی کێشـەکەی خەڵکیـدا هـەمان کـات تـەرخان دەکـەن و کێشەکانیش زۆر لەیەك دەچن.

تۆ ئەگـەر بەڕێوەبـەری کۆمپانیایـەکی کۆمپیوتـەر بیت، یـاخود نەخۆشخانەیەك بەڕێوەببەیت یاخود ڕێکخراوێك، کارەکەت تەنیا بە ڕێـژەی ١٠٪ لـەوانی دیکە جیاوازە. ئـەم ڕێژەیـەش پەیوەسـتە بـە ئـەرکی دەزگاکـەو مێژووەکـەی و کەلتورەکـەی و ئـەو وردەبابەتانەی کە تایبەتن بەخۆیەوە، ئەگینا ماباقی شتەکانی دیکە دەتوانرێت لە هەر دەزگایەکی دیکەدا جێبەجێ بکرێن.

ئامـانجی مـن لـەم دەروازەی دووەمـی کتێبـەدا (وا لـە خـەڵکیش بکـە دەنگـی خۆیـان بدۆزنەوە) یارمەتیدانی تۆیە کە بتوانیت بـە هـەوڵ و تێکۆشان ڕوبـەڕوی گیروگرفت و کێشە تایبەتـەکانت ببیتـەوەو دەوروتەنسیری خـۆت و دەزگاکـەت زیـاتر بکـەیت و لـەم مەسەلەیەدا گرنگ نـیـە بەڕێوەبەری تیمێك بیت یان هی بەشێك یاخود هی کۆمەڵەکە بەشێك یاخود هی گشت دەزگاکە.

با سەرەتا لەو سروشتە دولایەنـیـە بڕوانین کـە کێشـەکانمان هەیانـە. بـەڵام پـێش ئەوە داوات لێ دەکەم مێشکت بخەیتە کارو خۆت گورج بکەیتەوەو ئەو زەحمەتە بدەیتـە بەرخۆت کە هەمیشە لە ڕوبەڕوبونەوەی کێشە ئاڵۆزەکانی دەزگاکانـدا پێویستمانە. مـن هەمیشـە دوو وتـەی بـەنرخ دەهێنمـەوە بـە نمونـە. یـەکێکیان قسـەیەکی ئـەلبێرت (ئەنیشتاین)ە کـە دەڵێت: "ئێمـە نـاتوانین ڕوبـەڕوی ململانـێ گـەورەکان ببینـەوە بەو ئاستی بیرکردنـەوەی کـە پـێش دروسـتکردنی ململانێکـان هـەمان بـووە". ئێمـە باسـی گۆشـەنیگایەکی تـازەی سروشـتی مرۆڤمـان بـۆ کردیـت -گۆشـەنیگای مرۆڤـی تـەواو- جەسـتەو ئـەقڵ و دڵ و ڕۆح، زانیشـمان کـە ئـەم گۆشـە نیگایـە گۆشـەنیگای سـەردەمی پیشەسـازییە. لـەم سەدەیەشـدا باڵادەسـتە و وا تەماشـای مـرۆڤ دەکـات کـە شـتێکە دەتوانرێـت کـۆنترۆڵ بکرێـت. تـۆ بـۆ ئـەوەی بتوانیـت گیروگرفتـەکانت تێبگـەیت و چارەسەریان بکەیت پێویستت بە گۆشـەنیگای (مرۆڤـی تـەواوە) .. قسـەی دووەم قسـەی (ئۆلیڤەر ویندل هۆڵمز)ە کە دەڵێت: "ئەوەی لە هـەر ئاڵۆزییەکدا مـن خۆشحاڵ دەکـات سادەییە ئاشکراو نزیکەکە نـیـە، بـەڵکو سادەییە دوورو شاردراوەکەیە". ئەمـە واتـای

چی؟ واتە ململانێ گەورەکانی کە روبەڕویان دەبنەوە بەو پرۆگرامە چاکسازییە سادەو خێرایانە چارەسەر ناکرێت کە وەکو رەچەتەی ئامادەکراو وان. پێویستە سروشت و رەگ و ریشەی کێشەکانمان تێبگەین و ئەو پرنسیپانەش چاك بزانین کە چارەسەری گیروگرفتەکانیان پێ کۆنترۆڵ دەکرێت؛ ئەویش لەرێی پەیڕەوکردنی سیستمێکی تازەی بیرکردنەوەو ئەو شارەزایی و ئەزمونانەی لێوەی بەدی دێن. ئەمە پێویستی بە خۆئامادەکردنی راستەقینە هەیە، بەڵام بەڵێنت دەدەمێ ئەگەر تۆ ئەو رەنجە بدەیت ئەوا دەتوانیت بەشێوەیەکی کاریگەر و سادەو روون و ئاشکرا هەرسێ توخمەکەی زانیاری و شێواز و شارەزایی کۆبکەیتەوە. دیارە ئەم سێ توخمەشن کە (خوو) دروست دەکەن و وات لێ دەکەن بتوانیت بەسەر ململانێکانی ئەم دنیا نوێیەدا زاڵ ببیت. بەم شێوەیە تۆ دەبیتە خاوەنی هەشتەمین (خو) ئەو خووەی کە وزە شاردراوەکانی مرۆڤ ئازاد دەکات.

## گۆڕانکارییە هەژێنەرە جیهانییەکان

هاوکات لەگەڵ رۆچوونمان بۆ قوڵایی مەسەلەکان لەپێناو تێگەیشتنی ئەو گیروگرفتە گەورانەی کە روبەڕوی دەزگاکان دەبنەوە، بانگهێشتت دەکەم لێرەدا حەوت گۆڕانی هەژێنەر بناسیت کە تایبەتمەندێتییەکانی سەردەمە نوێیەکەی کرێکارانی زانیاری دیاری دەکەن. دەبینیت ئەو گۆڕانکارییانە رێوشوێنێکیان هێناوەتە پێشەوە کە لەناویدا گیروگرفتەکان رودەدەن. ئەو گیروگرفتانەی کە لە ژیانی تایبەت و لە شوێنی کاردا روبەڕومان دەبنەوە.

- بەجیهانیکردنی بازاڕ و تەکنەلۆجیا؛ تەکنەلۆجیا نوێیەکە زۆربەی بازاڕە ناوچەیی و نیشتمانییەکانی کردوە بە بازاڕێکی جیهانیی بێسنور.
- سەرهەڵدانی دیاردەی گەیاندنی جیهانی؛ هەردوو نوسەر (ئیڤانس) و (ۆرستەر) لە کتێبەکەیاندا (وردوخاشبون)دا دەڵێن؛ ئەو کەناڵە تەسك و باشبێکەوە گرێدراوانەی کە سەر بە خاوەندارێتی تایبەتی بون و خەڵك و کۆمپانیاکانیان پێکەوە دەبەستەوە لە کەفنەکۆنێکا نەمان و بیرچونەوە. دیارە لەگەڵیشیاندا ئەو دەزگایانەش لەناوچون کە کەناڵەکانیان بەکاردەهێناو دروستیان کردبون. بە کورتییەکەی دەڵێین تێن و تاوی گواستنەوەو پەیوەندیە جیهانییەکە هێندە

بەزمبرە کە بەئاسانی ئەو سرێشە (کەتیرە) ئاساییە دەتوێنێتەوە. کە چالاکییە ئابورییەکانی پێکەوە قایم کردبو. ئەم مەسەلەیەش یەکەمین جارە لە مێژودا ئازادی زانیارییەکان لە ئازادی شتەکانی دیکە جیادەکاتەوە.

• دیموکراتیزەکردنی زانیاری و پێشبینیەکان: کەس ئینتەرنێت بەڕێوە نابات. ئینتەرنێت دەریایەکە لە شتە بگۆڕەکان کە خەڵکی سەرتاسەری جیهان بەشداریی تێدا دەکەن. ئەمە یەکەمین جارە لە مێژودا دەنگە موشەکییەکەی ڕۆحی مرۆڤ لە شێوەی ملیۆنەها دیالۆگدا دەردەپەڕێت و سنورەکان دەبەزێنێت. ئەو زانیاریانەی کە لە پێگەکانەوە دێن سەرکردایەتی ویست و پێشبینییە کۆمەڵایەتییەکان دەکەن. لە کۆتاییدا ئەمیش سەرکردایەتی ئەو ویستە سیاسییە دەکات کە کاریگەریی دەبێت لەسەر هەمو کەسێك.

• زیادبونی ئەندازەیی لە پێشبڕکێکاندا: ئینتەرنێت و تەکنەلۆجیای مانگە دەستکردەکان دۆخێکی وایان خوڵقاندوە کە هەرکەسێك خاوەنی توانایەك بێت لە بوارێکدا، بۆی هەیە ببێتە ڕکابەر. دەزگاکان لەپێناوی کەمکردنەوەی زیاتری بڕی تێچون و نرخی کەرەسە خاوەکان و کرێکار و هەروەها لەپێناوی داهێنانی خێراتر و جۆری چاکتر، ناچارن بەردەوام ڕێگای باشتری کێبڕکێ بدۆزنەوە. هێزی کارو ڕکابەری ئازاد هەمیشە زامنی ئەوەن کە بەرهەم چاکتر ببێت و کەمتری تێ بچێت و خێراتر و نەرمتر وەڵامی پێویستییەکانی بەکاربەربداتەوە. ئێستا تەنیا هەر ئەوە بەس نییە بەسەر ڕکابەرەکاندا سەربکەویت، بەڵکو پێویستە لەسەر ئاستی هەمو جیهاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنیت.

• لە سەرمایەی داراییەوە بۆ سەرمایەی هزری و کۆمەڵایەتی: ئەو داهێنانی سەرمایەیەی کە جاران پشتی بە پارە بەستبو، ئێستا پشتی بەسەرمایە مرۆییەکە بەستووە (هزری و کۆمەڵایەتی) و ئەمەش هەمو ڕەهەندەکان دەگرێتەوە. ٢/٣ ی ئەو نرخەی کە دەخرێتە سەر بەرهەمەکان لە زانستەوە دێت. بیست ساڵ لەمەوپێش ئەو بڕە لە ١/٣ کەمتر بو.

• ئازادیی هەڵبژاردن: مرۆڤی ئەم سەردەمە بەردەوام زانیاری دەست دەکەوێت و زیاتر ئاگادار دەبێت لەو دەرفەت و ئەڵتەرناتیڤانەی کە بۆی دەستەبەر دەبن. بازاڕی کارو دامەزراندن دەبێتە بازاڕێکی ئازادو خەڵك تێیدا ئەگەری زۆرترو

زۆرتری دێنەبەردەست. لایەنە کارگێڕییەکان هەوڵ دەدەن رۆڵی کرێکارانی زانست لە سنورێکدا قەتیس بدەن، بەڵام ئەوان هەمیشە لە هەوڵدا دەبن خۆیان ناونیشان بۆ خۆیان بدۆزنەوە.

- کەفاوی بەردەوام: ئێمە لە ژینگەیەکدا دەژین بەردەوام لە گۆڕاندایە، ئەگەر لەناو روبارێکی تیژڕەوی پڕ لە کەفاودا سەوڵ لێ بدەن، پێویستە هەرکەسێك لە ناخی خۆیدا شتێکی هەبێت رێنمایی بکات بۆ بڕیارە راستەکە. پێویستە هەریەکەیان لای خۆیەوە ئامانجی تیمەکەو دەزگاکە بزانێت و ئەو پرنسیپانەش چاك بناسێت کە رابەرایەتیان دەکەن. لە بارودۆخی وادا ئەگەر هەوڵ بدەیت ببیتە بەڕێوەبەری سەوڵ لێدەرەکان و رێنماییان بدەیتێ، گوێیان لێت نابێت. دەنگە دەنگ و هاژەی ئاوەکەو گیروگرفتە هەنوکەیی و کتوپڕەکانی کە روبەڕویان دەبێت و بۆتەوە زۆر گەورە و کاریگەرن.

## فیلم: کەفاوێکی بەردەوام

سەبارەت بە بارودۆخی کەفاو و ئەو ئاڵۆزییەی کە بۆتە خەسڵەتی ژیانی ئەمڕۆمان، ئێمە کورتە فیلمێکی سەرنجڕاکێشمان بەرهەم هێناوە. فیلمەکە رابردو بەراورد دەکات بە ئێستاوەو ئاماژەش بۆ سێ ئەگۆڕ دەکات کە دەتوانین پشتیان پێ ببەستین بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کێشانەی کە لەم بەشەدا فێریان دەبین.

ئێستا من داوات لێ دەکەم سێ دیدیەکە بخەرە ئامێری نمایشەکەوەو فیلمی (کەفاوێکی بەردەوام) تەماشا بکە.

## گیروگرفتە درێژخایەنەکان و گیروگرفتە هەنوکەییەکان

جەستەی مرۆڤ و جەستەی دەزگاکان بەدەست دوو جۆر گیروگرفتەوە دەناڵێنن. گیروگرفتە درێژخایەنەکان و گیروگرفتە هەنوکەییەکان. گیروگرفتە درێژخایەنەکان بریتین لە گیروگرفتە شاردراوەکان کە هۆکاری گیروگرفتەکانی دیکەن. بەڵام گیروگرفتە هەنوکەییەکان کۆمەڵێك ئازارو نیشانە دروست دەکەن و دەبنە هۆی لاوازایی و بێ توانایی. دەزگاکانیش وەکو مرۆڤ وان و رەنگە دووچاری جۆرە گیروگرفتێکی درێژخایەن ببن کە هێشتا نەبونەتە گیروگرفتی هەنوکەیی .چارەسەرکردنی گیروگرفتە هەنوکەییەکان رەنگە ببنە هۆی شاردنەوەو داپۆشینی گیروگرفتە درێژخایەنەکان.

چەند ساڵێك لەمەوبەر بە ئەزمونێکدا تێپەڕیم کە ئەم خاڵە روون دەکاتەوە. هاوڕێیەکم هەیە پسپۆڕی نەشتەرگەری دڵەو لە نەخۆشخانەیەکی (دیترۆیت)دا کاردەکات. جارێکیان داوام لێ کرد رێگەم بدات رۆژێکی تەواو لە ژوری نەشتەرگەریدا بمێنمەوەو سەرنج لە پزیشکە نەشتەرگەرەکان بدەم لە کاتی نەشتەرگەرییدا هاوڕێکەم سێ خوێنبەری دڵی گۆڕی. کە لێ بوەوە، لێم پرسی: بۆچی ئەو خوێنبەرانەت گۆڕی؟ بۆچی پاکت نەکردنەوە؟ ئەویش بۆ وەڵامدانەوەم بە زمانێك قسەی کرد کە پیاوێکی ئاسایی تێبگات و وتی لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا دەتوانیت ئەوە بکەیت. دەتوانیت خوێنبەرەکە پاك بکەیتەوەو نەیگۆڕیت، بەڵام بە تێپەڕبونی کات کۆلیسترۆڵ هێندە کۆدەبێتەوە کە دەبێتە بەشێك لە دیواری خوێنبەرەکە. لێم پرسی: ئایا بە گۆڕینی ئەم سێ خوێنبەرە مانای وایە ئیتر کابرا بە تەواوەتی چاك بۆتەوە؟ وەڵامی دایەوە، وتی: ستیفن، ئەمە نەخۆشییەکی درێژخایەنەو بە جەستەی کابرادا بڵاوبۆتەوە. ئینجا دەستی گرتم و وتی خۆت دەست بدە لە خوێنبەرەکانەوە. هەستم بە پوکاوەیی کۆلیسترۆڵەکە کرد. هاوڕێکەم وتی: بەڵام بیرت نەچێت ئەم کابرایە بەردەوام وەرزش دەکات (لە ئەنجامی وەرزشەکەوە سوڕێکی ئەڵتەرناتیفی خوێنی بۆ دروست بووە، ئۆکسجین دەگەیەنێت بە ماسولکەکان، بەڵام بۆ ئەم خوێنبەرە گیراوانە سوڕی ئەڵتەرناتیفی خوێن نییە، بۆیە ئێستا ئەگەری ئەوە هەیە کابرا توشی نۆرمەیەکی دڵ یاخود جەڵتەیەکی مێشك ببێت ئەگەر لە خوێنبەرەکانیدا کلۆیەکی بچکۆلەی خوێنی مەیو دروست ببێت. کابرا گرفتاری نەخۆشییەکی درێژخایەن و بەربڵاوی دڵ بووە.

مەرج نییە هەمو حاڵەتە درێژخایەنەکان ببنە هۆی دەرکەوتنی نیشانەی کتوپڕ. جاری وا هەیە – بۆ نمونە لە نەخۆشییەکانی شێرپەنجەدا- پێش ئەوەی یەکەمین نیشانەی دەربکەوێت نەخۆشییەکە هێندە بڵاوبۆتەوە کە چاکبونەوە لێی زەحمەتە. ئەگەر لە روکارەکاندا نیشانەت نەبینی مانای ئەوە ناگەیەنێت کە لە قوڵاییدا گیروگرفتی مات و شاردراوەمان نییە. هەندێك جار مرۆڤ ئەوکاتە هەست بە زەبجەی دڵ دەکات کە کتوپڕ خۆی ماندو بکات، بۆ نمونە لەپاش یەکەمین بەفربارینی زستان بچێت بەفری بەردەم ماڵەکەی بماڵێت. واتە هەتاکو روبەروی بارودۆخێکی سەختی وا نەبێتەوە کە نیشانەکانی تیا دەربکەوێت نازانێت گیروگرفتێکی هەیە لە دڵیدا.

ئەم مەسەلەیە بۆ دام‌ودەزگاکانیش راستە. رەنگە کۆمەڵێك گیروگرفتی درێژخایەن و جددی لەناو دەزگاکەدا هەبن بەڵام نیشانەی کتوپڕو هەنوکەییان دەرنەخستووە چونکە هێشتا ئەم دەزگایە نەچۆتە ناو ململانێیەکی زەحمەتەوە لە بازاڕێکی جیهانیدا، بەڵکو تەنیا لە بازاڕێکی ناوچەیدا یاخود لە جۆرە بازاڕێکدا کێبڕکێ و ململانێ دەکات کە پارێزراوە. رەنگە کۆمپانیایەك لەروی داراییەوە سەرکەوتو بێت و بگرە لەوانەشە زۆر زۆر سەرکەوتو بێت. بەڵام وەك دەزانیت سەرکەوتن مەسەلەیەکی رێژەییە. ئێستا دەپرسین کە ئەگەر ئەنجامی کێبڕکێکردنەکان خراپتر بین ئەی ئیتر چ پێویست بە گۆڕانە؟

## پێشبینیکردنی چوار کێشەی درێژخایەن و نیشانە هەنوکەییەکانیان

هێزی راستەقینەی پارادایم لەوەدایە کە دەتوانێت پێشبینی بکات و شت لێك بداتەوە. تۆ ئەگەر پارادایمەکەت راست بێت ئەوا توانایەکی نائاساییت پێ دەبەخشێت بۆ لێکدانەوەو پێشبینیکردن و دەستنیشانکردنی گەورەترین کێشەکانی ژیانی خۆت و دەزگاکەت. پارادیمی راست نەك تەنیا هەر یارمەتیت دەدات لە دەستنیشانکردنی روونترین نیشانەی هەنوکەیی، بەڵکو یارمەتیشت دەدات لە بینینی هۆکارە ریشەییە درێژخایەنە شاردراوەکانی ئەو نیشانەیە. پاش ئەوە ئیتر دەتوانیت ئەم پارادیمە بەکاربهێنیت بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانت و فراوانکردنی بازنەی دەوروتەنسیرت بۆ خوڵقاندنی دەستگایەکی لێهاتوی کاراو هەروەها بۆ دروستکردنی متمانەیەکی بەرزو پتەو لەنێو تاکەکانیدا، دەزگایەك بە بەردەوامی بتوانێت فۆکەس بخاتە سەر گرنگترین ئەرك و ریزبەندییەکانی و هەروەها جێبەجێشیان بکات. بۆیە من لە هەمو بەشێکی ئەم کتێبەدا بەردەوام ئەو وێنەیە نیشان دەدەمەوە کە گوزارشت لە پارادیمی مرۆڤی کامڵ دەکات.

(تەماشای شێوەی ٦-٢ بکە). هەروەها لەپێناوی رونکردنەوەی هەر چوار بوارەکەی جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆحیش چەند وشە و زاراوەیەکی سادەی بۆ زیاد دەکەم.

مرۆڤی کامڵ - نمونەیەکی دەزگایی




شێوەی ٦–٢

لەم حاڵەتەدا دەبینیت کە چۆن فەرامۆش کردنی هەرکام لە جەستەو دڵ و رۆحی خەڵکەکە لەلایەن دەزگاکەوە گیروگرفتی هەنوکەیی و درێژخایەنی لێ دەکەوێتەوە.

ئێمە ئەم پارادیمە لە جێبەجێکردندا بەسەر دەزگادا تاقی دەکەینەوە. دیارە هەمان بیرۆکە بەسەر هەمو پەیوەندییەکی دیکەشدا جێبەجێ دەبێت. ئیتر ئەو پەیوەندییە لەناو خێزاندا بێت یاخود لەناو تیمێکدا بێت یاخود لەناو کۆمەڵگادا بێت، هەر (یەك) شتە. هەوڵ بدە پێش خوێندنەوەی حاڵەتەکە، تۆ خۆت جۆری گیروگرفتەکە دیاری بکەیت.

یەکەم: با لەناوەندی شێوەکەوە دەست پێ بکەین کە گوزارشت لە روح دەکات. ئایا ئەگەر بەردەوام لە هەر دەزگایەکدا رۆح یاخود ویژدان فەرامۆش کرا چ گیروگرفتێك سەر هەڵ دەدات؟ بیری لێ بکەرەوە. کاتێك کە خەڵکەکە خۆیان لەناو خۆیاندا بە پێچەوانەی ویژدانی خۆیانەوە مامەڵە دەکەن یاخود مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت. ئایا پەیوەندییەکانی نێوانیان چی بەسەر دێت؟

ئایا بێ متمانەیی دروست نابێت؟ یەکەمین گیروگرفتی درێژخایەن کە تێکرای دەزگاکانمان روبەروی دەبنەوە کەمی متمانەیە. ئایا نیشانە هەنوکەییەکانی ئەم کێشەیە چین؟ ئەو دەزگایانەی کە متمانە لەناو تاکەکانیدا کەم دەبێت و لە بارودۆخێکی خراپی بازاڕدا کاردەکەن، پڕن لە نیشانە هەنوکەیی و بەئازارەکان. نیشانەکانیش بریتین لە ململانێی ناوخۆ و پاشقول لە یەکترگرتن و شاردنەوەی

زانیاری و هەریەکەیان خۆی بە زوڵملێکراو دەزانێت و داکۆکی لە خۆی دەکات.

دووەم: پەراوێز خستنی ئەقڵ (دید) لە دەزگاکەدا چ گیروگرفتێکی درێژخایەنی لێ دەکەوێتەوە؟ لەحاڵەتی وادا دەزگاکە دیدێکی هاوبەش و سیستەمێکی بنەمای هاوبەشی تێدا دروست نابێت. ئەی ئەو نیشانەیەی کە دروستیان دەکات چییە؟ دەبینیت هەرکەسە بەپێی بەرنامەو ئەجێندایەکی نهێنی خۆی کاردەکات و لە بڕیارداندا بانێك و دوو هەوا بێت و دەزگاکە پڕ دەبێت لە گەمەی سیاسی. کەلتورێك دەبینیت پڕ لە ئاشوب و تەمومژ.

سێیەم: ئەگەر فەرامۆشکردنەکە جەستەی دەزگاکەی گرتەوە (سیستم و پێکهاتەو ڕێوشوێنەکان) چ گیروگرفتێك سەرهەڵدەدات؟ بە واتایەکی دیکە، ئەگەر دەزگاکە نەیتوانی شت جێبەجێ بکات یاخود نەیتوانی پشتوانێکی ڕێکخراو بدۆزێتەوە بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە گرنگەکانی کە لە ریزی پێشەوەدا ریزبەندی کراون. تۆ پێشبینی دەکەیت چی روبدات؟ وەڵامەکە زۆر سادەیە. لە حاڵەتی وادا هیچ هاوئاهەنگی و دیسپلینێك نامێنێت لە پێکهاتەو سیستەم و کەلتور و ڕێوشوێنەکانی دەزگاکەدا.

ئەو بەڕێوەبەرە کە پاردایمی هەڵە و ناتەواوی هەبێت لەسەر سروشتی مرۆڤ ئەوا سیستمێك دادەڕێژێت کە ناتوانێت هەمو ماتە وزەکانی ناخی خەڵکەکە ئازاد بکات. هەروەها خەڵکەکەش و دیمەنەکانیش و بەشە جۆراوجۆرەکانیش و تێکڕای دەزگاکەش ناتوانن لەسەر یەك تێڕوانی گەوهەری و یەك کۆمەڵە بنەمای هاوبەش و یەك ستراتیجی یەکگرتو ڕێك بکەون.

کە دەڵێین سیستەمی ناو دەزگاکە مەبەستمان لە چۆنێتی دامەزراندن و هەڵبژاردنی کارمەند و سیستمی پەیوەندییەکان و پاداشتکردن و بەرپرسیارێتی و پلە بەرزکردنەوە و مەشق و ڕاهێنان و فەرمبوکردنەوەیە. دیارە شکستهێنانی سیستمی دەزگاکەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی دەزگاکە نەتوانێت لەگەڵ بازاڕ و کڕیارەکان و هاوردەکارەکانی دەرەوەی خۆیدا خۆی بگونجێنێت.

> گشت دەزگاکان بە شێوەیەکی نایاب ڕێکخراون بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەی کە بەدەستیان دەهێنن.
>
> - ئارثەر دەبلیو جۆنس

ئەم کێشەی خۆ گونجاندنە بە هەزاران شێوە خۆی دەنوێنێت و زیاتر و زیاتر متمانە لەناو دەزگاکەدا کەم دەکاتەوەو زیاتر و زیاتر هەڵسوکەوتی ئەنقەست و بە سیاسیکراو بەرهەم دەهێنێت و ململانێی نێوان بەشە جۆراوجۆرەکان زیاتر دەکات. وای لێ دێت یاسا شوێنی لۆجیکی مرۆیانە دەگرێتەوە، چونکە هەتا مەسەلەکان زیاتر لە کۆنترۆڵ دەربچن، بەڕێوەبەرەکان زیاتر و زیاتر پێویستیان بە دەسەڵاتە. بەمەش بیروکراسیی و ڕێکخستن و هەرەمیبوون شوێنی متمانە دەگرنەوە و هەمو قسەو باسێك دەربارەی پێشخستنی خەڵکەکەو هەمو سەرکردایەتیش دەبێتە قسەیەکی ناواقیعیانەی سۆزدارانەی کات بەفیڕۆدەرو گران. لە ئەنجامدا لەجیاتی ئەوەی ببنە سەرمایەگوزاریی، دەبنە، ئەرك و خەرجی. دەزگاکەش زیاتر و زیاتر پێویستی بە کۆنترۆڵ و کاریگەری دەبێت و وای لێ دێت ئەم نیشەکە دەخاتە ئەستۆی ئەوی دیکەو کەلتورێك بالادەست دەبێت پێی دەوترێت کەلتوری (چاوەڕێ بە تا پێت دەڵێن). هەمو ئەمانە پێکەوە قەناعەتێك لای ئەوکەسانە دروست دەکات کە پێیان دەوترێت سەرکردەکان، کە بەبێ بەڕێوەکردنی سیاسەتی تێلاو گێزەرەکە ئیش‌وکاری دەزگاکە ناڕوات بەڕێوە. هەروەها دەبێت دەستی پۆلابین بەکاربهێنێت. ئەرێنی وادەکات بیانو بۆ کۆنترۆڵی تاکڕەوانە بهێنرێتەوەو ئەم جۆرە کۆنترۆڵەش وا دەکات خەڵکەکە زیاتر و زیاتر ئەرێنی بن. ئەم چاوەڕوانییەی کە خۆی خۆی سەلماندووە —ئیدارەکردنی خەڵکەکە واتە لێخوڕین و کۆنترۆڵکردنیان- هەرگیز وایان لێ ناکات بەوپەڕی توانا و دڵسۆزی خۆیانەوە بەشداریی بکەن چونکە جۆش‌و خرۆشیان ئەجولاوەو دەنگی راستەقینەی خۆیان ئەدۆزیوەتەوە. ئەم مەسەلەیە لەخۆوە و خۆبەخشانە نایەتە دی.

چوارەم: فەرامۆشکردنی دڵ چی لێ دەکەوێتەوە؟ واتە کە جۆش‌وخرۆش و پەیوەندی سۆزدارانە لەگەڵ ئامانجەکە و کارەکەدا ئەما، کە خۆشەویستی و پابەندبون لەناو دەزگاکەدا ئەما چی دەقەومێت؟

ئەنجامەکە پەکخستنی تواناکانی مرۆڤ و بلاوبونەوەی کەلتوری ترس‌و دوودڵییە.

لە حاڵەتی وادا پێشبینی دەکەیت چ نیشانگەلێکی کتوپڕ ببینیت؟ تۆزێك بیربکەرەوە، دەبینیت زۆربەی کارمەندەکان خۆیان بە کاری دیکەوە سەرقاڵ دەکەن و فەنتازیا برەو پەیدا دەکات و بێزاریی و ترس و تورەیی و خۆدزینەوە و گوێ پێنەدان و بەڕێوەکردنی نابەدڵ بلاودەبنەوە.

کەواتە فەرامۆشکردنی هەرکام لە جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆح کێشەی درێژخایەن دروست دەکات. چوار کێشە درێژخایەنەکان بریتین لە کەمیی متمانە، نەبونی دید و بنەمای هاوبەش، پەکخستنی تواناکان و تێکچونی هاودەنگیی. دیارە هەریەکەش لەو کێشانە کۆمەڵە نیشانەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە.




شێوەی ٦–٣

ئەنجامی کۆتایی تێکرای ئەم کێشە درێژخایەنانەو هی نیشانەکانیشیان بریتییە لە ئازارێکی هەنوکەیی تیژ کە بەهۆی شکست هێنان لە بازاڕ و زیانکردن و خراپی بەرهەم و بەرزبونی نرخی تێچوون و خاووخلیچکی، کەلتورێک دروست دەبێت کە تیایدا بەنجەی تۆمەتبارکردن بۆ یەکتری رادەکێشن، واتە کەلتوری لۆمەکردنی یەکتری

لەجیاتی ئەوەی بەرپرسیارێتییەکە بخاتە ئەستۆ. ئەگەر یەك جاری دیکە بیر لە فیلمی ماکس و ماکس بکەیتەوە دەتوانیت هەرکام لەو چوار کێشە درێژخایەنانە دیاری بکەیت.

## پارادیمی مرۆڤی کامڵ لە جێبەجێکردنێکی کرداریدا

بیرمە جارێکیان لە یەکەمین سەردانمدا بۆ دەزگایەك لە دەزگا گەورەکان، لەگەڵ گەورە بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکاندا کۆبومەوەو لێم پرسین پەیامی دەزگاکەتان چییە؟ ئەوانیش پاش کەمێك دوودڵیی وتیان: "ئامانجمان زیادکردنی سامانی پشکدارانی کۆمپانیاکەیە" لێم پرسین ئایا ئەم ئامانجەتان بە دیوارەکەدا هەڵواسیوە بۆ ئەوەی کارمەندەکان و کڕیارەکانی لێ ئاگادار ببنەوە. بە زەردەخەنەوە وتیان: "نەخێر، شتێکی دیکەمان هەڵواسیوە، بەڵام ئامانجە راستەقینەکەی ئێمە ئەمەیە". من هەرچەندە تازە ئاشنایەتیم پەیداکردبو لەگەڵ کار و دەزگاکەیاندا بەڵام پێم وتن: دەتانەوێت راستییەکانتان پێ بڵێم دەربارەی کەلتوری ناو دەزگاکەتان؟ ئێوە لە ناوخۆتاندا یەك دڵ و یەك دەنگ نین و ئەگەر بەرهەمەکەتان سەر بە سەندیکای کرێکاران بێت ئەوا لەگەڵ کرێکارەکانتاندا لە ململانێدان. ئێوە بەردەوام بە دەوری کارمەندەکانتاندا دەگەڕێن و دەیانپشکنن. ئێوە بۆ ئەوەی پاڵیان پێوەبنێن کاربکەن سیاسەتی تێڵاو گێزەرەکەیان لەگەڵدا بەکاردەهێنن. وزەی زۆری ئەرێنی لە ململانێی ناوخۆ و کێبڕکێی نێوان بەشەکان و لە بەرنامە نهێنییەکان و لە گەمە سیاسیەکاندا خەسار دەبێت.

هەمویان بەم قسەیە و بەم پێشبینیکردنەم سەرسام بون و پرسییان: ئەم هەمو شتە چۆن دەزانیت؟ چۆن توانیت ئاوا بە باشی بمانناسیت؟

وتم: پێویست ناکات زۆر (شت) دەربارەی کۆمپانیاکەتان یاخود دەربارەی بەرهەمەکەتان بزانم. هێندەم بەسە کە سروشتی مرۆڤ بناسم. ئامانجە بنەڕەتییەکەی ئێوە تەنیا جەختی لەسەر بەشێك لە چوار بەشە پێکهێنەرەکەی مرۆڤ کردۆتەوە. ئەویش جەستەیە (ئابوری)؛ هەروەها تەنیا یەك لایەنتان لەو لایەنانە بەلاوە گرنگە کە پەیوەندییان بە کۆمپانیاکەوە هەیە. (ئەویش خاوەنەکانی کۆمپانیاکەیە. ئێوە بە تەواوی سێ بەشەکەی دیکەتان فەرامۆش کردووە. ئەقڵ و دڵ و رۆح. لایەنەکانی دیکەشتان فەرامۆش کردووە کە پەیوەندییان هەیە بە کۆمپانیاکەوە. ئەمە هەڵەیە و بەردەوامبوون لەسەری ئەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. لەسەر پێشبینییەکەم

بەردەوام بوم و وتم: دوای کۆتاییهاتنی ئەم کۆبونەوەیە، نیوەتان زەمی نیوەکەی دیکە دەکات. ئیرە هیچ متمانەیەکی تێدا نییە و دووفاقی دیاردەیەکی زۆر ئاشکرایە.

ئەوی راستی بێت دەزگاکەیان بە یەکێك لە دەزگا سەرکەوتووەکان لەقەڵەم دەدرا، بەلام ئەوان بەم تێبینیانەی من سەرسام و بێزار بون.

لە راستیدا تۆ ئەگەر لە بازاڕدا سەرکەوتو نەبیت ناتوانیت لەگەڵ ئەو کەسانەدا سەرکەوتوبیت کە پەیوەندییان بە کۆمپانیاکەوە هەیە. لە بازاڕیشدا سەرکەوتو نابیت ئەگەر لە شوێنی کارەکەتدا سەرکەوتو نەبیت.

لێیان پرسیم. باشە بۆ گۆڕینی ئەم بارودۆخە پێویستە چی بکەین؟ وەلامم دانەوە. پێویستە بە جددی ئیش لەسەر چوار بەشەکە هەموی بکەن. ئەقڵی هەموان بەشدار بکەن بۆ ئەوەی هەموتان پێکەوە یەك گۆرانی بڵێنەوە.

پرنسیپە گەردونیەکان لە ناختاندا بژێنن کە پێکهاتون لە یەکسانی و دڵسۆزی و بێخەوشیی و راستگۆیی؛ بۆ ئەوەی بناغەیەکی پتەو بنیات بنێن گۆرانییەکەی لەسەر بڵێنەوە. بۆ دیاریکردنی ستراتیجی خۆتان لە هەموو بڕیارەکانتاندا کە پەیوەستن بە پێکهاتەی دەزگاکەو بە شێوەی کارکردن، پێویستە ئێوە ئەو پێوەرانە بەکاربهێنن کە دید و بەهاکانتانی تێدایە.

پێویستە بارودۆخێك دروست بکەن متمانە لەنێوان کارمەندەکاندا فەراهەم بکات. نەك هەر لەناو خۆیاندا بەڵکو لەناو ئەوان و دەزگاکەشدا. هەتا ئەو کارە نەکەن ناتوانن هێز و وزەی خەڵکەکەی ناو دەزگاکەتان ئازاد بکەن.

پێشنیارم بۆ کردن کە رەنگە پێویست بکات یەکەم هەنگاو ئەوان وەکو تیمێکی جێبەجێکار پەیامێك بۆ خۆیان دابڕێژن. پرسیاریان لێ کردم پرۆسەی گۆڕانەکە چەند دەخایەنێت؟ من لێم پرسین، ئەم بارودۆخەی ئێستا چەند ئازارتان دەدات؟ وەلامیان دامەوە وتیان: زۆر ئازارمان نادات. پێم وتن: "دە کەواتە ناتوانن گۆڕان بەدیبهێنن. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێت گۆڕانکاری دروست بکات، هەتاکو هەست بە ئازار و بارودۆخە سەختەکان نەکات و بایی ئەوەش بێ فیز بێت کە ئامادەیی تێدابێت بجوڵێت" لەبەر ئەوە پێم وتن باشتر وایە واز لە مەسەلەکە بهێنن.

وتیان: "بەلام ئێمە ئاگاداری ئەو روداوە باشانەین کە لە ئەنجامی کارکردنی تۆدا بەسەر کۆمەڵێك کۆمپانیاندا هاتووە کە ئیشت لەگەڵدا کردون. واش هەست دەکەین ئێمە لە ئایندەدا

روبەڕوی کێشەی ڕاستەقینە دەبینەوە بەهۆی گۆڕانی بازاڕ و تیژبوونی ململانێکانەوە لەبەر ئەوە ئێمە دەمانەوێت گۆڕانکاری بکەین و پێویستیشمان بە یارمەتییە".

وتم ئەگەر ئێوە دڵسۆز بن و بتانەوێت پێکەوە کاربکەن دەتوانن گۆڕانکارییەکە بەدەست بهێنن. بەڵام مەسەلەکە دوو سێ ساڵ و بگرە زیاتریشی پێویستە.

یەکێکیان هەڵی دایە وتی: "تۆ ئێمە باش ناناسیت. نازانیت چەندە خێراین. دەتوانین پەیامێکی چاککراو بۆ دەزگاکەمان دروست بکەین".

بە کورتبینییەکەی ئەو برادەرە وای دەزانی دەتوانیت لە یەک کۆبونەوەدا پەیامێکی ناڵ و واڵا دابڕێژێت سەرنجی هەمو کارمەندەکان رابکێشێت.

ورده ورده تێگەیشتن کە ئەم جۆرە بیرکردنەوە کورتبینانەیەو ئەم تەکنیکە خێرایانە ناتوانن ئەنجامێکی تەمەن درێژ بەدەست بهێنن. بە هێواشی لە سروشتی کێشە درێژخایەنەکانی ناو دەزگاکەیان حاڵی بون، بەو گیروگرفتانەشەوە کە لە شێوازی بیرکردنەوەی خۆیاندا هەبون. وایان لێ هات بە ڕێزێکی زۆرەوە تەماشای هەرچوار پێکهێنەرەکەی سروشتی مرۆڤ بکەن. لە کۆتاییشدا تێگەیشتن کە سەرکردایەتیکردن ئەرکی هەمو مرۆڤێکە و هەر کەسێك بیەوێت گۆڕانکاری دروست بکات پێویستە لە پارادایمەکەی خۆیەوە دەست پێبکات. واتە گۆڕان لە ناوەوە بۆ دەرەوە. دەزگاکە لە ڕەگ و ریشەوە خۆی بەهێز کرد. ئەرکەکە سێ چوار ساڵی خایاند لە کۆتاییدا گەیشتە ئەو هێز و ئاستەی کە هەم شێوە سەرکەوتووەکانی خۆی بپارێزێت و هەم بشتوانێت بەرگەی مامەڵە بگرێت لەگەڵ ئەو کێبڕکێ سەختەدا کە لە بازاڕدا دروست بوبو. هەرچەندە دواتر هەندێك لەو بەڕێوەبەرانە پۆستی گەورەتریان لە دەرەوەی دەزگاکە دەست کەوت بەڵام کەلتور و هێزی دەزگاکە هێشتا قوڵ و پتەو بون کە سەرەڕای ڕۆیشتنی هەندێك لەو بەڕێوەبەرانە بەردەوام لە پەرەسەندن و قازانجکردندا بوو.

## چارەسەری چاخی پیشەسازیی بۆ ئەم کێشەیە

ئێستا با بزانین چاخی پیشەسازیی چۆن وەڵامی چوار کێشە درێژخایەنەکە دەداتەوە؟

لە حاڵەتی بێ متمانەیی و نەبونی دەسەڵاتێکی ڕەوشتیدا (سەرۆك) دەبێتە ئەو رابەرەی کە لە هەموان زیاتر دەزانێت و هەمو بڕیارەکان دەدات "ڕێگەکەی من باشترین ڕێگەیە".

لە نەبونی دید یاخود بەهای هاوبەشدا پاساکان شوێنی خەون و دیدەکان دەگرنەوە.
پەیامی دەزگاکە بریتی دەبێت لەم دروشمە: بیر لە هیچ مەکەرەوە بێجگە لە کارەکەی خۆت. ئەوەی لێت داوا دەکرێت ئەنجامی بدە. گوێڕایەڵی پاساکان بەو بیرکردنەوە جێ بهێڵە بۆ من".

ئەگەر کێشەیەکیش لە هاودەنگیدا هەبێت، ئەوا هەوڵ دەدرێت تواناو لێهاتویی شتەکان زیاد بکرێت – کەرەسەکان، سیاسەتەکان، خەڵکەکە، هەمو شتێك. لێهاتویی ناوی گەمەکەیە.

ئەی بۆ یەکخستنی تواناکان چی دەڵێت؟ دەڵێت پێویستە خۆت جڵەوی مەسەلەکان بگریتە دەست.

ناتوانیت متمانە بە خەڵکەکە بکەیت؟ باشترین ڕێگە بۆ ئەوەی بەرهەمیان زیاتر ببێت بەکارهێنانی سیاسەتی تێلاو گێزەرە. گێزەرەکەیان (پاداشت) لەبەردەمدا دابنێ تا ئارەزوی کارکردنیان زیاد بکات و بڕێکی گونجاوی دیکەش (تێلا) بهێڵەرەوە (سزاو دەکردن لە ئیش) ئەگەر نەیانتوانی ئەرکە پێ سپێردراوەکانیان ئەنجام بدەن.




شێوەی ٤-٦

## چارەسەری سەرکردانە لە دەزگاکاندا

بڕیاری ئەوەی ببینە ئیلهامبەخشی خەڵك بۆ ئەوەی ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە راستەوخۆ دەمانباتە ناو قوڵایی چوار كێشە درێژخایەنەكە كە تایبەتن بە دەزگاكان و بەرهەمی نمونەی چاخی پیشەسازییەو لەم رۆژگارەشدا زۆر بڵاوەو لەسەر كۆنترۆڵكردنی خەڵك و بەدەستەوەگرتنی جڵەوی هەمو شتەكان وەستاوە.

هەر كەسێك لە ئێمە ئەگەر دەنگی خۆی بدۆزێتەوە دەتوانیت سەرلەنوێ بەرنامە خراپەكەی چاخی پیشەسازی ناو دەزگاكەی خۆی بنوسێتەوە (سەرۆك، یاساكان، لێهاتویی، كۆنترۆڵكردن).

پرۆسەی دانانەوەی پرۆگرامەكان چوار خول لەخۆ دەگرێت كە وەكو دژی ژەهری (نوشدارو، تلیاك)ی چوار كێشە درێژخایەنەكەوان.

كێشەكان، وەكو وتمان، دەرەنجامی فەرامۆشكردنی پێویستیەكانی جەستەو دڵ و ئەقڵ و رۆحن، بەڵام دووبارە دانانەوەی پرۆگرامەكان وەڵامدانەوەو جێبەجێكردنی ئەو پێویستییانەن.

ئێمە چۆن دەتوانین بە كردەوە و واقیعبینانە ئەو چوار كێشە درێژخایەنە چارەسەر بكەین؟

كاتێك كە متمانە كەم دەبێتەوە ئێمە جەخت لەوە دەكەینەوە ببینە پێشەنگێكی باش كە متمانە بخولقێنینەوە.

كاتێك كە دید و بەها هاوبەشەكان نامێنن هەمو هەوڵێك دەخەینە گەڕ بۆ دیاریكردنی رێبازەكە لەپێناوی بنیاتنانی دیدێكی هاوبەش و كۆمەڵێك بەهای هاوبەش.

كاتێك كە كێشە لە هاودەنگیدا دروست دەبێت ئێمە جەخت لەسەر هاوئاهەنگی دەكەینەوە لەنێوان ئامانجەكان و پێكهاتەكان و رژێمەكان و ریوشوێنەكان بۆ پتەوكردنی پرۆسەی تواناسازیی خەڵكەكە و هەروەها بۆ دروستكردنی كەلتورێك خزمەتی ئەو دید و بەهایانە بكات.

كاتێكیش كە تواناكان پەك دەخرێن، ئێمە جەخت دەكەینەوە لە تواناسازیی خەڵك و تیمەكان چ لەسەر ئاستی پرۆژەكە هەموی و چ لەسەر ئاستی ئەو كارەی ئەنجامی دەدەن.




شێوەی ٦-٥




شێوەی ٦-٦

من ئەم چوار دانە رۆڵە ناو دەنێم چوار رۆڵی سەرکردایەتی. دیسانەوە دەیڵێمەوە کە ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە سەرکردایەتی نییە وەکو پۆستێك. بەڵکو باسی سەرکردایەتی دەکەین وەکو دەستپێشخەرییەك بە ئامانجی ئەوەی خەڵکەکەی دەوروبەرمان وایان لێ بێت بەهای خۆیان و تواناکانی خۆیان بدۆزنەوەو هەروەها یەکخستنیان لە تیمێکی کامڵدا بۆ زیادکردنی کاریگەریی دەزگاکان و زیادکردنی کاریگەریی ئەو پرۆژانەی کە ئێمە بەشێکی پێك دەهێنین. بیرت نەچێت کە لەو جۆرە تیمانەدا خاڵە لاوازەکانی هیچ تاکێك کاریگەریی خراپی نامێنێت چونکە خاڵە بەهێزەکانی ئەوانی دیکە قەرەبوی بۆ دەکەنەوە.

زۆر بە سادەیی دەتوانین بڵێین چوار رۆڵی سەرکردایەتی بریتییە لە چوار خەسڵەتە تایبەتەکەی سەرکردایەتی – دید، دیسپلین، سۆز (عیشق)، ویژدان – کە لەسەر ئاستی دەزگا جێبەجێ بکرێن.




شێوەی ٦–٧

- نمونەسازیی باش (ویژدان)؛ نمونەیەکی وا بە خەڵکی لاسایت بکەنەوە
- رێدەرکردن (دید)؛ پێکەوە لەگەڵ خەڵکیدا رێبازەکە دیاری بکە
- گونجان (دیسپلین)؛ سیستمی وا دروست بکەو بەڕێوەی ببە کە دەزگاکە لەسەر رێبازەکە بهێڵێتەوە
- توانا سازیی (جۆش‌وخرۆش)؛ جەخت لەسەر ئامانجەکان بکەرەوە نەك لەسەر

گرتنەبەری ڕێگای دیاریکراو. سەرمایەگوزاری لەوەدا بکەو ئینجا هانی خەڵکەکە بدە بە شێوازی خۆیان کارەکە ئەنجام بدەن و ئەگەر داوایان کرد یارمەتییان بدە.

خاوەن پۆستە باڵاکانی ناو دەزگاکە ڕەنگە ئەنجامدانی ئەم چوار ڕۆڵەیان بەلاوە زەحمەت بێت، وەك ڕێگەیەکی تەحەداکار و سروشتیی بۆ ئەوەی ڕۆڵی پێشەنگی خۆیان ببینن وەك سەرکار. پێویستە ئەوەش بڵێین کە فەتیسکردنی جێبەجێکردنی ئەم چوار ڕۆڵە تەنیا لەناو کاربەدەستە گەورەکاندا هێندەی دیکە ئەقڵیەتی پشت بەستن بەوانی دیکە دەچەسپێنێت، ئەو ئەقڵییەتەی کە دەڵێت "تەنیا سەرۆکەکە بیر لە مەسەلە گرنگەکان دەکاتەوەو بڕیاریان لەبارەوە دەدات".

مرۆڤ لەهەر پۆستێکدا بێت پێویستە ئەم چوار ڕۆڵە ببینێت. چونکە ڕێگای زیادکردنی دەورو تەئسیری مرۆڤ و تیمەکەی و دەزگاکەیەتی.




شێوەی ٦-٨

لە ساڵی (١٩٩٥)ەوە من و هاوکارەکانم لە کۆمپانیای فرانکلین کۆڤی نمونەی ئەم چوار ڕۆڵی سەرکردایەتیکردنە بە موحازەرە دەڵێینەوە. بەڵام زۆر پسپۆڕ و شارەزای دیکەی بواری سەرکردایەتیکردن بە شێوەیەکی سەربەخۆ گەیشتونەتە چەند نمونەیەک کە لەسەر هەمان پرنسیپ دروست بون.

بۆ نمونە دەیڤ ئۆلریخ لە زانکۆی میشیگان و جاك زینگەر و نۆرم سمۆل وود لە کتێبە قوڵ و گرنگەکەیاندا (سەرکردایەتی پشت بەستو بە ئەنجام) کە ساڵی ١٩٩٩ بڵاویان کردەوەو بەرهەمی چەندین ساڵ تێبینیکردن و ڕاوێژ و لێکۆڵینەوەی زانستییە، هەمان ئەنجامگیریی دووپات دەکەنەوە بە وشەی جیاوازتر لە وشەکانی ئێمە. ئەو سێ نوسەرە گەورەیە لە کتێبەکەدا نمونەیەکی سەرکردایەتیکردنیان گەشە پێداوە کە لە چوار پێکهێنەر دروست بووە ڕێك وەکو پێکهێنەرەکانی نمونەی چوار ڕۆڵی سەرکردایەتیکردنە و جیاوازییەکە تەنیا لە وشە بەکارهێنراوەکاندایە. بەڵام لە هەردو نمونەکەدا واتا بنەڕەتییەکە یەك شتە.

ڕاستی و دروستی ئەم نمونەی سەرکردایەتیکردنە جەختی لەسەرکراوەتەوە لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە ٥ ساڵی خایاندووەو هەریەك لە (نیتین نۆهریا) و (ویلیام جویس) و (برۆس رۆبرتسۆن) بەشدارییان تێداکردووە. [سەرنج بدە لە کتێبی (بەراستی چی باشە؟). لە بڵاوکراوەکانی هارڤارد بزنس ریڤیو، تەموزی ٢٠٠٣]. ئەم نوسەرانە لەرێی پرۆژەیەکەوە کە ناویان ناوە پرۆژەی هەمیشە سەوز ٢٠٠ شێوەی ئیدارییان شرۆڤە کردووە کە بە درێژایی ١٠ ساڵ لە ١٦ دەزگادا پەیڕەوکراون. بە لێکۆڵینەوەکە توانیویانە لەو ڕەفتارە ئیدارییانە تێبگەن کە بە کردەوە ئەنجامی سەرکەوتویان بەدەست هێناوە. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە بۆی دەرخستون کە کۆمپانیا سەرکەوتووەکان ئەوانەن کە بە ئاشکراو بێ هیچ ئەملاو ئەولایەك چوار هەڵسوکەوتی کارگێری جێبەجێ دەکەن:

١. **ستراتیج:** ستراتیجێکی نوسراوی ڕۆشن دابڕێژە کە جەخت لەسەر چەند مەسەلەیەکی دیاریکراو بکات و ئەو ستراتیجە بپارێزە.

٢. **جێبەجێکردن:** پرۆسەیەکی وا بۆ جێبەجێکردنی ستراتیجەکەت گەشە پێ بدە کە هەمیشە و بێ کۆسپ و تەگەرە بەڕێوە بچێت. ئەم شێوە جێبەجێکردنە بپارێزە.

٣. **کەلتور:** کەلتورێك دابهێنەو پارێزگاری لێ بکە کە بایەخ بە چۆنێتی کارکردنەکە دەدات.

٤. **پێکهاتە:** دەزگایەك دروست بکەو بپارێزە کە نەرمەوخێرا و ڕوونکار (شەفاف) بێت.

یەکێك لە ئەنجامەکانی کە ئەم پرۆژەی هەمیشە سەوزە پێی گەیشت دەڵێت هەمو دەزگا سەرکەوتووەکان دوان لە رەفتارە لاوەکیەکەیان پەیرەو کردووە (بەهرە، داهێنان، سەرکردایەتی، تێکەڵبون و لەخۆگرتنی کۆمپانیای دیکە). بەڵام تۆ تەنیا بیر لە چوار رەفتارە ئیدارییەکانیان بکەرەوە کە هۆکاری راستەوخۆی سەرکەوتنی کۆمپانیاکانن بەسەر رکابەرەکانیاندا. ئایا ئەم رەفتارانە شێوازێکی دیکەی چوار رۆڵی سەرکردایەتیکردن نین؟ جارێکی دیکە دەبینین وشەی جیاواز بەکاردەهێنرێن بۆ گوزارشتکردن لە هەمان پرنسیپ.




شێوەی ٦—٩

بایەخی بەدوای یەکدا هاتن؛ نمونەیەك لە دنیای وەرزشەوە

ئەو چوار رۆڵەی کە باسمان کردن، تا ئەندازەیەکی زۆر پشتیان بە یەکتری بەستووە و لەلایەکەوە یەك لەدوای یەکتری دێن و لەلایەکی دیکەشەوە هاوزەمانن. یەك لەدوای یەکتری دێن چونکە تۆ پێش ئەوەی هیچ رۆڵێکی دیکە ببینیت بۆ ئازادکردنی ماتە وزەکانی مرۆڤ پێویستە خۆت جێی باوەڕی خەڵکەکە بیت. هاوزەمانیشن چونکە لەکاتی بنیاتنانی کەلتوری دەزگاکە لەسەر بناغەی ئەم جۆرە سەرکردایەتیکردنە پێویستیشە بەردەوام ئاگات لە رێوشوێنەکان و لە هەرچوار رۆڵەکە بێت.

بێم باشە ئەم بایەخی یەك لەدوای یەکهاتنەی هەر چوار رۆڵەکە بە بەراوردکردن

لەگەڵ یارییە وەرزشییەکاندا روون بکەمەوە، چونکە لە وەرزشیشدا و لە دنیای نیشوکاریشدا کێبڕکێکان بەهێزن.

مرۆڤ ئەگەر بچێتە گۆڕەپانی مەشقەوە بەڵام توانای جەستەیی نەبێت (ماسولکەی بەهێز و کۆئەندامێکی بەهێزی دڵ کە توانای بەرگەگرتنیان هەبێت) ناتوانێت هیچ شارەزاییەك نیشان و گەشە پێبدات. ئەگەر توانا وەرزشییەکانیش پێش ئەخات نابێتە ئەندامێکی بەسودی تیمەکەی و بەشێك لە سیستمێکی براوە. بە گوتەیەکی دیکە گەشە دان بە ماسولکەکان پێش بڕەودان بە شارەزاییەکان دێت. بایەخدان بە شارەزاییەکانیش بەر لە پێشخستنی تیمەکەو سیستمەکەیە.

جەستە سیستمێکی سروشتییە و یاساکانی سروشت بەڕێوەی دەبەن. ئەم نمونەیەی وەرزیش وێنەیەکی گونجاو و کاریگەرە و دەتوانێت لە باسی زیادکردنی تواناکان و دۆزینەوەی دەنگی تایبەتی خۆتاندا سودی لێ ببینیت.

مرۆڤ بەر لەوەی پەیوەندی پتەو دروست بکات لەسەر بناغەی باوەڕو متمانە، پێویستە توانا تایبەتەکانی خۆی گەشە پێ بدات. دروستکردنی پەیوەندییش لەسەر بناغەی باوەڕ و متمانە مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ پێشخستنی ئەو دەزگایانەی کە کاری دەستەجەمعی و بەشداریی و هاوکاریی خەسڵەتی سەرەکییەتی و لە کۆمەڵگادا دەورو تەئسیری هەیە.

بۆ نمونە، گریمان کەسێك هەیە ناتوانێت ئەو بەڵێنانە بباتە سەر کە بەخۆی داون، واتە کەسێکی دەمدەمییە و لە ژیانێکی بێ سەروبەردا دەژی. ئایا کەسێکی وا دەتوانێت پەیوەندییەکی رێکوپێك لەگەڵ خەڵکیدا دروست بکات و ببێتە جێی متمانەیان؟ وەڵامەکە ئاشکرایە. کەسێکیش جێی باوەڕ و متمانە نەبێت لە پەیوەندییەکانیدا ئایا دەتوانێت ببێتە خاوەنی ئەو بناغەیەی کە خێزان و دەزگا کاریگەرەکانی لەسەر راوەستاوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارەش ئاشکرایە کە نەخێر. منداڵ هەتا فێری رۆیشتن نەبێت ناتوانێت رابکات و هەتا گاگۆڵکێش فێر نەبێت ناتوانێت بڕوات. تۆش هەتا جەبر فێر نەبیت ناتوانیت کارە ژمێرارییەکان ئەنجام بدەیت و هەتا بنەماکانی ماتماتیکیش فێر نەبیت ناتوانی پرسیارەکانی جەبر حەل بکەیت. واتە هەمیشە کۆمەڵە مەسەلەیەك هەن دەکەونە پێش مەسەلەکانی دیکەوە. کە بایەخی ئەم یەك لەدوایەکە فێر بویت، ئینجا تێدەگەیت بۆچی گرنگە پێش ئەوەی

پەیوەندییەکانت لەسەر بنەمای متمانە لەگەڵ خەڵکیدا بەرەو پێ بدەیت پێویستە رەنج و تەقەلا بدەیت دەنگی تایبەتی خۆت بدۆزیتەوەو دوای ئەوە ئینجا بەرەو ئامانجەکانی دیکە بڕۆیت بۆ داهێنان لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا.

بەم شێوەیە کارێك دێتە ئاراوە کە بەرهەمی کۆمەڵە پەیوەندییەکی پتەون لەسەر بناغەی متمانەی بەهێز. ئەم کارە دەبێتە بناغەیەك تیمێك یاخود دەزگایەکی لەسەر دروست دەکرێت لەو کۆمەڵە کەسانەی کە هاوبەشن لە ئامانج و بەهاکاندا و ئامادەن لەم بوارەدا رۆڵی خۆیان ببینن. لە کۆتایدا خەڵکەکە و تیمەکان و دەزگاکان دەتوانن بازنەکانی دەوروتەنسیریان فراوان بکەن لەڕێی خزمەتکردن و دابینکردنی پێویستییەکانی ئەو کەسانەی کە لەژێر چاودێریی ئەماندان. دانانی مەسەلەی خزمەتکردنی خەڵك پێش بەرژەوەندییەکانی خۆت مانایەك دەبەخشێت بە هەر سێ ئاستەکەو دەمانگەیەنێتە چاخی حیکمەت کە پێنجەمین چاخی شارستانێیە.

رەنگە باشترین رێگا بۆ روونکردنەوەی بایەخ و هێزی ئەم مەسەلەی بەدوای یەکدا هاتنە نیشاندانی ئەو تاقیکردنەوەیە بێت کە زۆرجار من لەسەر خوێندکارەکانم ئەنجامی دەدەم. کەسێکی بەهێزی کەتە بانگ دەکەم و داوای لێ دەکەم بێت لەبەرچاوی هاوکارەکانیەوە ٢٠ جار (شناو) بکات. دیارە کەسەکە ئەگەر بەهێز بێت و مەشقی لەسەر ئەم وەرزشە کردبێت دەتوانێت بە ئاسانی شناوەکە بکات بەڵام کەمیان دەتوانن بیکەن .. تەنانەت ئەوانەشی کە بەهێز و تەندروست دیارن لە پێنج جار زیاتریان بۆ ناکرێت.

بە سودوەرگرتن لەم نمونە جەستەییە دەتوانم بڵێم ئەگەر کەسێك نەتوانێت لانی کەم (٢٠) جار شناوی سۆزداری بکات لەسەر ئاستی کەسێتی ناتوانێت و ئازادیی ئەوەشی نابێت (٣٠) جار شناوی سۆزداریی بکات، کە پێویستە بۆ چاککردنی پەیوەندییەکان لەگەڵ خەڵکیدا. هەروەها ئەگەر پەنجا جار شناوی سۆزداریی نەکات لەسەر ئاستی کەسێتی و لەسەر ئاستی پەیوەندییەکان لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، مەحاڵە بتوانێت تیمێك دابمەزرێنێت و کەلتورێکی دامەزراوەی وا دروست بکات کە ئاستێکی بەرزی متمانەو لێهاتویی تێدا بێت.

ئێستاش ئەم مەسەلەی هاتن بەدوای یەکترییەدا لە مێشکی خۆماندا دەچەسپێنین و لە بەردەوان بە ئەخلاقەوە دەڕۆینە سەر مەسەلەی گەشەدان بە شارەزاییەکان و پێشخستنی ئەم تیمەو سیستەمەی کە پێویستن بۆ ئەوەی وا لە خەڵکی بکەن دەنگی خۆیان بدۆزنەوە لە دەزگاکاندا.

## فۆکەسکردن و جێبەجێکردن
## هێڵە گشتییەکان بۆ پاشماوەی ئەم کتێبە

وەك لە وێنە تازەو بەرفراوانەکەی خوارەوەدا دیارە، چوار رۆڵەکە بەشی سەرەوەی ڕێگاکە پێك دەهێنن کە دەکاتە (ئیلهام ببەخشە بە خەڵکی بۆ ئەوەی دەنگی خۆیان بدۆزنەوە) و مەزنی لە دەزگاکاندا بەدی دەهێنێت. لە کاتێکدا چوار کێشە دەزگاییە درێژخانەکان ڕێگاکەی خوارەوە پێك دەهێنن کە ناهێڵن خەڵکەکە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە و ئەمەش دەبێتە کۆت و پێوەند بۆ دەزگاکەو دەیکاتە دامەزراوەیەکی ئاسایی.

ئێمە دەتوانین پرۆسەی ئیلهامبەخشین بە خەڵکی تا دەنگی خۆیان بدۆزنەوە لە دوو وشەدا کورت بکەینەوە. فۆکەسکردن و جێبەجێکردن.

فۆکەسکردن دوو رۆڵ لەخۆ دەگرێت: نمونەسازیی (خۆت بکەیتە نمونەیەکی باش) و دیاریکردنی رێبازەکە. جێبەجێکردنیش دوو رۆڵ لەخۆ دەگرێت گونجان و توانا بەخشین (تواناسازیی)

لە پاشماوەی ئەم کتێبەدا فێر دەبیت چۆن مەسەلەی ئیلهامبەخشین بەوانی دیکە بۆ ئەوەی دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە دەبێتە خوویەك لەلایان. ئەمەش بە برەودان بە شێواز و شارەزایی و زانیاری لەسەر ئەو پرنسیپانەی کە باسیان دەکەین.

### فۆکەسکردن – نمونەسازیی باش و دیاریکردنی رێبازەکە (ڕێدەرکردن)

١. **دەنگی کاریگەریی:** بەنمونەبوون (نمونەسازیی) واتە: یەکەم شت دەنگی خۆت بدۆزیتەوە (بەشی یەکەم) ئینجا هەڵبژاردنی شێوازی دەستپێشخەریی بۆ ئەوەی دەوروتەنسیرت زیاد ببێت لەسەر هەمو دەرفەتێك کە لە دەوروبەرتدا سەرهەڵ دەدات (بەشی حەوتەم).

٢. **دەنگی شایستەی متمانە:** خەسڵەتی نمونەسازیی و لێهاتویی لە هەر پەیوەندی و دەزگایەکدا پەیوەستن بە متمانەوە. مرۆڤ ئەگەر خۆی شایستەی متمانە پێکردن نەبێت ناتوانێت متمانەی خەڵکەکە بەدەست بهێنێت. زانینی ئەم پرنسیپەو پرنسیپەکانی دیکە کە گرنگن لە دۆزینەوەی رێباز (ڕێ دەرکردن) و لە هاوئاهەنگکردن و توانا بەخشیندا دەبنە دەروازەی دەورو تەئسیرت (بەشی هەشتەم)

٣. **دەنگ و خێرایی متمانە**: هەروەها نمونەسازیی باش پێویستی بە لێهاتویی بەهێز هەیە لە مەسەلەی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا بە جۆرێك کە متمانە دروست بکات (بەشی نۆیەم) و دەنگەکان تێکەڵ یەکدی بکات. بۆ روبەروبونەی ململانێکان و جیاوازییەکانت لەگەڵ خەڵکیدا رێگە چارەی سێیەم دابهێنێت بۆ تەحەداکانت و جیاوازییەکانت لەگەڵ ئەوانی دیکەدا.

٤. **یەك دەنگ**: دیاریکردنی رێبازەکە داهێنانی دیدێکی هاوبەش لەخۆ دەگرێت لەگەڵ خەڵکیدا و ئەم دیدە هاوبەشە یەکێك دەبێت لە مەسەلە هەرە گرنگەکان و لەو بەها هاوبەشانەش کە مەسەلە گرنگەکانیان تێدا بەدی دێت (بەشی پانزەهەم)

## جێبەجێکردن – گونجان و تواناسازیی

٥. **دەنگی جێبەجێکردن**: دروستکردنی هاوئاهەنگیی لەنێوان ئامانجەکانداو توانابەخشین بە سیستمەکان بۆ ئەوەی ئەنجامەکان بەدەست بهێنن (بەشی دوانزەهەم)

٦. **دەنگی تواناسازیی**: بەرزکردنەوە و ئازادکردنی جۆش‌وخرۆشی خەڵکی و تەختکردنی رێگەکەی بەردەمیان و پاشان وردە وردە خۆکشاندنەوە لە رێگەکەیان (بەشی سیانزەم). تواناسازیی ئەنجامی کۆتایی چوار رۆڵی سەرکردایەتیکردنەکەیە.

**بەشی چواردەهەم**- خووی هەشتەمین و خاڵە خوازراوەکە.

لەم بەشەدا روونی دەکەینەوە چۆن رێبازی کتێبەکە و نزیکبونەوە لە ئامانج هەر سێ رەهەندەکەی مەزنیی بەرجەستە دەکات. رەهەندەکان بریتین لە کەسێتی و سەرکردایەتی و دەزگایی. دواییش دەبینیت کە چۆن هەرسێ رەهەندەکە کۆدەبنەوەو چۆن دەکرێنە چوار پاسای جێبەجێکردن کە توانا بە دەزگاکەت دەبەخشن لە چاخی کرێکارانی زانیاریدا دەستکەوتی مەزن دابین بکات.

**بەشی پانزەهەم** – سودوەرگرتنی حەکیمانە لە دەنگی خۆمان بۆ خزمەتکردنی خەڵکی.

لەم بەشەی کتێبەکەدا روونی دەکەینەوە چۆن خووی هەشتەم (دۆزینەوەی دەنگی خۆت و ئیلهامبەخشین بە خەڵکی دیکەش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە) رێبەرایەتیمان دەکات بۆ چاخی داهاتوی دەنگی مرۆڤ کە چاخی حیکمەتە. جارێکی دیکە ئەم بەشەی کۆتایی چەند پرسیار و وەڵامێك لەخۆ دەگرێت. پرسیارەکان لەو پرسیارە هەرە باوانەن کە پەیوەندییان بە بابەتەکانی کتێبەکەوە هەیە و ساڵەهای ساڵ من سەروکارم لەگەڵیاندا هەبوە.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: سەرکردایەتی چۆن پێناسە دەکرێت؟

وەڵام: ئەمجارەش دەیڵێمەوە، سەرکردایەتی ئاگادارکردنی خەڵکییە لە بەهاو تواناکانیان بە شێوەیەکی هێندە روون و ئاشکرا کە لە خۆیاندا ببینن. تکایە تێبینی هەردوو وشەی (بەها) و (توانا) بکە. پێویستە هەمو کەسێك هەست بکات بایەخێکی تایبەتی خۆی هەیە و هیچ پەیوەندییەکی نییە بە مەسەلەی بەراوردکردن بە خەڵکی دیکەوە. پێویستە مرۆڤ رەفتار و تواناکەی هەرچۆنێك بن، هەست بکات بەوەی کە شایستەی خۆشەویستییەکی بێ قەیدوشەرتە. مرۆڤ کە ئەو هەستەی پێ بەخشرا و بواری بۆ رەخسێنرا ئەو توانایانە گەشە پێ بدات و بەکاریان بهێنێت، ئەو کاتە لەسەر زەمینەیەکی پتەو دایاندەمەزرێنێت، بەڵام ئەگەر هەستیان کرد بەهاو بایەخی هی ناخی خۆی نییە بەڵکو لە دەرەوە وەری گرتووە ئەوا لەسەر زەمینەیەکی فشۆڵ دایاندەمەزرێنێت و هەرگیز ناتوانێت تواناو بەخششەکانی زیاد بکات.

پرسیار: ئەمرۆ زۆر کتێب دەربارەی سەرکردایەتی هەن. تایبەتمەندێتییەکانی ئەم کتێبەی تۆ چییە و چی وای لێ دەکات لەوانی دیکە بەهای زیاتر بێت؟

وەڵام: لەم کتێبەدا پێنج خەسڵەت هەن کە بریتین لە:

یەکەم: گەشەپێدانی یەك لەدوای یەك. هیچ کتێبێکم پێ شك نایەت فۆکەس بخاتە سەر ئەوەی کە پێویستە لەسەر ئاستی کەسێتی مرۆڤەکە گەشەپێدان و هاوئاهەنگی دروست ببێت ئینجا پەیوەندی پتەوی متمانە لەگەڵ خەڵکیدا دابمەزرێنێت. کتێبەکەی ئێمە سەرەڕای ئەمە جەخت دەکاتەوە کە ئەم دوو مەسەلەیە دوو مەسەلەی زۆر گرنگ و پێویستن بۆ دروستکردنی دەزگای کاریگەری تەمەن درێژ، بە خێزانیشەوە.

دووەم: رێڕەوی کتێبەکە پشتی بە پارادیمی مرۆڤی کامڵ بەستووە. کتێبێکم پێ شك نایەت باسی هەرچوار جۆری زیرەکییەکان بکات و ئەوپەڕی بایەخ بدات بە زیرەکی رۆحی (ویژدان) لە سەرکردایەتیکردنی زیرەکییەکانی دیکەدا.

سێیەم: ئەم کتێبە بە تەواوی پشتی بەستووە بە پرنسیپە هەمیشەییە گەردوونییە نەگۆڕەکان کە جیاوازن لەو بەهایانە کە خەڵك و دامودەزگاکان هەیانەو مەرج نییە

لەسەر پرنسیپ دروست کراین. وەك دەزانین، جڵەوی هەڵسوکەوتمان بەدەست بەهاکانمانەوەیە، بەڵام ئەوەی حوکمی دەرئەنجامی هەڵسوکەوتەکان دەکات پرنسیپەکانن. کە تۆ ئەمسەری دارێك بەرز دەکەیتەوە سەرەکی ئەوسەریشی بەرز دەبێتەوە.

چوارەم: ئەم کتێبە فێرمان دەکات کە سەرکردایەتیکردن لەرێی گەشەدانی ئەنقەست بە پرنسیپەکان ئەرکێکە خۆت هەڵیدەبژێریت (دەسەڵاتی رەوشتی) نەك پۆست و مەقام (دەسەڵاتی فەرمی). هەروەها کلیلی چاخی تازەی کرێکارانی زانیاری ئەوەیە تواناکان ئازاد بکەیت نەك بیانخەیتە ژێر کۆنترۆڵی خۆتەوە. بە واتایەکی دیکە تۆ ئامرازەکان و شتەکان بەرێوە دەبەیت بەڵام مرۆڤ رابەرایەتی دەکەیت.

پێنجەم: ئەم رێرەوەی کە پشتی بە پارادیمی مرۆڤی کامڵ بەستووە. بە شێوەیەکی تایبەت بۆ دەزگاکان بەسودە –بە خێزانەکانیشەوە، ئەویش بە بەکارهێنانی چوار رۆڵی سەرکردایەتیکردن (ببیتە سەرمەشقێکی باش، دیاریکردنی رێباز، گونجاندن، تواناسازیی). ئەم پارادیمە هێزێکی لێکدانەوەیی سەرنجراکێشی وای هەیە کە دەتوانرێت لە دەستنیشانکردنی هەمو کێشە و ئاریشەیەکدا بەکاربهێنرێت و لە دۆزینەوەی هەنگاوەکانی چارەسەرکردنیشدا سودی لێ وەربگیرێت.

پرسیار: ئایا دەتوانین مرۆڤ فێری سەرکردایەتیکردن بکەین؟

وەڵام: نەخێر، بەڵام خۆیان دەتوانن فێری ببن. جارێکی دیکە دەیڵێمەوە، کلیلەکە لە بەکارهێنانی پانتایی نێوان کارلێکەر (واتە فێرکردن) و کاردانەوە، (واتە: فێربون)دایە.

ئەگەر مرۆڤ ئازادبێت لە هەڵبژاردنی زانیاری و شارەزایی و خەسڵەتە تایبەتەکانی پێویست بۆ سەرکردایەتیکردن (دید، دیسپلین، سۆز، ویژدان) ئەوا فێر دەبن چۆن ببنە سەرکردەی وا کە خەڵك بە خۆشحاڵییەوە دوایان بکەون. لەراستیدا سەرکردەکانیش و شوێن کەوتووەکانیشیان شوێنکەوتوی پرنسیپەکان دەبن.

لە کۆتاییشدا ئەو تیمە کە بە باشی رابەرایەتی دەکرێت تیمێکی کامڵی لێ دەردەچێت. خاڵە بەهێزەکانی ئەندامانی ئەو تیپە دەبنە خاڵی بەرهەمهێن و خاڵە لاوازەکانیش هیچ کاریگەرییەکی خراپیان نامێنێت چونکە خاڵی بەهێزی ئەندامەکانی دیکە قەرەبویان دەکەنەوە.

# بەشی حەوتەم

## دەنگی کارتێکردن
## خۆت بکەرە ڕوکاری وەرچەرخێن

پێویستە ببینە ئەو گۆڕانەی کە دەمانەوێت لە دنیادا بەدی بهێنین
- گاندی

نمونەسازیی باش سەنتەر و ڕۆحی هەمو چالاکییەکی سەرکردایەتییەو بە دوو مەسەلە دەست پێدەکات. یەکەمیان دۆزینەوەی دەنگی خۆتە، واتە گەشەدان بە هەرچوار زیرەکییەکە. دووەمیش گوزارشتکردن لەو دەنگە لە ڕێی تێڕوانین و دیسپلین و عیشق و ویژدانەوە. مرۆڤ ئەگەر ببێتە پێشەنگێکی باش بۆ بەرجەستەکردنی خەسڵەتەکانی کەسایەتی سەرکردە، دەتوانێت بە ئاسانی ڕۆڵەکانی دیکەی سەرکردایەتی بگێڕێت.




شێوەی ٧–١

جێبەجێکردنی رۆڵی پێشەنگی باش بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە ڕێگەی هەرسێ رۆڵەکەی دیکەی سەرکردایەتییەوە مەیسەر دەبێت. نەک هەر ئەوە، بەڵکو مرۆڤ پێش ئەوەی ئەو سێ رۆڵە ببینێت دەمێکە بۆتە پێشەنگێکی باشی خەڵکەکە و هەر ئەمەشە وایان لێ دەکات بڕوایان پێی هەبێت و متمانەی پێبکەن. سەرکردایەتی راستەقینە نایەتە دی هەتا خەڵکەکە بە چاوی خۆیان نەبینن چۆن ئەو کەسەی ویژدانی خۆی رابەرایەتی دەکات بۆتە پێشەنگێکی باش لەڕێی بینینی رۆڵەکانی (دیاریکردنی رێبازەکەو هاوئاهەنگیکردن و تواناسازی). ئەوکاتە خەڵکەکە پێ دەزانن کە چەند بەرێزن و نرخیان دەزانرێت، بۆچی؟ چونکە حساب بۆ بیروڕایان دەکرێت و کارەکانیان رێز لێ گیراون و ئەزموونە بێ هاوتاکەیان بایەخی پێ دەدرێت. ئەوان بەراستی بەشدارن لە پرۆسەی دیاریکردنی رێبازەکەدا، بەشداری راستەقینەن و مەسەلەکە هەر ئەوە نییە تەنیا بەس بە بیستن پەیامی دەزگاکەو پلانە ستراتیجییەکەیان بیستبێت، بەڵکو بەشدارییان کردووە لە پێشخستنیاندا و خۆیان بە خاوەنی دەزانن. یاخود ئەگەر بەبێ بەشداریکردنی ئەوان ئەرکەکەو پلانە ستراتیجییەکە پێشوەخت دارێژرابێت ئەوا ئەمان دەبنە بەشێکی، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی زۆر سەرسامن بە سەرکردە نمونەییەکە یاخود خۆیان بە هۆشیارییەوە ئەوەیان هەڵبژاردووە.

هەندێک جار لەخۆگرتنی مەسەلەکە بە لەخۆگرتنێکی نەقڵی یاخود سۆزداریی لە بەشداریکردن بەهێزترە. ئەمە لەناو لایەنگرانی گاندی و مارتن لۆثەرکینگ و نیلسۆن ماندێلادا دەبینین. تەنانەت رەنگە تۆ زۆر سەرسام بیت بە کەسێک پابەندی تێڕوانینەکەی بیت بێ ئەوەی هیچ بەشدارییەکت کردبێت لە دروستکردنی ئەو تێڕوانینەدا. ئەمە هێزێکی زۆر گەورەی دەروونییە و هەندێک جار لە بەشداریکردنی راستەقینە کاریگەرترە. ئەم مەسەلەیە زیاتر لەوەی بەسەر بەهاکاندا جێبەجێ بکرێت، بەسەر تێڕوانین و پلاندانانی ستراتیجیدا جێبەجێ دەبێت. خاوەن راکان و ستراتیجزانە بلیمەتەکان هەمیشە وەک خەڵکی خاوەن پلەو پێگەی تایبەت تەماشا دەکرێن، زۆرجاریش کەلتور ئەم تێڕوانینە باشتر دەچەسپێنێت بە مەرجێک کەسەکە متمانە پێکراو و شایستەی متمانە بێت. بەهەرحاڵ، مەسەلەی لەخۆگرتن لە کۆتاییدا هەر پشت بە بەشداریکردن دەبەستێت، جا ئیتر بەشداریکردنەکە راستەوخۆ بێت یان ناراستەوخۆ.

ڕۆڵی پێشەنگیی باش تەنیا هەر بۆ تاكەكان نییە، بەڵكو گروپەكانیش دەتوانن ببنە پێشەنگی باش. ئەو تیمەی كە لە كۆمەڵە خەڵكێك پێك هاتبێت هەریەكێكیان پشت بە خاڵە بەهێزەكانی ئەوانی دیكە ببەستێت و بە جۆرێك خۆیان ڕێك خستبێت كە خاڵە لاوازەكانیان هیچ كاریگەرییەكی خراپ دروست نەكەن، مانای وایە ئەو تیمە خاوەنی هێزێكی ڕاستەقینەیە لەناو دەزگاكەدا. كەواتە هەم تاكەكان دەتوانن ببنە پێشەنگی باش و هەم تیمە كامڵەكانیش. گەوهەری تیمی كامڵ ئەوەیە كە تۆ لە تیمەكەدایت بۆ ئەوەی ڕۆڵێك ببینیت قەرەبوی خاڵە لاوازەكانی ئەوانی دیكە بكاتەوە. تۆ بۆ ئەوە لەوێ نیت خاڵە لاوازەكانی ئەوانی دیكە بدۆزیتەوەو فۆكەسیان بخەیتە سەر، یاخود لە پاشملە باسیان بكەیت، بەڵكو بۆ ئەوە لەوێیت خاڵە لاوازەكانی ئەوان قەرەبو بكەیتەوە، وەك چۆن ئەوانیش خاڵە لاوازەكانی تۆ قەرەبو دەكەنەوە. هیچ كەس بە تەنیا خاوەنی هەمو خاڵە بەهێزەكان نییە. ئەو كەسانەش ژمارەیان زۆركەمە كە دەتوانن لە هەمو بوارەكانـدا سەركەوتن بەدەست بهێنن. لەبەر ئەوە مەسەلەی ڕێزگرتن لە یەكتری دەبێتە پێویستییەكی ڕەوشتی.

## شێوازی كارتێكردن

خووی ئەوەی وەڵامی ئارەزووەكەی ناخمان بدەینەوە بۆ گۆڕانكاریكردن و بۆ ئەوەی ببینە مرۆڤی گرنگ و بتوانین كاریگەری زیاتر و فراوانترمان هەبێت لەسەر ئەو كەس و بابەتانەی كە بەلامانەوە گرنگن، تێكڕا بەگشتی بە سیستمێكی دیاریكراوی بیركردنەوە دەست پێدەكات، لە هەڵوێستێكەوە دەست پێدەكات، لە بڕیارێكەوە دەست پێدەكات كە خۆمان هەڵمانبژاردووە. لەوەوە دەست پێدەكات كە دەنگی كارتێكردن بەكاربهێنیت.

كاتێك من پرنسیپەكانی ناو ئەم كتێبە بە موحازەرە دەڵێمەوە حەز دەكەم بوار بڕەخسێنم بۆ پرسیار، چ بە بەرچاوی هەموانەوە و چ دووبەدوو. هەمیشەش كەسێك دەبینم دەستی هەڵبڕیوە و شتێك دەڵێت بەم واتایەی خوارەوە: "دكتۆر كۆڤی، ئەم پرنسیپانە مەزنن. من باوەڕم پێیانە و زۆر زۆریشم پێخۆشە بە گوێرەی ئەو پرنسیپانە بژیم، بەڵام داخەكەم تۆ باش ئەو دەزگایە ناناسیت كە كاری تێدا دەكەم. ئەگەر سەرۆكێكی وەكو سەرۆكەكەی منت دەبو دەتزانی جێبەجێكردنی قسەكانی تۆ مەحاڵە. بەڕاستی نازانم چی بكەم؟ "بیركردنەوەی ئەم جۆرە كەسانە دیارە چۆنە. دوو

ڕێگە زیاتریان لەبەردەمدا نییە" بەڕێوەبەرەکەم کەسێکی بێ ئەقڵەو مەحاڵە بەهیچ شتێک بگۆڕێت. لەبەر ئەوە (یان) دەبێت واز لە ئیشەکە بهێنم. کە ئەمە مەسەلەیەکی زۆر زەحمەتە. یاخود بە هەمو توانامەوە هەوڵ بدەم خۆمی لەگەڵدا بگونجێنم.

لە شرۆڤەکردنی چۆنێتی جێبەجێکردنی ئەم پرنسیپانەدا بەسەر خێزان و هاوسەرگیریدا ژن و پیاوانی جیاجیا دەبینم هەمان شت دەربارەی هاوسەرەکانیان دەڵێن. "هاوسەرەکەمت بناسیایە باسی ئەم شتانەت لەگەڵدا نەدەکردم. مەحاڵە ئەو مەبەستەی تۆ لای ئێمە جێبەجێ ببێت". ئەمجارەشیان تەنیا دوو ڕێگە لەبەردەمدان: یان ئەبێت لە هاوسەرەکەم جیاببمەوە یاخود تا خۆمی لەگەڵدا بگونجێنم.

ئەم شێوازی هەست و بیرکردنەوەیە زۆر ئاسانە. هەمو کەس دەتوانێت ڕۆڵی قوربانی ببینێت و بڵێت: چیم لەتوانادا بووە کردومە، لەمە زیاترم پێ ناکرێت و من ئێستا تیا ماوم نازانم چی بکەم؟ ئەمە بیرکردنەوەی خەڵکی شکستخواردوی هیوابڕاوە کە هیچ ڕێگەیەکی دیکە نابینێت.

> هەر کەسێک ڕۆڵی قوربانی ببینێت ئایندەی خۆی لەناو دەبات

وەڵامی من بۆ ئەوانەی پرسیاری وا دەکەن، هەمیشە ئەختێک توشی شۆکیان دەکات. ئەمە بە ئاشکرا لە چاویاندا بەدی دەکەم، تەنانەت هەندێکیان وەڵامەکەی من بە جۆرە هێرشێک بۆسەر خۆیان لێک دەدەنەوە. وەڵامەکەش ئەمەیە: "ئەگەر تۆ وابزانیت کێشەکە لە تۆدا نییە بەڵکو لە ژینگەدایە یاخود خەتای ئەوانەی دەوروبەرتە، خۆی لە خۆیدا ئەمە کێشەکەیە".

هەندێکیان لە وەڵامدا پێم دەڵێن: "کەواتە بە ڕای تۆ کێشەکە کێشەی (خۆمە)".

"ئەوەی من دەمەوێ تێتی بگەیەنم ئەوەیە کە مرۆڤ هەرکاتێک هەستی خۆی گرێدا بە خاڵی لاوازی کەسێکی دیکەوە، مانای وایە ئەو مرۆڤە وازی لە ئازادی خۆی هێناوە کە هەست و ئارەزووەکان دەربڕێت و ڕێگەی داوە بەو کەسە ژیانی لێ ناخۆش بکات، بەمەش ئایندەی خۆی خستۆتە ژێر ڕەحمەتی رابردوویەوە. ئاشکرایە کە ئەمە کێشەی پەیوەندییەکانە لەگەڵ خەڵکیدا، بەڵام مرۆڤ هەتاکو دەنگی تایبەتی خۆی نەدۆزێتەوە مەحاڵە بتوانێت تێبگات و لە ئاخدا هەست بە ئاشتی و ئاسودەیی بکات و ببێتە

خاوەنی ڕەوشتی پێویست بۆ جێبەجێکردنی ڕێگا چارەی مەبدەئی لەگەڵ سەرۆکە (بێ نەقڵەکە)دا. جاری واش هەیە مرۆڤ تەنیا هێزە ناوخۆییەکەی هەیە بێ ئەوەی خاوەنی ئەو ئەزموون و شارەزاییانە بێت کە زادەی پشودرێژی و ئەزمونی بەردەوامن.

خەڵکەکە هەمیشە لەناو پرۆسەی فێرکردندا لە سایەی کارلێکی بەردەوام لەگەڵیاندا، وریا دەبنەوە و زۆرجار دەگەنە ئەو خاڵەی کە وا تێدەگەن ئەوان قوربانی نین و دەتوانن کاردانەوەکانیان هەڵبژێرن بەرامبەر بە هەڵسوکەوتی خەڵکیی. کۆمەڵگا بەردەوام ئەو سیستمە فکرییە دروست دەکات و دەچەسپێنێت کە پشتی بەستووە بە گلەیی و بە بینینی ڕۆڵی قوربانیی. بەڵام من و تۆ دەتوانین ئەو دیارییانە بەکاربهێنین کە لەگەڵماندا لەدایک بون بۆ ئەوەی ببنە هێزی خولقێنەر لە ژیانماندا. دەتوانین ڕێرەوێك بگرینە بەر دەوروتەنسیرمان لەو دەزگایەدا زیاتر و زیاتر بکات کە کاری تێدا دەکەین. دەتوانین ئێمە سەرۆکەکانمان بەرێوە ببەین.

## فەلسەفەی کاریگەریی یۆنانی

ئەو فەلسەفە یۆنانییەی کە دەربارەی کاریگەرییەو پێی دەوترێت (ڕەوشت و سۆز و لۆجیك) کورتەیەکی نایابە بۆ ئەو پرۆسەیەی کە بازنەی کاریگەرییەکانت فراوان دەکات (شێوەی ٧-٢)




شێوەی ٧-٢

زنجیرەیی (یەك لەدوای یەکهاتن) زۆر گرنگە. بەکارهێنانی لۆجیك پێش ئەوەی خەڵکەکە هەست بکەن تۆ تێیان گەیشتویت کارێکی بێهودەیە. هەروەها ئەوەش کارێکی بێهودەیە هەوڵ بدەیت خەڵکانێك تێبگەیەنیت کە بڕوایان بە رەوشتت نییە.

گروپێکی ٢٠ کەسی هەیە لە نوێنەر و پسپۆڕەکانی بواری بیمە پێك هاتووە. ئەم گروپە بە هەر سێ مانگ جارێك کۆدەبنەوە بۆ ئاڵوگۆڕی بیروڕا. ماوەی دوو ساڵ من سەرچاوەی زانیاری و بیرۆکەکانیان بوم و موحازەرەم دەداێ.

لە کۆبونەوەیەکماندا لە مانگی کانونی دووەمدا گلەیی و بێزارییان دەردەبڕی لە پرۆگرامی مەشق و پەرەپێدانی ناو کۆمپانیاکە. ئەو دەنگە پوشەی کە وەك دەڵێن پشتی حوشترەکەی شکاند ئاهەنگێکی جیهانیی خەڵات دابەشکردن بو لە (هاوایی) رێك خرا پێش کریسمەس و ماوەیەك کاتەکەیان لە مەشقکردندا بردەسەر. راهێنانەکە هیچ ئاڵوگۆڕێکی زانیاری و بیروڕای لەخۆنەگرتبو. باشترین بڕگەشی نمایشێکی گرانبەهای لێزەری بو. وتیان هەمو راهێنانەکانی دیکەیشمان هەر بەم شێوەیە بوو. کاریگەرییەکی کاتییان هەبووەو هیچ سودێکمان لێ نەبینیبون.

لێم پرسین وتم باشە بۆچی پرۆگرامەکەتان نەگۆڕی؟ وتیان: چونکە ئەوە ئیشی ئێمە نییە و ئێمە لەو مەسەلەیە بەرپرسیار نین. وتم ئەگەر مەبەستتان بێت دەتوانن پرۆگرامی راهێنانەکە بگۆڕن. ئەوان باشترین کارمەند بون لە ئاستی هەمو دەزگاکەدا و خاوەنی متمانەیەکی بەهێزیش بون (هێزە رەوشتییەکە).

گرێیان بویستایە دەیانتوانی گفتوگۆ و بیروڕا گۆڕینەوەی لەگەڵدا بکەن. هانم دان ئەم بیروبۆچونەیان پێشکەشی بڕیاربەدەستەکانی لیژنەکە بکەن بە شێوازی خۆیان یاخود بە شێوازێکی باشتر (هاوسۆزی) تەنانەت مەترسی خۆشیان باس بکەن لە گۆڕینی پرۆگرامی راهێنانەکەو لە ئاهەنگە قەشەنگەکان. ئامانجەکە باسکردنی ئەو مەترسییانە بو بۆ ئەوەی بڕیار بەدەستەکان قەناعەت بکەن کە ئەمان بە قوڵی لێیان حاڵی بون و دواجار بڕیاربەدەستەکان ئامادەبن راسپاردەی (لۆجیك) نوێنەرەکان قبوڵ بکەن.

بەمجۆرە دووکەسیان لە خۆیان هەڵبژارد بچن سەرۆکی وەرزش و بەڕێوەبەری جێبەجێکار و هەروەها بەرپرسیاری راهێنان و گەشەپێدان ببینن. دوو نوێنەرەکە بواریان بەو سێ کەسە دا بە ئارەزوی خۆیان باسی شێوازی دەزگاکە بکەن لە مەسەلەی

ڕاهێنان و هۆکارەکانی پشت ئەو پرۆگرامە و هەروەها باسی ئەو ناکۆکی و ململانێ سیاسی و ئابوری و کەلتورییانە بکەن کە گۆڕانکاری دروستیان دەکات.

بڕیار بەدەستەکان بە دورودرێژی بەردەوام بون لە باسکردن تا قەناعەتیان لا دروست بو کە دوو نوێنەرەکە بە تەواوی لێیان تێگەیشتون. یەکسەر کە ئەو هەستەیان لا دروست بو، ئامادەیی تەواویان تێدا خولقا کە کاریان تێبکرێت (کلیلی کارتێکردن ئەوەیە یەکەمجار خۆت (کار)ت تێبکرێت، واتە بەرووی خەڵکیدا کراوە بیت و تێیان بگەیت، لە نوێنەرەکانیان پرسی ئایا هیچ ڕاسپاردەیەکیان هەیە؟ ئەوانیش ڕاسپاردەکان و پلانی کارێکیان پێشکەش کرد کە هەمو لایەنە ئابوری و سیاسی و کەلتورییەکانی لەخۆگرتبو. خاوەن بڕیارەکان شاگەشکەبون. هەرچەندە ڕاسپاردەکان ئەوەبون کە پرۆگرامێکی نوێ دابڕێژێت، بەڵام ڕاستەوخۆ ڕەزامەندییان دەربڕی کە لە هەمو کۆمپانیاکەدا جێبەجێ بکرێت. پاش سێ مانگ کە کۆبوینەوە روداوەکەیان بۆ گێڕامەوە. لێم پرسین، ئەی ئێستا دەتانەوێ چی بکەن؟ ئایا بێ ئەقڵییەکی دیکە هەیە لە دەزگاکەتاندا کە بتانەوێت بیگۆڕن؟ کۆمەڵەی بیست بەم شێوازەی خۆیان سەرسام بون کە چۆن تواناسازییان بۆ خۆیان کردووە و بینیان کە دەستپێشخەری و ئازایەتی و هاوسۆزییان چ ئەنجامێکی باشی لێ کەوتۆتەوە. وازیان لە گلەیی و بۆڵەبۆڵ و چەنەبازیی هێناو دەستیان کرد بە لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی زیاتر. هەروەها شانبەشانی پەیداکردنی شارەزایی زیاتر لەو کارەی پێیان سپێردرا، بوارەکانی دیکەشیان تاقی کردەوەو وایان لێ هات مەسەلەکان باشتر و فراوانتر ببینن. هەروەها خاوەن بڕیارەکانیشیان وەکو مرۆڤ بینی و هەستیان کرد ئەوانیش ڕێك وەکو ئەمان هەوڵوتەقەلا دەدەن و پێویستیان بە پێشەنگی باشە نەك بە مرۆڤی ڕەخنەگر؛ پێویستیان بە قازی نییە دادگاییان بکات بەڵکو پێویستیان بە سەرچاوەیەکی روناکییە تاریکییان بۆ روناك بکاتەوە.

ئەم چیرۆکە ئەو ڕێڕەوەو هێزەکەیمان بۆ روون دەکاتەوە کە لە ناوەوە بەرەو دەرەوە دەچێت. بیرت نەچێت هەر کاتێك باوەڕت وابو کێشەکە لەوێیە نەك لێرە، ئەوا هەر ئەو باوەڕەت خودی کێشەکەیە.

هیوادارم بە پەیڕەوکردنی ئەم دەستپێشخەری و هاوسۆزییە و بە بنیاتنانی هێزە ڕەوشتیەکەو فۆکەسکردنەسەر ئەو مەسەلانەی کە دەکەونە ناو بازنەی - کاریگەرییەکانت

بتوانیت ببیتە هاندەری گۆڕان لە شێواز و هەڵوێستدا. بەم شێوازە تۆ بە کردەوە دەبیتە رابەری سەرۆکەکەت، واتە ئەگەر سەرۆکەکەت خاوەنی دەسەڵاتی رەسمی بێت تۆ بەو کردەوە هەڵوێستانەت دەبیتە خاوەنی دەسەڵاتە رەوشتییەکە، خاوەنی دەورو تەئسیر.

## روکاری وەرچەرخێن

مـن لـەو دەربڕینـە سەرنجڕاکێشـە تێگەیشـتم کـە گۆڕانکارییـەکی گـەورە بـەدی دەهێنێت لـە پارادیمدا و (بۆکمنیسـتەر فولـەر) هەڵیبـژاردووە بخرێتـە سـەرگۆڕەکەی، "تەنیا بزوێنەری روکاری گۆڕین". بزوێنەری سوکان لـە پاپۆڕ و فرۆکەدا بریتییە لە روکارێکی بچکۆلە کە سوکانە گەورەکە دەجوڵێنێت ئەویش هەمو پاپۆڕەکە دەجوڵێنێت.




شێوەی ٧ – ٤

من باوەڕم وایە لە هەمو دەزگایەکدا ژمارەیەکی زۆر بزوێنـەری وا هـەن – چ لەناو حوکمەتداو چ لەناو خوێندنگاو خێزان و رێکخراوە کۆمەڵایەتی و فازانج نەویستەکان و چ لەناو کۆمپانیاکانیشدا کە لە هەر پلەو پۆستێکدا بن دەتوانن سـەرکردایەتی بکەن و بازنەی دەوروتەئسیریشیان زیاد بکەن.

بزوێنەرەکان دەتوانن خۆیان و ئەو گروپ و بەشەش بجوڵێنن کە کاری تێدا دەکەن؟ جوڵانێـك کاریگـەری جـێ بهێڵێـت لەسـەر دەزگاکـە. ئـەو سـەرکردەیەی کـە روکاریی گۆڕانکارییەکـە دەجوڵێنێـت، بـە کـردەوە دەستپێشـخەرییەك دەنوێنێـت لـە بازنـەی کاریگەرێتییەکەیدا، تەنانەت ئەگەر بازنەیەکی بچوك بێت.




شێوەی ٧–٤

بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە سەرنج بدە لە شێوەی ٧-٤ کە دوو بازنەی تێدا دەبینین. بازنە گەورەکە بازنەی بایەخپێدانە (ئەو شتانەی بەلاتەوە گرنگن) و بازنە بچکۆلەکەش بازنەی کاریگەرێتییە (کارتێکردن) (ئەو شتانەی کە دەتوانیت کاریان تێبکەیت و کۆنترۆڵیان بکەیت). لە وێنەکەدا دەبینین بەشە گەورەکەی کاری مرۆڤ دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی کاریگەرێتییەوە.

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا هەندێك زانیاری سەرنجڕاکێشم هێنایەوە کە دەرەنجامی لێکۆڵینەوەیەکن کۆمپانیای (هاریس ئینتەرنەکتیف) بە دەستی هێناون لەرێی بەکارهێنانی پرسیارەکانی هاوکۆلکەی زیرەکیی جێبەجێکارییەوە XQ کە ئێمە دامانڕشتون. جا لەبەر ئەوەی ئەنجامەکانی ئەم شرۆڤەیە زۆر بیرۆکەی بەکەڵکیان هەڵگرتووە، ئێمە لەو بەشانەی کتێبەکەدا کە پەیوەندییان بە کارتێکردنەوە هەیە. نمونەی زۆریان لێ دەهێنینەوە. ڕەنگە بەلاتەوە گرنگ بێت گەر بزانیت تەنیا ٣١٪ی ئەوانەی هاوکۆلکەی زیرەکیی جێبەجێکارییان لەسەر تاقی کراوەتەوە وتویانە ئەوان فۆکەس دەخەنە سەر ئەو شتانەی کە ڕاستەوخۆ دەتوانن کاریان تێبکەن زیاتر لەو شتانەی کە کاریان تێناکەن.

ئەو سەرکردانەی کە ڕۆڵی بزوێنەری رووکاری گۆڕین دەبینن و لە هەر پلەو پۆستێکدا بن –تێڕوانین و دیسپلین و جۆش‌وخرۆش و ویژدان جێبەجێ دەکەن لەسەر قەراغی دەرەوەی بازنەی کارتێکردنیان و ئەمەش دەبێتە هۆی فراوانبونی بازنەکە.

زۆرجار ئەم کەسانە نە پۆستی باڵایان هەیە و نە دەسەڵاتی فەرمی بڕیاردانیش. دەستپێشخەریکردن جۆرێکە لە جۆرەکانی توانا بە خۆبەخشین (خۆ بەتواناکردن/ تواناسازیی). واتە نە سەرکردە فەرمییەکە توانای پێ بەخشیویت و نە پێکهاتەی دەزگاکەت و نە سروشتی کارە فەرمییەکەی خۆت ئەو کارەی کردووە. خۆت توانات بە خۆت بەخشیوە، لەڕێی کارکردن لەسەر ئەو بابەت و کێشە و تەحەدایەی هاتونەتە ڕێگات و تۆش بە شێوەو بڕی گونجاو دەستپێشخەریت نواندووە.

| |
|---|
| هەمیشە پرسیارە بنەڕەتییەکە ئەمەیە: لەم بارودۆخەدا باشترین شت چی‌یە کە دەتوانم ئەنجامی بدەم؟ |

## حەوت ئاستی دەستپێشخەری یان توانابەخۆبەخشین

لە وێنەکەی خوارەوەدا (سەرنج بدە لە شێوەی ٧-٥) شەبەنگێک دەبینیت کە لە حەوت ئاستی دەستپێشخەریی پێکهاتووە. لەو ئاستەوە دەست پێدەکات کە دەڵێت (چاوەڕێ بکە تا پێت دەڵێن). ئەمە ئاستی هەرە نزمی دەستپێشخەرییە، دوای ئەو ئاستی (بپرسە) دێت پاشان ئاستی (پێشنیارێک پێشکەش بکە) ئینجا ئاستی (من نیازم وایە فلانە کار بکەم) پاشان ئاستی (بیکەو راپۆرتێک دەربارەی کارەکەت پێشکەش بکە) و دواتر ئاستی (بیکە و راپۆرتێکی دەوری بنوسە) و دوا ئاستیش ئاستی (بیکە)یە کە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە ناوجەرگەی توانای کۆنترۆڵ و دەوروتەنسیرەوە.

هەڵبژاردنی ئاستی دەستپێشخەرییەکە لەسەر ئەوە ڕاوەستاوە بابەتەکە دەکەوێتە کوێوە؟ ناو بازنەی کاریگەرێتییەوە یاخود لە دەرەوەی بازنەکەدایە؟ بۆ ئەمەش مرۆڤ پێویستە هەست بە هەلوێستەکە بکات و مەسەلەکان بە باشی هەڵبسەنگێنێت. بەلام وردە وردە بازنەی دەوروتەنسیرت فراوانتر دەبێت. هەڵبژاردنی ئاستی دەستپێشخەریی، پێناسەکردنی ئێمە بۆ (دەنگ) فراوانتر دەکات بە جۆرێکی وا کە بتوانین لە هەموو بارودۆخێکدا دەنگی خۆمان بدۆزینەوە. ڕەنگە دەنگمان لە کارێکدا بدۆزینەوە کە بە هیچ جۆرێک چێژی لێ نابینین، بەلام لەڕێی بەکارهێنانی ئاستی دەستپێشخەرییەوە دەتوانین سروشتی کارەکە بگۆڕین یاخود کاربکەینە سەر ئەو خەلکەی لەناو بازنەی کارتێکردنی ئێمەدان بەلام کەوتونەتە دەرەوەی بواری کارەکەمان.




شێوەی ٧—٥

لە کاری ئێستاماندا دەتوانین تێبکۆشین لە پێناوی سەرکەوتندا. دەتوانین هەوڵی سەرکەوتن بدەین نەک تەنیا هەر لەسەر ئاستی شوێنەکە یاخود ناوچەکە یاخود لەسەر ئاستی نیشتمانی، بەڵکو لەسەر ئاستی جیهانی. پارێزەر دەتوانێت ببێتە دروستکەری ئاشتی و مامۆستاش دەتوانێت ببێتە راهێنەر و چاودێر و رابەر و پزیشک دەتوانێت فۆکەس بخاتە سەر خۆپاراستن و فێرکردن و بەو چاوە تەماشای مرۆڤ نەکات کە پێک هاتووە لە کۆمەڵێک ئەندام و تەکنەلۆجیا و کەرەسەی کیمیاوی، بەڵکو وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو ببینێت. باوکان دەتوانن ٨٠٪ی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ منداڵەکانیاندا ئەرێنی بێت و تەنیا ٢٠٪ی تەرخان بکەن بۆ بەدواداچون و راستکردنەوەو تەمبێکردن. فرۆشیار دەتوانێت زیاتر گوێ لە پێویستیەکانی خەڵکی بگرێت و سەرراستانە وەڵامیان بداتەوە. بەڕێوەبەری جێبەجێکار دەتوانێت هەوڵی ئەوە بدات بەڵێنەکانی کەم بکاتەوە و بەخششەکانی زیاد بکات. بە کورتی، هەمیشە و لە هەمو شوێنێک دەتوانین پرنسیپەکان فێر بکەین و هەندێ جاریش پێویستمان بەوە دەبێت قسە بکەین.

ڕێگام بدەن ئاستەکانی دەستپێشخەری باس بکەم.

## ١. چاوەڕێ بکە تا پێت دەڵێن.

ئەم ئاستە بریتییە لە: بایەخدانی هاوکات بەو مەسەلانەی کە هەم دەکەونە دەرەوەی بازنەی کاریگەرێتی و هەم لە دەرەوەی کارەکەشتدایە. لە حاڵەتی وادا ئەوەی لەسەر شانت پێویستە تەنیا هەر چاوەڕوانکردنە. تۆ لەم ئاستەدا ناتەوێت نیشی خەڵکی بکەیت و ناشتەوێ پێشنیار پێشکەش بکەیت دەربارەی ئەو مەسەلانەی دەکەونە دەرەوەی بازنەی دەوروتەنسیرت، خەڵکەکە لەبەر هۆکاری جۆراوجۆر متمانە بە پێشنیارەکانت ناکەن. بە نەگونجاویان دەزانن و ڕەنگە تۆش بە کەسێکی دەرەکی و بێئاگا حساب بکەن. لەراستیدا جوڵانەوە لەو بوارانەدا کە دەکەونە دەرەوەی بازنەی دەوروتەنسیرتەوە دەبێتە هۆی تەسککردنەوەی بازنەکە.

کەواتە پێویستە چی بکەیت؟ زەردەخەنە بتگرێ. بەڵێ زەردەخەنە، ڕێك وەکو ئەو دوعا ئارامبەخشەی کە ڕێکخراوی (مەیخۆرە نەناسراوەکان) دەیڵێنەوە:

خوایە گیان ئارامیم پێببەخشە
تا ئەو شتەم پێ قبوڵ بکرێت کە ناتوانم بیگۆڕم
ئازایەتیشم پێ ببەخشە
تا ئەو شتە بگۆڕم کە دەتوانم بیگۆڕم
حیکمەتیشم پێ ببەخشە
ئەو دوو شتە لێک جیابکەمەوە

بەمەش ئیتر وزەو توانات لەو شتانەدا خەسار نابن کە ناتوانیت بیانگۆڕیت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر توانات هەیە کاربکەیتە سەر کەسێك دەسەڵاتی گۆڕینی ئەو مەسەلانەی هەبێت کەواتە تۆ دەزانیت بچیتە ئاستێکی باڵاتری دەستپێشخەری و تواناسازیی خۆتەوە. بەڵام تکایە جارێ پەلەت نەبێت و حاڵی حازر هیچ شتێك لەم بارەیەوە مەکە.

زۆر کەس دەبینیت نوقمی بیرکردنەوە بون لەو مەسەلانەدا کە لە حاڵی حازردا ناتوانن بیانگۆڕن. ئەمانە جیرۆکی جەنگە خەیاڵییەکان لەگەڵ یەکتریدا ئاڵوگۆڕ دەکەن و بە باسکردنی ئەو مەسەلانەی کە ناتوانن بیانگۆڕن، ختوکەی هەستی یەکتری دەدەن.

جارێکی دیکە دەیڵێمەوە، ئایندەی ئەم کەسانە دەبێتە دیلی رابردووەکانیان. دواتر دەکەونە تەڵەیەکی ترسناکەوە. تەڵەی پشتبەستن بە کەسانی دیکە و ئەمیش کارەساتێکی دیکەی لێ دەکەوێتەوە کە ناوم ناون پێنج شێرپەنجە سۆزدارییەکە (رەخنەگرتن و بۆڵەبۆڵ و بەراوردکاری و کێبڕکێکردن و بەرهەڵستکاری) کەسێك کە لە ناخی خۆیدا هەست بە ئاسایش ناکات هەوڵ دەدات لە سەرچاوەی دەرەکییەوە ئەو ئاسایشە دابین بکات. ئەمانە چونکە بە شێوەیەکی هەمیشەیی پشتیان بە دەوروبەرەکەیان بەستووە، زوو دەکەونە ناو ئەم رەفتارە شێرپەنجەییە وێرانکەرانەوە کە بە کردەوە دەچنە ناو هەموو پەیوەندی و کەلتورەکانەوە. بەمجۆرە دەزگاکە چەند جەمسەرێکی بۆ دروست دەبێت و بە شێوەیەك لەناو خۆیدا توشی دابەشبون و دووبەرەکیی دەبێت کە مەحاڵە بتوانێت خزمەتگوزارییەکی نایاب پێشکەشی کڕیارەکان بکات.

**پێنج رەفتارە شێرپەنجەییەکە**

- رەخنەگرتن
- بۆڵەبۆڵ (گلەیی)
- بەراوردکردن
- کێبڕکێکردن
- بەرهەڵستکاریی

شێوەی ٧-٦

**تێبینییەك لەسەر رکابەریکردن (کێبڕکێ)**

هەرچەندە کێبڕکێکردن ئەگەر لەناو پەیوەندییەکان و خێزان و تیم و کەلتورەکاندا بێت شتێکی وێرانکەری لێ دەردەچێت، بەڵام من لەو باوەڕەدام کە لە هەندێك بواردا زۆر بەسودە، بەتایبەت لە وەرزش و کێبڕکێی ناوبازاڕدا، چونکە خەڵکەکە دەجوڵێنێت و باڵیان پێوە دەنێت باشترینی خۆیان پێشکەش بکەن.

لە بازاڕدا مرۆڤ وەك ئەو مامۆستایە تەماشای ڕکابەرەکەی دەکات کە دەتوانێت خۆی پێ بەراورد بکات و ئاستی خۆی پێ دیاری بکات. تۆ کاتێك هەوڵ دەدەیت ڕکابەرەکەت ببەزێنیت لەڕاستیدا هەوڵ دەدەیت خزمەتگوزارییەکی باشتر پێشکەشی کڕیارەکە بکەیت، هەروەها هەوڵیش دەدەیت لەو کەسانەوە فێر ببیت کە لە تۆ چاکترو خێراترن. ئەمەیە بازاڕی ئازاد؛ هۆکاری کێبڕکێیە لەناو بازاڕەکەداو مایەی یارمەتی و هاوکارییەتە لە شوێنی کارەکەدا. لە بازاڕدا مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە خۆی لەو ئەقڵییەتە پەکلایەنە دوربخاتەوە کە ئەبراهام ماسلۆ بەم شێوەیە باسی دەکات:

"ئەو کەسەی کە شارەزای بەکارهێنانی چەکوشە وا دەزانێت هەمو شتێك بزمارە"

## ٢. بپرسە

کارێکی ماقوڵ و لۆجیکییە مرۆڤ پرسیار دەربارەی شتێك بکات کە پەیوەندی بە کارەکەیەوە هەبێت، بەڵام لە دەرەوەی بازنەی دەورو تەئسیرەکەیدا بێت. مادام بابەتەکە لە دەرەوەی بازنەی کارتێکردنی تۆدایە کەواتە شتێکی ئەوتۆت لە ئاستیدا لەدەست نایەت، بەڵام لەبەر ئەوەی کاردەکاتە سەر کارەکەت، خەڵکەکە بە مافی خۆی دەزانێت هەر هیچ نەبێت پرسیارێکی لەبارەوە بکات. ئەگەر پرسیارەکە پرسیارێکی زیرەك و دەرئەنجامی شیکارییەکی بەرفراوان و بیرلێکردنەوەیەکی وریاوە بێت ئەوا سەرنجی خەڵکەکە ڕادەکێشێت و بازنەی کاریگەرییەکەت فراوانتر دەکات.

## ٣. پێشنیارێك پێشکەش بکە

ئەم ئاستی پێشنیارە لە کوێدایە؟ ڕاستەوخۆ لە قەراغی دەرەوەی بازنەی کاریگەرێتی تۆدایە. مەسەلەکە لە چوارچێوەی کارەکەتدا نییە. پێشنیار بۆ مەسەلەیەکە لە دەرەوەی سنوری کارەکەت و لە دەرەوەی بازنەی دەوروتەئسیرت.

باشترین ڕونکردنەوەی ئەم ئاستە سێیەمینەی دەستپێشخەری و توانا بە خۆبەخشینە لە پێنج هەنگاودا بەرجەستە دەبێت کە بریتین لە:

١. شیکارکردنی کێشەکە

٢. پێشکەشکردنی ڕێگاچارەی ئەڵتەرناتیڤ و گونجاو.

٣. بردودان بە هەنگاوی پێشنیارکراو بۆ جێبەجێکردنی چارەسەر.

٤. ڕەچاوکردنی هەموو بوارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان و هەروەها ڕەچاوکردنی تواناکانیش.

٥. پێشنیارەکەت وا پێشکەش بکە تەنیا پێویستی بە یەك ئیمزا هەبێت.

جێبەجێکردنی ئەم شێوازی کارکردنە لە فەرمانگەکاندا وا پێویست دەکات بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکە چاوەڕوان بێت تا باشترین کاری بێتە بەردەست. یەکەم هەنگاو، پێویستە داوا لە خەڵکەکە بکات بیر لە کێشە و بابەتەکان بکەنەوە و دواتر کە باشترین ڕێگاچارەیان بیرلێ کردەوە پێشنیارێکی کۆتایی پێشکەش بکەن و ئەوەی لەسەر بەڕێوەبەرەکە پێویستە تەماشاکردنی پێشنیاری کۆتاییە.

ئەم شێوازی کارکردنە بۆ ئەو کەسانە دەست نادات کە بە دوای وەڵامی ئاسان و خێرادا دەگەڕێن، تەنانەت ئەگەر بە ڕاستییش مەبەستیان بێت ئەو وەڵامانە بدەنەوە.

پێویستە بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکە دڵنیابێت لەوەی کە شێوازەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە تەواوی جێبەجێکراوە. پێویستە چاوەڕوانیش بێت تا هەموو هەنگاوەکان تەواو دەبن ئەگینا خەڵکەکە هەلی گەشەسەندنیان لەدەست دەچێت و بەمەش کاتی دەزگاکە بەفیڕۆ دەدەن. هەروەها ناشبێت دەست وەربدەینە جۆری کارکردنەکەیان چونکە بەو دەست وەردانە ئامانجەکە ناپێکرێت.

> کاتێک لە سقەلیە (سیسیلی) بوم ژەنەراڵێکم لابو زۆر دوودڵ بو لە هێرشکردن. من پێم وت متمانەیەکی تەواوم پێتە و بۆ سەلماندنی قسەکەشم شوێنی کارەکەم جێهێشت و گەڕامەوە ماڵەوە.
>
> ئەگەر بە خەڵک نەڵێیت پێویستە وا بکەیت و وانەکەیت، بە جۆرێک ئیشەکە ئەنجام دەدەن کە سەرسام دەبیت لە بلیمەتییان
>
> - ژەنەراڵ جۆرج ئێس پاتۆن

ئەم شێوازی کارکردنە هیلاکی و کاتێکی زۆر بۆ بەڕێوەبەرەکان دەگێڕێتەوە و کارمەندەکانیش هان دەدات بۆ دەستپێشخەریی زیاتر. من بە چاوی خۆم لە زۆر کۆمپانیادا

سەرکەوتنی بەرچاوی ئەم ڕێبازەم بینیوە. شێوازەکە ڕاستەوخۆ بازنەی کاریگەرێتی مرۆڤ فراوان دەکات.

## ٤. من نیازم وایە فڵانە کار بکەم

ئەم ئاستی دەستپێشخەرییە درێژکراوەی ئاستی پێشکەشکردنی پێشنیارە و لەویش بەرزترە. من ئەم پرنسیپە کاتێك فێربوم کە لە دەریاکانی ناوچەی دورگەکانی (هاوایی)دا لەسەر ژێر دەریایی (سانتاق)ی ئەتۆمی بوم کە نرخەکەی چەند ملیار دۆلارێکەو لەوکاتەدا سەرگەرمی مەشقێکی سەربازیی جەنگێکی خەیاڵی بو. دیمەنەکە دیمەنێکی دڵڕفێن بو کاتێك لەسەر پردەکە لەگەڵ کاپتن (دەیڤید مارکێت)ی سەرکردەی ژێر دەریاییەکەدا بوم و لە بەندەری دەریای (لاهانیا)وە بەڕێ کەوتبوین. من لە پێشەوەدا نزیکەی هەشتا مەترێکی لاشەی درێژی ژێردەریاییەکەم بینی و لە دواوەش هەمان ئەندازەییم لێ دیاربو کە بە ئاوەکەدا ڕێی دەکرد. لەکاتی گفتوگۆکردنی من و کاپتنەکەدا، ئەفسەرێك لێ نزیك بووەوە و پێی وت: کاپتن ئەمەوێ چوار سەد پێ ژێردەریاییەکە دابەزێنمە خوارەوە. کاپتنەکە لێی پرسی: نوقیانوسەکە چەند قوڵە؟ ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە: هەشتسەد پێ. کاپتنەکە پرسی: ئامێری سۆنارەکە دەڵێت چی؟ ئەفسەرەکە وەڵامی دایەوە: هیچ ناڵێت. لە ماسی زیاتری لێ نییە. کاپتنەکە وتی: بیست خولەکمان لەسەر ڕاوەستەو پاش ئەوە چی دەکەیت بیکە.

بە درێژایی ڕۆژەکە خەڵك دەهاتنە لای کاپتنەکەو پێیان دەوت: دەمەوێت فڵانە کار بکەم، دەمەوێ فیسارە ئیش بکەم. کاپتنەکەش زۆرجار چەند پرسیارێکی لێ دەکردن و ئینجا دەیوت: زۆرچاکە. کاپتنەکە تەنیا ئەوەندەی بۆ خۆی هێشتبۆوە بڕیاری لەسەر بدات کە بەقەدەر لوتکەی شاخە سەهۆڵەکانی ناو دەریاکانە. ماباقی بارستایی شاخەکە —واتە ٩٥٪ی بڕیارەکان- بەبێ بەشداری و تەنانەت بەبێ ڕەزامەندی کاپتنەکە ئەنجام دەدران. سەبارەت بە شێوازی سەرکردایەتیکردنەکەی پرسیارم لە کاپتن کرد، وتی هەتا ئەو جێگەیەی یاساکانی هێزی دەریایی ڕێگە بدەن من هەوڵ دەدەم سەربازەکان دەسەڵات و توانا بۆ خۆیان دروست بکەن و ئەوپەڕی متمانەیان پێدەکەم. وتی من لەو باوەڕەدام ئەگەر داوا لە سەرباز بکەیت تەنیا هەر خاوەنی کێشەکە نەبێت بەڵکو خاوەنی چارەسەرکردنەش بێت، ئەوا خۆیان لە ئەڵقەیەکی گرنگی زنجیری

سەرکردایەتیکردندا دەبینەوە. ئەم کاپتنە کەلتورێکی هێندە پێگەیشتوی دروست کرد کە ئەفسەر و دەریاوانەکان هیچ مەسەلەیەك لە کاپتنەکە نەشارنەوەو پەیوەندییان بەو بڕیارانەوە هەبێت کە تەنیا لە دەسەڵاتی ئەودان.

"دەمەوێت فلآنە شت بکەم" جیاوازە لەوەی بڵێت پێشنیار دەکەم. کە دەڵێیت دەمەوێت فلآنە کار ئەنجام بدەم مانای وایە تۆ هەمو شیکارییەکت کردووەو مەسەلەکە ئامادەی جێبەجێکردنەو تەنیا چاوەڕێی ڕەزامەندییە لەسەری.

ئەو دەریاوانانە بەراستی هەستیان بە نرخ و بایەخی خۆیان دەکردو ئەمەش هەستێکە لەوەوپێش لێی بێبەری کرابون کاتێك کە کاپتنەکانی پێشوتر ڕێی هیچ دەستپێشخەرییەکیان نەدەداو پێیان دەوتن (چاوەڕێ بن تا خۆمان پێتان دەڵێین). لەبەر ئەوە شێوازی "من نیازم وایە فلآن کار بکەم" دەکەوێتە فەراخ بازنەی کاریگەریی مرۆڤ و فەراخ ئەرك و پیشەکەی.

تۆ کە توانا بە مرۆڤێك دەبەخشیت لەراستیدا ڕێ لە بەهەدەردانی وزەکانی دەگریت و کەسانی پۆستە باڵآکانیش وا لێ دەکەیت سەروەریی خۆیان بۆ ئەو کارانە تەرخان بکەن کە داهاتیان زیاترە. چەند مانگێك پاش ئەو گەشتەم لەگەڵ ژێردەرییاییەکەدا، نامەیەکم لە کاپتن (مارکیت Markuett)ەوە پێگەیشت زۆر دڵخۆشی کردم کە لە نامەکەدا هەواڵی دابومێ کە ژێردەریاکە خەڵاتی باشترین ئامێری دەریایی لە ناوچەی پاسفیکدا پێبەخشراوە. دیارە ئەو خەڵاتە بەرهەمی ستراتیجە کاریگەرەکەی کاپتنە، ستراتیجی بەتواناکردنی خەڵك لەرێی بزواندنی چارۆکەی گۆڕانەوە.

## ٥. کارەکە ئەنجام بدەو راستەوخۆ را پۆرتێك دەربارەی کارەکەت بنوسە (کار بکەو را پۆرتی راستەوخۆی لەبارەوە بنوسە)

دەکەوێتە دەرەوەی سنوری کاریگەرییەکانی مرۆڤ بەڵام لەناو سنوری کارەکەیدایە. مەبەست لە ئاگادارکردنی خەڵکەکە لەبەرئەوەیە چونکە ئەوان دەیانەوێت ئاگاداربن. ئەم شێوازە وا دەکات خەڵکەکە دڵنیابن لەوەی کە هەمو شتێك بە رێكوپێکی دەڕوات بەرێوەو لەکاتی پێویستیشدا چاکسازی بکەن.

هەروەها ئەو زانیارییانەش دەبەخشێت بە خەڵکی کە پێش بڕیاردانەکانی ئایندەو پێش دەستکردن بە پرۆسەی بەدواداچوندا پێویستیان پێیەتی.

## ٦. کارەکە بکەو راپۆرتی دەوری بنوسە.

ئەم ئاستەی دەستپێشخەری بۆ ئەو کارانە گونجاوە کە بەشێك بن لە خۆ هەڵسەنگاندنی ئاسایی لە کۆبونەوەکانی تایبەت بە هەڵسەنگاندندا یاخود بەشێك بن لە راپۆرتێکی فەرمی کە زانیارییەکان بگەیەنێت بە مەبەستی سودلێوەرگرتن. تۆ کاتێك کە راپۆرتێکی دەوری پێشکەش دەکەیت زۆر بە ئاشکرا خۆت لە ناوجەرگەی پۆستە رەسمییەکەتداو لەناو بازنەی کاریگەرێتیدا دەبینیت.

## ٧. بیکە (ئە نجامی بدە)

کە کارێك دەکەوێتە ناوەندی بازنەی کارێگەرێتیت و لە ناوجەرگەی خەسڵەتە وەزفییەکەتدا دەبێت، تاقە ئەرکێکی سەرشانت ئەوەیە کارەکە ئەنجام بدەیت. هەندێك جار و لە هەندێك کەلتوردا مرۆڤ لێبوردنی ئاسانتر دەست دەکەوێت وەك لە رەزامەندی. لەبەر ئەوە ئەگەر دڵنیابویت لەوەی تۆ لەسەر حەقیت و کارەکەش زۆر لە بازنەی کاریگەرێتیەوە دور نییە، رەنگە باشتر وابێت راستەوخۆ ئەنجامی بدەیت.

لە بیرۆکەی بەرپرسیارێتیوەرگرتن و ئەنجامدانی راستەوخۆی کاردا هێزێکی مەزن خۆی حەشارداوە. ئەم ئاستە هەرە بەرزەی دەستپێشخەری چیرۆکێکی راستەقینەمان بیردەخاتەوە کە بە چیرۆکی (نامەیەك بۆ گارسیا) ناسراوە.

(لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا کە شەڕ لەنێوان ئیسپانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەڵگیرسا، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان ویستی نامەیەك بنێرێت بۆ شۆڕشگێڕی کوبایی کە ناوی گارسیا بو. ئەم شۆڕشگێڕە لە شوێنێکی وا نادیاردا لە دورگەی کوبادا خۆی حەشاردابو نە پۆستەی پێدەگەیشت و نە بروسکە. کەس نەیدەزانی چۆن بیدۆزێتەوەو بگاتە لای. بەڵام ئەفسەرێك ناوی کەسێکی پێشنیار کرد کە دەتوانێت کارەکە ئەنجام بدات. ئەو کەسە ناوی (روان) بو. کاتێك (ماك کینلی) لە واشنتۆنی پایتەخت، نامەیەکی رادەستی روان کرد، روان نە پرسیاری ئەوەی کرد بڵێ گارسیا لە کوێیە؟ نە وتی چۆن بیگەمێ؟ نە وتی ئەگەر گەیشتمە ئەوێ چی بکەم؟ نە وتی چۆن بگەڕێمەوە؟ یەکسەر نامەکەی وەرگرت و خۆی رێگای گەیشتنە لای گارسیای دۆزییەوە. بە سواری شەمەندەفەر چو بۆ نیویۆرك و لەوێوە سواری پاپۆڕێك بو بۆ جامایکا. ئینجا بە سواری بەلەمێکی بچکۆلە دڕی دا بەو ئابڵوقەیەی کە ئیسپانییەکان خستبویانە سەر

کوبا و پاشان ڕوی کردە دارستانەکانی کوباو هەندێك جار بە پێی پیادەو هەندێك جاری دیکەش بە سواری، ئینجا پاش نۆ ڕۆژ توانی لە سەعات نۆی بەیانیدا گارسیا ببینێت و سەعات پێنجی ئێوارەی هەمان ڕۆژ بەرێ بکەوێتەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان.)

ئەلبێرت هۆبارد لە کۆمێنتێکدا لەسەر ئەم چیرۆکە نوسیویەتی: مرۆڤ لە ئاست ئەو پیاوە سەرنجڕاکێشەدا دەکەوێتە حاڵەتی دڵە کوتێوە کە لەکاتی ئامادەنەبونی بەرپرسەکەشیدا بە جۆرێك ئەرکەکەی جێبەجێ دەکات کە وەك لەوێ بێت وایە. ئەو کەسە کە نامە ڕاسپاردەکەی تایبەت بە گارسیا بە ئارامی وەربگرێت بێ ئەوەی هیچ پرسیارێکی بێ بایەخ بکات و بێ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە فڕێی بداتە نزیکترین ئاوەڕۆوە و بیر لە هیچ ناکاتەوە تەنیا لەوەی چۆن نامەکە بگەیەنێت. شارستانیی مرۆڤ بریتییە لە گەڕانێکی بەردەوام و پڕ نیگەرانی بۆ دۆزینەوەی ئەم جۆرە کەسانە .. پیاوی لەو جۆرە هەرچییەك داوا بکات بۆی جێبەجێ دەکرێت. مرۆڤێکی هێندە دەگمەنە هیچ خاوەن کارێك ناتوانێت دەستبەرداری ببێت. لە هەمو شار و گوند و شارۆچکەیەکدا پێویستیان پێیەتی، هەروەها لە هەمو نوسینگە و ئەنبار و کارگەیەکیشدا .. دنیا تینوی بینین و دۆزینەوەی مرۆڤی ئاوایە .. ئەو کەسە پێویستە، زۆر پێویستە چونکە دەتوانێت (نامەیەك بۆ گارسیا) بگەیەنێت.

## ڕۆحی بزوێنەری ڕووکاری گۆڕین

مرۆڤ وەك بینیمان، سەرباری کێشە و بابەت و مەسەلە و گیروگرفت و دڵەڕاوکێکان، دەتوانێت توانای ئەوە بە خۆی ببەخشێت کە جۆرێك دەستپێشخەری بنوێنێت. تۆ ئەگەر هەستیاریت، یان حەکیمیت، یاخود دەترسیت کاتەکەن بەفیڕۆ بڕوات، ئەمانە هیچیان ڕێگر نین لەوەی کە کارەکە بکەیت. واز لە ڕەخنەو گلەیی و ئەرێنی بێنە. لە بەرپرسیارێتی ڕامەکەو شکستەکان مەخەرە ئەستۆی خەڵکی و گلەییان لێ مەکە.

ئێمە هەمومان لە کلتوری لۆمەکردندا دەژین. ڕێژەی ٧٠٪ی ئەوانەی وەڵامی پرسیارەکانی تاقیکردنەوەی زیرەکی جێبەجێکارییان داوەتەوە دەڵێن: کە کێشەیەك لە دەزگایەکدا ڕوودەدات، خەڵکەکە دەست دەکەن بە لۆمە کردن. لەبەر ئەوە تۆ ئەگەر بەرپرسیارێتییەك بگریتە ئەستۆ مانای وایە دژەباویت و بە پێچەوانەی ڕەوتەوە مەلە دەکەیت. دەستپێشخەریکردن پێویستی بە شتێك لە خەون و لە خەیاڵ هەیە. پێویستی

بەوە هەیە ئاستی هەندێك پێوەر بەرز بكرێتەوەو هەندێك چاكسازیش بەدی بهێنرێت. هەروەها پێویستی بە دیسپلین و جۆش‌وخرۆش و خۆشەویستی بۆ نیشەكە هەیە. دیارە جێبەجێكردنی كاری لەو جۆرەش پێویستە بە رێگایەك بێت پشتی بە ویژدان و پرنسیپەكان بەستبێت بۆ گەیشتن بە ئامانجی بالاّ.

(تۆم بیتەرز) لە وەسفی بزوێنەری رووكاری گۆڕین و رۆحی بزوێنەرەكەدا دەڵێت:

"سەركەوتووەكان ئەوانەن كە عاشقی كارە بچوك و بێ نرخەكانن. بۆچی؟ چونكە ئەم جۆرە كارانە پانتاییەكی فراوانیان پێ دەبەخشێت بۆ جوڵەكردن؛ كەس چاودێری ناكات، كەس بایەخ نادات، تۆ خۆت گەورە و پادشای خۆتیت. هەڵە بكەیت، دەستت پیس بكەیت، سەرچڵی بنوێنیت، مەحاڵ بەدەست بهێنیت، كەس هەقی نییە بەسەرتەوە .. كێشەی ئەو كەسانەی كە ناتوانن خۆیان بەتوانا بكەن ئەوەیە پانتاییەكیان نییە جموجوڵی تێدا بكەن و كارێكی دڵڕفێن بەئەنجام بگەیەنن.

بیرۆكە بنەڕەتییەكە لێرەدا بریتییە لەمە: چێژ لەو كارە سوك و بێنرخانە وەربگرە كە كەس نایانەوێن! بۆیان بگەڕێ! ئەمە كلیلی خۆبەتواناكردنە. كارە سوكەڵەكە رەنگە رێكخستنی فۆڕمێك بێت یاخود ئەوەبێت لە پشوی كۆتایی هەفتەدا خزمەتی كڕیارێك بكەیت. تۆ دەتوانیت ئەم كارە بچوكانە بكەیتە شتێكی مەزنی مایەی شانازی خۆت و سەرنجڕاكێشانی خەڵكی.

من جارێكیان بومە یاریدەدەری كارگێڕی یەكێك لە سەرۆك زانكۆكان، كە تاكڕەوانەو دیكتاتۆریانە رەفتاری دەكرد. هەمیشە خۆی لە هەمو كەس بە باشتر دەزانی و هەر خۆی تێكڕای بڕیارە گرنگەكانی دەدا. بەڵام لەهەمان كاتیشدا كەسێكی بلیمەت و بەهرەدار و خاوەن تێڕوانین بو. كەچی بەداخەوە وا رەفتاری لەگەڵ خەڵكەكەدا دەكرد وەك ئەوەی خزمەتكاری بن "بچۆ بۆ ئەوێ، وەرە بۆ ئێرە" وەك ئەوەی كەس ئەقڵی نەبێت. وردە وردە ئەو خەڵكە خوێندەوار و خولیایە پشتیان ساردبووەوەو تواناكانیان پەك خران. لە ڕاڕەوەكاندا دەوەستان و گلەییان لە بەڕێوەبەر دەكرد:

"خۆشم باوەڕناكەم شتی وای كردبێت"

"با تازەترین هەواڵت پێ بڵێم"

"ئەوەی تۆ هیچ نییە، دەزانیت لای ئێمە چی كرد"

"بەراستیتە؟ سەیرە ها"

"لە ژیانمدا یاساو ڕێنمایی ئاوا بێ مەعنام نەبینیوە. بەراستی ناخۆشە .."

بە کورتییەکەی، ئەوان ڕۆژانە چەند کاتژمێرێکیان لە ئاڵوگۆڕکردنی گلەیی و دەردە دڵەکاندا بەسەر دەبرد.

پاشان (بین) هات کە ڕێگەیەکی دیکەی گرتەبەر. ڕاستەوخۆ چووە سێیەمین ئاستی دەستپێشخەری و خۆپێگەیاندن. ئەو هەرچەندە وەکو نۆکەرێك مامەڵەی لەگەڵ دەکرا بەڵام بڕیاری دا پێشنیارێك پێشکەش بکات. بڕیاری دا ببێتە باشترین نۆکەر، ئەمەش ڕاستگۆیی و متمانەی پێبەخشی (هێزە ڕەوشتییەکە). وای لێ هات پێویستییەکانی سەرۆك تێبینی بکات و بزانێت لەبەر چی فلاَنە کاری پێ سپێردراوە "ئێستا با بزانین سەرۆك ئەم زانیارییەی بۆ چی‌یە؟ چونکە وادەی کۆبونەوەی ئەنجومەنی کارگێڕییە و دەیەوێت زانیاری بۆ کۆبکەمەوە دەربارەی ئەوەی پاسەوانەکانی زانکۆ چۆن چۆنی چەکەکانیان هەڵدەگرن لەبەر ئەوەی ڕەخنەی زۆری پێگەیشتوە لەسەر ئەم مەسەلەیە. وابزانم دەتوانم لە ئامادەکارییەکانی ئەم کۆبونەوەیەی ئەنجومەنی کارگێڕیدا یارمەتی بدەم"

## تەواوکەری بەڕێوەبەرەکەت بەو ڕەخنەی لێ مەگرە

(بین) هاتە ناو کۆبونەوە ئامادەکارییەکەوەو ئەو زانیارییانەی پێشکەش کرد کە لێی داواکرابون، پاشان هەنگاوێکی دیکە هاتە پێشەوەو دەستی کرد بە شرۆڤە و پێشنیارکردن. سەرۆك تەماشایەکی منی کرد بێ ئەوەی هیچ بڵێت و ئینجا ڕووی کردە (بین) و پێی وت: دەمەوێت لە کۆبونەوەکەی ئەنجومەنی کارگێڕیدا ئامادەبیت و ئەو پێشنیارانەت پێشکەش بکەیت.

شرۆڤەکانت بلیمەتانەن، ڕێك ئەوەت پێشبینی کردوە کە پێویستە". بێجگە لە (بین) هەموو کارمەندەکانی دیکە بەشدارییان لەو کودەتا بێدەنگەدا کرد لەسەر بنسیپی (چاوەڕوان بە تا پێت دەڵێن) (بین) بە هاوسۆزیکردن لەگەڵ سەرۆکەکەیداو بە دیاریکردنی ویست و پێویستیەکانی سەرۆك توانی بەشداریی بکات لە سەرکردایەتیکردندا. ئەو بە پۆستێکی بچوك دەستی پێکرد بەڵام هێندەی نەبرد گەیشتە ئاستی ئەوەی بەردەوام پێشنیار بدات بە ئەنجومەنی کارگێڕی.

من لەو پۆستەدا ماوەی چوار ساڵ کارم کرد. لە کۆتایی چوارەمین ساڵدا (بین) بوبووە کەسی دووەمی دەستڕۆیشتوی ناو زانکۆ، هەرچەندە هێشتا لەڕوی وەزیفییەوە

نەگەیشتبۆوە ئەو ئاستە. بەڵام بەبێ ڕەزامەندی و ئاگاداری (بین) سەرۆک هیچ هەنگاوێکی نەدەنا. کاتێکیش کە خانەنشین بو، خەڵاتێکی تایبەتی پێ بەخشرا بو. بۆچی؟ چونکە نمونەی دڵسۆزیی و فیداکاری و متمانە بەخۆبوون بو لە زانکۆدا.

لەو بڕوایەدام بین لەوە تێگەیشتبو کە گۆڕانکارییەکان تەنیا هەر بە ئارەزوکردن نایەنە دی و ئاوات خواستن لەو ڕووەوە کارێکی بێ هودەیە. چیرۆکەکەی (بین) بۆمان دەسەلمێنێت کە مرۆڤ ئەگەر بڕیاربدات دەبێتە سەرکردە. ئایا تۆش وەکو (بین) دەتوانیت ببیتە سەرکردەی سەرۆکەکەی خۆت.

> کە دەڵێم سەرکردایەتیکردن بەدەست خۆمانە مەبەستم لەوەیە کە مرۆڤ ئازادە لەوەی ئاستی دەستپێشخەرییەک هەڵدەبژێرێت بتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارەی خوارەوە بداتەوە: لەم بارودۆخەدا باشترین کار چییە بیکەم؟

مرۆڤ پێویستە بە شێوەیەکی هەمیشەیی هەر حەوت ئاستەکەی دەستپێشخەری دادگایی بکات، دادگاکردنێکی لۆجیکی. دیاریکردنی ئەو ئاستی دەستپێشخەرییەی کە تۆ دەتەوێت چالاک و کارای بکەیت پێویستی بە حیکمەت و بە دادگاییەکی لۆجیکی هەیە.

- پێویستە چی بکەیت؟ چۆن بیکەیت؟ کەی بیکەیت و لە هەموش گرنگتر، بۆچی پێویستە بیکەیت.

ئەمە پێویستی بە هەر چوار جۆری زیرەکییەکە هەیە.

پرسیاری (بۆچی بیکەم) هەمیشە زیرەکییە ڕۆحییەکە کارا دەکات چونکە پەیوەندی هەیە بە سیستم و کۆبەندی ئەو بنەمایانەتەوە کە سەرچاوەی پاڵنەرەکانی تۆن.

پرسیاری (چی بکەم) هەمیشە زیرەکییە ئەقڵییەکە کارا دەکات چونکە هانت دەدات شرۆڤەکارانەو ستراتیجییانە بیر بکەیتەوە.

بەڵام پرسیارەکانی (کەی) و (چۆن) هەمیشە زیرەکییە سۆزدارییەکە کارا دەکەن چونکە وا لە مرۆڤ دەکەن زینگە بخوێنێتەوەو هەست بە نەریتە کەلتوری و سیاسیەکان بکات و خاڵی بەهێز و خاڵی لاوازیی خۆی بناسێت.

هەروەها هاوکاتیش کە تۆ بڕیارەکەت جێبەجێ دەکەیت و بە شێوەیەکی تەکنیکی

(چۆن)ایەتییەکە جێبەجێ دەکەیت، زیرەکی کار ڕۆڵی خۆی دەبینێت بەتایبەت کە حەکیمانە دەستپێشخەری دەکەیت لەڕێی بەکارهێنانی هەر حەوت ئاستەکەی دەستپێشخەرییەوەو دەبینیت وردە وردە بازنەی دەورو تەنسیرت فراوان دەبێت تا دەگاتە ئەوەی سنوری هەمو کارەکەت دەگرێتەوە.

خاڵە سەرنجڕاکێشەکە لێرەدا ئەوەیە مرۆڤ چەندێك بازنەی کاریگەرێتییەکەی فراوانتر بێت هێندەش بازنەی بایەخپێدانەکە فراوان دەبێت.

سەرکردەی بزوێنەری ڕوکاری گۆڕین هەمیشە ئامادەیە. لە منارەی ناو دەریاکان دەچێت کە سەرچاوەی ڕوناکییەو بە تەنیا هەر ئاراستەی (با)کە نیشان نادات. سەرکردەی بزوێنەر کەسێك نییە ڕەشەبا کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ خۆیاندا ڕاپێچی بکەن.

> باشترینی خۆت ببەخشە بە جیهان، ڕەنگە بەم کارە ئازارت پێ بگات بەڵام گوێ مەدەرێ و باشترینی خۆت ببەخشە.
>
> - دایکە تێریزا

مرۆڤ ئەگەر ئەم ڕێیە بگرێتە بەر، کە پشتی بەستوە بە گۆڕانکاریکردن لەناوەوە بۆ دەرەوەو هەروەها بە دەستپێشخەری و سودوەرگرتن لە فرسەتەکان ئەوا بە دڵنیاییەوە خاوەن پۆستە فەرمییەکان متمانەیان زیاتر بە کەسایەتی و تواناکانی ئەو مرۆڤە بۆ دروست دەبێت. زیاتر بڕوای پێدەکەن و زیاتر حەز دەکەن ئاستی بەرزتری دەستپێشخەری و خۆبەتواناکردنی پێ ببەخشن. بەمجۆرە وای لێ دێت ببێتە سەرکردەی بەڕێوەبەرەکەی و بەڕێوەبەرەکەش بە شێوەیەکی سروشتی دەبێتە بەشێك لە تیمێکی کامڵ، واتە دەبێتە ئەو سەرکردەیەی کە خزمەتی شوێنکەوتوەکانی دەکات.

## فیلمی: مۆریچۆس Mauritius

بانگهێشتت دەکەم بۆ بینینی فیلمێك بە ناونیشانی (مۆرچۆس). ئەم فیلمە لەسەر سەدیەە هاوپێچەکەی ئەم کتێبەدا هەیە. تەنیا هەر دەزگا و تاك تاکی خەڵکەکە نین کە دەتوانن ڕۆڵی بزوێنەری ڕوکاری گۆڕین ببینن. ئەم فیلمە ڕوونی دەکاتەوە کە چۆن

وڵاتێك و کۆمەڵگایەك بە تەواوی دەتوانن ڕۆڵی بزوێنەری رووکاری گۆڕین ببین لە پێناوی بەدیهێنانی سەرکەوتندا و سەرەڕای جیاوازییە ئیتنی و کەلتوری و ڕەگەزییە گەورەکانی ناویشی. لەڕاستیدا سەرکەوتنەکە (سەرەڕا)ی ئەو جیاوازیبیانە نییە، بەڵکو (بەهۆی) ئەو جیاوازییانەوەیە کە ڕۆڵەکانی ئەو کۆمەڵگایە توانیویانە هێزێکی کەلتوری تایبەت دروست بکەن.

گوزارشت و دەستەواژەکانی کە لە پێشەکی فلیمەکەدا دەیانبینیت ڕاست بون لەوکاتەی فیلمەکەی تێدا بەرهەم هێنرا. لەوکاتەوە تا ئێستا بارودۆخی مۆریچۆس هەندێك گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بەسەرهەڵدانی هەندێك ململانێی کۆمەڵایەتیشەوە. ئێمە لەم چیرۆکەدا نامانەوێت ئەو بیرۆکەیە روون بکەینەوە کە تەحەدا و ململانێکانی بەردەم مرۆڤ و خێزان و دەزگاو تەنانەت هی بەردەم نەتەوەکانیش چەندە گەورە و مەزن بن، ئێمە دەتوانین لە چوارچێوەی بازنەی دەورو تەنسیری خۆماندا بە شێوەیەکی داهێنەرانە ڕۆڵی بزوێنەری روکاری گۆڕین ببینین.

## پرسیار و وەڵام:

پرسیار: قسەکان جوانن، بەڵام تۆ سەرۆکەکەی من ناناسیت. کابرایەکە بە شێوەیەکی زۆر سەیر حەزی لە کۆنترۆڵکردنە و ئەگەر بزانێت دەوروبەرەکەی خەڵکی بەتوانای لێیە ترسی لێ دەنیشێت. لەبەر ئەوە بارودۆخەکەی من تەواو جیاوازە.

وەڵام: بەڵێ هەمو بارودۆخێك بە شێوەیەك لە شێوەکان تاقانەو جیاوازە. بەڵام ئەگەر بچیتە قوڵاییەوە دەبینیت کێشەو ململانێکان زۆر لەیەکتری دەچن. کلیلەکە لەناو بارودۆخەکەدا نییە بەڵکو لەو پانتاییەدایە کە کەوتۆتە نێوان کارلێکەر و کاردانەوەکە - واتە لە بارودۆخەکە و لە کاردانەوەت بۆ بارودۆخەکەت -ئازادیی هەڵبژاردن و بڕیاردان لە لێرەدایە. ئەگەر ئەو ئازادییەت حەکیمانە بەکارهێناو بڕیارەکانت لەسەر پشتبەستن بە بنەماکان هەڵبژارد، ئەوا نەك هەر ئازادییەکانت زیاد دەبن، بەڵکو وات لێ دێت لە جاران زیاتر لە ناخەوە هەست بە ئاسایش بکەیت و ئیتر ژیانت پابەند نابێت بە خاڵە لاوازەکانی خەڵکییەوە. ئیتر بەردەوام نابیت لەسەر پەکخستنی تواناکانی خۆت و چیتر ڕێگە نادەیت خاڵە لاوازەکانی خەڵك ژیانت لێ تێك

بەمن، رەنگە کەڵکە ئابورییەکە شرۆڤە بکەیت و بڕیار بدەیت کارێکی جیاواز ئەنجام بدەیت یاخود بڕۆیت بۆ جێگەیەکی دیکە. یاخود رەنگە زۆر بە سادەیی بگەڕێیتەوە بۆ واقیعەکەی بازاڕ و رۆڵی بزوێنەری روکاری گۆڕین ببینیت بۆ فراوانکردنی بازنەی کاریگەر تاببیتە ئەو کەسەی سەرۆکەکەت ئەتوانێت دەستبەردارت ببێت و رەنگە تۆ ببیتە سەرکردەی ئەو. مرۆڤ بۆ ئەوەی داهێنەر و ئیلهامبەخش بێت پێویستە هەرچوار زیرەکییەکە بەکاربهێنێت. پێویستە لە دەرەوەی سنوری کارەکەی و لەناو بازنەی کاریگەرێتییەکەیدا کاربکات و زیاتر هەست بە بەرپرسیارێتی بکات و خۆبەخشی بنوێنێت بۆ تێگەیشتن لەو پێویستیانەی جێبەجێ نەکراون و لەو گیروگرفتانەی کە چارەسەر نەکراون. هەروەها پێویستی بەوەیە لە کارەکەیدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و متمانەی ئەوانی دیکە مسۆگەر بکات و هاوکات لەگەڵ بەرەودان بە بواری کارەکەی خۆی ئاگای لە کاری ئەوانی دیکەش بێت. بیرت نەچێت سەرەتا متمانە (هێزە رەوشتییەکە) گرنگە ئینجا هاوسۆزی و پاشانیش لۆجیک.

پرسیار: بە کردەوە مرۆڤ چۆن دەتوانێت ببێت بە سەرکردەی سەرۆکەکەی؟

وەڵام: باشتر وایە روناکییەک بیت رێی خەڵک رۆشن بکەیتەوە نەک دادوەر بیت. پێشەنگ بە نەک رەخنەگر. بۆ بەدەستهێنانی متمانە و زیادکردنی دەسەڵاتە رەوشتییەکەت پێویستە لە چوارچێوەی بازنەی کاریگەرێتیی خۆتدا کاربکەیت. ئازایانە دەستپێشخەر بە لە دروستکردنی روداودا. هاوسۆزیی بنوێنە لەگەڵ جیهانی سەرۆکەکەت و ئامانج و بیرکردنەوە و ئەو شتانەی کە بایەخدارن بەلایەوە. پێش هەمو دەستپێشخەرییەک هاوسۆزیی بنوێنە لەگەڵ کەلتور و بازاڕدا. ئەمجارەش دووپاتی دەکەمەوە، قسەی ناخۆش و خراپ مەکە. ئەگەر پشودرێژ و مشورخۆر بیت متمانەت لەلای خەڵک زیاتر و زیاتر دەبێت.

ئەنجامەکان خەڵکە رەشبینەکە بەدرۆ دەخەنەوە. سەرکردایەتی ئەمەیە. پۆست و مەقام نییە، شتێکە خۆت بڕیاری لێ دەدەیت.

پرسیار: زۆرجار دەڵێیت بەدەستهێنانی لێبوردن لە بەدیهێنانی رەزامەندی ئاسانترە. بەڵام جاری وا هەیە مرۆڤ سزا دەدرێت و لە کارەکەشی دوردەخرێتەوە تەنیا لەبەر ئەوەی دەستپێشخەرییەکی بچوکی نواندوە

وەڵام: مــرۆڤ بــۆ ئــەوەی سەرچــاوەیەکی هەمیشــەیی هــەبێت کــە پێویســتییە ئابورییەکانی دابین بکات دەبێت بەردەوام سەرمایەگوزاری بکات لە پێشخستنی تواناکانی خۆیداو پێویستە رۆژ بە رۆژیش توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی زیاتر بکات.

نە کارەکەی خۆت و نەخێر و ساقەی خەڵك ئاسایشە ئابورییەکەی تۆ دابین ناکەن، بەڵکو ئەو ئاسایشە زادەی توانای چارەسەرکردنی کێشەکان و بەدیهێنانی پێویستیەکانە. بەردەوام سەرمایەگوزاریی بکە لەو توانایانە بۆ ئــەوەی ببیتــە خــاوەنی فرسەت و هەل زیــاتر. پێویســتە زۆر بــە وردی جەنگــەکانت هەڵببــژێریت. دەستپێشــخەرییەك مەکــە کەوتبێتە ئەو دیو بازنەی کاریگەرێیەکانت، لە جیاتی ئــەوە دەستپێشــخەری لــەدەرەوەی سنوری کارەکەتــدا بکــە بــەڵام بــا لــەناو بازنــەی دەورو تەنســیردا بێــت. پاشــان لــە رێی پێشنیار و شرۆڤەکردنەوە بیرۆکەی تازە پێشکەش بکــە. دڵنیابــە، بــەم کارانــەت بازنــەی دەورو تەنسیرت فراوان دەبێت.

# بەشی هەشتەم

## شایستەی متمانە
## لە ڕەوشت و لێهاتوییدا پێشەنگ بە

گرنگترین خەسڵەتی سەرکردە سەرڕاستییە. بەبێ سەر راستی ناتوانرێت هیچ سەرکەوتنێکی راستەقینە بەدی بهێنرێت نە لە ڕێبەرایەتیکردنی نوسینگەدا، نە لە سەرکردایەتیکردنی یاریگای وەرزشدا نە لە هی سوپادا.




شێوازی ٨–١

جارێکیان داوای راوێژکارییم لێ کرا لە بارەی بانقێکەوە کە کارمەندەکانی ورەیان دابەزیبو. بەڕێوەبەرە گەنجەکەیان پێی وتم، نازانم کەموکوڕییەکە لە کوێدایە. کەسێکی سەرنجڕاکێش و گورج و گۆڵ بو. لە پۆستێکەوە بەرزبۆوە بۆ پۆستێکی دیکە، کەچی ئێستا دەبینێت دەزگاکەی سەرسم دەدات. بەرهەم و قازانج بەردەوام لە دابەزیندا بون. بەڕێوەبەرەکە دەستی کرد بە سەرزەنشتی کارمەندەکانی "چەندێك هانیان بدەم کەڵکی نییە لەگەڵیاندا".

ناهەقی نەبو. کەش و هەواکە ئالودە بوبو بە گومان و بێ متمانەیی.

لە ماوەی دوو مانگدا کۆمەڵێك وۆرکشۆپم رێکخست، بەڵام بێسود بو. مەسەلەکە ناخۆش بو.

زوو زوو هەموویان ئەم رستەیەیان دوپات دەکردەوە. "چۆن بڕوام بە شتەکانی ئێرە هەبێت. کەچی هیچیان سەرچاوەی بێ متمانەییەکەیان پێ نەوتم. بەڵام پاشان و لە ئەنجامی گفتوگۆی لابەلاوە راستییەکەم بۆ دەرکەوت. لەنێوان بەڕێوەبەرە خێزاندارەکە و یەکێك لە کارمەندە ژنەکاندا پەیوەندییەك هەبو. هەموانیش بەو پەیوەندییەیان دەزانی. ئێستا بۆم دەرکەوت لاوازیی بانقەکە خەتای هەڵسوکەوتی بەڕێوەبەرەکەیە. بەڵام زیانی هەرە گەورە بەر بەڕێوەبەرەکە دەکەوت. ئەو تەنیا بیری لە رابواردنەکانی خۆی دەکردەوەو گوێی نەدەدا بە ئاکامە درێژخایەنەکانی. هەروەها ناپاکیشی دەنواند دەرهەق بە متمانە پیرۆزەکەی نێوان خۆی و ژنەکەی.

بە واتایەکی دیکە شکستەکە لە رەوشتی ئەودابو

| |
|---|
| رێژەی ٩٠٪ی شکستی سەرکردەکان خەتای شکستە لە کەسایەتیدا |

وەك چۆن متمانە کلیلی هەمو پەیوەندییەکانە، ئاوهاش ئەو سرێشمەیە (کەتیرە) کە دەزگاکە پێکەوە قایم دەکات –متمانە وەك ئەو چیمەنتۆیە وایە کە بەردەکانی خانو پێکەوە دەبەستێت. من هەروەها ئەوەش فێربوم کە لەناو خەڵکیش و لەناو دەزگاکانیشدا متمانە دروست نابێت هەتا لایەنەکە خۆی شایستەی متمانە نەبێت.

**متمانە سێ سەرچاوەی هەیە:**

سەرچاوەی کەسێتی و سەرچاوەی دەزگایی و سێ یەمیشیان ئەوەیە کەسەکە بە هوشیاری تەواوە متمانە ببەخشێت بە کەسێکی دیکە. واتە ئەو رەفتارەی کە وام لێ

دەکات هەست بکەم تۆ من بە کەسێك دەزانیت دەتوانم بەهایەك بخەمە سەر بەهای تۆ، تۆ متمانەم پێ دەبەخشیت و منیش بۆت دەگەڕێنمەوە. لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی متمانە (trnst) هەم ناویشە و هەم فرمانیشە. شتێکیش بەو جۆرە بێت مانای وایە دەتوانرێت هاوبەشی تێدا بکرێت و لە ناو خەڵکدا ئاڵوگۆڕ بکرێت. ئەمە گەوهەری ئەو ڕێگایەیە کە مرۆڤ تیایدا دەبێتە سەرکردەی سەرۆکەکەی. کە تۆ متمانە بە کەسێك دەبەخشیت، خۆیشت متمانە بەدەست دەهێنیت. کرداری متمانەپێکردن مەرجەکەی ئەوەیە هەردولایەنەکە شایستەی متمانە پێکردن بن. هەم ئەو کەسەی متمانەکە دەبەخشێت و هەم ئەو کەسەش متمانەکەی پێ دەبەخشرێت.

ڕۆڵی چوارەم -توانا پێبەخشین (تواناسازیی)- لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە متمانە پێکردن. لە توێژینەوەیەکدا کە (٥٤) هەزا کەسی گرتەوە پرسیارەکەمان ئەوەبو کە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی سەرکردە بریتین لە چی، یەکەمین خەسڵەت سەر راستی بو (بڕوانە شێوەی ٨-٢)




شێوەی ٨-٢

زۆر کەس باوەڕی وایە باسکردنی ڕەوشت مۆدەی نەماوەو قسەیەکە تەنیا بۆ ختوکەدانی سۆزە یاخود پەیوەندی هەیە بە دینەوە. هەندێکیش دەپرسن ئاخۆ بەهاکانی ناوەوە لەمەولا هیچ ڕۆڵێکیان دەبێت. پاش هەمو ئەمانە ئایا ئەو بەڕێوەبەری بانقەی باسمان کرد سەرباری پێشێلکارییەکانی، توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت؟

ئەم پرسیارە زۆر بە باشی قەیرانی ژیانی هاوچەرخمان وێنا دەکات. زۆرکەس لەو باوەڕەدایە کە هەمو پێویستییەکانی بەدیهێنانی سەرکەوتن تەنیا بریتین لە بەهرەو وزەو کەسایەتیی. بەڵام مێژو فێرمان دەکات کە لە دورمەودادا هەقیقەتی ناوەوەی مرۆڤ زۆر گرنگتر دەبێت لە ڕواڵەتی.

من بۆ ئامادەکردنی کتێبی (حەوت خووەکە) چاوم خشاندەوە بە ئەدەبیاتی سەرکردایەتی و سەرکەوتندا لە سەرەتای دامەزراندنی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە و بۆم دەرکەوت کە لە سەدوپەنجا ساڵی یەکەمدا فۆکەسەکە لەسەر ڕەوشت و بنەماکان بوون. پاشان لەسەردەمی پیشەسازی پاش یەکەمین جەنگی جیهانیدا فۆکەسەکە گواسترایەوە بۆ سەر کەسایەتی و تەکنیك و تەکنەلۆجیا! واتە بۆ ئەو شتەی کە دەتوانین ناوی لێ بنێین زانستی ڕەوشتی کەسایەتی.

ئەم جۆرە مەیل و تێڕوانینە تا ئەمڕۆش هەر بەردەوامە، بەڵام هەست دەکەم تێڕوانینێکی پێچەوانە سەری هەڵداوەو ئەمەش دەرەنجامی هەستکردنی خەڵکە بە بەرووبومی ئەو کەلتورە دەزگاییەی کە پشت نابەستێت بە بەهاکان. ئێستا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەزگاکان زیاتر هەست بەوە دەکەن کە پێویستیان بە ڕەوشت و بڵاوکردنەوەی متمانە و متمانە بەخۆبوونە.

ئێستا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ قەناعەتی خەڵکی زیاتر دەبێت بەوەی کە پێویستە لە قوڵایی ڕۆحی خۆیان بڕوانن و هەست بە بەرپرسیارێتی بکەن و بەشداربن لە دۆزینەوەی چارەسەر و خزمەتکردنی پێویستییە مرۆڤایەتییەکاندا.

> لە دور مەودادا هۆکارە یەکلاکەرەوەی ژیانی مرۆڤ و نەتەوەکان بریتی‌یە لە ڕەوشت
>
> - ثیۆدۆر ڕۆزفڵت

ئەو سەرۆکی بانقە چی بەسەرهات کە تێوەگلابو لە پەیوەندییەکی گەرمدا لەگەڵ یەکێك لە کارمەندە ژنەکانیدا؟

من کاتێك کە بە راشکاوی پێم وت ئاگاداری ئەو پەیوەندییەی ئەوم و کاریگەری پەیوەندییەکەم بۆ باس کرد لەسەر کارمەندەکانی، دەستێکی هێنا بە قژیدا و وتی: نازانم لەکوێوە دەست پێبکەم؟

لێم پرسی: ئایا ئەو پەیوەندییە کۆتایی هاتوە؟

لێبڕاوانە تەماشای کردم و وتی: بەڵێ، بە دڵنیاییەوە.

وتم: کەواتە برۆ راستییەکە بە ژنەکەت بڵێ.

بە قسەی کردم و چو تەواوی مەسەلەکەی بۆ ژنەکەی باس کرد، ئەویش لەم هەڵەیەی خۆش بو. پاشان کۆبونەوەیەکی لەگەڵ کارمەندەکانیدا کرد و هۆی دابەزینی وەرەی ئەوانی بۆ روونکردنەوە: "هۆکاری کێشەکەم دۆزیوەتەوە، هۆکارەکە منم، داواتان لێ دەکەم فرسەتێکی دیکەم بدەنێ".

مەسەلەکە ماوەیەکی پێچو، بەڵام لە کۆتاییدا وەرەی کارمەندەکان چاك بووەوە سەرلەنوێ گەشبینی و کرانەوە متمانە گەڕانەوە.

ئەو بەڕێوەبەرە کاتێك کە رێگەی رەوشتیی دۆزییەوە گەورەترین خزمەتی بە خۆی کرد.

## کەسی شایستەی متمانە

لە هەر شوێنێك متمانەی هەمیشەیی هەبێت مانای وایە خەڵکەکانیش شایستەی متمانەن. ئەم دوو مەسەلەیە هەمیشە پێکەوەن و پرنسیپێکی نەگۆڕە. هەروەها وەك چۆن متمانە لە شایستەییەوە دێت، شایستەییش لە رەوشت و لێهاتوییەوە دێن. مرۆڤ ئەگەر خاوەنی رەوشتی بەرز و لێهاتوییەکی بەرچاو بێت بە دڵنیاییەوە دەبێتە کەسێکی دڵنیا و خاوەنی توانای بڕیاردان و لێکدانەوە، کە دوو کۆڵەکە سەرەکییەکەی هەمو بەدیهێنان و دیاریکردنی ئەو هۆکارە بنەڕەتییانەن کە مایەی بەدەستهێنانی متمانەن

با سەرەتا بە سێ دیوەکەی رەوشت دەست پێبکەین کە بریتین لە: سەرراستی و یەکهەڵوێستی و بەرچاوتێری.

- سەرڕاستی (بێخەوشی) مانای ئەوەیە رەفتارمان هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ ئەو پرنسیپ و یاسا سروشتییانەی کە لە کۆتاییدا ئاکامەکانی ئەو رەفتارە هەڵدەسەنگێنن.

راستگۆیی بریتییە لەوەی راستی بڵێیت، بەڵام سەرڕاستی بریتییە لە پابەندبون بەو بەڵێنانەی کە مرۆڤ بە خۆی وبە خەڵکیی دەدات.




شێوەی ٨—٣

- پێگەیشتویی کاتێك گەشە دەکات کە مرۆڤەکە نرخی سەرڕاستییەکەی خۆی بدات و بەسەر خۆیدا سەربکەوێت بەمەش وای لێ دێت هەم ئازا بێت و هەم خۆشەویست. واتە مرۆڤی لەوجۆرە دەتوانێت بە خۆشەویستییەوە مامەڵە لەگەڵ مەسەلە زەحمەتەکاندا بکات. کۆکردنەوەی ئازایەتی بە چاکی هەم سەرچاوەو هەم دەرەنجامی سەر راستین لە یەك کاتدا.

- بەرچاوتێریی بریتییە لەوەی مرۆڤ لەبری ئەوەی تەماشای ژیان بکات وەك پێشبڕکێیەك تەنیا (یەك) براوەی تێدا بێت، وای ببینێت سەرچاوەیەکی بەپیتەو بەردەوام لە گەورەبوندایە و پڕە لە سامان و سەرچاوە و فرسەت.

مرۆڤی سەرڕاست نایەت خۆی بەراورد بکات بە خەڵکی دیکەو سەرکەوتنیشیان بەراستی دڵخۆشی دەکات بەڵام کەسی چاوبرسی بەپێچەوانەوە رەفتار دەکات. ناسنامەکەی خۆی لە روانگەی بەراوردکرن لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دیاری دەکات و باوەڕی وایە سەرکەوتنی ئەوانی دیکە مایەی مەترسییە بۆ سەر ئەم. مرۆڤی بەرچاوتەنگ بە سەرکەوتنی خەڵك هەست بە ناڕەحەتی دەکات، هەرچەندە بە رواڵەت جۆرێکی دیکە خۆی نیشان دەدات لە کاتێکدا کە مرۆڤی بەرچاوتێر حسابی گرنگترین مامۆستا بۆ رکابەرەکانی دەکات.

مرۆڤ ناتوانێت لە بەشێکی ژیانیدا کارێکی باش بکات بەڵام لە بەشێکی دیکەدا سەرگەرمی کارێکی خراپ بێت.
ژیان پێکهاتەیەکی یەکگرتووە و بەش بەش ناکرێت
- مەهاتما گاندی

ئەم سێ خەسڵەتە پێکەوە .. سەرڕاستی و پێگەیشتوویی و بەرچاوتێریی خەسڵەتی هەمو تیمێکی کامڵە.

با ئێستا لە مەسەلەی متمانە و ئەمانەتدا سەرنجێك لە لێهاتوویی بدەین. لێهاتوویی تەکنیکی بریتییە لە شارەزایی و زانیاریی پێویست بۆ ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو. زانیاریی چەمکیی بریتییە لەوەی بتوانین هەم وێنە گەورەکە ببینین و هەم پەیوەندی نێوان بەشە جیاجیاکان. هەروەها بریتیشە لە بیرکردنەوەی ستراتیجی و مەنهەجی نەك تەنیا هەر بیرکردنەوەی تەکنیکی.

پشتبەستن بە یەکتریی (هاوسۆزیی، یەکترتەواوکردن) تێگەیشتنی ئەو راستییەیە کە هەمو ژیان شتێکی پێکەوە بەستراوە، بە تایبەت لەناو دامودەزگا و تیمە کامڵەکانی کە هەوڵ دەدەن مەیلی کڕیار و بەشداران و هاوردەکارەکان و خاوەکانیان بپارێزن. بیرکردنەوەی سەربەخۆ و یەکلایەنە لەم جیهانە پێکەوە گرێدراوەی کە خەڵکەکە پشتیان بە یەکتری بەستوە، وەك ئەوە وایە تۆ یاری تێنس لەگەڵ یانەیەکی (گۆڵف)دا بکەیت، یاخود لە جیهانێکی دیجیتاڵدا تۆ باسی ئەنەلۆگ بکەیت.

(مات)ی زاوام کاتی خۆی کە داوایکردبو لە کۆلێژێکی پزیشکی وەربگیرێت، لە چاوپێکەوتنەکەدا لێیان پرسیبو ئایا تۆ کامیانت بەلاوە باشترە، نەشتەرگەرێکی راستگۆی بێتوانا، یاخود نەشتەرگەرێکی بە توانای ناراستگۆ؟ ئەویش تۆزێك بیری کربۆوە و ئینجا وەڵامێکی زۆر باشی دابوەوە، وتبوی: "مەسەلەکە پەیوەستە بە بابەتەکەوە، ئەگەر پێویستم بە نەشتەرگەریی بێت نەشتەرگەرە بەتواناکە هەڵدەبژێرم، بەڵام ئەگەر بمەوێت بزانم پێویستم بە نەشتەرگەریی هەیە یا نا، ئەوا نەشتەرگەرە راستگۆکە هەڵدەبژێرم.

بێگومان رەوشت و لێهاتوویی هەردوکیان پێویستن، بەڵام دەبێت پێکەوە بن و ئەمیان بەبێ ئەوی دیکە بەس نییە. ژەنەراڵ ئیج. شۆرمان شوارزکۆف لەمبارەیەوە دەڵێت: " لە سوپادا زۆر سەرکردەی لێهاتوم بینیوە کە لە رەوشتدا ناتەواو بون. ئامادە نەبون

هیچ شتێك بكەن لە سوپادا ئەگەر خەلاتێك یاخود پلە بەرزكردنەوەیەكی تێدا نەبوایە. هەمو كارێكیان بۆ ئەوە بو بەسەر شانی خەلكیدا بەرز ببنەوە و پارچە كاغەزێكیان دەست بكەوێت كە پلەیەكی دیكەیان پێببەخشێت بەرەو لوتكە. وەك دەبینیت ئەمانە مرۆڤی لێهاتو بون، بەلام رەوشتیان نوقسان بو.

لەهەمان كاتیشدا زۆر لەو سەركردانەم بینیوە كە خاوەنی رەوشتی بەرز بون، بەلام لێهاتو نەبون. ئەمانە ئامادە نەبون باجی سەركردایەتی بدەن، ئامادە نەبون چەند كیلۆمەترە زیادەكە ببڕن كە مرۆڤ دەكەنە سەركردەیەكی مەزن. سەركردایەتیكردن لە سەدەی بیست و یەكەمدا پێویستی بە رەوشت و لێهاتویی هەیە پێكەوە.

- ئەگەر تا ئێستا بۆت روون نەبوبێتەوە، لەمەولا بە ئاشكرا بۆت ساغ دەبێتەوە كە ئەوانەی شایستەی متمانە پێكردن نین یاخود ژیانی تایبەتییان بێ سەروبەرە، بۆچی ناتوانن پەیوەندییەكانیان لەگەڵ خەلكیدا گەشە پێبدەن. لەبەر ئەوە تۆ ئەگەر ویستت پەیوەندییەكانت لەگەڵ خەلكیدا چاكتر بكەیت، پێویستە لە خۆتەوە دەست پێبكەیت، پێویستە خۆت چاك بكەیت.

## نمونەسازیی باش ئەوەیە حەوت خوومكەی كەسانی هەرە كاریگەر لە ژیانی خۆتدا جێبەجێ بكەیت

حەوت خوومكەی كەسانی هەرە كاریگەر ئەو كرۆكەن كە مرۆڤ دەكاتە كەسێكی هاوسەنگ و یەكپارچە و سەرڕاست و بەتوانا لە دروستكردنی تیمێكی كامل كە لەسەر رێزگرتنی هاوبەش بنیاتنرابێت. ئەمانە پرنسیپەكانی رەوشتی تاكە كەسین.

ناتوانین لێرەدا خوومكان بەو شێوازە كاریگەرە نیشان بدەین كە لە كتێبی (حەوت خوومكە)دا نیشان دراون، بەلام لە خوارەوە كورتەیەكی دەبینیت.

## حەوت خوومكەی كەسانی هەرە كاریگەر

### یەكەمین خوو – دەستپێشخەر بە

دەستپێشخەریی تەنیا ئەوە نییە جلەوی دەستپێشخەرییەكە بگریتە دەست، بەلكو لەوە زیاترە. درك كردنە بەو راستییە كە ئێمە بەرپرسیاری بڕیارەكانی خۆمانین و ئازادیی هەلبژاردنی بڕیارەكانیشمان پشتی بە پرنسیپ و بەهاكان بەستوە، نەك بە مەزاج و ئارەزوی

خۆمان و بارودۆخەکەی دەروبەرمان. مرۆڤی دەستپێشخەر ئامرازی گۆڕانکارییە و هەرگیز نایەوێت ڕۆڵی قوربانی بگێڕێت و لۆمەی خەڵکی بکات و سۆزدارانەش کاردانەوە نانوێنێت.

### دووەم خوو- کە دەستت پێکرد ئامانجەکەت لەبیر بێت

واتە پێویستە تۆ ئایندەی خۆت بەوە دابڕێژیت کە هەر پرۆژەیەك دەستی دەدەیتێ وێنەیەکی لە مێشکی خۆتدا بۆ بخولقێنیت، ئیتر پرۆژەکە بچوك بێت یان گەورە، تایبەت بێت یان گشتی، گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە وێنەکەی بۆ بخولقێنیت. ئەم شێوازی کارکردنە بۆ هەمو کەسێك و هەمو خێزانێك و هەمو تیمێك و هەمو دەزگایەك پێویستە. هەر کەسێك ئەم خووە پەیڕەو بکات هەرگیز بەوشێوەیە ناژی کە ئەمڕۆ بداتە دەست سبەینێ بێ ئەوەی ئامانجێکی ڕوون و ئاشکرای هەبێت. مرۆڤی لەو جۆرە پابەندی پرنسیپ و پەیوەندی و ئامانجە گرنگەکانی ژیانێتی ..

### سێیەم خوو – گرنگتر پێش گرنگ دابنێ

ئەم خووە لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە ڕێکخستن، واتە مرۆڤ لە هەمو بارودۆخێکدا مەسەلەکانی خۆی بەپێی گرنگییان ڕیزبەندیی بکات و سێیەمین خوو واتە جڵەوی ژیانت بەدەست ئەو پرنسیپانەوە بێت کە بەلای تۆوە لە هەموان گرنگترن، نەك بەدەست ئەجێنداو هێزە هەراسانکەرەکانی دەوروبەرت.

### چوارەمین خوو – بیرکردنەوە بەشێوازی براوە – براوە

بیرکردنەوە بۆ بەدیهێنانی سودی گشتی لە ڕاستیدا چوارچێوەیەکی ئەقڵ و سۆزە کە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئاستی بەدیهێنانی ڕێزگرتنی یەکتری و سودبەخشینی هاوبەش لە هەمو کارلێك و مامەڵەیەکدا لەگەڵ خەڵکیدا. ئەم بیرکردنەوەیە بیرکردنەوەی بەرچاوتێری و دەرفەتە زۆرەکانە، نەك هی ڕکابەرایەتی ناحەزانەو بیرکردنەوەی چاوبرسییانە. پێچەوانەی بیرکردنەوەی خۆپەرستانەیە کە دەڵێت (من براوەبم تۆ دۆڕاویت) هەروەها پێچەوانەی ئەوەشە ڕۆڵی قوربانی ببینیت (من بدۆڕێنم تۆ ببەیتەوە). بیرکردنەوەیە بە شێوازی (ئێمە) نەك شێوازی (من)

### پێنجەمین خو – هەوڵ بدە یەکەمجار لە خەڵکی تێبگەیت ئینجا ئەوان تێت بگەن.

کاتێك ئێمە بەونیازەوە گوێ لە کەسێك دەگرین کە تێی بگەین نەك بە نیازی

ئەوەی وەڵامی بدەینەوە، ئەوا سەرەتای پێکەوە گرێدانێکی راستەقینەو بنیادێکی راستەقینەی پەیوەندییەکانی لەگەڵدا دروست دەکەین. ئەگەر بەو جۆرە بکەین ئەوا زیاتر هەلی گفتوگۆی راشکاوانەمان دێتە دەست و ئاسانتر و سروشتییتریش خەڵکە لێمان تێدەگەن. مرۆڤ ئەگەر بیەوێت بەرامبەرەکەی تێی بگات پێویستە حسابیشیان بۆ بکات و هەروەها پێویستیشی بە ئازایەتییە. مرۆڤ ئەگەر بیەوێت کەسێکی کاریگەر بێت پێویستە لەو دوو مەسەلەیەدا هاوسەنگی بدۆزێتەوە.

### شەشەمین خوو – یەکترتەواوکردن لەگەڵ خەڵکیدا (هاوکاریی سۆزدار)

پێکهاتن لە ناوەڕۆکدا هەڵبژاردنی سێیەمە: نە رێگەکەی من و نە رێگەکەی تۆ، بەڵکو رێگەیەکی سێیەم کە لە هەرکام لە دوو رێگاکەی من و تۆ بە تەنیا چاکتر بێت. ئەمە بەرهەمی رێزگرتنی جیاوازییەکانی نێوان خۆت و ئەوانی دیکەیە. بەڵکو بەرز نرخاندن و ستایشکردنیانە.

ئەم شەشەمین خووە بایەخ دەدات بە چارەسەرکردنی کێشەکان و قۆستنەوەی فرسەتەکان و رێکخستنی جیاوازییەکان لەگەڵ یەکتریدا .. جۆرێکە لەو هاوکارییە داهێنەرانەیەی کە تیایدا (١ + ١ = ٣ !!!!! ..) و بگرە زیاتریش.

هاوکاریی خولقێنەر کلیلی دەستی هەمو تیمێك و پەیوەندییەکی کاریگەرە. تیمی لەوجۆرە بە شێوەیەك خۆی رێك دەخات کە خاڵە لاوازەکانی هەندێك لە ئەندامەکانی بە خاڵە بەهێزەکانی ئەوانی دیکە قەرەبوبکاتەوە. بەم شێوەیە خاڵە بەهێزەکان بەهێزتر دەبن و خاڵە لاوازەکانیش کاریگەریی نەرێنییان نامێنێت.

### حەوتەمین خوو – مشارەکە تیژ بکەرەوە

حەوتەمین خوو مەبەستی ئەوەیە کە ئێمە بەردەوام خۆمان تیژبکەینەوە لە هەر چوار بوارە بنەڕەتییەکانی ژیاندا کە بریتین لە بوارە: جەستەیی و کۆمەڵایەتی/ سۆزداریی و ئەقڵی و رۆحییەکان. ئەم خووە توانای ئەوەمان زیاتر دەکات کە لە خووە کاراکانی دیکەدا بژین.

سێ خووی یەکەمی ناو هەر حەوت خووەکە لەم چوار وشەیەدا کورت دەکرێتەوە: بەڵێن بدەو جێبەجێیان بکە. بەڵێندان بریتییە لە دەستپێشخەریی (یەکەمین خوو). ناوەڕۆکی بەڵێنەکە دووەمین خووەو جێبەجێکردنیشی بریتییە لە سێیەمین خو.

> ئەو کرێکارانەی راپرسیاریان لەگەڵدا کراوە، تەنیا ٥٧٪ باوەڕیان وایە دەزگاکان بەردەوام بەڵێنەکانیان دەبەنەسەر.

هەروەها دەتوانین چوارەمین و پێنجەمین و شەشەمین خووی خوی تیمی کامڵ لەم رستەیەدا کورت بکەینەوە کە دەڵێت: خەڵکی لە کێشەکەدا هاوبەش بکەو پێکەوە بەدوای چارەسەردا بگەڕێن. ئەمە پێویستی بە رێزگرتنی یەکتری هەیە (چوارەمین خوو) هەروەها بە لێکتێگەیشتنیش (پێنجەمین خو) هەروەها بە هاوکاریکردنی خولقێنەرانە (شەشەمین خوو). حەوتەمین خوو بریتییە لە زیادکردنی لێهاتوییت لە هەر چوار بوارەکەی ژیانتدا کە بریتین لە: جەستە و ئەقڵ و دڵ و رۆح. ئەم خووە نوێکردنەوەی سەر راستی کەسەکەو هەستکردنێتی بە ئاسایش (خووەکانی ١ و ٢ و ٣). هەروەها نوێکردنەوەی رۆح و رەوشتی تیمە کامڵەکەشە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە پرنسیپ و پارادیمی تایبەتی هەر حەوت خووەکە روون دەکاتەوە (بڕوانە خشتەی ژمارە ٣)

**ئەو پرنسیپ و پارادیمانەی کە حەوت خووەکە لە خۆیان دەگرن**

| خوو | پرنسیپ | پارادیم |
| --- | --- | --- |
| (١) دەستپێشخەر بە | بەرپرسیارێتی | چارەی خۆنوسین |
| (٢) کە دەستت پێکرد با ئامانجەکەت لەبیرت بێت | دید/ بنەماکان | دووجار خولقاندن/ فۆکەسکردن |
| (٣) گرنگتر بخەرە پێش گرنگەوە | سەرراستی/ جێبەجێکردن | ریزبەندیکردن/ کار |
| (٤) بیرکردنەوە بەشێوازی براوە - براوە (سودی هەموان) | سود و رێزگرتن لەیەکتری | بەرچاوتێریی |
| (٥) یەکەمجار هەوڵ بدە لە خەڵکی تێبگەیت ئینجا هەوڵ بدە تێت بگەن. | لەیەکتر حاڵیبوون | حسابکردن بۆ خەڵکی / نازایەتی |
| (٦) یەکتر تەواوکردن | هاوکاریی خولقێنەر | رێزگرتن لە جیاوازییەکان |
| (٧) مشارەکە تیژ بکەرەوە | نوێکردنەوە | مرۆڤی کامڵ |

خشتەی ٣

## ئەو پرنسیپانەی کە حەوت خووەکە لە خۆیانیان دەگرن

وەك پێشتر باسم کرد، وردبونەوە لەم پرنسیپانە سێ مەسەلەت بۆ رون دەکاتەوە:

یەکەم: پرنسیپەکان جیهانین، واتە کەلتورەکان تێدەپەڕێنن و لە هەمو ئاینێکی گەورەو لە هەمو فەلسەفەیەکدا هەن.

دووەم: پرنسیپەکان هەمیشەیین، واتە نەگۆڕن

سێیەم: پرنسیپەکان بەڵگەنەویستن. چۆن دەزانیت بابەتێك بەڵگەنەویستە؟ وەك پێشتر باسم کرد بەوەی هەوڵ بدەیت نکوڵی لێ بکەیت. بێگومان ناتوانیت. سەبارەت بەپرنسیپەکانی ناو حەوت خووەکە کەس ناتوانێت نکوڵی لە بایەخی بەرپرسیارێتیی یاخود لە بایەخی دەستپێشخەری بکات یاخود لەوەی مرۆڤ سەرڕاست بێت یاخود ئامانجێکی هەبێت یاخود رێزی یەکتری بگرن یاخود لە یەکتری تێبگەین یان خولقێنەرانە یارمەتی یەکتری بدەن یاخود بەردەوام خۆمان تازە بکەینەوە. حەوت خووەکە ئەو پرنسیپانەن کە پێناسەکەی تۆ دیاری دەکەن (تۆ کێیت و چیت؟). حەوت خووەکە متمانە و دەسەڵاتی رەوشتی و شارەزایی ئەوە بە مرۆڤ دەبەخشن کە کاریگەریی بەسەر دەزگاکەدا هەبێت جا ئیتر ئەو دەزگایە خێزان بێت یاخود کۆمەڵە خەڵکێك بێت یاخود هەموو کۆمەڵگا بێت.

حەوت خووەکە ناوەڕۆك و کاکڵەی پێشەنگیی باشە کە لە چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتیکردندا یەکەمین رۆڵی هەیە. چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتیکردن کە دەڵێت سەرکردە پێویستە چی بکات بۆ ئەوەی ببێتە ئیلهامبەخشی خەڵکەکە تا دەنگی تایبەتی خۆیان بدۆزنەوە. (بڕوانە شێوەی ٨-٤)

زۆر دەزگا دەستیان کردووە بە راهێنانی کارمەندەکانیان لەسەر حەوت خووەکەو زۆربەی ئەو راهێنراوانەش بۆیان دەرکەوتووە کە حەوت خووەکە زۆر یارمەتیدەرن لە کارەکانیاندا بە مەرجێك سیستم و بنیادی دەزگاکان پشتگیریان بکەن. بەڵام زۆر جار دەبینین کەلتورەکان نابنە پشتیوانی ئەو خووانە بە تایبەت ئەگەر کەلتورەکە متمانە تیایدا لاواز بێت و بنیاد و پێکهاتەکان لەگەڵ یەکتریدا هاوئاهەنگ نەبون. لەبەر ئەوە زۆر کەس وای بۆ دەچن کە حەوت خووەکە قابیلی جێبەجێکردن نین لە بواری کاردا (وەزیفەدا). ئەم نمونەی چوار رۆڵە پێکهاتەیەکی پشتیوان و گونجاو دروست دەکات لەگەڵ حەوت خووەکەداو بە جۆرێك پشتیوانیان لێ دەکات کە بتوانیت لەناو ماڵ و لە

شوێنی کاردا بەپێی خووەکان بژیت. ئەوی راستی بێت ئێمە بە کردەوە بۆمان ساغ بۆتەوە کە نمونەی ئەو چوار رۆڵە تاقە رێگەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە راستی بەپێی حەوت خووەکە بژی، نەك وەك راهێنانێکی فیکری، بەڵکو وەکو راهێنانێکی پراکتیکی.




شێوەی ٤-٨

مرۆڤ کەی ئەو حەوت خووە دەناسێت؟ کاتێك کە جێبەجێی کردن، واتە کە بەپێی ئەو حەوت خووە ژیا. زانینی ئەو حەوت خووە تەنیا لە مێشکی خۆتدا بێ ئەوەی جێبەجێیان بکەیت وەك ئەوە وایە نەیانزانیت رەوتی چوار رۆڵەکە رۆحێکی تازە دەکات بە بەری حەوت خووەکەدا و بایەخێکی ستراتیجی دەبەخشێت بە دەزگاکەو بەوچاوەوە تەماشا ناکرێت کە بەرنامەیەکی لاوەکییە بۆ راهێنان. کاریگەریی چوار رۆڵەکە ئەوەیە حەوت خووەکە کارا دەکەن و ئاراستەشیان دەکەن. بیرمە جارێکیان لە وڵاتی (میسر) راهێنانم بە کۆمەڵێك راهێنەری جێبەجێکار دەکرد لە هەردو کەرتی گشتی و تایبەتدا. وایان دەزانی من بۆ ئەوە چومەتە ئەوێ حەوت خووەکە بفرۆشم. بە راشکاوی پێم وتن، وا دەزانن من هاتوم حەوت خووەکە بفرۆشم؟ ئامۆژگاریم بۆ ئێوە ئەوەیە حەوت خووەکە مەکڕن؛ چونکە ئیتر وا دەزانن مەسەلەکە تەنیا بریتییە لە بەرنامەیەکی راهێنان بۆ ئەو خەڵکانەی لە ئاستی خوارتردان و هەرگیز بە شێوەیەکی

کاریگـەر شـێوازی سـەرکردایەتیکردنتان نـاگۆڕن و دەسـتناکەنەوە بـە سـەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو پێکهاتە و سیستم و ڕێوشوێنانەی کە پرنسیپەکانی حەوت خووەکە بەرجەستە دەکەن. ئێوە ئەگەر دەتانەوێت ببنە سەرکردەی جیهانی عەرەبی و بگەنە هاوشانی بـازاڕە ئابورییـە تازەکـەی جیهـان پێویسـتتان بـە رەوتێکـی گـەورەتر هەیـە پشتگیری لە حەوت خووەکە بکات. کـە ئـەوەتان کـرد ئـەنجامی واتـان چـنگ دەکەوێت سەرسام دەبن پێی. ئـەم قسانەم سـەرنجی راکێشان و لـە کاتی حەوانـەوەدا بـە مۆبایل قسەیان لەگەڵ ناشناو هاوڕێکانیاندا کردو ژمارەی بەشداران لە دانیشتنەکانی داهاتوودا چەند بەرابەری لێ هات.

## پارادیمی حەوت خووەکە

هەر خوویەك لەو حەوت خووە بە تەنیا هەر نوێنەرایەتی پرنسیپێك ناکات بـەڵکو نوێنەرایەتی پارادایمێکیشە، واتـە نوێنـەری شـێوازێکی بیرکردنەوەیـە (دووبـارە سـەرنج بدەرەوە لە خشتەی ژمارە ٢) کاتێك بـە قـوڵیی بیـر لـە یەکـەم و دووەم و سـێیەم خوو دەکەینەوە کە بەم رستەیە بەرجەستەکراوە: (بەڵێن بدەو جێبەجێی بکە) دەتوانین لە پارادایمی هەر خویەك لەو خووانە تێبگەین.

خووی ژمارە (١) (دەستپێشخەر بە): پارادایمی چارەی خۆنوسینە لەجیاتی فرێدانی بەرپرسـیارێتییەکە بۆسـەر کۆمـەڵگاو هۆکارەکـانی بۆمـاوەیی یـان هۆکـارە دەرونـی و ژینگەییەکان. (دەتوانم بەڵێن بدەم و بەڵێنەکەش ببەمەسەر).

خووی ژمارە (٢) (کە دەسـتت دایـە کارەکـە بـا ئامانجەکـە لـە مێشکتدا روون بێت): پـارادیمی هـەمو ئـەو شـتانەیە کـە دوو جـار دەخـولقێنرێن. جارێـك لـە مێشکماندا و جارێکی دیکە لەسەر زەمینی واقیع. ئەمە ناوەڕۆکی بەڵێنەکەیە و من بەو پێکهاتەیەی بەڵێنەکەی دادەنێم کە دەمـەوێت پابەنـدی بم و هیوادارم لـەو بەڵێنـەدا بـەدی بهێنم. ئەمە هێزی فۆکەسکردنە.

خووی ژمارە (٣): ئەمە پارادیمی ریزبەنـدیکردن و کـارو جێبەجێکردنـە (مـن بـای ئەوە هەست و توانا و هەستکردن بە لێپرسراوێتیم هەیە بتوانم ئەم بەڵێنە ببەمەسەر.

خووی (٤) و (٥) و (٦)- بەشێوازی براوە — براوە بیر بکـەرەوە و سـەرەتا هـەوڵ بـدە لـە خەڵکەکە تێبگـەیت ئینجا هـەوڵ بـدە تێت بگـەن و هاوکـاریی خولقێنـەر لەگەڵ

خەڵکیدا. ئەمانە پارادیمی بەرچاوترین لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا، بەرچاوترین لە ئاڵوگۆڕکردنی ڕێز و تێگەیشتنی یەکتری (هاوسەنگی لە نێوان ئازایەتی و حسابکردن بۆ خەڵکی) و جیاوازی بەهاکان، ئەمە دڵی تیمە کامڵەکەیە.

بەڵام خووی (٧) پارادیمی گەشەپێدانی بەردەوامی مرۆڤی کامڵەو بایەخ بە فێرکردن و فێربون و نوێکردنەوەی پابەندبون دەدات (ئەوەی ژاپۆنییەکان پێی دەڵێن کایزن Kaizen). لەبەر ئەوە دەبینیت شێوە بازنەییەکانی کە لەم کتێبەدا نمایش کراون، هەریەکەیان تیرێکی تێدایە کە بازنەکە تەواو ناکات بەڵکو شێوەیەکی لولەیی هەڵکشاو پێك دەهێنێت کە ئاماژەیە بۆ گەشەپێکردنێکی بەردەوام لە هەمو بوارێکی ئەو چوار هەڵبژاردەیەدا.

## کەرەسەی نمونەسازیی - سیستمی پلانی کەسێتی

لەبەر ئەوەی پێشەنگی باش یەکەمەو لەبەر ئەوەی لە هەرسێ ڕۆڵەکەی دیکەدا بە شێوەیەکی سەرەکی دەردەکەوێت، کەواتە یەکەمین ئەرکت ئەوەیە لە کارەکانتدا جەخت لەسەر تاقە یەك مەسەلە بکەیتەوە. پێویستە فۆکەس لە خۆتدا بخولقێنیت. پێویستە بڕیار بدەیت، چی بەلاتەوە گرنگترینە؟ تێڕوانینت بۆ ژیان چییە؟ گرنگترین بنەماکانت کامانەن؟ لەناو خێزانەکەی خۆتدا تۆ وەك باوك/ دایك، خوشك/ برا، ئەنك/ باپیر، کوڕ/ کچ/ پور، خاڵ .. چ ڕۆڵێکت هەیە؟ ئەو جۆرە خزمەتگوزارییە چییە کە دەتەوێت پێشکەشی کۆمەڵگاکەت، هاوسێکانت، مزگەوت و کەنیسەکەت یاخود پێشکەشی ئەوانەی بکەیت کە پێویستیان پێیەتی؟ تەندروستی بەلاتەوە چ بایەخێکی هەیە؟ چۆن تەندروستی خۆت دەپارێزیت و باشی دەکەیت؟ هەندێك دەڵێن سامانی ڕاستەقینە بریتییە لە تەندروستی و بەبێ تەندروستی هیچ سامانێکی دیکە سودی نییە، ئەی دەربارەی ئەقڵ و نەشونماکردن و گەشەکردنت دەڵێیت چی؟ چ بایەخێکیان هەیە لەلات؟ ئەی کارەکەت؟ بەهرە ڕاستەقینەکانت کامانەن؟ ئەو مەسەلانە چین کە دەتخەنە جۆش‌وخرۆش؟ لە بازاڕدا و لە دەزگاکەی تۆدا مەسەلە هەرە گرنگ و هەستیارەکان چین، ئەو پرۆژەو دەستپێشخەرییانە چین کە ویژدانت ئیلهامت پێ دەبەخشێت جێبەجێیان بکەیت؟ لە بواری کارەکەتدا چ گۆڕانکارییەکی ڕاستەقینە دروست دەکەیت؟ لە دوای خۆت چ شوێنەدەستێك بەجێ دەهێڵیت؟

ئامرازی فۆکەسکردن لە رۆڵی یەکەمدا بریتییە لە سیستمی پلاندانی کەسێتی (تایبەت). دەست بکە بە نوسینی ئەو مەسەلانە کە لەوانی دیکە زیاتر بەلاتەوە گرنگن (دەکرێت نوسینەکە لەسەر کاغەزبێت و دەشکرێت لەسەر کۆمپیتەرەکەت بێت) پاشان لە سیستمێکی پلاندانانی تایبەت بە خۆتدا مەسەلەکان ریزبەندی بکە بە شێوەیەکی وا هاوسەنگییەکی کارای تێدا بێت لە نێوان ئەوەی چەند پێویستە خاوەنی دیسپلین و رێ‌و شوێنی دیاریکراو بیت و چەندیش پێویستە خودی خۆت بیت بێ رتوش و تەمسیلکردن. کورت و کرمانجی فۆکەس و جێبەجێکردن.

نوسین بەهێزترە لە هێنانە پێشچاو. نوسین ئەقڵی هوشیار دەبەستێت بە ئەقڵی نەستەوە (لاشعور).. نوسین چالاکییەکی دەورنی- دەماریی- ماسولکەییە و شوێن دەستی بەسەر مێشکەوە جێ دەهێڵێت. بۆ تاقیکردنەوەی ئەم راستییە ئەمشەو پێش ئەوەی بچیتە ناو جێگاوە سێ (شت) بنوسە لەو شتانە کە دەتەوێت سبەینێ بەیانی ئەنجامیان بدەیت یاخود بیریان لێ بکەیتەوەو بروانە بزانە چی روودەدات. لە زۆربەی هەرە زۆری حاڵەتەکاندا یەکسەر کە خەبەرت بۆوە مەسەلەکانت بیردەکەونەوە.

| |
|---|
| یەک لەسەر سێی ئەوانەی تاقیکردنەوەی زیرەکیی جێبەجێکارییان XQ بەسەردا جێبەجێ کراوە دەڵێن سیستمی پلاندانانی کەسێتییان هەیە |

بۆ پاراستن و پێشخستنی سیستمی نەخشەکێشانی کەسێتی چەندین رێگە لە ئارادان. مەسەلە بنەڕەتییەکە ئەوەیە پێویستە رێگاکە یارمەتی کەسەکە بدات جەخت بخاتەسەر گرنگترین ریزبەندییەکانی. هەندێک کەس، وەکو من، پێی وایە ئەم جۆرە پێکهاتەیە ئازادی پێدەبەخشێت، بەڵام خەڵکی دیکەش بە کۆت‌و پێوەندی دەزانن. ئامرازی رێکخستن و پلاندانانی بەهێز پێویستە سێ پێوەر جێبەجێ بکات؛ پێویستە هاوئاهەنگ بێت لەگەڵ شێوازی ژیانتداو گەرۆک بێت (هەمیشە لەگەڵ خۆتدا بێت) و تایبەتیش بێت بە خۆت بە جۆرێک کە بە تەواوی لەگەڵ پێویستییەکانتدا بگونجێت.

ئەمە رێگایەکی ئاسانە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوەی تا چەند ئەو مەسەلانەی فۆکەست خستۆتە سەریان گونجاون لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا کە بۆ تۆ گرنگترینن. بروانە هەرەمەکەی خوارەوە




شێوەی ٨-٥

لە بنی بنەوە پێویستە سەرەتا مرۆڤ بەهاکان و پەیامی خۆی لە ژیاندا دیاری بکات، واتە ئەو پێوەر و بیرۆکانەی کە جڵەوی ژیان دەگرنە دەست. (ئەلفیس بریسلی) دەڵێت: "بەهاکان وەکو مۆری پەنجە وان. هیچیان لەوی تر ناچێت، بەڵام کاریگەری بەجێ دەهێڵن لەسەر ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدەین".

وەك پێشتر باسمان کرد پێویستە ئەم بەهایانە پابەند بن بە پرنسیپەکانەوە بە جۆرێکی وا کە ژیانت کرۆکێکی نەگۆڕو سەرچاوەیەکی ناوخۆیی تێدا بێت بۆ هێزو حیکمەت و ئاسایش و ڕێنمایکردن. ڕەنگە لێرەدا کلیلەکە بریتیی بێت لە نوسینەوەی پەیامی تایبەتی خۆت لەم ژیانەدا. ئەو مەسەلانەی تێدا دیاری بکەیت کە بەلاتەوە گرنگترینن. ئەمە تێڕوانین و بەهاکانیشت دەگرێتەوە. مرۆڤ کە ئەم پەیامەی ژیانی هەمیشە لەبەر چاو بێت دەتوانێت بە ئاسانی مەسەلەکانی ژیانی ڕیزبەندی بکات.

رۆژێکیان ژنێك هاته لام و پێی وتم: "من مردنی باوکی خۆمم بینی. زۆر لێوەی نزیك بوم و روداوەکە زۆر کاری کردەسەر هەستم. بیرمە تۆ لە کتێبی حەوت خووەکەداو لە پەیڕەوکردنی دووەمین خوودا نوسیوتە باشترین رێگە بۆ پەیڕەوکردنی ئەو خووە ئەوەیە چوار برگەی لاواندنەوەی وا بنوسیت حەز بکەیت لە کاتی بە خاك سپاردنتدا بخوێنرێتەوە. یەکێکیان لە کەسێکەوە کە خۆشی دەوێیت، یەکێك لە هاورێیەکەوە، یەکێك لە هاوکارێکەوە، یەکێك لە کەسێکەوە کە کاتی خۆی لەرێی کۆمەڵگاوە یاخود لە رێی کەنیسە (مزگەوت)ەوە چاکەیەکت لەگەڵدا کردوە. من کە باوکم بینی ئەم دنیایە جێدەهێڵێت بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا بە راستی بیرم لەوە کردەوە پەیامێکی تایبەت بە خۆم بنوسم لەم ژیانەدا کە زۆر بە قوڵیی ئەو مەسەلانە روون بکەمەوە بۆ من گرنگترینن. ئێمە بۆ یارمەتیدانی تۆ لە نوسینی نامەی ژیانتدا هەندێك پرسیارمان دەستکاری کردوە کە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵتا دێن.

پاشان گرنگ ئەوەیە گرنگترین رۆڵی خۆت لەم ژیانەدا دیاری بکەیت (لە خێزان و کۆمەڵگە و مزگەوت (کەنیسە) و وەکو هاورێ و باوك و دایك و سەرکردەی تیم، پاشان کۆمەڵێك ئامانج دابنێ بۆ هەفتەی داهاتو کە بگونجێت لەگەڵ ئەو رۆڵ و بەهایانەدا کە دەستنیشانت کردون. ئامرازی نەخشەکێشانی کەسێتی یارمەتی مرۆڤ دەدات بۆ دانانی ئامانجی وا کە قابیلی جێبەجێ کردن بن و تۆ بەرپرسیاریان بیت و بە جۆرێکی واش بن بتوانرێت بکرێن بە ئامانجی بچوك بچوك. ئاستی پابەندبونی مرۆڤ بەم ئامانجانەوە راستەوخۆ پەیوەندی هەیە بەوەی کە تا چەند ئەو ئامانجانە لەگەڵ بەهاکانی ئەم کەسەدا دەگونجێن. هەر کەسێك بە روونی لە بەهاکانی خۆی و لە رۆڵی خۆی تێگەیشت دەتوانێت هاوسەنگی بەدی بهێنێت لە ژیانیدا.

ئاستی سێیەمی هەرەمەکە بریتییە لە نەخشە دانانی هەفتانە. لە ماوەی نەخشە دانانەکەدا مرۆڤ بواری بیرکردنەوەی دەبێت لە رۆڵی خۆی و (دانانی بەردە گەورەکان) هەڵبژاردنی ئامانجە گەورەکان و پلاندانان بۆ ریزبەندیکردنیان. ئەمانە هەمو لەکاتی دانانی نەخشەی کارەکانی هەفتەی داهاتودا. پلاندانانی هەفتانە رێنمایت دەکات بۆ پلاندانانی رۆژانە بە جۆرێك کە ئەرکە گرنگەکان بەپێی بایەخیان ریزبکەیت و هەریەکەشیان کاتی خۆی بۆ دیاری بکەیت لە رۆژەکەدا. من لە کتێبی (یەکەمجار مەسەلە گرنگەکان)دا کە لەگەڵ (ریبیکا و رۆجەر میریل Rebecca and Roger Merrill)دا

نوسیومە زۆر بە قوڵی باسی ئەو مەسەلانەم کردوە کە پەیوەستن بە پەیامی ژیان و سیستەمەکانی نەخشەدانان بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت زیاتر لەم بارەیەوە بزانن.

ئەو کەسەی کە تەنیا پلانی رۆژانە دادەنێت — لە دەرەوەی چوارچێوە گەورەکەی کە پێکهاتووە لە بەهاو ئامانجە گەورەکانی و لە دەرەوەی نەخشەی هەفتانەدان - هەمو کاتی خۆی لە چارەسەرکردنی قەیرانەکان و کوژاندنەوەی ئاگرەکاندا خەسار دەکات. وای لێ دێت تەنیا کارە هەنوکەییەکانی بەلاوە گرنگ دەبێت و دواجار پەشیمانی بۆ دەمێنێتەوە، ژیانە پڕ دڵەڕاوکێکەی خۆی لە مەسەلە رواڵەتییەکاندا بەسەر دەبات.

## فیلم: بەردە گەورەکان

کتێبی (یەکەمەکان یەکەم جار) لێکچواندنێکی نایابی تێدایە دەربارەی بەدیهێنانی هاوسەنگی لە ژیانداو بە ئەنجامگەیاندنی ئەو بابەتانەی کە لەوانی دی گرنگترن بەلاتەوە. ئێمە وێنەی راستەقینەی ئەو لێکچواندنەمان بە ڤیدیۆ تۆمار کردووە کە لە یەکێك لە وۆرکشۆپەکانمدا نمایشم کردبو. ناونیشانی فیلمەکە بریتییە لە (بەردە گەورەکان) و بە شێوازی تایبەتی خۆی چۆنێتی بەکارهێنانی ئەو سێ دیارییە نیشان دەدات کە لەگەڵماندا لەدایك بون و پێکهاتون لە هەڵبژاردن (بڕیار)، پرنسیپەکان، چوار زیرەکییەکەی مرۆڤ —مەبەست لەم نمایشە سێ بەکارهێنانی سێ دیارییەکەیە بۆ بەدیهێنانی گۆڕانێکی ئەرێنی لە ژیانماندا. ئێستا دەتوانیت فیلمەکە ببینیت کە لەسەر سی دی پەیوەست بەم کتێبەوە تۆمار کراوە.

ئەم تاقیکردنەوەیە گەلێك وانەی تێدایە کە دەتوانرێت سودیان لێ وەربگیرێت؛ وانە هەرە گرنگەکە زۆر سادەیە، یەکەمجار بەردە گەورەکان دابنێ. تۆ ئەگەر یەکەمجار ژیانت پڕ بکەیت لە شتە بچوکەکان و ئینجا روبەروی قەیرانێك بویتەوە لەگەڵ یەکێك لە منداڵەکانتدا یاخود توشی کێشەیەکی دارایی یان تەندروستی بویتەوە یاخود هەلێکی نایاب و تازەت بۆ هەڵکەوت، ئەوکاتە چی دەکەیت؟ ئەمانە ئەو بەردە گەورانەن کە لە ژیانتدا شوێنێکت بۆ تەرخان نەکردون.

هەمیشە ئاوا بیر بکەرەوە: یەکەمجار بەردە گەورەکان. مەسەلە هەرە گرنگەکانی ژیانت دیاری بکە ئینجا بەپێی پێوەرە هەرە گرنگەکان بڕیار بدە. بە سادەیی بیزانە بەردە گەورەکان مەسەلە هەرە گرنگەکانی ژیانتن. گرنگ ئەوەیە مەسەلە بنەرەتییەکان

بە بنەرەتیی بمێننەوە. سێ دیاریە بەنرخەکەی ناخت توانای بڕیاری راست و دروستت دەدەنێ لەم رووەوە و هەروەها بەراستییش دەتوانن ببنە هێزە خولقێنەرەکەی ژیانت. ئەگەر بە (بەڵێ)یەکی پرشنگدار وەڵامی مەسەلە هەرە گرنگەکانی ژیانت بدەیتەوە، زۆر بە ئاسانی دەتوانیت بە مەسەلە هەنوکەییە ناگرنگەکان بڵێی (نا). وتنێکی پڕ لە خەندەو دڵخۆشیی و بێ هیچ هەستکردنێك بەوەی گوناهێکت کردووە.

## پرسیار و وەڵام:

پرسیار: کارێکی لۆجیکییە مرۆڤ خەڵکی ئەمین و متمانە پێکراوی لە رێکخراوەکەیدا هەبێت، بەڵام چی بکەیت لەگەڵ ئەو کڕیارانەی کە هەڵسوکەوتی خراپ دەنوێنن بەرامبەر ئەو جۆرە کارمەندانە.

وەڵام: کڕیارەکان دەربکە. من کۆمپانیایەکی زۆر بەناوبانگ دەناسم کە ئەگەر بزانێت کڕیارەکان بە بەردەوامی رەفتاری خراپ لەگەڵ کارمەندەکانیدا دەکەن، نامەیان بۆ دەنوسێت دەڵێت پێویستمان بە مامەڵەکردن نییە لەگەڵتاندا.

بەڵام چارەسەرێکی باشتر و شارستانیتر هەیە. ئەویش گەڕانە بەدوای رێگە چارەی سێیەمدا. رێگە چارەیەکی وا کە بە پەیوەندی باش دروست ببێت. هەمیشەش ئەم ئامۆژگاریەت لەبیر بێت: پێویستە سەرەتا گوێ لە خەڵکەکە بگریت.

# بەشی نۆیەم

## دەنگ و خێرایی متمانە

"پێگەی متمانەپێکردن لەپێگەی خۆشەویستی بەرزترە."

- جۆرج ماکدۆناڵد

کاتێك کە هەوڵی فراوانکردنی بازنەی کاریگەریتمان دەدەین و دەمانەوێ ئیلهامیان پێ ببەخشین دەنگی خۆیان بدۆزنەوە مانای وایە ئێمە دەچینە ناو دنیای پەیوەندییەکانەوە. [بیرت نەچێ وشەی ئیلهامبەخشین Inspire لە زمانی لاتینیدا مانای وایە ژیانی نوێ فو بکەینە خەڵکییەوە]. دروستکردنی پەیوەندیی بەهێز تەنیا هەر بە بەرچاوتێری و دەسەڵاتی تایبەتی رەوشت و بونی کەسایەتییەکی ئاسودە و ئارام لە ناخی خۆیدا مەیسەر نابێت کە لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کردن، بەڵکو پێویستیشی بە فراوانکردنی بازنەی دەورو تەئسیرمانە لەڕێگای هێنان و بەرەودان بە شێوازی تازەی پەیوەندیکردن بە خەڵکییەوە کە وامان لێ بکەن بتوانین روبەروی هەر کێشەو تەحەدایەك ببینەوە کە لە پەیوەندیەکانماندا لەگەڵیاندا دێنە رێمان.

دوو وەرزی داهاتوی کتێبەکە دەربارەی نمونەسازیی بریتین لە تیشکخستنەسەر جۆنێتی گەشەدان بەو شارەزاییانە.




شێوە ٩–١

زوربەی هەرە زۆری ئەو هەمو کارو چالاکییانە کە لە جیهانـدا ڕودەدەن لە ڕێی پەیوەندییەوە ڕوو دەدەن. پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی دیکەو لەناو دەزگاکاندا. بەڵام ئایا ئەو پەیوەندیە چۆن بەردەوام دەبێت ئەگەر متمانـە نـەبێت؟ ئـەوە کارێکی مەحاڵە؟ وەك ئەوە وایە بە کێڵگەیەکی مینرێژکراودا بڕۆیت. بـەڵام ئـەی ئەگـەر پەیوەندییەکە ڕوون و ورد و ئاشکرا بێت، بـەڵام متمانـە لـە گۆڕێـدا نـەبێت؟ ئەوکاتـە ئیتر هەمیشە سەرگەرمی گەڕان دەبیت بەدوای واتا شاردراوەکان و ئەجێندا شاردراوەکاندا. لـە هەمو شتێك گومان دەکەیت و هەست دەکەیت مەبەستێکی شاردراوەی تێدایە. نەبونی متمانە وردترین پێناسەیە بۆ پەیوەنـدی خـراپ. هـەروەها وەك (سـتیفن)ی کـوڕم دەڵێت: بێ متمانەیی گـەورەترین بـاجی شاردراوەیە "لـە ڕاسـتیدا ئـەم باجە شاردراوەیە لە گۆی هەمو باجە شاردراوە و ئاشکراکان گەورەترە.

## خێرایی متمانە

پەیوەندیی نێوان ئەو کەسانە چۆنە کە متمانەی زۆریان بە یەکتری هەیە؟ ئاسان و خۆڕسکەو هیچ خۆماندوکردنێکی ناوێت. لە حاڵەتی وادا ئەگەر هەڵەش روبدات زۆر گرنگ نییە. بەرامبەرەکەت دەتناسێت "گوێ مەدەرێ، ناهەقت ناگرم" (بیری لێ مەکەرەوە تکایە) "دەزانم مەبەستت چییە؟". دیارە هیچ تەکنیکێك لەسەر ئەم گۆی زەوییە شتی وای پێ ناگرێت. رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێت دڵ گرنگترە لە مێشك. ئەگەر مێشکیش مردبێت، بەڵام دڵی لێ بدات بە زیندو حساب دەکرێت. بەڵام کە دڵ لە لێدان کەوت کەسەکە بە مردو دادەنرێت.

(ستیفن)ی کوڕم دەڵێت هیچ شتێك لە متمانە خێراتر نییە. لە هەمو شتێك خێراترە، چونکە ئەگەر متمانە هەبێت هەڵەکان بیردەچنەوەو چاوپۆشییان لێ دەکرێت. متمانە کەتیرە (چەسپ، سرێش)ی ژیانە. کەتیرەیەکە دەزگاکان و کەلتورەکان و پەیوەندییەکان پێکەوە دەبەستێت. سەیرەکەشی لەوەدایە کە خێرایی متمانە لە هێواشییەکەیدایە. لە پەیوەندییە مرۆییەکاندا (خێرا) هێواشە و هێواشیش خێرایە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر سەردانی هاوڕێیەکم کرد کە تازە پرۆژەی کارێکی گەورەی تەواو کردبو. من بە چاکی ئاگاداری کارەکەی بوم و پیرۆزبایی تەواوکردنی ئەو پرۆژەیەم لێ کرد کە کاریگەرییەکی باش دروست دەکات لەسەر ژیانی هەزاران کەس. لێم پرسی وتم ئەم پرۆژەیە چی فێرکردویت؟ وتی: "من دڵنیام ئەم پرۆژەیەی کە دوو ساڵی تەمەنی خۆمم بۆ تەرخان کرد مەزنترین بەشدارییە تا ئێستا پێشکەشم کردبێت." پاشان چەند چرکەیەك بێدەنگ بو. دواتر بەدەم زەردەخەنەیەکەوە زۆر بە جدی درێژەی بە قسەکانی دا: بەڵام ئەو وانە راستەقینەیەی کە لێوەی فێربوم ئەوەیە کە بەبێ پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ هاوسەرەکەمدا ئەم پرۆژەیە هیچ بایەخێکی نەدەبو بۆم.

وتم: "بەراست؟". هاوڕێکەم کە زانی قسەکانیم لەلا گرنگە دڵی خۆی بۆ کردمەوەو ئەم ئەزمونەی خوارەوەی لەلا درکاندم:

"کە داوام لێ کرا ئەم پرۆژەیە سەرپەرشتی بکەم زۆرم پێخۆش بو. ژنەکەم و منداڵەکانم پشتگیرییان دەکردم لەبەر ئەوە منیش بە تەواویی خۆمم بۆ تەرخان کرد: هەستم بە لێپرسراوێتییەکی گەورە دەکردو پرۆژەکە بۆ من ئامانجێکی مەزن بو. هانی

دەدام و وزەی پێ دەبەخشیم. هەستکردنم بە بایەخی پرۆژەکە وای لێ کردم بە تەواوی بچمە ناوییەوە. وام دەزانی ئەگەر لە وەرزش و ئاهەنگەکاندا لەگەڵ منداڵەکاندا بم کارێکی باشەو دوورناکەومەوە لێیان. هەمو نانی ئێوارەیەکم لەگەڵ خێزانەکەمدا دەخوارد و وام دەزانی ئیش‌وکارەکان زۆر نایاب بەڕێوەبەدەبەم. لە شەش مانگی کۆتاییدا کارەکە گەیشتە ئەوپەڕی زەحمەتی و رێک لەو ماوەیەدابو هەستم کرد هاوسەرەکەم چەندە نائومێدە لێم و لەسەر سادەترین مەسەلە بێزاریی دەنوێنێت. ئەمەش زیاتر رقی هەستانم کە لێم تێ ناگات و لە کارەکەمدا پشتیوانیم ناکات، بە تایبەت لەو قۆناغە ناسکەدا وامان لێ هاتبو لەسەر سادەترین بابەتیش نەتوانین رێک بکەوین. کە پرۆژەکە تەواو بوو، ویستی ئامادەی قاوەڵتی ئاهەنگێڕانەکە نەبێت، کە ئامادەش بو هیچ چێژێکی لێ نەبینی. ئەوکاتە ئیتر هەستم کرد من و ئەو بەراستی پێویستە دڵی خۆمان بۆ یەکتری بکەینەوە. بەمەش دەرگای زریانێکی گەورە کرایەوە.

بۆی باس کردم کە ئەو ماوەیە زۆر هەستی بە تەنیایی کردووە و تەنانەت کە لە ماڵیشەوە بوبم هەستی کردووە لە شوێنێکی دیکەم. ئەو ماوەیە کەمتر رێک دەکەوت حەفتانەش یەکدی ببینین و لەبەر ئەوەی من هەمیشە دوای گەڕانەوەی ئەو لەسەر ئیش دەگەیشتمە ماڵەوە، بواری قسەکردن و ئاڵوگۆڕی بیروڕاشمان نەمابو کە جاران لەسەری راهاتبوین. ئەمانە هەموویان وایان لە ژنەکەم کرد زیاتر هەست بە گۆشەگیری و دابڕان و رێزنەگرتن بکات. سەبارەت بە هیچ بابەتێک پەیوەندیم پێوە نەدەکرد. مێشکم تەنیا هەر لای کارەکەم بو. لەو باوەڕەدا بوم کە پێویستە هەمو هەست‌و هۆشم لەسەر پرۆژەکە بێت. بیری خستمەوە کە تەنانەت یادی رۆژی لەدایکبونەکەیشییم بیربچێتەوە و درەنگانێکی ئەو رۆژە بیرم کەوتەوە. هەرچەندە پێشتریش خۆی بیری خستبومەوە، درەنگانێکی ئەو رۆژە بیرم کەوتەوە. بیرچونەوەکە خۆی لە خۆیدا زۆر خراپ نەبو، بەڵکو ئەوەی ناخۆش بو کە فەرامۆشکردنەکە نیشانەی دۆخێک بو ساڵێکی تەواوی خایاند.

کە لێم پرسی بۆچی زوتر ئەم مەسەلەیەی لەلا نەدرکاندوم، وتی نەمدەویست بێزارت بکەم و وات لێ بێت نەتپەرژێتە سەر پرۆژەکەت. چاوم بڕییە چاوی و ئازارێکی گەورە و هەستێکی قوڵی تەنیاییم تێدا بینی. ئەم راشکاوییە باری شانی سوک کردم و سەرسام و شەرمەزار بوم لەو غەفڵەت و بێ ئاگاییەی کە تێی کەوتبوم. ئەو کە باسی بۆ کردم چەند هەستی بە تەنیایی کردووە، پارمەتی منیشی دا لە واتاکانی ئەو بۆشاییە

گەورەیە تێبگەم کە ماوەیەکی زۆر کەوتبومە ناوی. هەردوکمان تاقەتی جارانمان نەمابو، هەم لەگەڵ خودی خۆماندا و هەم لەگەڵ یەکتریشدا. داوای لێبوردنم لێ کردو جەختم بۆ کردەوە کە لەسەر ئەم گۆی زەوییە هیچ کەسێک و هیچ شتێک هێندەی ئەو بۆ من بەرێز و بایەخدار نیە. بەڵام هەر تەنیا قسە بەس نەبو. زانیم کە ماوەیەکی زۆر زۆر، کۆمەڵێک شتی دیکە هەبون پەیامی دیکەیان داوەتێ. عوزرهێنانەوەکەم و پابەندبونم بە رێکخستنەوەی ریزبەندیی شتەکانم یارمەتییان دام، بەڵام مەسەلەکان لە شەو و رۆژێکدا چاک نەبونەوە، بەڵکو چەندین رۆژ و هەفتە و مانگی خایاند تا بە هەوڵی بەردەوام و گفتوگۆو نزیکبونەوەو بەشداریکردن و بەڵێن بردنەسەر توانیم پەیوەندیەکانمان بگەڕێنمەوە بۆ ئاستەکەی جارانی و بگرە باشتریش. من لەم کارەمدا جگە لە داوای لێبوردنکردن و بردنە سەری بەڵێنەکانم هەمو رۆژێکیش چەند سەعاتێک وازم لە کارەکەم دەهێناو تەرخانم دەکرد بۆ خێزانەکەم بەمەش متمانەکەمان گەڕایەوە ئاستی جارانی."

لەدوای ئەو سەردانەمەوە هاورێکەم دوو پرۆژەی دیکەی تەواو کردووە کە هێندەی پرۆژەکەی یەکەمجار گرنگن و هەریەکەشیان چەند ساڵێکی خایاندووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکەی لەگەڵ ژنەکەیدا رۆژ لەدوای رۆژ بەهێزتر بووە. ئەزمونە بە ئازارەکەی یەکەمجار و تێگەیشتنی زیاتر لە ژنەکەی و دڵسۆزبونی بۆی گۆڕانێکی بەردەوامی دروست کرد لە پەیوەندی نێوانیاندا. ئەو خۆی دواتر باسی ئەو بیرۆکە ئازانەی بۆ کردم کە بە ئەزمون فێریان بووبو:

وانە راستەقینەکەی کە تێی گەیشتم مرۆڤ ئەگەر دڵسۆزی هاوسەرگیرییەکەی بێت و هاوسەرەکەی خۆش بوێت و هەردولاش دڵسۆز و پابەندی یەکتربن و ئەرکی پەروەردەکردنی منداڵەکانیش بگرنە ئەستۆ بەڵام هەر ئەگەری ئەوە هەیە پەیوەندی و متمانەکەی نێوانیان تێک بچێت. بۆ ئازاردانی کەسێک پێویست ناکات قسەی زبری پێ بڵێیت، یاخود بەرێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەکەیت. کەسەکە کەسێکی نزیکت بێت و بتەوێت ئازاری بدەیت هەر هێندە بەسە بایەخ بە ئەقڵ و دڵ و رۆحی نەدەیت و پشتگوێیان بخەیت. متمانەو پەیوەندییەکان نەگۆڕنین، لەبەر ئەوە پێویستە بەردەوام بیانپارێزیت و برەویان پێ بدەیت و قوڵیان بکەیتەوە. بەچی؟ بەوەی لەگەڵ بەرامبەرەکەتدا نەرمونیان بیت و خزمەتیی بکەیت و رێزی بگریت و حسابیی بۆ بکەیت. من بە ئەزمون تێگەیشتوم کە سەرکەوتنی هاوسەرگیریەکەمان و کامەرانیی

تایبەتی خۆم زۆر پەیوەندییان بەوەوە نییە کە ژنەکەم لە پێناوی مندا چی دەکات بەڵکو زیاتر پەیوەندییان بەوەوە هەیە کە من ڕۆژانە چی دەکەم لە پێناوی بەختەوەری ئەودا و هاوکاریکردنی لە هەڵگرتنی ئەرکە زەحمەتەکانداو لەو بابەتانەدا کە بۆ هەمو لایەکمان گرنگن. من فێر بوم کە یەکێک لە سەرچاوەکانی هێز لە ژیانی خۆمدا ئەوەیە لەگەڵ ژنەکەمدا یەکبگرم، نەک تەنیا لەو کارە هاوبەشەی کە هەردوکمان لەناو خێزان و لە کۆمەڵگادا ئەنجامی دەدەین بەڵکو لە هەمو بوارێک لە بوارەکانی ژیانی خۆمدا، تەنانەت لە ژیانی پیشەییشم دا. ئەم یەکێتی‌یە وام لێ دەکات هەست بە هێزو ئارامی و چێژ بکەم و وام لێ دەکات خۆم سەر بە لایەنێک بزانم کە توانای کارکردن و داهێنان و ئارەزوی بەشدارکردنم پتەوتر دەکەن.

دواجاریش تێگەیشتم کە پەیوەندی بەهێز پێویستی بە هەوڵ و قوربانیدانی ڕاستەقینە هەیەو دەبێت گەشەکردن و بەختەوەری و سەلامەتیی کەسی بەرامبەر بخەینە پێش بەختەوەری و گەشەکردن و سەلامەتی خۆتەوە. مەسەلەکەش هێندە گرنگە کە ئەو قوربانیدان و هەوڵ و تەقەلایە دەهێنێت، چونکە دەروازەی بەختەوەرییە. مرۆڤ ئەگەر هێزێکی وای نەبێت ئەو پەیوەندییانە بە ئاراستەیەکی لەمجۆرەدا ببات ناگاتە بەختەوەری.

## دەسەڵاتی ئەخلاقی و خێرایی متمانە

ئەزمونی هاوڕێکەم نمونەیەکی ئاشکرایە کە ئەوەی پەیوەندییەکان بەڕێوە دەبات یاسا سروشتییەکانە. واتە پەیوەندییەکان پابەندی یاسا سروشتییەکانن. لە پرۆسەی بنیادنانی متمانەیەکی هەمیشەییدا لە پەیوەندییە کەسییەکاندا ساختەکاری ناکرێت. زۆر بەدەگمەنیش ڕێک دەکەوێت متمانە بە یەکجار و لە هەوڵێکی درامیدا دروست ببێت. متمانە بەرهەمی هەوڵێکی ڕێکخراوی هەڵقوڵاوی دڵ و ویژدانە. من لە کتێبی (حەوت خووەکەی کەسانی هەرە کاریگەر)دا متمانەم شوبهاندووە بە ژمارە حسابی بانقی سۆزداریی.

متمانە ڕێک لەو ژمارە حسابە بانقییە دەچێت کە دەیخەینە سەری و لێی رادەکێشین، جیاوازییەکەش هەر هێندەیە کە تۆ لە پەیوەندییەکانتدا لەگەڵ خەڵک لەجیاتی پارە برێک سۆز بەکاردەهێنێت، ئیتر یان لێی رادەکشێیت یاخود دەیخەیتە سەری و دەرئەنجامەکەش دوو جۆرە، یان پەیوەندییەکە پتەوتر دەکات یاخود لاوازی دەکات. ڕەنگە شوبهاندنەکە زۆر ورد نەبێت بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ڕێگەیەکی بەهێز و

ئاسانە بۆ گوزارشتکردن لە چۆنێتی پەیوەندییەکە. هێلکارییەکەی خوارەوە (دە) جۆر سپاردن و راکێشانی بنەرەتی روون دەکاتەوە، کە دەتوانین لە پەیوەندیماندا لەگەڵ خەڵکیدا تاقییان بکەینەوە و من خۆم بە ئەزموونی خۆم، باوەڕم وایە کە کاریگەریی گەورەیان دەبێت لەسەر ئاستی متمانەکردن لەو پەیوەندییانەدا. هەروەها وێنەکە ئەو پرنسیپ و قوربانیدانە پێویستانەش روون دەکاتەوە کە لە هەر پاشەکەوتکردنێکدا هەن. (خشتەی چوار)

| دەسەڵاتی ردوشتی و خێرایی متمانە | | | |
|---|---|---|---|
| پاشەکەوتەکان | راکێشانەکان | قوربانیدانی پێویست | پرنسیپەکەی |
| یەکەمجار تۆ لە بەرامبەرەکەت تێبگە | داوای لێ بکەیت یەکەمجار (ئەو) لە (تۆ) تێبگات | کەم چێکڵدانەیی، خود، بەرنامەکانی تایبەت بە خۆت | لە یەکتر تێگەیشتن |
| بەڵێنبردنەسەر | پەیمانشکێنی | تاقەت، هەست، سۆز، کات | سەرڕاستی، بەئەنجامگەیاندن |
| راستگۆیی، راشکاویی | گەمەی نهێنی | خود، فیز، کۆنترۆڵ | دید/ بەهاکان، سەرڕاستی\| بەئەنجامگەیاندن، لەیەکتر تێگەیشتن |
| چاکە، روخۆشی | بێبەزەیی، زەبرو زەنگ | خود، کات، لێ تێگەیشتنەکان، ڕێتە ئەقلییەکان، خۆ خوارندنەوە | دید/ بەهاکان. سەر راستی/ جێبەجێکردن |
| شێوازی بیرکردنەوەی براوە – براوە یاخود رێکەوتنەکە نەکەیت | شێوازی بیرکردنەوەی براوە – دۆڕاو یاخود بەپێچەوانەوە | بردنەوە واتا دۆڕانی ئەوی دیکە، رکابەری | رێز و سودی یەکتری |
| روونکردنەوەی پێشبینیەکان | دژایەتیکردنی پێشبینیەکان | بەردەوامبوون لەسەر ریاکاریی | رێز و سودی یەکتر، تێگەیشتن لە یەکتری، یارمەتی خولقێنەر، نوێبوونەوە |
| پابەندبون بەوەی لێرە نییە | دووڕوویی، نەبونی پابەندبوون (بێ‌موبالاتی) | ملدان بۆ هەندێك بابەتی کۆمەڵایەتی، ختوکەدانی سۆزەکان | دید\| بەهاکان سەر راستی\| جێبەجێکردن |
| داوای لێبوردنکردن | شانازی، غەڕا بون، خۆبەزل زانین | خود، خۆبەزلزانین، شانازی، کات | دید\| بەهاکان سەر راستی\| جێبەجێکردن |
| قبوڵکردنی فیدباکەکان | قبوڵکردنی فیدباکەکان | خود، خۆبەزلزانین، | لێکحاڵیبوون |

| | | | |
|---|---|---|---|
| و ناردنی پەیامەکانی (من) | و ناردنی پەیامەکانی (تۆ) | شانازی، پەیوەندییە کاردانەوەییەکان | |
| لێبوردەیی | ڕق هەڵگرتن | شانازی، خۆکردن بە سەنتەر | دید\| بەهاکان سەر ڕاستی\| ڕەوشت |

گرنگە بزانین کە ئەوەی وای کردووە ئەم (دە) پاشەکەوتکردنە متمانە بنیاد بنێن ئەوەیە کە پرنسیپە بنەڕەتیەکانی پەیوەندییە مرۆییەکان لەخۆ دەگرن. ئایا بەڕای تۆ کۆڵکەی هاوبەشی ناو ئەم (دە) پاشەکەوتە چییە؟ من پێم وایە هەمویان (یەك کۆڵکەی هاوبەشی گرنگیان هەیە و ئەویش بریتییە لە هێزی ویست و بڕیاردان. ئەگەر لێیان ورد ببینەوە دەبینین تێکڕای پاشەکەوتەکان دەکەونە بواری توانای ئەنجامدان و لەناو بازنەی کاریگەرییەکاندان. مادام پشتبەستوون بە پرنسیپەکان کەواتە دەبنە هۆی دروستبونی دەسەڵاتی ڕەوشتی و متمانە. دەبینیت ئەگەر کەسەکە لەسەر ئاستی کەسایەتی خۆی توانای ئەنجامدانی ڕاهێنانی سۆزداری سەختی نەبێت (بۆ نمونە بیست جار شناوی سۆزداری) ئەوا هەرگیز بواری بۆ نارەخسێت پرۆسەی بەڕێوەبردنەکە (پاشەکەوتکردنەکە) ئەنجام بدات و ئازایەتی و دەستپێشخەری و سوربونەکەی نیشان بدات.

دووەمین خەسڵەتی هاوبەشی ناو ئەو پاشەکەوتکردنە چییە؟ پێم وایە بێ فیزی و نەبونی خۆپەرستییە. ئەو ئارەزووەیە کە وات لێ دەکات خۆت بخەیتە ژێر کۆنترۆڵی کەسێك یاخود پرنسیپێك یاخود مەسەلەیەکی مەزنەوە. تێگەیشتنە لەو ڕاستییەی کە دەڵێت ژیان بریتی نییە لە (من) و (بۆ من) بەڵکو وەك (مارتن بوبەر Martin Buber)ی فەیلەسوف دەڵێت بریتییە لە (من و تۆ) هەستکردنێکی قوڵە بەوەی کە پێویستە ڕێز لە تواناو بایەخی هەمو کەسێك بگریت.

ئەگەر تۆ بەردەوام بڕی گونجاو نەخەیتە سەر حسابە سۆزدارییەکەت، ئەوا متمانەو هەستی پێکەوەبوون و دەسەڵاتە ڕەوشتییەکە وردە وردە کاڵ دەبنەوە، بە تایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە زۆربەی کات پێکەوە کاردەکەن و دەژین، چونکە ئەمانە لە خەڵکی دیکە زیاتر چاوەڕوانییان لێت هەیە. سەبارەت بەو کەسانەی کە چەند ساڵێکە نەمانبینیون زۆرجار دەتوانین یەکسەر لەو شوێنەوە دەست پێبکەین کە جێمان هێشتن، بەمەش ڕاستەوخۆ متمانەو خۆشەویستی و پەیوەندییەکە دروست دەبنەوە، چونکە لە پێویست ناکات بەردەوام بڕی گونجاو بخەینە سەر حسابەکەمان.

دەسەڵاتی ڕەوشتی ئەوەیە کە، بە پشتبەستن بە پرنسیپەکان، مافی بڕیاردانی ئازاد ئەنجام بدەیت و زۆرجاریش پێویستی بە جۆرێک لە قوربانیدانە

خەسڵەتی سێیەمی هاوبەشی نێوانیان ئەوەیە کە ئەم پاشەکەوتکردنانە – وەك هەموشتە بەنرخەکانی دیکەی ژیان- پێویستیان بە قوربانیدانە (بیرت نەچێت یەکێك لە پێناسە باشەکانی قوربانیدان وازهێنانە لە مەسەلەیەکی دیاریکراو- تەنانەت ئەگەر چاکیش بێت- لە پێناو مەسەلەیەکی باشتردا).

ئەگەر حسابی بانقە سۆزدارییەکەت بەلاتەوە ئاشکراو ئاساییە، من پێم باشە لەم گوزارشتانەی خوارەوە رابمێنیت و دڵت بۆ کۆمەڵێك واتای نوێ بکەرەوە کە توانات بدەنێ دەنگی خۆت بدۆزیتەوەو ئیلهامیش ببەخشیت بە خەڵك بۆ دۆزینەوەی دەنگی خۆیان. دواتر تێبینی دەکەیت کە هەر برە خستنە سەرێك (پاشەکەوتێك) ئازادییەکی تازەت دەداتێ لە بەکارهێنانی ئەو دیارییانەی کە لەگەڵماندا لەدایك دەبن و هەروەها هەوڵ و تەقەلادان بۆ قوربانیدان بە خویەکی تایبەتی بێکەڵکی خۆت و گۆڕینەوەی بە کارێکی وا کە لە پەیوەندییەکاندا دەسەڵاتی ڕەوشتی دروست بکات.

هیچ سیستمێک نی‌یە ماوەیەکی درێژ پابەندبونی ژنان و پیاوان دەستەبەر بکات بێ ئەوەی بیانبەستێتەوە بە برێکی دیاریکراو لە دیسپلین. بە تایبەت دیسپلینی خۆیی. ڕەنگە مەسەلەکە زەحمەت بێت و قوربانیی زۆری بوێت، بەڵام ڕەوشت و هێز و جوامێری هەر ئەم ڕێگەیەیان هەیە.

شت بە ئاسان وەرگرتن هەرگیز مرۆڤ ناگەیەنێتە مەزنی. سەر ڕاستی و پابەندبون و هێز ئەو خەسڵەتە باشانەن کە مرۆڤ بەدەستیان دەهێنێت لە ڕێی ئەو خەباتەوە کە دیسپلینی خۆیی پێویستی پێیەتی بەپێی داواکارییەکانی هەقیقەتە پیرۆزەکە.

- گۆردن بی. هینکلی

## هەوڵدان بۆ ئەوەی یەکە مجار تۆ لە بەرامبەرەکەت تێبگەیت

بۆچی گرنگترین و یەکەمین پاشەکەوت بریتییە لەوەی هەوڵ بدەیت لە خەڵکی تێبگەیت؟ وەڵامەکە ئاسانە. گرنگە چونکە ئەگەر کەسەکە بە باشی نەناسیت، نازانیت پاشەکەوتەکە بەلای ئەوەوە چ مانایەکی هەیە. ئەوەی کە تۆ بە پاشەکەوتێکی زۆر گرانبەهای دەزانیت رەنگە لەلای ئەو پاشەکەوتێکی کەم بایەخ بێت و تەنانەت رەنگە بە راکێشانیشی لەقەڵەم بدات. ئەوەی کە بەلای تۆوە بەڵێنێکی گرنگە، رەنگە بەلای کەسێکی دیکەوە گرنگ نەبێت. هەر کەسەو بەپێی فەرهەنگی تایبەتی خۆی و بەپێی فلتەری تایبەتی خۆی گوزارشت لە راستی و رێز و چاکی دەکات. دیارە ئەو پرنسیپەی کە سپاردەکانی پێ ئەنجام دەدرێن هەمیشە راست و دروستن، بەڵام بۆ ئەوەی لە حاڵەتە جیاجیاکاندا سەرکەوتوانە جێبەجێیان بکەین پێویستمان بەوە هەیە خەڵکەکە بە باشی بناسین.

خاتونێك بۆی گێرامەوە وتی: پاش ئەوەی کە بیرۆکەی سپاردن لە حسابی بانقی سۆزدارییدا تێگەیشتم، بڕیام دا جێبەجێی بکەم و دەست بکەم بە کارێکی جیاوازی وا کە پەیوەندیم لەگەڵ مێردەکەمدا باش بکات. هەستم کرد ئەگەر هەمو جارێک کە هاتەوە ماڵەوە منداڵەکانی بینی جلی پاکیان لەبەردایە، پێی خۆش دەبێت.

دوو هەفتەی رەبەق ئیش‌وکارم هاتبوە سەر گۆڕینی منداڵەکان و شۆردنی جل‌وبەرگەکان بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی خۆشحاڵی و پێزانین لە مێردەکەمدا ببینم. بیرم کردەوە وتم ئەم شتانە بێ سودن. لەپڕێکدا کاتێک ئەو لەسەر چەرچەفە پاکەکان خەوێکی قوڵی لێ کەوتبو ئەم بیرۆکەیە لە مێشکدا چەخماخەی دا: خوایە گیان مێردەکەم قەت گوێ ناداتە پاک و تەمیزی منداڵەکان. پاک و تەمیزی هەر من بەختەوەر دەکات، بەڵام ئەو پێی باشترە پشتی بۆ بخورێنم یاخود شەوی کۆتایی هەفتە پێکەوە بچینە دەرێ. من خۆمم بە جل شۆرین و پاککردنەوەوە ماندو دەکرد و ئەو هەمو سپاردەیەشم پاشەکەوت کرد کەچی بەلای ئەوەوە هیچ بایەخێکیان نەبو.

من پاش ئەوەی کە زۆرم لەسەر کەوت هەقیقەتێکی سادەم بۆ دەرکەوت کە دەڵێت: پێویستە سپاردەکەت بەلای کەسەکەوە گرنگ بێت.

من خۆم زۆرم ئەزمونی تایبەتم هەیە دەیسەلمێنن کە ئەگەر هەوڵ بدەیت لە خەڵکی تێبگەیت، ئەو هەوڵە هێزێکی گەورەت پێ دەبەخشێت. هەرگیز ئەو جارەم

بیرناچێتەوە کە بەڕێوەبەرێکی جێبەجێکاری خاوەنی پۆستێکی باڵا بانگهێشتی کردم بۆ ئەوەی بیروبۆچونی خۆمی بدەمێ سەبارەت بە هەڵبژاردنی سەرۆك زانکۆیەکی نوێ. ئەمە یەکێك بو لە ئەزمونە هەرە توندەکانی پەیوەندی لە ژیانمدا.

لە نوسینگەکەی هاتە دەرەوە بۆ ئەو ژووری کە من چاوەڕوانی دیدارەکەم تێدا دەکرد، ئینجا پاش ئەوەی سڵاوی لێ کردم خستمیە پێش خۆی بەرەو نوسینگەکەی و لەوێ لەسەر کورسییەکی نزیك خۆی دایینیشاندم بە جۆرێکی وا کە روبەرو قسە بکەین و هیچ شتێك بەرچاومان نەگرێت. پێی وتم: "ستیڤن، سوپاست دەکەم کە هاتویت بۆ ئێرە. من زۆر بە شەوقەوە حەز دەکەم مەبەست و بیروبۆچوونەکانت تێبگەم" من پێشتر زۆر باش خۆم بۆ ئەم سەردانە ئامادە کردبو، کاتێکی زۆریشم پێ بەخشی. کورتەیەکی ئەم خاڵانەم دەرهێنا کە دەمویست روونیان بکەمەوە و وێنەیەکی ئەو کورتەیەم پێشکەش کردو ئینجا دەستم کرد بە روونکردنەوەی خاڵەکان یەك یەك. لەو ماوەیەدا کە باری سەرنجی خۆمم روون دەکردەوە، ئەو یەك جاریش قسەی پێ نەبڕیم، جگە لە چەند پرسیارێك بۆ ئەوەی مەسەلەکە لەلای روونتر بێت بە بایەخێکی گەورەوە گوێی لێ گرتم و لە ماوەی ئەو سێ خولەکەدا کە قسەم تیاکرد هەستم کرد بە تەواوی تێم گەیشتووە. هیچ رایەکی دەرنەبڕی، نە بەوەی قسەکانی بەلاوە پەسەندن، نە بەوەشی کە بەدڵی نین و تەنانەت هیچ تێبینیەکیشی پێشکەش نەکرد. لە کۆتاییدا هەستایە سەرپێ و چاوی بڕی چاومەوەو بەدەم تەوقەکردنەوە سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ دەربڕیم، تەواو. ئەم رەفتارەی وای لێ کردم زۆر سەرسام ببم بە گوێگرتنی قوڵی و بێ فیزیەکەی و قسەزانین و راستگۆییەکەی. هەستم کرد منەتبار و پابەندی بوم چونکە دڵنیابوم، لەوەی کە بە تەواوی لێم تێگەیشتومو بەراستی گوێی لە قسەکانم گرتووە و رێزی بۆ داناون. لەبەر ئەوە ئامادە بوم پشتگیریی هەر بڕیارێك بکەم کە دەدرێت.

هەرچەندە من پێشتریش چەند جارێك لەگەڵ ئەم کابرایەدا کۆبوبومەوە، بەڵام ئەوەی ئەمجارەیان کە پەیوەندییەکی روبەروی راستەقینەبو وای لێ کردوم، دەسەڵاتێکی رەوشتیی وای پێ بەخشیم کە ئیتر پێویست نەکات بۆ پاراستن و تازەکردنەوەی ئەو هەستە جارێکی دیکە سەردانی بکەم یان بچمە ئەزمونێکی دیکەوە لەگەڵیدا. سەیرەکە لەوەدایە کە ئێستاشی لەگەڵیدا بێت من هەست بە کاریگەری ئەو گفتوگۆ بەنرخە دەکەم لەنێوان من و ئەودا.

## پەیماندان و بەجێهێنانی

هیچ شتێك لەوە خێراتر متمانە ناکوژێت کە مرۆڤ پەیمان بدات و نەیباتەسەر. لە بەرامبەریشدا هیچ شتێك هێندەی پەیمان بردنەسەر متمانە دروست و بەهێز ناکات.

بەڵێندان ئاسانە. ئەمە خویەکە بە خێرایی بەرامبەرەکەت رازی دەکات، بە تایبەت ئەگەر نیگەرانی و دڵەڕاوکێی هەبو دەربارەی مەسەلەیەك کە پێویستە چاکی بکات. تۆ کە بەڵێنێك بە کۆمەڵە کەسێك دەدەیت و دەیبەیتە سەر، ئیتر خۆشیان دەوێیت. ئێمەش هەمومان حەز دەکەین خۆشەویست بین.

مرۆڤ هەتا زیاتر حەزی لە شێتك بێت، ئاسانتر باوەڕی پێ دەکات. خەڵك بەگشتی حەزیان لە گرێبەست و رێکەوتنە وەك ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی مەبەستێك، بە جۆرێکی وا کە باوەڕ بە هەمو لێدوان و بەڵێن و باسکردنێك دەکەن. خۆشیان گێل دەکەن لە ئاست زانیارییە نەرێنییەکان و بەردەوام دەبن لە بڕواکردن بەوەی کە حەز دەکەن بڕوای پێ بکەن. بەڵام پابەندبوون بە پەیمانەکان مەسەلیەکی زەحمەتە چونکە قوربانیدانی پێویستە، بە تایبەت کاتێك کە بارودۆخەکە دەگۆڕێت یاخود گیروگرفت دێتە پێشەوە یاخود ئەو جۆش و خرۆش و خولقە باشە نامێنێت کە لەسەرەتای راگەیاندنی بەڵێنەکەدا هەبون.

من وا خۆم راهێناوە کە هەرگیز نەڵێم (بەڵێن دەدەم) (هەرگیز مەڵێ هەرگیز ئەڵڵاهومە مەگەر ئامادەیم بەهەر نرخێك بووە بەڵێنەکە ببەمە سەر، بەتایبەت لەگەڵ منداڵەکانمدا. ئەوان زۆرجار تکام لێ دەکەم بڵێم (بەڵێن دەدەم) بۆ ئەوەی دڵیان ئیسراحەت بکات و وا هەست بکەن کە داواکەیان ئێستا جێبەجێکراوە. پێشتر زۆرجار ناچار دەبوم بڵێم (بەڵێن دەدەم) تەنیا بۆ ئەوەی دڵیان ئیسراحەت بکات و بە شێوەیەکی کاتی هەست بە ئاسودەیی بکەن. (هەوڵ دەدەم) و (هیوادارم) و (منیش خواخوامە) تینوێتیان ناشکێنێ بە تەنیا (بەڵێن دەدەم)یان دەوێت.

لە حاڵەتە دەگمەنەکاندا کە بارودۆخەکان لە دەرەوەی دەسەڵاتی مندا گۆڕانیان بەسەردا دێت، داوا لە منداڵەکانم دەکەم حاڵەتەکە تێبگەن و لەو بەڵێنە ببورن. بەڵام زۆرجار منداڵە بچوکەکانم لەوە تێناگەن، تەنانەت ئەگەر بە دەمیش بیڵێن و بە ئەقڵ لێم خۆش ببن، ئەوا بە دڵ لێم خۆش نابن.

لەبەر ئەوە بەڵێنەکانم دەپارێزم، مەگەر لەو کاتانەدا نەبێت کە بزانم

جێبەجێکردنیان بێ ئەقڵییە. لەم حاڵەتانەدا ئاستی متمانەکە بە شێوەیەکی کاتیی دادەبەزێت و هەوڵ دەدەم وردە وردە بە شێوازی دیکە دروستی بکەمەوە.

## ڕاستگۆیی و بێخەوشیی

(ریک پیتینۆ Rick Pitino)ی ڕاهێنەرە ئەفسانەییەکەی تۆپی سەبەتە بە شێوەیەکی زۆر سادەو قوڵ گوزارشی لە پرنسیپی بێخەوشیی کردووەو دەڵێت: "درۆ کێشەکە دەکاتە بەشێك لە ئاییندە، بەڵام ڕاستگۆیی دەیکاتە بەشێك لە ڕابردوو".

بیرم دێت جارێکیان لەگەڵ بەڵێندەرێکی بیناسازیدا کارم کرد، بە شێوەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر ڕاستگۆ و ڕاشکاو بو لەگەڵ ئەو ململانێیانەی کە دەهاتنە ڕێگەی، تەنانەت بەرامبەر هەڵەکانیش کە لەپرۆژەکەماندا ئەنجامی دابون. خۆی بەرپرسیارێتی هەڵەکانی گرتە ئەستۆ و وردەکارییە داراییەکانی بە تەواوی خستە بەردەستمان سەبارەت بەو ڕێوشوێنانەی کە لە قۆناغە جیاجیاکانی بیناسازییەکەدا دەکرێت بیانگرێتە بەر. لەوکاتەوە ئیتر من متمانەی ڕەهاو خۆڕسکم بۆ دروست بو بەرامبەر بەو کابرایە، باوەڕم بە هەمو قسەیەکی دەکرد. چونکە دڵنیابوم بەرژەوەندیی ئێمە دەخاتە پێش بەرژەوەندیی خۆیەوە. ئەو بەڵێندەرە سەرراستی و پەیوەندییەکانی نێوانمانی خستە سەرو عیززەتی نەفس و ئەو پێویستییە غەریزیانەی کە وا لە مرۆڤ دەکەن هەڵەکانی بشارێتەوەو لە ئیحراجبوون دوربکەوێتەوە. بەمەش متمانەیەکی نائاسایی لە نێوانماندا دروست بو. ئەم متمانەیە وای کرد کاری زیاتری دەست بکەوێت. پێویستە بڵێم کە لەم پرۆسەیەی بیناسازییەدا ئەزمونی پێچەوانەی ئەمەشم چنگ کەوت لەگەڵ کەلێك ئاستەنگ و ململانێدا.

> • کەس ناتوانێت ماوەیەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا دەموچاوێکی هەبێت و لەگەڵ خەڵکیدا دەموچاوێکی دیکە. مرۆڤی ئاوا دواجار سەری لێ دەشێوێت، نازانێت، لەو دوو دەموچاوە کامیان دەموچاوە ڕاستەقینەکەیەتی.
>
> - ناثانیل هاوثۆرن

ئەو ماوەیەی کە لە زانکۆ کارم دەکرد شەرەفمەند بوم بە میوانداریکردنی زانایەکی دەروونناسی بە ناوبانگ کە پێشتر سەرۆکی کۆمەڵەیەکی دەروونناسی نیشتمانی بووە. ئەم پیاوە دامەزرێنەری ڕێبازێکە پێی دەڵێن (چارەسەر بەسەر ڕاستی) کە ڕێبازێکی چارەسەری دەروونییە پشت بەو بیرۆکەیە دەبەستێت کە هەستکردن بە دڵنیایی و بەختەوەریی ڕاستەقینە و هاوسەنگیی وا دەکەن مرۆڤەکە بە هاوئاهەنگی بژی لەگەڵ فەرمان و داواکارییەکانی ویژدانیدا. ئەم زانایە باوەڕی وایە ویژدان لقێکە لەو هەستە مرۆڤایەتییە گشتییەی کە ڕاست و هەڵەی بۆ جیا دەکاتەوە. ئەم هەستە لە هەمو دەورو زەمانێکدا هەستی هاوبەشی نێوان هەمو کەلتور و دین و کۆمەڵگاکانە.

ئێوارەیەکیان – لە ماوەی نێوان دوو موحازەرەدا- بردمە سەر شاخ بۆ ئەوەی دیمەنە دڵڕفێنەکانی سروشتی نیشان بدەم. لەوێ دەرفەتەکەم قۆستەوەو لێم پرسی چۆن بو وات لێ هات باوەڕهێنانت بەم ڕێبازە بۆ دروست ببێت، ڕێبازی چارەسەرکردن بەسەر ڕاستی؟ وتی: لەڕێی ئەزمونێکی زۆر تایبەتی خۆمەوە. من توشی واسواسی و خەمۆکی بوبوم و زۆربەی ژیانم پێکهاتبو لە زنجیرەیەك هەوراز و نشێو. بە تێپەڕبونی کات و سەرەڕای راوێژکردن بە زۆر کەس هەستم بە لاوازی و نائارامی دەکرد. گەیشتمە ئەو حاڵەتەی کە خەریك بو خۆم بکوژم. بەهۆی پێشینە زانستی و پیشەییەکەمەوە دەمزانی چیم بەسەردێت، لەبەرئەوە هەمو جارێك کە دەگەیشتمە قۆناغە ترسناکەکە، داخڵی نەخۆشخانە دەبوم بۆ ئەوەی لە خۆکوشتن خۆم بپارێزم. پاش یەك دوو مانگ لە نەخۆشخانە دەردەچوم و دەگەڕامەوە سەر کارەکەم. ئینجا نزیکەی ساڵێك دوای ئەوە دەگەڕامەوە بۆ خەمۆکییەکە و خۆمم داخڵی نەخۆشخانە دەکردەوەو پاشان وردە وردە دەگەڕامەوە سەر نیش‌و لێکۆڵینەوەکانم؟ زاناکە بەردەوام قسەی بۆ دەکردم و وتی: لە قۆناغێکدا کە سەرۆکی کۆمەڵەکە بوم، نەخۆشییەکەم تەشەنەی سەندو خەمۆکییەکەم هێندە زیادی کرد کە نەمدەتوانی بچمە کۆبونەوەکان و تەنانەت دەست بدەمە بچوکترین شتی ناو نوسینگەکەشم. لەوکاتەدا لە خۆمم پرسی: تۆ بڵێی من لە ژیان و لە پیشەکەمدا لەناو چوارچێوەیەکی هەڵەدا بجولێمەوە؟ لە ناخی خۆمدا دەمزانی کە چەندین ساڵە من لەگەڵ درۆیەکدا دەژیم، ژیانم لایەنێکی تاریکی تێدا بو کە نەمدەویست ددانی پێدا بنێم".

ئەو بەدەم ئوتومبیل لێخوڕینەوە قسەی بۆ دەکردم و منیش هەمو گیانم کردبو بە گوێ و بەوپەڕی جددییەوە گوێم لێ دەگرت و ئەختێکیش لەو قسانە دەترسام کە ڕەنگ

بو بیانکات. زاناکە بەردەوام بو وتی: "بڕیارم دا گۆڕانێکی گەورە لە ژیانمدا بەدی بهێنم، وازم لە مەعشوقەکەم هێناو بڕیارم دا دڵسۆزبم بۆ ژنەکەم. دوای ئەوە هەستم کرد ویژدانم ئاسودەیە. لە ماوەی چەندین ساڵی رابردودا یەکەمجار بو هەست بە ئاسودەیی وا بکەم" ئەم ئاسودەیی و سوکبوونی باری شانە جیاواز بون لەو ئاسودەیی و شانسوکییەی کە هەمو جارێك دوای چاکبونەوەم لە شەپۆلی خەمۆکییەکە و گەڕانەوەم بۆ سەرکارەکەم هەستم پێ دەکرد. ئەم هەستە لە ناخەوە بو. هەستکردن بو بە ئیسراحەت و راستگۆیی لەگەڵ خوی خۆمداو هەستکردن بو بە هاوئاهەنگی و یەکپارچەبوونی خودی خۆم. ئەمە بو بە هەوێنی دۆزینەوەی ئەو تیۆرییە کە دەڵێت: زۆربەی ئەو گیروگرفتانەی کە پێیانەوە دەناڵێنین دەرەنجامی فەرامۆشکردن و نکۆڵیکردن و دەستدرێژیکردنە سەر ویژدانمان. بەمجۆرە کارم لەسەر بیرۆکەکە کردو کۆمەڵێك پزیشکم بەشدار کرد لە لێکۆڵینەوەی جیاجیادا. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان راستی و دروستی تیۆرییەکەمیان سەلماند و ئەمەش رێنمایی کردم شێوازی چارەسەرکردن بە سەرراستی دابهێنم؟

راستگۆیی ئەم پیاوەو مانافوڵەکانی ددان پیانانەکانی کارێکی زۆر بەهێزیان کردە سەر من و سەر سەدان خوێندکاری دیکەش کە بۆ رۆژی دوایی زاناکە غافلگیری کردم و هەمان چیرۆکی بۆ گێڕانەوە. مەسەلەیەکی دیکەش کە زۆر سەرسامی کردم چۆنێتی ئاشکرابونی بایەخی سەر راستییە، نەك تەنیا لە پەیوەندییەکانماندا لەگەڵ دەوروبەردا بەڵکو بۆ تەندروستی دەروونییشمان و هەروەها بۆ ئەوەی بتوانین لە کارو پیشەکانماندا کاریگەر ببین.

## میهرەبانی و خۆشڕوویی

لە مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکیدا ئاگادار بە کە مەسەلە بچوکەکان لای ئەوان مانای زۆریان هەیە. جارێکیان لە کۆتایی وەرزی خوێندندا خوێندکارێك هاتە لام و پاش ئەوەی ستایشێکی زۆری ئەو بابەتەی کرد کە پێم وتبونەوە، پێی وتم: دکتۆر کۆڤی، تۆ پسپۆڕی پەیوەندییە مرۆییەکانیت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ناوم نازانیت.

هەقی بو، هەستم بە شەرم و بێزاری کرد و بە خۆمم وت دەستی خۆش بێت وای پێکردبیت. پێویستە سەرقاڵی چەمکە ئەقڵییەکان و ئەو ئامانجە بم و هەمیشە لێهاتویی خۆم بپارێزم. وەك دەشزانن ئەو لێهاتوییە کاریگەر نابێت ئەگەر پەیوەندییەکان بەهێز

ئەبن و ئامانجەکان هاوبەش ئەبن، بە تایبەت لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەست بە ئارامیی ناوخۆیی ناکەن و پاراستنی پەیوەندی لەگەڵیاندا کارێکی زۆری دەوێت.

مرۆڤ شتێکی بێ رۆح نییە، هەستی هەیە، تەنانەت، خەڵکە گرنگ و پایە بەرزەکانیش ناسکن و هەستیان هەیە. مرۆڤ ئەگەر کەمێك خۆشرویی و میهرەبانیی بنوێنێت بە شێوەیەکی بەردەوام، دەستکەوتی مەزنی چنگ دەکەوێت و هەر ئەمەشە بابەتی زیرەکییە سۆزدارییەکە. لە بەرامبەریشدا خەڵکی ئاسایی بە شێوەیەکی گشتی هێندە زیرەکن بتوانن میهرەبانییە روکەشەکان بناسنەوەو دەزانن کەی یارییان پێ دەکرێت. میهرەبانی راستەقینەو رێزو خۆشرویی هەموویان لە سەرچاوە قوڵەکەی زیرەکی رۆحییەوە هەڵدەقوڵێن و کە ئەمانە هەبون ئیتر دەتوانرێت زۆرێك لە نەریتە دەستکردە کۆمەڵایەتیەکان بخرێنە لاوەو مرۆڤ دەستبەرداریان ببێت.

من زۆرجار کە لە ماڵەوەو قوتابخانەدا قسە بۆ منالان دەکەم پێیان دەڵێم ئەگەر دڵسۆزانەو بەردەوام چوار دەستەواژە فێر ببن و بەکاریان بهێنن - بە هەموی دە وشە- دەتوانن لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە ئامانج بگەن.

یەك وشە – تکایە

دو وشە – سوپاست دەکەم

سێ وشە – من خۆشم دەوێت

چوار وشە – چۆ بتوانم یارمەتیت بدەم؟-

بیرت نەچێت، مرۆڤی گەورەساڵ منالێکی گەورەیە،

بیرکردنەوە بە شێوازی براوە- براوە یاخود نەگەیشتنە رێکەوتن

زوربەی زۆرمان پێمان وایە زەمینەی گفتوگۆکان و چارەسەرکردنی کێشەکان بیرکردنەوەیە بەشێوازی براوە - دۆڕاو. بەشێکی زۆر دانوستاندانەکان بەو رۆحیەتە دەکرێن کە بردنەوەی لایەنێك دۆڕانی لایەنەکەی دیکە مسۆگەر دەکات. ئەم شێوازی بیرکردنەوەیە بەرهەمی جۆرە سیستمێکی ترساوی بیرکردنەوەیە کە دەڵێت، هەتا بەرامبەرە کە براوە بێت و زیاتری دەست کەوێت من کەمترم پێ دەبرێت. مادام ئامانجەکەش ئەوەیە تۆ ئەوەت دەس بکەوێت کە دەتەوێت (کەواتە پێویستە کۆمەڵە رێگایەك بدۆزیتەوە بەرامبەرەکەتیان بە جۆرێك پێ ببەزێنیت کە لەئاکامدا ئەوپەڕی گوێڕایەڵیی بنوێنێت.

زۆرکەس گیروگرفتەکانیان لەگەڵ خەڵکیدا – تەنانەت لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکانیشاندا بەم ڕێگەیە چارەسەر دەکەن و هەردووکیان دەچنە جەنگەکەوە تا ئەو کاتەی یەکێکیان تەسلیم دەبێت یاخود پێکەوە دەگەنە سازشێك.

بیرم دێت لە موحازەرەیەکدا ئەو بیرۆکەیەم ڕوونکردەوە کە دەڵێت: ڕێگەی تێپەڕاندنی سیستمی بیرکردنەوەی (بڕاو/ دۆڕاو) ئەوەیە کە لەڕووی ئەقڵی و سۆزدارییەوە هێندە بەرز ببیتەوە بگەیتە ئەو قۆناغەی کە چەند سوریت لەسەر ئەوەی خۆت براوەبیت هێندەش سوربیت لەسەر براوەبوونی بەرامبەرەکەت. ئەم مەسەلەیە پێویستی بە ئازایەتی و بەرچاوتێری هەیە. هەروەها پێویستیشە زۆر داهێنەر بیت بۆ ئەوەی بە سازش ڕازی نەبیت. من لەو موحازەرەیەدا وتم کلیلێکی (ئەلتەرناتیفێکی) دیکەش هەیە، ئەویش هەڵبژاردنی ڕێك نەکەوتنە (یارییەکە نەکەیت).

لەراستیدا ئەگەر مێشکت ئەم بڕیارەی تێدا نەبێت و بیرت لە ڕێکنەکەوتن نەکردبێتەوە و ئامادە نەبیت لەگەڵ بەرامبەرەکەت لەسەر ئەوە ڕێك بکەوێت کە ڕێك نەکەون – ئەگەر نەگەیشتنە ڕێکەوتنێکی وا هەردوکتان هەست بە براوەیی بکەن. ئەوکاتە هەست دەکەیت دەتەوێت بەرامبەرەکەت بخەڵەتێنیت و زۆرجار گوشاری دەخەیتە سەر و هەرەشەی لێ دەکەیت دۆخێك قبوڵ بکات کە تۆ تیایدا براوەبیت. ئەگەر ئەم ڕێکنەکەوتنە ئەگەرێك نەبێت لەبەردەمتدا، باشتر وایە ڕاستگۆیانە بە بەرامبەرەکەت بڵێیت: ((ئەگەر شتەکە قازانجێکی ڕاستەقینەی تێدا نییە بۆ تۆ و ئەگەر بەڕاستی و لە دڵەوە هەست بەو قازانجە ناکەیت و ئەگەر قازانجێکی ڕاستەقینەی تێدا نەبێت بۆ من و ئەگەر بە ڕاستی و لە دڵەوە هەست بەو قازانجە نەکەم، وەرە لە ئێستاوە من و تۆ لەسەر ڕێکنەکەوتن ڕێك بکەوین."

ئەم پرۆسەیە دەبێتە مایەی ئازادبونی هەردولایەنەکەیە و پێویستی بە تێکەڵەیەك لە بێ فیزی و میهرەبانی و هێز و ئازایەتی هەیە. هەروەها هەڵوێستی هەردو لایەنەکەش دەگۆڕێت و پەیوەندی بەهێز لەنێوانیاندا دروست دەکات و وا لە هەردوکیان دەکات لە پاشملەش دڵسۆزی یەکتربن.

پاش موحازەرەکە پیاوێکی ڕیزی پێشەوە هاتەلام و سوپاسی کردم و وتی ئەم بیرۆکەیەت بەڕاستی لەکاتی خۆیدابو. ئەو نوێنەری کۆمپانیای (دیزنی ئیپکۆت Disney – Epcot) بو، وتی: نیازم وایە لە سبەینێ زوتر نییە ئەم بیرۆکەیە لە

شێوازێکدا بەکار بهێنم کە پەیوەندی هەیە بە پەخشکردنی نمایشێك دەربارەی وڵاتێکی دیاریکراو لە سەنتەری ئیپکۆت. بۆی باسکردم کە ئەوانەی ئارەزوومەندانە حەزدەکەن بەشێکی زۆری پرۆژەکە سپۆنسەر بکەن دەیانەوێت نمایشەکە لە شوێنێك بکەین دیزنی هەست نەکات قازانجێکی باشی لێ دەکات. هەر لەم پێناوەشدا گوشاریان خستۆتە سەر دیزنی بۆ ئەوەی لەبەرامبەر ئەو سپۆنسەرەدا بە هیچ سازشێك رازی نەبێت، کابراکە پێی وتم بەڵام پاش ئەم قسانەی تۆ ئێستا بۆم دەرکەوتووە کە رێگەیەکی دیکە هەیە.

دواتر بۆی گێرامەوە وتی بە رێزەوە قسەم لەگەڵ سەرچاوەی (سپۆنسەرەکە) پشتیوانیکردنە داراییەکە کرد و پێم وت: ((ئێمە بەراستی پێمان خۆشە بگەینە رێکەوتن و پەیوەندییەك هەمومان تیایدا براوە بین. ئێمە بە دڵنیاییەوە پێویستمان بەو پارەیەوە هەیە کە دەیخەنە بەردەممان، بەڵام لەبەر ئەوەی جیاوازیی گەورە هەیە لەنێوانماندا، گەیشتوینەتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە ئەگەر رێکەوتنەکە و پرۆژە هاوبەشەکە قازانجێکی گەورەیان تێدا نەبێت بۆ هیچ لایەکمان باشتر وایە رێك نەکەوین. ئیتر کە سەرچاوەی سپۆنسەرەکە هەستی بەم راستگۆیی و دڵسۆزیی و راشکاوییە کرد لە قسەکانمدا دەستبەجێ وازیان لە گوشارەکانیان هێناو پاشەکشەیان کرد. دواتر بەرنامەکانی خۆیان سەرلەنوێ رێك خستەوەو پەیوەندییەکی راستەقینەی وایان لەگەڵماندا دەست پێکرد کە بە گەیشتنە رێکەوتنێکی هاوسەنگ و راستەقینەی وا کۆتایی هات سودی هەمو لایەکی پاراست.))

دواتر بۆت رون دەبێتەوە کە هێزی بیرکردنەوە بە شێوازی بەدیهێنانی سود بۆ هەموان (براوە — براوە) یاخود رێك نەکەوتن لەو ئارەزووە سەرەتاییەدایە کە دەیەوێت بیرکردنەوە لە بەدیهێنانی بەرژەوەندییە تایبەتەکانت دوا بخەیت تا ئەوکاتەی بۆت روون دەبێتەوە لایەنی بەرامبەر چی دەوێت و بۆچی. کە ئەوانەت بۆ روون بووەوە زۆر رێی تێدەچێت هاوکاری بکەیت لە پێناوی گەیشتن بە چارەسەرێکی داهێنەرانەی تازەی وا کە سود بە هەردووکتان بگەیەنێت.

## روونکردنەوەی پێشبینییەکان

روونکردنەوەی پێشبینییەکان هەمو سپاردەکانی دیکە کۆدەکاتەوە کە باسکران چونکە پەیوەندییەکی وەك روونکردنەوەی پێشبینییەکان پێویستی بە رێزلەیەکگرتن

و لێك تێگەیشتن هەیە بەتایبەت ئەگەر روونکردنەوەی پێشبینییەکان پەیوەندی هەبو بە رۆڵ و ئامانجەکانەوە. رەگ و ریشەی زۆربەی شکستهێنانەکانی پەیوەندییەکان هەروەها رەك و ریشەی کەلتورە نەخۆش و تێکشاوەکان یان لە مەسەلە تەمومژاوییەکاندایە یاخود بەهۆی بەدینەهاتنی پێشبینییەکانە لە بوارەکانی رۆڵ و ئامانجەکاندا. واتە بەوەی کێ کام رۆڵ دەبینێت و بایەخدارترین ئامانج کامەیە.

بیرمە جارێکیان سەرقاڵی دروستکردنی تیمێك بوین کە ئەندامەکانی کۆمەڵێك بەڕێوەبەری جێبەجێکاری زنجیرەیەك چێشتخانەی گەورەبون. لەسەرەتاوە دیاربو کە رێزبەندییەکان و ئامانجەکان هێندە دژ بە یەك بون کە گوێ پێنەدانیان یاخود بەرگەگرتنیان دەرەنجامی خراپی لێ دەکەوێتەوە بۆ سەر تەواوی دەزگاکە. منیش زۆر بە سادەیی دوو پارچە کاغەزم هێناو لە دامێنی سەرەوەی هەر یەکێکیان نوسیم رۆڵ و ئامانجەکانی منت بەلاوە چۆنن؟ و (رۆڵ و ئامانجەکانی خۆتت بەلاوە چۆنن؟) بەشدارەکانیش بەبێ قرەو بێ هیچ رێکەوتنێکی پێشوەخت یان رێك نەکەوتن پڕیان کردنەوە. دواتر کە بە چاوی خۆیان بینیان ناکۆکییە سەختەکانی نێوانیان کە چارەسەرناکرێن خەتای جیاوازی پێشبینیەکانە لە مەسەلەی رۆڵ و ئامانجەکاندا، ئیتر رێز و بێ فیزی باڵیان کێشایەوە بەسەر پەیوەندییەکانیاندا. بەمجۆرە توانییان دەست بکەن بە پەیوەندییەکی راستگۆ بۆ روونکردنەوەی پێشبینییەکان.

## وەفاداریی بۆ ئەو کەسانەی کە لێرە نین ( رەتکردنەوەی زەمی پاشملە )

وەفاداریی بۆ ئەو کەسانەی کە لێرە نین یەکێکە لە سپاردەکردنە هەرە زەحمەتەکان. یەکێکە لەو تاقیکردنەوە هەرە وردانەی کە رەوشت و قوڵایی هەمو پەیوەندییەکان دەدات لە سەنگی مەحەك. ئەم پابەندبونە کاتێك رۆڵی خۆی دەبینێت کە مرۆڤ دەکەوێتە ناو کۆمەڵێکەوە بە خراپە باسی کەسێکی دیکە دەکەن. لێرەدا دەتوانیت دەنگت بەرز بکەیتەوە و رەوشت بەرزانە بڵێیت؛ "من مەسەلەکە بە جۆرێکی دیکە دەبینم." یان "لەزمونی من جۆرێکی دیکەیە و جیاوازە" یان "لەوانەیە قسەی تۆ بێت کەواتە با بچین بۆلای و شتەکەی پێ بڵێین: "تۆ کە ئاوا رەفتارت کرد مانای وایە بەردەوام ئەم پەیامەی خوارەوە دەگەیەنێت: بێخەوشی وەفادارییە، نەک تەنیا بۆ لەوانەی خۆیان لێرە نین، بەڵکو بۆ ئامادەبوانیش. خەڵکەکە دەریببڕن یان دەرینەبڕن

لەئاکامی ئەم رەفتار و هەڵوێستەتدا رێزت دەگرن و دەبنە دڵبەستەت. دەزانن کە ئەگەر خۆیشیان لەوێ نەبن ئەوا ناوەکانیان لای تۆ سەلامەتن. بە پێچەوانەوە ئەگەر مەسەلەی بێخەوشی بکەیت بە قوربانی موجامەلەکردنی خەڵکەکە و پابەندبونت بەوانەوە لا گرنگتربێت لە سەرراستی خۆت، ئەوا بەشداری دەکەیت لە زەمکردنی خەڵکیدا. ئەوانیش دەزانن کە تۆ ئامادەییت تێدایە لەژێر گوشاردا هەمان اشت! بەرامبەر ئەوانیش بکەیت و لە پاشملە قسەی خراپیان لەسەر بکەیت.

بیرم دێت جارێکیان من لە دەزگایەکی گەورەدا سەرۆکایەتی کۆبونەوەیەکم دەکردو لێپرسراوەکان باسی هەندێک مەسەلەی تایبەتی نێوان خۆیانیان دەکردو وا دیاربو هەمویان هاوڕان لەسەر خاڵە لاوازەکانی کەسێکی دیاریکراو. تەنانەت کار گەیشتە ئەو رادەیەی کە نوکتە و چیرۆکی پێکەنیناوی وای لەسەر بگێڕنەوە کە بە بەرچاوی خۆیەوە نەتوانن بیڵێن. بۆ ئێوارەیەکی درەنگ یەکێک لە بەرێوەبەرە جێبەجێکارەکان و بەشدارانی کۆبونەوەکە هاتە لام و وتی: ئەمڕۆ بۆم دەرکەوت کە مرۆڤێکی راستگۆ و سەرڕاست و بە ویژدانیت. لێم پرسی بۆچی؟ وتی: چونکە ئێمە کاتێک لە کۆبونەوەکەدا زەمی ئەو پیاوەمان دەکرد لە پاشملەی خۆی، تۆ بە پێچەوانەی رەوتەکەوە رۆیشتیت و لە دڵەوە رێز و بایەخێکی راستەقینەت بەرامبەری دەربڕی. لێم پرسی ئەمە بۆچی کاری کردە سەر تۆ؟ وتی: لەبەر ئەوەی منیش هەمان خاڵە لاوازەکانی ئەوم هەیە، بگرە خراپتریشم، بەڵام ئەوەیە کەس پێی نەزانیون تەنانەت تۆش. بۆیە جاران کە هەمو جارێک رێز و پێزانینت بۆ دەردەبڕیم لە دڵی خۆمدا دەموت (ئاخر نازانیت)، بەڵام ئەمڕۆ هەست دەکەم زانیوتەو هەست دەکەم لە پاشملەی خۆم دڵسۆز و راستگۆ دەبیت لەگەڵمدا، لەبەر ئەوە دەتوانم متمانەت پێ بکەم و بڕوا بە زمانە شیرینەکەت بکەم.

کلیلی دڵی زۆربەی خەڵک یەک کلیلە: چۆن رێز لە خەڵکی دەگریت و بە بەرچاوی خۆیان و لە پاشملەش چۆن باسیان دەکەیت، چونکە ئەم رەفتارەت بڵاودەبێتەوە و هەمو خەڵک زو دەتناسن و دەزانن قسەی پاشملەت و قسەی رووبەرووت چۆنن.

## داوای لێبوردنکردن

تۆ ئەگەر فێرببیت بڵێت "ببورە، من هەڵە بوم" یان "خۆمم پێ رانەگیرا، دەزانم زیادەڕەویم کرد .." و بەپێی ئەم قسانەت رەفتار بکەیت ئەمە یەکێکە لە شێوە هەرە

پەهێزەکانی عوزرهێنانەوە. من ئاگاداری پەیوەندی وام کە ساڵەهای ساڵ پچڕابو، کەچی لە ماوەیەکی کەمدا گەڕایەوە دۆخی جارانی، بەهۆی ئەو دڵسۆزی و مانا قوڵەی کە داوای لێبوردنکردنی لەم جۆرە هەیەتی. ئەگەر لە ئەنجامی هەڵچون و تورەبوندا زمانت خراپ هاتە گۆ و قسەیەکت کرد کە بە راستی مەبەستت نەبوبێت. هەقە لەکاتی عوزرهێنانەوەدا بۆ خەڵکەکەی باس بکەیت کە چۆن عیززەتی نەفست پاڵی پێوە ناویت ئەو قسەیە بکەیت و بۆیان باس بکەیت تۆ رێک مەبەستت بوبێت ئەوا سروشتی عوزرهێنانەوەکە وات لێ دەخوازێت هەستت بگۆڕیت و خەفەت بەو قسەیە بخۆیت کە کردوتەو ئینجا دڵسۆزانە پێی بڵێ: "داوای لێبوردن دەکەم، من بە قسەو بە کردەوەش هەڵەبوم و هەردووکیان چاك دەکەمەوە".

من جارێکیان لەسەر مەسەلەیەکی زۆر سەرەکی، لەگەڵ کابرایەکدا توشی قڕە بوم.. ئەوە کاری کردە سەر پەیوەندی راستەقینەی نێوانمان، هەرچەندە بە رواڵەت وامان دەرنەدەبڕی. رۆژێك ئەو کابرایە هاتە لام و وتی هەست بە نیگەرانی دەکەم لە پەیوەندی نێوانماندا دەمەوێت وەکو جارانمان لێ بێتەوە کە گونجاو و یەکگرتو بوین. پێی وتم: ناخۆشترین (شت) بەلامەوە ئەوەیە تەماشای دڵم بکەم بۆ ئەو کەموکورتییە بگەڕێم کە هاتۆتە ئاراوە. بەراستی دەیویست داوای لێبوردن بکات. عوزرهێنانەوەکەی راستگۆیانە و بێ فیزانە بو، هیچ بروبیانویەکشی تێدا نەبو. ئەمە وای لێکردم منیش لای خۆمەوە بەرپرسیارێتیەکە بگرمە ئەستۆ. بەمجۆرە پەیوەندییەکانمان وەکو جارانی لێ هاتەوە لە پتەوییدا.

خاتونێکی کۆنە هاوکارم ئەزمونێکی کۆنی خۆی بۆ گێڕامەوە کە -لە یەکێك لە کۆبونەوەکاندا لەگەڵ تیمێکی بەڕێوەبەرە جێبەجێکارە گەورەکاندا روبەروی بوبۆوە: "سەرۆکەکە بەیانییەکیان ئامۆژگاری کۆمەڵەکەی کرد کە پێش ئەوەی بیروبۆچونی خۆیان دەربڕن پێویستە باش گوێ لە بەرامبەرەکە بگرن و تێی بگەن. بەڕێوەبەرەکە پێش ئەوەی بچێتە سەر بابەتی کۆبونەوەکە ئەزمونێکی تایبەتی و کاریگەریی خۆی بۆ گێڕاینەوە بۆ روونکردنەوەی ئەو گۆشەنیگایەی. ئەمەش پوختەی ئەو روداوانەیە کە نێوارەی هەمان رۆژ بەسەر خاتونەکەدا هاتن (دیارە لەم چیرۆکەشدا وەك زۆربەی چیرۆکەکانی دیکە دەستکاری ناوی خەڵکەکانم کردووە):

[لە گەرمەی گفتوگۆماندا بەڕێوەبەرە ناخۆشەویستەکە دەستی کرد بە گێڕانەوەی

ئەزمونێك کە لە بواری کارەکەدا خەریکێتی. کۆمەڵەکە پەلاماریان دا، منیش حەزم دەکرد پەلاماری بدەم بەڵام دەمزانی کاری لەو جۆرە بۆ من جوان نییە. پاشان گوێم لە سەرۆك (جاك) بو بە دەنگی بەرزو روبەرو بەو بەڕێوەبەرە پێدەکەنی. ئەو بە بەرچاوی هەمو خەڵکەکەوە پێی پێدەکەنی و بێگومان ئێمەش وەکو کۆرس بەشداریمان کرد.

ئەم رەفتارە توشی شکۆی کردم، چونکە هەموی چەند سەعاتێك نابێت کە بەڕێوەبەر باسی ئەزمونی خۆی دەکردو دەیوت پێویستە چاوەڕێی نۆرەی خۆی بکات و هەوڵ بدات لە رەفتاری کەسەکەی بەرامبەری تێبگات، کەچی ئێستا رێك بە پێچەوانەی ئەو قسانەی خۆیەوە رەفتار دەکات. دیارە من نەمدەتوانی بە بەرچاوی کۆمەڵەکەوە سەرزەنشتی بکەم، لەبەر ئەوە تەنیا چاوم تێبڕی. ئەویش بە باشی تێیم گەیشت (چاوەکانم دەیانوت؛ ئەمە نیشێکی ناشرینە، ئەگەر مەسەلەکە چاك نەکەیتەوە ئا ئێستا هۆڵەکە جێ دەهێڵم! من لەو چرکەساتەدا زۆر توڕەبوم و ئامادەبوم هەمویان جێ بهێڵم و لە هۆڵەکە بچمە دەرەوە .. چونکە گەڕابونەوە سەر رەوشتە دوژمنکارانەکەی جارانیان و سەر ئەو شێوازانەی کە رۆحی کۆمەڵ ژەهراوی دەکات.

سەرۆکیش چاوی تێبڕیم، منیش لە جێگاکەی خۆمەوە رەق راوەستام و چاوم تێبڕی، وەك ئەوەی پێی بڵێم؛ "بڕیارەکە لای تۆیە، جاك. ئەو لە شوێنی خۆیدا خۆی گرمۆڵە کرد و منیش بەردەوام بوم لە چاوتێبڕینی. مەسەلەکە پێنج خولەکی خایاندو لە ماوەی ئەو پێنج خولەکەدا کۆمەڵەکە بەو کابرا داماوە پێدەکەنین. کتوپڕ سەرۆك کۆبونەوەکەی وەستاند و وتی؛ "بوەستن، من کارێکی هەڵەم کرد، دەیڤید بمبورە"، دەیڤید بە سەرسوڕماوییەوە پرسی؛ "چی بوە؟". بەلای ئەوەوە مەسەلەکە ئاسایی بو، سەرۆك وتی؛ "کارێکی نەشیاوم کرد، نەدەبوایە پێبکەنم، ئێمە هەرگیز گوێمان لە تۆ نەگرتووە. هەمیشە هەر هێرشمان کردۆتە سەرت لێم دەبوریت؟".

وام زانی دەیڤید کە جێگری بەڕێوەبەر بو دەڵێت؛ کێشە نییە، گوێی مەدەرێ، کەچی وەلامێکی سەیری دایەوە، وتی؛ ئەوا لێت خۆش بوم سوپاس. ئایا دەزانیت لێبوردن چەند پێویستی بە ئازایەتی هەیە و چەندێك مەزنترە لەوەی مرۆڤ روداوەکەی بیر بخێتەوە؟

دانیشتم و بیرم لە رەفتارەکەی جاك کردەوە. ئەدەبو داوای لێبوردن بکات، بە تایبەت بە بەرچاوی ئەو هەمو خەڵکەوە. ئەو سەرۆکی بەشێك بو هەشت هەزار

کارمەندی تێدابو، کەس زۆری لێ نەکردبو کارێک ئەنجام بدات خۆی حەزی لێ نەبێت بیکات. لە کۆتایی کۆبونەوەکەدا چومە لای و بە دەنگێکی پڕ لەسۆزەوە پێم وت: سوپاسی ئەو کارەت دەکەم، وەڵامی دامەوە وتی: "من ئەو کارەم ئەنجام داوە کە راستەو پێویستە بیکەم. سوپاس بۆ تۆ کە چاوت تێبڕیم. هەرچەندە ئێمە ئیتر جارێکی دیکە باسی ئەم مەسەلەیەمان نەکردەوە، بەڵام هەردوکمان هەستمان کرد کە لەو رۆژەدا گەیشتوینەتە بەرزترین ئاستمان.]

## بەخشین و وەرگرتنی فیدباک (تازەترین زانیاری و ئاڵوگۆڕ)

لە ساڵانی مامۆستاییمدا نزیکترین خوێندکار لێمەوە ئەوانەبون کە فیدباکی بەهێزم دەدانێ. "رێت پێنادەم لە بەرپرسیارێتی هەڵبێیت، بڕوبیانوم ناوێت، پێویستە باجەکە بدەیت. تۆ لەمە زیاترت پێدەکرێت". زۆربەیان دواتر پێیان وتم ئەرک خستنە سەرشانیان چرکەساتێك بو ژیانی ئەوانی گۆڕی سەرەڕای هەمو نارەحەتییەکانی کە ئەوکاتە منیش و ئەوانیش روبەڕوی بوبوینەوە.

یەکێك لە زەحمەترین پرۆسەکانی پەیوەندیکردن پێشکەشکردنی فیدباکی نەرێنییە (ئاگادارکردنی کەسەکە لە ناتەواویی و هەواڵی ناخۆش) و لەهەمان کاتیشدا یەکێکە لە پرۆسە هەرە پێویستەکان. وەك چۆن لە مەودای بینینی هەر مرۆڤێکدا ناوچەیەك هەیە هیچی تیا نابینرێت و پێ دەوترێت پەڵەی (خاڵی) نابینا، لە پەیوەندییەکانیشدا هەمومان ئەو پەڵە نابینایەمان هەیە کە تیایدا هەست بە هیچ ناکەین چونکە کەس فیدباکمان ناداتێ لەسەری. مرۆڤی ئاسایی لەوە دەترسێت کە ئەگەر رەخنەی لە بەڕێوەبەرەکەی گرت، ئەوا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵیدا تێك دەدات و چارەنوسی خۆی دەخاتە مەترسییەوە.

لە چیرۆکەکەی (جاك)دا شێوازی گاڵتە پێکردنەکە نمونەیەکی ئاشکرای ریاکاریی بو بۆ بەڕێوەبەرەکە، بە جۆرێکی وا کە پاشگەزبونەوە لەو شێوازە نەك هەر ددانپێدانان بو بە پەڵە نابیناکەدا بەڵکو پاراستنی خودی خۆیشی بو. بۆیە کاری خۆی کرد. ئازایەتی و سەرڕاستی ئەو خانمەی کە ئاگاداری کردەوە و فیدباکی پێشکەشکرد لە پۆست و ئازناوەکانی بەڕێوەبەرەکە بەهێزتر بون، لەبەر ئەوە سودیان پێگەیاند. هەندێك جار ئازایەکی و سەرڕاستی لە پۆستەکە بەهێزتر دەرناچن و هیچ سودێك ناگەیەنن. لە

حاڵەتی وادا مرۆڤ ناچار دەبێت بە شێوەیەکی تایبەت پەنا بۆ ئامۆژگاری و بۆ گەیشتنە ڕێکەوتنێك ببات.

باشترین ڕێگە بۆ پێشکەشکردنی فیدباك بە شێوەیەکی تایبەت و دووبەدوو ئەوەیە کە باسی خۆت بکەیت نەك هی کەسەکەی بەرامبەرت، واتە لەبری ئەوەی کەسەکە تۆمەتبار بکەیت و خەسڵەتی خراپی بدەیتە پاڵ و دادگایی بکەیت، هەست و نەستو دڵەڕاوکێ و مەترسییەکانی خۆتی بۆ دەربڕە. ئەم شێوازە زۆرجار وا لەلایەنی بەرامبەر دەکات بێ ئەوەی هەست بە هیچ هەڕەشەو مەترسییەك بکات. زانیاری زیاتری چنگ بکەوێت دەربارەی پەڵە نابیناکەی خۆی.

خاوەن دەسەڵاتەکان پێویستە لەسەریان ئەم فیدباکە بکەنە مەسەلەیەکی یاسایی و ڕەوا. تۆ کاتێك کە فیدباکێك وەردەگریت، چەندە ناخۆش و بە ئازاریش بێت پێویستە بەئاشکرا رابگەیەنیت سوپاسگوزاریش ببیت. ئەگەر ئەو کارە بە ئاشکرا ئەنجام نەدەیت، کەلتورێك دروست دەبێت دەڵێت؛ فیدباك شێوەیەکە لە شێوەکانی یاخیبوون و نەمانی پابەندبوون. ئێمە کاتێك ئەم فیدباکە دەکەینە مەسەلەیەکی ڕەواو کەلتورێکی کۆمەڵایەتی، ئەوا خاوەن دەسەڵاتەکە ئازاد دەکەین بۆ ئەوەی بتوانێت ڕەخنە لە خەڵکی بگرێت بێ ئەوەی هەستیان بریندار بکات یاخود پەیوەندییەکانی لەگەڵیاندا بپچڕێنێت و بێ ئەوەی وا تێبگەن کە ئەم ڕەخنەیە دوا وتەیەو دوای ئەوە ئیتر هەمو شتێك تەواو.

ئێمە هەمومان پێویستمان بە فیدباکە، بە تایبەت دەربارەی پەڵە نابیناکانمان. پەڵە نابیناکان بریتین لەو شوێنە بەنازارانەی کە هەمیشە بەرگرییان لێ دەکەین. لەبەر ئەوە گەشەکردنی کەسەکە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، چونکە وا دەکات پەڵە نابیناکان ئازاریان کەمتر ببێتەوە. هەستکردنی مرۆڤ بە نرخی خۆی مەسەلەیەکە لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت و هیچ کاریگەرییەکی خاڵە لاوازەکانی خۆی لەسەر نییە، جا ئیتر ئەو خاڵانە ئاشکرا بن لەلای یاخود شاردراوە بن.

من بیرم دێت پەیوەندییم لەگەڵ دراوسێیەکانماندا تێك چو، لەبەر ئەوەی هەڵکردن لەگەڵ خێزانێکی قەرەباڵغی وەکو ئێمەدا کارێکی زەحمەت بو، چونکە هەمیشە سەرچاوەی دەنگە دەنگ و غەلبەغەلب بوین، گلۆپەکان هەمیشە داگیرسابوون و سەگەکەشمان هەمیشە دەوەڕی. من چومە لای ئەو هاوسێیە و پێم وت، من پێم خۆشە دوو هاوسێی باشی یەکتری بین و سوپاسگوزاریش دەبم ئەگەر ئاگادارم بکەیت فیدباکی

وام بدەیتێ. بتوانم بزانم گلەییەکان چین و کەموکوڕییەکان چارەسەر بکەم. لە سەرەتادا هاوسێکەم دوودڵیی نواند، بەڵام من زۆر هانم دا بەوەی کە هەڵکردن لەگەڵ ئێمە یانی چی؟ ئیتر ئەویش بە راشکاویی ئەو هەستو مەترسی و گلەییانەی دەربڕی کە خۆی و ژنەکەی لەسەر ئێمە هەیانبو. هەمو جارێکیش کە گوێم بۆ دەگرت ئەو زیاتر دڵبەستەی من دەبو کە دەمەوێت بیرو بۆچونەکانی بزانم و رێزیشیان لێ دەگرم و هەوڵ دەدەم خێزانەکەم بەشدار بکەم لە چاکترکردنی مەسەلەکاندا. دواتر پێی وتم ئەو لە کاردانەوەیدا زیادەڕەوی کردوە چونکە خێزانی فەرمبالغ ئەو شتانەی هەر دەبێت. کاتێکیش کە هەستام بڕۆم، سوپاسی ئەو سەردانەی کردم و پێی وتم من بەو کارەم زۆر خۆشحاڵم کردووە.

## لێبوردن

تورەبون سرکەیەکە زیاتر زیان بەو دەفرە دەگەیەنێت کە تیایەتی نەک ئەو شتەی کە سرکەکەی پێدا دەکرێت.

- مەهاتماگاندی

لێبوردنی راستەقینە بریتییە لەوەی مەسەلەکە بڕیتەوەو بیخەیتە پشتگوێ و ئاوڕی لێ نەدەیتەوەو بڕۆی بەڕێی خۆتەوە.

جارێکیان کە بەڕێوەبوم، لە گەشتێکی دەرەوەی وڵاتدا تەلەفۆنێکم لە بەڕێوەبەرێکەوە بۆ هات هەواڵی ئەوەی دامێ کە لەتاو رەفتاری خراپی سەرۆکەکەی دەیەوێت واز لە کارەکەی بهێنێت. داوام لێ کرد هیچ بڕیارێک لەو بارەیەوە نەدات تا پێکەوە دادەنیشین.

پێی وتم: من تەلەفۆنم بۆ ئەوە نەکردووە راوێژت پێ بکەم، تەنیا ویستومە هەواڵی دەست لەکار کێشانەوەکەمت پێ رابگەیەنم. نا لێرەدا تێگەیشتم کە تاکو ئێستا من بە باشی گوێم لێ نەگرتووە، بۆیە بڕیارم دا چاک گوێی لێ بگرم. ئیتر ئەویش دنیایەک هەست و گلەیی و ئەزمونی هەڵڕشت، بە گلەییەکانی ژنەکەشیەوە. من بە بایەخێکی راستەقینەوە گوێم لێ گرت و هەستم کرد وردە وردە وزە ئەرێنییەکەی کە لەناو دەنگیدا بو نەماو خۆبەخۆ رازی بو لەوەی کە گەڕامەوە چاومان بە یەکتر بکەوێت. کاتێک کە گەڕامەوە خۆی و ژنەکەی هاتنە لام بۆ نوسینگە. بە رواڵەت خۆشحاڵ دیاربون، بەڵام هەر کە دەستمان کرد بە گفتوگۆ لەسەر مەسەلەکە، تورەیی و بێزارییان

تیادەرکەوت. منیش بەردەوام گوێم لێ گرتن تا بە تەواوی هەستیان کرد من چاك تێیان گەیشتوم. بەوە ئەوان تەواو لەگەڵمدا کرانەوەو یەکسەر منیش باسی پانتایی نێوان کارلێکەر و کاردانەوەم بۆ کردن و بۆم روونکردنەوە کە چۆن زۆربەی کێشەو نارەحەتییەکانی ئێمە خەتای خودی ئەو کارە نییە کە بەرامبەرمان دەگرێت، بەڵکو خەتای کاردانەوەی ئێمەیە بەرامبەر کارەکە. سەرەتا ئەوان وایاندەزانی من بەو قسانەم دەمەوێت کابرا بخەڵەتێنم بۆ ئەوەی دەست لەکارنەکێشێتەوەو بگەڕێتەوە بۆسەر کارەکەی. لەبەر ئەوە بەردەوام بوم لە گوێگرتن لێیان تا هەرچییەکیان پێبو هەڵیان رشت و سەرجەم مەسەلەکانی دیکەشیان باسکرد و دڵنیابون لەوەی چاك تێیان گەیشتوم. تەنانەت باسی ئەوەشیان کرد کە ئیش‌وکاری پیاوەکە چ کاریگەرییەکی خراپی لەسەر هاوسەرگیری و ژیانی خێزانییان جێهێشتووە. لەراستیدا مەسەلەکە وەك ئەوە وابو پیازێك بهێنیت توێخ توێخ پاکی بکەیت تا دەگەیتە ناوکەکەی ناوەوەی.

لەم قۆناغەدا هەردوکیان زۆر کراوە دەرکەوتن و زانیم کە ئیتر ئەوپەڕی ئامادەن شتیان بۆ روون بکەمەوەو تێی بگەن. منیش دیسان جارێکی دیکە جەختم کردە سەر هێزی بڕیار و هەڵبژاردن و پێم راگەیاندن کە باشتر وایە داوای لێبوردن لە سەرۆکەکە بکەن دەرهەق بەو نارەحەتی و تورەییەی کە کابراکە هۆکاریان بووە.

کابراکە بە سەرسامییەوە لێی پرسیم؛ چی؟ تۆ هەمو شتەکەت هەڵگێڕایەوە. قوربان گیان پێویستە ئەو داوای لێبوردن لە ئێمە بکات، نەك ئێمە داوای لێبوردن لەو بکەین. دیسانەوە دەستیان کردەوە بە دارشتنی کۆمەڵێك هەستی نەرێنی تا بە تەواوی کرانەوەو ئامادەییان تێدا دەرکەوت ئەو بیرۆکەیە قبوڵ بکەن کە دەڵێت (کەس بەبێ رەزامەندیی خۆمان ناتوانێت ئازارمان پێ بگەیەنێت و ئەوەی کە ژیانمان دیاری دەکات شێوەی کاردانەوەمانە و باروذۆخی ئێستاشمان بەرهەمی بڕیارەکانی خۆمانە نەك بەرهەمی بارودۆخەکانمان). ژن و مێردێکی زۆر بێ فیز بون و بڕیاریان دا بیر لە پێشنیارەکە بکەنەوە. دواتر کابراکە پێی راگەیاندم کە بۆیان دەرکەوتووە قسەو پێشنیارەکانی من حیکمەتیان تێدا بووە و هەر لەسەر ئەو قسانەش چۆتە لای سەرۆکەکەی و داوای لێبوردنی لێ کردووە، سەرۆکەکەشی بەو هەڵوێستە زۆر سەرسام بووەو ئەویش بە نۆرەی خۆی داوای لێبوردنی لەم کردووە و پەیوەندییەکانیان وەکو جارانیان لێ هاتۆتەوە. کابراکە پێی وتم خۆی و ژنەکەی بە قسەکانم گەیشتبونە

قۆناغی قبولکردنی مەسەلەی پانتایی نێوان کارلێکەر و کاردانەوە و بە جۆرێك لە هێزی بڕیاردانیش تێگەیشتبون کە ئەگەر سەرۆکەکە داوای لێبوردنەکەی قبوڵ نەکردایە ئەم هەر وازی نەدەهێناو بەردەوام دەبو لەسەر داواکەی.

> لێبوردن ئەو زنجیرە دەپسێنێت کە هەر ئەڵقەیەک هۆکارەکە دەخاتە ئەستۆی ئەڵقەکەی دیکە، چونکە ئەو کەسەی کە لێت دەبورێت دەرەنجامی کارەکەیشت قبوڵ دەکات لەبەرئەوەی خۆشی دەوێیت.
> بۆیە لێبوردن هەمیشە پێویستی بە قوربانیدانە
> - داگ هامەرشۆڵد

گازی ماری ژەهراوی زیانبەخشە سەرەکییەکە نییە. بەڵکو زیانبەخشە گەورەکە ئەوەیە رابکەی بەدوایدا و راوی بنێیت. راکردنەکە ژەهرەکە دەگەیەنێتە دڵت. ئێمەی مرۆڤ مادام هەمومان هەڵە دەکەین کەواتە پێویستە لە یەکتریش ببورین و داوای لێبوردن بکەین. باشتر وایە فۆکەس بخەینە سەر هەڵەکانی خۆمان و داوا لە بەرامبەرەکەمان بکەین لێمان ببورێت، نەك بە پێچەوانەوە بچین جەخت بکەینە سەر هەڵەی خەڵکی و چاوەڕوان بین ئەوان داوای لێبوردن لە ئێمە بکەن و ئینجا حسودییان پێ ببەین لەسەر دەستپێشخەرییەکەیان و ئەوسا ئێمەش لێیان ببورین. چاکتر وایە رۆحی ئەو کابرایەمان هەبێت کە دوعای کرد وتی: خوایە گیان یارمەتیم بدە لەو کەسانە ببورم کە گوناهەکانیان لە گوناهەکانی من جیاوازن.

سی. ئێس. لویس بەهەمان رۆحییەتەوە دەڵێت:

هەمو ئێوارەیەک کە نوێژ دەکەم و چاو بە گوناهەکانی ئەو رۆژەمدا دەگێڕم، دەبینم لە لەدا گوناهیان، ئەوانیان دژی چاکەکارییە، بۆ نمونە لچم لە یەکێک هەڵقورچاندوە یان سەرزەنشتم کردووە یاخود قسەی خراپم پێ وتوە یاخود پەلاماریم داوە یاخود هەستیم بریندار کردووە. بیانوی هەمو ئەو کردەوە خراپانەشم کە یەکسەر بە مێشکمدا دێن ئەوەیە کە مەسەلەکە کتوپڕ رویداوە یاخود زۆر چاوەڕوان نەکراوبوە.

واتە من نەمتوانیوە کۆنترۆڵی خۆم بکەم و شتەکەش هێندە کتوپڕ قەوماوە فریانەکەوتوم خۆم کۆنترۆڵ بکەم. دیارە ئەو کارە، کە مرۆۋ لەکاتی غافڵگیری و نەمانی کۆنترۆڵدا ئەنجامی دەدات باشترین بەڵگەیە کە دەری دەخات مرۆڤەکە چۆن مرۆڤێکە. بە دڵنیاییەوە پێویستە بڵێین مرۆۋ ئەوکاتە رووی راستەقینەی خۆی نیشان دەدات کە فریاناکەوێت دەمامک بپۆشێت. ئەگەر ژێر زەمینەکەت مشکی تێدا بێت، دیارە زیاتر ئەوکاتانە دەیانبینیت کە کتوپڕ خۆت بکەیت بە ژێرزەمینەکەدا. بەڵام ئایا کتوپڕییەکە مشکەکانی خوڵقاندووە؟ نەخێر، خۆیان هەبون، بەڵام کە تۆ کتوپڕ دەچیتە ژێرزەمینەکە وایان لێ دەکات فریا نەکەون خۆیان بشارنەوەو هیچی تر. بەهەمان شێوە تورەکردنی کتوپڕ من ناکاتە مرۆڤێکی خراپ و کەم چیکڵدانە، بەڵکو رادەی خراپی وکەم چیکڵدانەیەکەم نیشان دەدات. ئینجا مادام ژێرزەمینەکە لە دەرەوەی ویستی هوشیارانەی خۆمە کەواتە ناتوانم بە هەوڵ و تەقەلای رەوشتیانەی خۆم پاڵنەری تازە بێنمە ئاراوە. پاش هەنگاوە سەرەتاییە کەمەکان تێدەگەیت کە هەر خودا دەتوانێت گۆڕانکاری پێویست لە رۆحمانا بەدی بهێنێت."

## دوا قسە دەربارەی متمانە

لەم بەشەی کتێبەکەدا کە تایبەتە بە دروستکردنی متمانە، من زیاتر جەختم لەسەر ئەو شتانە کردۆتەوە کە ئەنجامدانیان بەشێوەیەکی هۆشیارانە دەتوانن رۆڵیان هەبێت لەدروستکردنی پەیوەندی لەسەر بنەمای متمانە، واتە من فۆکەسم کردبووە سەر متمانە وەك (ناوێك) نەك وەك (کردار). بەڵام بیرت نەچێت لەرێزمانی ئینگلیزیدا متمانە (trust) ناویشەو کرداریشە. لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا بەو چیرۆکە دەستم پێکرد کە چۆن لە هەرەتی هەرزەکاریدا کەسێك هات و پێی وتم تۆ توانای زۆرت هەیە. زۆرتر لەوەی کە خۆم هەستم پێ کردبێت. ئەو شتەکانی ژێر رووکارەکەی دەبینی. مەسەلە ئاشکراو نەگۆڕەکانی تێدەپەڕاند. ئەو سەرنجی دابو لەدڵ و چاو و رۆحم. تۆوە شاردراوە گەشەنەکردووەکانی ناخی مرۆڤی دەبینی. لەبەرئەوە کۆمەڵێك بەرپرسیارێتی وای خستە ئەستۆم کە بە بڕوای خۆم لە تواناو شارەزاییەکانم زیاتربون. ئەو بەبێ هیچ بەڵگەو سەلماندنێك متمانەی خۆی پێبەخشیم. زۆر بەسادەیی باوەڕی پێهێنام و پێشبینی دەکرد لەناستی ململانێکاندابم و هەر بەو گیانەش رەفتاری لەگەڵدا دەکردم. کارەکەی ئەو

هەڵقوڵاوی متمانەکردن بو بە من، بەڵام هەر ئەم متمانە و باوەڕپێکردنە وای لە منیش کرد زیاتر بڕوام بەنرخ و توانا و بەهاکانی خۆم هەبێت و بەجۆرێکی وا ئیلهامی پێبەخشیم کە توانیم تواناکانی ناخی خۆم ببینم. باوەڕی ئەو بەمن وای کرد منیش زیاتر باوەڕم بەخۆم بۆ دروست ببێت. وای لێ کردم بگەمە ناستە هەرە بەرزو جوامێرەکانی حەزو ئارەزو. من مرۆڤێکی کامڵ نەبوم، بەڵام ئەو متمانەیە تا ئەوپەڕی سنورەکان بواری گەشەکردنی پێبەخشیم و بو بە فەلسەفەی تایبەتی ژیانم؛ وا لە خەڵکی بکە متمانەیان بە خۆیان هەبێت. با منداڵەکانت متمانەیان بە خۆیان لەلا دروست ببێت. بڕوایان پێبکە، بڕوا بەو شتانە نا کە تیایاندا دەبینیت، بەڵکو بەوانەی کە نایانبینیت. بە توانا متەکانیان.

قسەکەی (گۆتـە)ی شاعیر زۆر قوڵ و راستە کە دەڵێت: ئەگەر وا رەفتار لەگەڵ مرۆڤدا بکەیت وەك ئەوەی هەیە، هەر بەو شێوەیە دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر وا رەفتاری لەگەڵدا بکەین وەك ئەوەی کە دەتوانێت و پێویستە پێی بگات، ئەوا دەبێتە ئەو کەسەی کە دەتوانێت و کە پێویستە بیگاتێ"

> متمانە ئەو کاتە دەبێتە کردار کە توانیت بەرامبەرەکەت
> وا لێ بکەیت بە روونی هەست بە بایەخ و تواناکانی خۆی بکات و
> لە ناخی خۆیدا بیانبینێت

متمانە هەر تەنیا بەرهەمی شایستەبونی متمانە پێکردن نییە، بەڵکو ئەو رەگ و ریشەیەشە کە پاڵنەرەکە دەڕوێنێت، بەڵکو بەهێزترین پاڵنەرە. خۆشەویستییش دەبێتە کردار، لە راستیدا خۆشەویستی ئەوەیە خەڵکیت خۆش بوێت و خزمەتیان بکەیت. کە تۆ متمانە بە کەسێك دەکەیت مانای وایە توانا و بەهاکانی دەبینیت و فرسەت و پشتگیری و زەمینەی پێدەبەخشیت.

ئەگەر کەسی متمانە پێکراو بەپێی ئەو متمانەیە نەژیا، ئەوا متمانەکە لەناو دەچێت و ناتوانێت ببێتە سەرچاوەی ئیلهامی کە بەهرە و بەهاکانی خۆی ببینێت و ناشتوانێت وا لە خەڵکی دیکە بکات کە ئەوانیش بڕوا بە بەهرە و بەهاکانی خۆیان بکەن.

واتە (متمانە) بۆ ئەم کەسانە نابێتە کردار. لەڕاستیدا ئەگەر کەسێك خۆی شایستەی متمانە پێکردن نەبێت زەحمەتە بتوانێت بەشێوەیەکی هەمیشەیی بڕواو متمانە بە کەس بکات.

ڕێگەم بدەن چیرۆکێك بگێڕمەوە کە زۆرجار دووپاتی دەکەمەوە سەبارەت بەوەی چۆن خۆشەویستیش وەکو (متمانە) دەتوانێت ببێتە کردار:-

لە خولێك لە خولەکاندا، بەشدارێك پێی وتم: "ستیڤن، من قسەکانتم بەدڵە، بەڵام هەمو کەسێك دۆخێکی تایبەت و جیاوازی هەیە. بۆ نمونە تەماشای هاوسەرگیرییەکەی من بکە. من بە ڕاستی نیگەرانم. من و ژنەکەم ئەو هەستەمان نەماوە کە جاران بەرامبەر یەکتری هەمانبو. وا هەست دەکەم چیتر یەکتریمان خۆش ناوێت. چی بکەم؟

لێم پرسی: هەستی جارانتان بەرامبەر یەکتری نەماوە؟

بەدڵنیاییەوە وەڵامی دامەوە: نەخێر نەماوە. ئێمە ئێستا سێ (٣) منداڵمان هەیە و نازانین چیان لێ بکەین. بەڕاستی نیگەرانین. ڕای تۆ چییە؟

وتم: خۆشت بوێ

- پێت دەڵێم ئەو هەستە نەماوە

+ خۆشت بوێ

- لەوە دەچێت تێم نەگەیت. دەڵێم ئەو هەستە نەماوە

+ کەواتە خۆشت بوێ. نەمانی ئەو هەستە خۆی لەخۆیدا هۆکارێکی باشە بۆ ئەوەی خۆشت بوێت.

- بەڵام ئەگەر تۆ کەسێکت خۆش نەوێ چۆنی دەتوانیت خۆشت بوێ

+ هاوڕێ گیان خۆشەویستی کردارە. خۆشویستن هەستێکە، بەرهەمی کرداری (خۆشم دەوێت)ە. لەبەر ئەوە خۆشت بوێ. گوێی لێ بگرە، لە پێناویدا قوربانی بدە، ڕێزی بگرە، هاوسۆزی بە، وای لێ بکە متمانەی بە خۆی زیاتر ببێت.

ئایا ئامادەیت ئەو کارە بکەیت؟

لە دەقە ئەدەبییە مەزنەکانی گشت کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا (خۆشەویستی) (LOVE) کردارە. تەنیا خەڵکی هەڵچو، ئەوانەی پەرچەکرداریان هەیە وەکو (هەست) تەماشای دەکەن. خەڵکی لەو جۆرە بەپێی هەست و ئیحساسی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن. هۆلیود ئێمەی وا پرۆگرام کردووە کە بگەینە ئەو باوەڕەی خۆشەویستی تەنیا هەستێکە و مرۆڤ لێی بەرپرسیار نییە. بەڵام هۆلیود هەقیقەت وێنا ناکات. ئەو کەسەی کە کۆنترۆڵی کارەکانی بەدەست هەست و ئیحساساتییەوە بێت، مانای وایە وازی لە ئەرکی بەرپرسیارێتی هێناوە و داوێتییە دەست هەست و سۆز. کەسێك دەستپێشخەر

بێت خۆشەویستی دەکاتە کردار. خۆشەویستی بریتییە لەو کارەی کە ئەنجامی دەدەیت، لەو قوربانییەی کە دەیبەخشیت. بریتییە لە خۆفیداکردن. رێك وەکو ئەو کارەی کە دایك لە کاتی منداڵبوندا دەیکات. ئەگەر دەتەوێت لە خۆشەویستی تێبگەیت ژیانی ئەو کەسانە شرۆڤە بکە کە لە پێناوی خەڵکیدا قوربانییان بەخشیوە، تەنانەت لەپێناوی ئەوانەشدا کە خۆشیان نەویستون و پەلاماریان داون. تۆ ئەگەر باوك بیت یاخود دایك بیت تەماشا بکە بزانە چەندێك منداڵەکانت خۆش دەوێت و چەندێك قوربانیت بۆ داون. خۆشەویستی بەهایەکە لە رێی ئەو کردارانەوە دەبنە هەقیقەت کە لە خۆشەویستییەوە سەرچاوەیان گرتووە. مرۆڤی دەستپێشخەر هەمیشە هەست و سۆزی خۆی دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی بەهاکانییەوە. خۆشەویستی وەکو هەست بابەتێکە هەمو کەس دەتوانێت بەدەستی بهێنێت. باشترین شوێن کوێیە بۆ بەخشینی متمانە و بۆ ئەوەی وا لە خەڵکی بکەیت نرخ و توانای خۆیان بزانن؟ بێ هیچ دودڵییەك باشترین شوێن، ناو خێزانە. بەڵام ئەگەر خێزانەکە رۆڵی خۆی نەبینێت، کوێ باشە پاش ئەو؟ خوێندنگا باشە. لە خوێندنگادا مامۆستا دەتوانێت لەجیاتی باوك و دایکەکە سەرلەنوێ پرۆسەی متمانە دروستکردن دەست پێبکاتەوە.

هەمیشە ئەو هێزەت لەبیر بێت کە پێویستت پێیەتی بۆ متمانە بەخشین بە خەڵکی. پێویستە لە بەکارهێنانی هێزەکەدا حەکیم بیت چونکە ئەگەری ئەوە هەیە توشی هەستکردن بە شکستت بکات؛ بەڵام لە بەکارهێنانی ئەو هێزەدا تۆ دیارییەك و فرسەتێکی بێهاوتا دەبەخشیت بە بەرامبەرەکەت.

گەورەترین سەرکێشی لە ژیاندا ئەوەیە سەرکێشی نەکەین.

## *فیلم/ مامۆستا*

دەمەوێت ئێستا فیلمێکی دیکە ببینیت کە چیرۆکی راستەقینەی نێوان (هیلین کیللەر) و (ئانی سولیڤان)ی مامۆستای دەگێڕێتەوە؛ (هیلین کیللەر) لە زگماکییەوە کەڕ و نابینایە و (ئانی سولیڤان)یش جگە لەوەی هەر لە منداڵییەوە نابینایە، بە منداڵیش کوێرەوەری و نارەحەتی و ستەمی زۆری بینیوە. بەڵام هەمو ئەمانە تێدەپەڕێنێت و لە رێی خزمەتکردنی خوێندکارێکەوە مانایەك بۆ ژیانی خۆی دەدۆزێتەوە کە (هیلین کیللەر)ە. ژیان و بەخشش و بەشدارییەکانی هیلین زۆر زۆرن و سەرنجڕاکێش و

نیلهامبەخشیشن. دەیان ملیۆن کەس راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کەوتونەتە ژێر کاریگەرییەکانی هیلین، بەڵام کلیلەکەی هیلین کێ بو؟

## مامۆستاکەی بو

کاتێك فیلمەکە دەبینیت کە لەسەر سی دی پەیوەستە بە کتێبەکەو تۆمار کراوە، تکایە لە هەردو گۆشەنیگاکەوە سەرنجی لێبدە. لە گۆشە نیگای ڕێگاکەی سەرەوە کە دەگاتە مەزنی و لە گۆشەنیگای ڕێگاکەی خوارەوە کە دەگاتە ژیانێکی ئاسایی. سەرنج بدە، بزانە چۆن (ئانی سولیڤان) لە ڕێی بڕیارەکانییەوە دەبێتە خاوەنی دیسپلین و تێڕوانین و جۆش‌وخرۆشێك کە ویژدان و دەسەڵاتی ڕەوشتی ناڕاستەی دەگەن. ئەو دەسەڵات و ویژدانەی کە بەرهەمی قوربانیدان و خۆڕاگرتنی ئەو بوە بەرامبەر سەختییەکان. سەرنج بدە بزانە ئەو (هیلین کیللەر)ەی کە هەر لە منالّییەوە لە تاریکیدا ژیاوە، چۆن دەبێتە مرۆڤێکی هاوسەنگ و سەر ڕاست و بەهێز. سەرنج بدە بزانە چۆن لەڕێی سپاردنی بەردەوامەوە پەیوەندی لەنێوان (ئانی) و (هیلین)دا دروست دەبێت لەسەر بنەمای متمانە. سەرنج لەو پەیوەندییە ورد و خێرا و بەردەوامەی نێوانیان بدە کە پێك هاتووە لە پشو درێژی و بەردەوامی و لێك تێگەیشتن.

بە کورتییەکەی، ئەمە چیرۆکێکی جوانی نێوان دو کەسایەتی مەزنن کە دەنگی تایبەتی خۆیانیان دۆزیوەتەوە و هەمو ژیانی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ ئەوەی وا لە خەڵکی بکەن دەنگی خۆیان بدۆزنەوە و بەمجۆرەش ژیانیان بەخشییەوە بە ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە سەرتاسەری جیهاندا.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: چۆن ڕەفتاری خەڵکی چاك بکەین؟ خۆت دەزانیت هیچ شتێك هێندەی ڕەفتاری نەرێنی، دام‌ودەزگاکان وێران ناکات، بۆ ئەم مەسەلەیە چی بکرێت باشە؟

وەڵام: ڕێگام بدە هەوڵ بدەم لەسەر سێ ئاست وەڵامت بدەمەوە.

یەکەم، لەسەر ئاستی کەسێتی: خۆت بکەرە نمونەی ئەو کەسەی کە ڕەفتارەکانی نەرێنین. دیارە کەس ناتوانێت ڕێگە لە گواستنەوەی شێرپەنجەکانی گلەیی و ڕەخنە و

بەراوردکاریی و کێبڕکێ و حانەحەپەشێ بگرێت. لە راستیدا هیچ شتێك هێندەی ئەوە کاریگەر نییە لە تەنیشت کەسێکەوە بیت حەکەم نەبێت رێ نیشاندەربێت و رەخنەگر نەبێت بەڵکو پێشەنگێکی باش بێت.

دووەم، کاتی گونجاو تەرخان بکە بۆ پێکەوەبون و بنیادنانی پەیوەندیی لەگەڵ ئەو کەسەدا کە رەفتاری نەرێنی هەیە. رەفتاری نەرێنی لە راستیدا نمایشکردنی بابەتە قوڵترەکانن. مرۆڤی ئاسایی پێویستی بە کەسێکە تێی بگات. کە تۆ هەوڵ بدەیت لە کەسێك بگەیت مانای وایە چارەسەری دەکەیت و متمانە بە خۆکردنی لەلا بەهێزتر دەکەیت و کار دەگاتە ئاستێك کە لەجیاتی گلەییکردن لەوەی بەرهەم کەمە، ئیش لەسەر رەگەکان بکرێت.

سێیەم، هەندێك جار تەنیا هەر هێندە بەس نییە کە پێشەنگی چاك بیت یان پەیوەندییەکەت لەگەڵ کەسەکەدا لە چ ئاستێکدا بێت، بەڵکو هۆکاری بەهێزتر هەن. هەندێك جار هەر هێندە بەسە کە زەردەخەنەیەك بکەیت و زۆر گوێ بە مەسەلەکە نەدەیت. ئەمە رێ لەوە دەگرێت شێرپەنجەی نەرێنی بڵاوببێتەوە. ئەو راستییەت بیر نەچێت کە ئەگەر تۆ زیانی سۆزداری خۆت لەسەر خاڵە لاوازەکانی بەرامبەرەکەت دروست کرد، بە هەڵوێستە نەرێنییەکانیشیانەوە، ئەوا تۆ خۆت لە هەمو هێزێك دادەبڕیت و رێگە بە هەڵوێستە نەرێنییەکانیان دەدەیت خانە شێرپەنجەییەکانیان بگوێزنەوە بۆ ناو کەلتوری دەزگاکە. تۆ ناتوانیت هەمو شتێك و هەمو کەسێك بگۆڕیت، تەنیا دەتوانیت خۆت بگۆڕیت. بەهەرحاڵ من بە ئەزمونی ژیان بۆم دەرکەوتووە مرۆڤ ئەگەر بتوانێت شارەزایی و لێهاتویی خۆی بەجۆرێك گەشە پێبدات کە لەگەڵ ئەو بەهرە بنەڕەتییانەدا بگونجێن کە خودا پێی بەخشیون ئەوا هەڵوێستی بەرامبەر خۆی و بەرامبەر ژیان و بەرامبەر خودی خۆی بە شێوەیەکی بەرچاو چاك دەبێت.

بۆ نمونە، تۆ ئەگەر بتەوێت کەسێك فێری یاری تێنس بکەیت، ئایا باشتر وایە ئامۆژگاری ئەوەی بکەیت کە هەق نییە هەڵوێستی خۆی وەك کەسێکی نەرێنی و دۆڕاو نیشان بدات؟ یان باشتر وایە زانیاری تیۆری زیاتری بدەیتێ دەربارەی یاری تێنس، یاخود باشتر وایە لەگەڵ خۆتا بیبەیتە ناو یاریگاوە و بە کردەوە هونەری یاریکردنەکەی فێربکەیت بۆ ئەوەی هەست بکات کە پێویستی بە زانیاری زیاتر هەیە، ئەوا رێگەی سێیەم باشترین رێگەیە. بەدەم چێژ وەرگرتن لە یارییەکەوە هەڵوێستەکەشی دەبێتە هەڵوێستێکی ئەرێنی.

مرۆڤ بۆ پێشخستنی خودی خۆی سێ ڕێگەی لەبەردەمدایە:
زانیاری و لێ زانین و شێواز. زوربەی خەڵك فۆکەس دەخەنە سەر شێواز و زانیاری.
بە بڕوای من کلیلی ئەو دو ڕێگەیە لێ زانینە مرۆڤ ئەگەر لە ئیشێکی دیاریکراودا لێزان بێت ئەوا هەست و سۆزی بەرامبەر خۆی و بەرامبەر ژیان چاکتر دەبێت.

پرسیار: باشترین ئامۆژگاری بۆ هاندانی خەڵك چییە؟

وەڵام: یەکەم، پێویستە خۆت پێشەنگێکی باش بیت، ئینجا وا لە بەرامبەرەکەت بکە متمانەی تەواوی بە توانا و بەهاکانی خۆی تێدا بچەسپێت، ئەمەش تەنیا هەر بە قسەنا، بەڵکو لەڕێی پاداشت و خەڵات و سیستمی هاندانەوە. پێویستە بزانین هەم پاڵنەرە ناوەکییەکان گرنگن هەم دەرەکییەکانیش. ئەو مەشخەڵەی کە لەناخی مرۆڤدا هەیە وەکو کۆمەڵێك دەنکە شقارتە وایە، پێویستە تۆ دانەیەکیان دابگیرسێنیت بۆئەوەی بە گەرما و تینی ئەو دەنکە داگیرساوە، دەنکە شقارتەکانی دیکە دابگیرسێنیت. من لە وتاری ورە بەرزکردنەوەدا (خرۆشێندا) شارەزا نیم بەڵام باوەڕم بە جۆش و خرۆش هەیە. بڕوام بەو قسەیەی (کین بلانچارد) هەیە دەربارەی ئەو شتانەی پاڵ بە مرۆڤەوە دەنێن کارێکی دیاریکراو بەباشی ئەنجام بدەن. مرۆڤ پێویستی بە ڕێزگرتن هەیە و بەوەی کە هەست بکات بەهای بۆ دانراوە، ئەمە ڕاستە، بەڵام پێویستیشی بەوە هەیە کە ئەو کارەی پێی سپێردراوە گرنگە و شایانی ئەوپەڕی خۆ ماندوکردن و بەخشش هەیە.

پرسیار: لە جیهانی ئینتەرنێتدا مرۆڤ دەتوانێت پەیوەندیش ببەستێت بێئەوەی کەسەکە روبەڕو ببینێت. ئایا چۆن دەتوانین سود لەم تەکنەلۆجیایە وەربگرین بۆ زیادکردنی شارەزایی لە کارێکدا کە پەیوەندییە کەسێتییەکان زۆر ڕاستەوخۆ نین؟

وەڵام: بە بۆچونی من ئەگەر پەیوەندییەکی باش و بەردەوام مەیسەر ببێت، تەکنەلۆجیا لە دور مەودا سودی دەبێت. بونی پەیوەندی باش وات لێ دەکات باشتر کار بکەیت و باشتر بیر بکەیتەوە. تەکنەلۆجیا دەتوانێت بتکاتە کەسێکی لێهاتو بەڵام ناتوانێت شوێنی پەیوەندییەکان بگرێتەوە. ئەو ڕاستییەت بیر نەچێت کە لە مەسەلەی پەیوەندییەکاندا (خێرا هێواشە و هێواش خێرایە). تەکنەلۆجیا وەکو جەستەی مرۆڤ وایە کە خزمەتکارێکی باشە بەڵام ئاغایەکی خراپە.

# بەشی دەهەم

## تێکەڵکردنی دەنگەکان
## گەڕان بە دوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا
## جیاوازی

اسەرکردەکان لە ناکۆکی ناترسن و نایشارنەوە و پەراوێزیشی ناخەن، بەڵکو بە فرسەتێکی دەزانن)

- وارن پێنیس

من باوەڕی تەواوم هەیە کە یەکێك لە ململانێ گەورەکانی ئەم ژیانە، چ لەناو ماڵدا یان لە شوێنی کاردا یان لە هەر شوێنێکی دیکەدا بریتییە لەوەی چۆن مامەڵە دەکەیت لەگەڵ جیاوازییەکاندا و لەگەڵ جیاوازییە مرۆییەکاندا. بۆئەوەی بزانیت قسەکەم راستە یان نا بیر لەو تەحەدایانە بکەرەوە کە دێنە رێت. ئێستا لە دڵی خۆتدا دەڵێیت ئای چەند خۆش دەبو رەوشت و شارەزایی ئەوەم هەبوایە ناکۆکییەکان بە هەماهەنگی و هاودەستی چارەسەر بکەم، واتە چارەسەرێکی باشتر لەو رێگە چارەیەی کە هەر لایەنێك بە تەنیا پێشکەشی دەکات؟ ئامادەیی و توانای گەیشتن بەمجۆرە چارانە و ئەم هاوکارییە خولقێنەرە لەسەر بناغەیەك بنیاد دەنرێت کە لەسەر ئاستی کەسێتی پێکهاتبێت لە دەسەڵاتی رەوشتی و لەسەر ئاستی پەیوەندییەکانیش پێکهاتبێت لە متمانە.




شێوەی ١٠-١

جارێکیان گوێم لە نەوەیەکی گاندی بو (ناروون گاندی) کە بە بەرچاو روونییەکی زۆرەوە باسی باپیری خۆی دەکرد. وتارەکە کارێکی گەورەی کردە سەر ئامادەبوان:

"ڕەنگە مایەی سەرسامی هەمو لایەکتان بێت گەر بڵێم ئەگەر ڕەگەز پەرستی و جودایی نەبونایە، (گاندی)یشمان نەدەبو. ڕەنگە تەنیا ببوایە بە پارێزەرێکی سەرکەوتوی دەوڵەمەند. بەڵام بەهۆی ئەو ڕەگەز پەرستییەی کە لە ئەفریقای باشوردا هەبو، گاندی هەر لە یەکەم هەفتەی گەیشتنیدا لەوێ سوکایەتی پێ کرا. لە شەمەندەفەرەکە دەرکرا چونکە سپی پێست نەبو، ئەمە هێندە هەستی بریندار کرد کە ئەو شەوە تا بەیانی لە ئیستگەکەدا مایەوە و بیری لەوە دەکردەوە چۆن بتوانێت دادپەروەری بەدی بهێنێت. کاردانەوەی یەکەمی بەرامبەر سوکایەتیپێکردنەکە بریتی بو لە توڕەبون. هێندە توڕەبو کە داوای ئەو دادپەروەرییە بکات کە دەڵێت ئەگەر چاوێکیان دەرهێنایت تۆش چاوێکیان دەربهێنەرەوە. ویستی توندوتیژی دژی ئەو کەسانە بەکاربهێنێت کە سوکایەتیان پێکرد. بەڵام خۆی ڕاگرت و وتی: ئەمە ڕاست

نیيە و هیچ دادپەروەرییەك ناهێنێتە ئاراوە. کاردانەوەی دووەم ئەوەبو ویستی بگەڕێتەوە بۆ هندستان و لەناو گەلەکەیدا نابڕومەندانە بژی. بەڵام ئەم بڕیارەشی وەلانا و وتی: مرۆڤ نابێت لە کێشەکان رابکات، پێویستە بمێنێتەوە و بەرەنگارییان بکات. لەمەوە گەیشتە هەڵبژاردەی سێیەم، کە بریتییە لە کاردانەوە بە شێوازێکی دور لە توندوتیژی. لەو چرکە ساتەوە ئیتر گاندی فەلسەفەی (نا توندوتیژی)ی برەو پێداو کەوتە پەیڕەوکردنی ئەو فەلسەفەیە لە ژیانی خۆیدا و لە خەباتیشدا بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری لە ئەفریقای باشوردا. بەم جۆرە ماوەی بیست و دوو ساڵ لە ئەفریقای باشور مایەوە و ئینجا گەڕایەوە و رابەرایەتی بزوتنەوەکەی کرد لە هندستاندا".

هەڵبژاردەی سێیەم بریتییە لە: نە رێگەی تۆو نە رێگەی من، بەڵکو رێگەی هەردووکمان.

مەبەست لەم هەڵبژاردەیە سازشێك نییە بەوەی شوێنێك هەڵببژێریت لە ناوەڕاستی رێگەکەی من و رێگەکەی تۆدا. بەڵکو لە سازش چاکترە. هەڵبژاردەی سێیەم بریتییە لەوەی کە بوزییەکان پێی دەڵێن (رێگەی ناوەند)، رێگەیەکە لە ناوەڕست و لەسەروی هەردو رێگەکەدایەو لە هەردوکیشیان چاکترە، رێك وەکو ئوك و لوتکەی سێگۆشە. هەڵبژاردەی سێیەم هەڵبژاردەیەکە باشتر لەو هەڵبژاردانەی کە پێشکەش کراون، ئەوە بەڕاستی دەرەنجامی هەوڵێکی خولقێنەری هاوبەشە. لە هاوکاریی خولقێنەری دوو کەس یاخود زیاتر لە دوو کەسەوە دروست دەبێت. بەرهەمی راشکاو و ئارەزوی ئەوانەیە کە بەڕاستی گوێ لەیەکتری دەگرن و بەدوای رێگە چارەیەکدا دەگەڕێن. کە تۆ رێگەی سێیەم هەڵدەبژێریت بە وردیی نازانیت مەسەلەکە چۆن کۆتایی دێت. هەرئەوەندە دڵنیایت کە بارودۆخەکە لەمەی ئێستا چاکتر دەبێت. لە سێ پێکهاتەکەی ناوەرۆك و رۆح و پاڵنەر، لانی کەم یەکێکیان دەگۆڕدرێت و لەوانەشە دوانیان و بگرە هەرسێکیان گۆڕانیان بەسەردا بێت.

ئەڵتەرناتیڤی سێیەم، وەك چۆن لە چیرۆکەکەی گاندیدا بینیمان، هەمیشە لە ناخی مرۆڤەکەوە دەست پێدەکات، بەڵام زۆرجار پێویستی بە پاڵنەرێك هەیە، بەهێزی بارودۆخێك. بۆ نمونە یەکێك دژایەتیت بکات. هەتا ئەو پاڵنەرە نەبێت زەحمەتە تۆ لەناخی خۆتدا دەست بکەیت بە گەڕان بەدوای هەڵبژاردەی سێیەمدا. لە قسەکانی ئەوەکەی گاندیدا تێبینی پەیوەندی نێوان دوو ململانێمان کرد. ململانێیەك کە لەناخی خودی گاندی رویداو ململانێی پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکیدا. گاندی پێش

ئەوەی بتوانێت تەحەدای پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەڵکیدا چارەسەر بکات، پێویستی بەوە هەبو لەگەڵ ناخی خۆیدا هەوڵێکی گەورە بدات.

## ئەقلییەتی گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا

(گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا) وەك چۆن راهێنانی شناوکردنمان کردە نمونەیەکی باش بۆ روونکردنەوەی مەسەلەی سەرکەوتنی کەسێتی، پێم باشە یاری (دەستشکاندنەوە)ش بکەم بە نمونەیەك بۆ روونکردنەوەی دەزگای بیرکردنەوە و دەزگای شارەزاییەکانی پەیوەست بە گەڕان و گەیشتنە ئەڵتەرناتیڤێکی راستەقینەی سێیەم. لە موحازەرەکانمدا دەربارەی ئەڵتەرناتیڤی سێیەم هەمیشە من داوا لە ئامادەبوان دەکەم خۆبەخشێکی بەهێز بنێرن تا بە بەرچاوی خۆیانەوە دەستشکاندنەوەی لەگەڵدا بکەم. هەمو جارێکیش کە خۆبەخشەکە دێتە پێشەوە، من بەزمانێکی زبر قسەی لەگەڵدا دەکەم و پێی دەڵێم دەدۆڕێیت. باسی هێز و شارەزایی خۆمی بۆ دەکەم و پێی دەڵێم کە گوایە من لە یاری دەستشکاندنەوەدا پاڵەوانم. ئینجا پێش دەستپێکردنی یارییەکە داوای لێ دەکەم بە دەنگی بەرز هاوار بکات بڵێ: "من دەدۆڕێم" کە زۆرجار بەقسەم دەکات. پێی دەڵێم مەسەلەکە پەیوەندی بە قەبارە و پەیکەرەوە نییە، بەڵکو هونەر و تەکنیکە و من خاوەنی تەکنیکێکم کە ئەو هەر ناویشی نەبیستووە. وردە وردەقسەکانم زبرتر دەبن و دەکەومە گاڵتە پێکردنی. تا لێرەدا وەك مەبەستمە — ئامادەبوان دەبنە لایەنگری ئەو و سۆزیان بۆی دەجوڵێت.

ئینجا خۆمان بۆ دەستشکاندنەوەکە ئامادە دەکەین بەوەی هەریەکەمان قاچی راستی خۆی لە بەرامبەر قاچی راستی ئەوی دیکە دابنێت و دەستی ئەوی دیکە لە ناوەڕاستدا بگرێت. ئینجا داوا لە ئامادەبوان دەکەم پارە ببەخشن بە یارییەکە، واتە ئەگەر رکابەرەکە دەستی منی شکاندەوە دۆلارێکی بدەنێ بەڵام ئەگەر من دەستی ئەوم شکاندەوە دۆلارەکە دەن بە من، ئەوانیش هەمیشە دەڵێن باشە. ئینجا داوا لە تەماشاچییەکی نزیك دەکەم دەستپێکردنی یارییەکە رابگەیەنێت و بیژمێرێت بزانێت کێ چەندجار دەستی ئەوی دیکە دەشکێنێتەوە، پاشان هەوڵ دەدەم بزانم ئەوانەی کە گوایە پارەی یارییەکەیان لەئەستۆ گرتووە، بەشی ئەوە پارەیان پێیە.

کە یارییەکە دەست پێدەکات من یەکسەر قۆڵم شل دەکەمەوە و ئەویش خێرا

دەیشکێنێتەوە و تەختی دەکات. بێگومان ئەو بەمە توشی شڵەژان و سەرسوڕمان دەبێت چونکە من هیچ بەربەرەکانییەکم نەکرد. جارێکی دیکە دەست پێدەکەینەوە، بەڵام ئەمجارەش و جاری دووەمیش و سێیەمیش و چوارەمیش رێی پێدەدەم دەستم بشکێنێتەوە و هەمو جارێکیش چاوەڕوانە من بەربەرەکانییەك بنوێنم. ئینجا پێی دەڵێم: گرنگ ئەوەیە من و تۆ پێکەوە پارەیەکی زۆرمان دەست بکەوێت. دیارە ئەمە سەرنجی رادەکێشێت بەڵام چونکە سەرەتا کە هاتە ناو یارییەکەوە من ناوا بە زبری هێرشم کردە سەری، لەبەر ئەوە ناتوانێت باوەڕم پێبکات. رەنگە وابزانێت ئەم خۆشلکردنەی ئێستام تەنیا بۆ ئەمینکردنەوەی ئەوە و شتێکی دیکەم لەژێر سەردایە. بەڵام کە دەبینێت من بەردەوام دەستی خۆمی بۆ شل دەکەم بە ئاسانی بیشکێنێتەوە، ئیتر ویژدانی ئەویش وردە وردە وای لێ دێت رۆڵی پارێزەری من ببینێت و زیاتر لە پێشنیارەکەم تێدەگات کە ئەگەر هەردووکمان براوەبین پارەیەکی زیاترمان دەست دەکەوێت. بەم جۆرە و پاش دوودڵی و ململانێیەکی زۆری ناوخۆیی رێم پێدەدات یەکجار دەستی ئەو بشکێنمەوە.

ئینجا دوای ئەوە یارییەکە دەست پێدەکەینەوە و بێ هیچ بەرگریکردنێك رێی پێدەدەم بیباتەوە. دیارە هەمو خۆبەخشەکان وەکو یەك نین و جاری وا هەیە بە ئاسانی لە ئەخشەکەی من تێناگەن. پاشان فێری ئەوەیان دەکەم کە لەباتی ئەوەی هەمو قۆڵمان بخەینە کار، تەنیا مەچەکمان بجوڵێنین کە پێنج ئەوەی قۆڵ جوڵاندنەکە خێرایە. پاشان هەردوو قۆڵمان بەکاردەهێنین و ئەنجامەکە دوو بەرابەر دەکەین لە کۆتایشدا پێی دەڵێم: ئێستا ئیتر بڕۆ سەر جێگاکەی خۆت و ئەو پارەیە ببژێرە کە پێمان دەدەن و لەبەرچاوی خۆشیاندا دەستشکاندنەوەکە دەکەینەوەئیتر هۆڵەکە دەبێتە غەڵبەغەڵب و هەمو لایەك لە پەیامەکە تێدەگەن.

| |
|---|
| ئەوانەی تاقیکردنەوەی زیرەکی جێبەجێکاریان XQ بۆ کراوە تەنیا (٢\١١)یان دەڵێن: لە ژینگەیەکدا کاردەکەن کەبیرکردنەوە بەشێوازی براوە — براوە باڵادەستە |

دوای ئەوە من بۆ گوگوێگرەکانی روون دەکەمەوە کە بیرکردنەوە بە شێوازی براوە — براوە. سیستمی بیرکردنەوەیە بۆ گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیفی سێیەمدا. بیرۆکە و پرنسیپی رێزگرتنی یەکدی و سوودی بەرانبەرە. لە یاری دەستشکاندنەوەکەدا

هەرچەندە من خۆم وا نیشان دەدا کە هەرە باشترین و هەرە بەهێزترین و هەرە نازاترینم بۆ ئەوەی رکابەرەکەم وا لێبکەم بەشێوازی (براوە— دۆڕاو) رەفتار بکات بەڵام لەڕاستیدا سیستمی ئەو بیرکردنەوەیەم کاراکرد لەکاتی یارییەکەدا کە هەردوکمان براوەین.

پاشان راستەوخۆ هەوڵم خستەگەڕ بەرژەوەندی ئەو بەدی بهێنم بەوەی کە بێ هیچ بەرەنگارییەك یارییەکە بباتەوە. ئینجا دوای ئەوەی کە کرایەوە و لوت بەرزییەکەی تەماو تەواو هەستی بە گوناح کرد ئامادەیی تێدا دروست بو ئەو بیرۆکەیە قبوڵ بکات کە ئەگەر پارمەتی یەکدی بدەین هەریەکەمان قازانجی زیاتری دەست دەکەوێت. پاشان ئەم تێگەیشتنە هێندە فێری داهێنانی کردین کە مەچەکمان بەخێرایی بە چەپ و راستدا بجوڵێنین و ئینجا دەستەکانی دیکەش. ئەنجامەکەشی بەڕاستی ئەنجامێکی خوڵقێنەر بو بەوەی کە هەریەکەمان قازانجی زۆرمان کەوتە دەست. هەروەها ئەو کەسانەش کە پارەکەیان دابین کرد ئەوانیش قازانجیان کرد چونکە شتێکی گرنگ فێربون. بێگومان دواجار هیچ پارەیەکی تیانەدرا، بەڵام رێگەیەکی زۆر خۆش و ئاشکراو کاریگەر بو بۆ روونکردنەوەی چۆنێتی گەڕان بە شوێن ئەڵتەرناتیفی سێیەم و دۆزینەوەیدا.

من وەك چۆن لە راهێنانی شناودا بۆ روونکردنەوەی سەرکەوتنە کەسێتییەکان سودم لە توانای ناخی خۆم و لە هەستکردن بە ئارامی و ئاسایش وەرگرت، ئاواش ئەو هەست و توانایەم بەکارهێنا بۆ دروستکردنی متمانە و گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیفی سێیەمدا. من بەو کارەم هەستێکی کاریگەرم لەناخی رکابەرەکەمدا جوڵاند کە هەستکردنێکی قوڵە بۆ ململانێ و وام لێ کرد بەشێوازی (براوە —دۆڕاو) بیربکاتەوە. تا ئەو ئەندازەیەی لەناخی خۆیدا بڵێت (بە هیچ شێوەیەك رێگە نادەم ئەو سەر روتاوە هیچ و پوچە لێم بباتەوە) لەبەر ئەوە ناچاربوم پشو درێژبم لە بەرامبەر کاردانەوە توندەکانی ئەو کە ناهەقیشی ناگرم چونکە من بە ئەنقەست هێرشم دەکردە سەری و قسەی ناخۆشم پێدەوت.

زۆر کەس وا دەزانێت کە پێویستە هەردوو لایەنەکە بەم شێوەیە بیربکەنەوە، شێوازی بەدیهێنانی سود بۆ هەموان. بەڵام مەسەلەکە وا نییە. پێویستە تەنیا (یەك) لایەن ئاوا بیربکاتەوە. هەروەها زۆر کەس وا دەزانن کە پێویستە لایەنەکەی دیکە هاوکار بێت، بەڵام هاوکاریکردنی خوڵقێنەر کە ئەڵتەرناتیفە سێیەمییەکانی لێ دەکەوێتەوە لە قۆناغی دواتردا دێت، واتە پاش یەکترتەواوکردنەکە. یەکەمجار پێویستە

لەڕێی نیشاندانی هاوسۆزی و گوێگرتنی قوڵەوە بەرامبەرەکەت بۆ ئەم هاوکارییە ئامادە بکەیت و هەوڵ بدەیت سودی ئەویش دەستەبەر ببێت و ئەم کارە بەردەوامیی هەبێت تا ئەو کاتەی لایەنی بەرامبەر بڕوا و متمانەت پێدەکات.

من جارێکیان ئەم ڕاهێنانەم لە بەرنامەکەی (ئۆپێرا)دا جێبەجێ کرد و هەوڵێکی زۆرم دا بۆئەوەی خاتونە بەرهەمهێنەکە ڕێگەم بدات ڕاهێنانەکە نمایش بکەم لەو بەرنامە تەلەفزیۆنییەدا. کێشەکە ئەوەیە کە مەسەلەکە خۆڕسك بێت و کەس نەزانێت دواتر چی ڕودەدات، یان لانی کەم خودی ئۆپێرا نەزانێت. خاتونە بەرهەمهێنەکە لە سەرێکەوە ترسی ئەوەی هەبو نەتوانێت بابەتەکە کۆنترۆڵ بکات و لە سەرێکی دیکەشەوە حەزی لێ بو بەرنامەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش پێشکەش بکرێت، بۆیە زۆر دوودڵ و پەشۆکاو بو. بەڵام من بەردەوام هەوڵم دەدا ئەمیش و ئۆپێراش دڵنیا بکەمەوە و سەرەنجام هەردووکیان ڕازی بون.

لەکاتی پەخشی ڕاستەوخۆدا هێرشم کردە سەر ئۆپێرا و پێم وت تۆ لاوازیت و من بەهێزم و بە چاوتروکاندنێك لێت دەبەمەوە. بەجۆرێك تورەم کرد کە هەوڵ بدات هەمو تواناکانی بخاتە کار دەستم بشکێنێتەوە و تەختی مێزەکەی بکات. پێم وت: ئۆپێرا، بۆچی هەردووکمان براوە نەبین؟

وتی: مەحاڵە.

وتم: بۆچی؟

وتی: چونکە من لەسەر شەقام پەروەردە بوم و هەر کەسێك ئاوا قسەم لەگەڵدا بکات من باوەڕی پێناکەم.

وتم: باشە دەی با ئەمجارەش دەستت بۆ شل بکەم تا بیبەیتەوە.

وتی: ڕاست ناکەی. (متمانەی پێ نەدەکردم).

وتم: تەماشاکە، ئەمناوا دەستمت بۆ شل دەکەم بۆ ئەوەی تەختی بکەیت و دۆلارێکی دیکەش ببەیتەوە کە ئەزانم زۆرت پێویستە.

یارییەکە خۆش بو، لەکۆتاییشدا هەمو لایەك وانەکە تێگەیشتن.

حیکمەتێکی کۆنی خۆرهەڵاتی هەیە دەڵێت: یەك وێنە هەزار وشە دەهێنێت. بە بڕوای من یەك ئەزمون نرخی هەزار وێنەی هەیە. کە بینەر تەماشای ئەم دەستشکاندنەوەیە دەکات نرخی هەزار وشەی هەیە، بەڵام ئەزمونی بەشداربووەکە

هەزار وێنە دەهێنێت. تۆی خوێنەر رەنگە لە مێشکی خۆتدا بایەخی مەسەلەکە تێبگەیت بەڵام ئەگەر دەتەوێت بزانیت چ هێزێکی کاریگەری هەیە ئەوا لەگەڵ کەسێکی نزیکی خۆتدا تاقی بکەرەوە.

وەك دەبینیت کەم کەس ئەم ئەرکە قورسە دەگرنە ئەستۆ کە پێویستی بەوە هەیە بیر لە سودی هەموان بکەیتەوە و هەوڵ بدەیت لە پێناوی گەیشتنە ئەڵتەرناتیفی سێیەمدا هەوڵ بدەیت لە بەرامبەرەکەت تێبگەیت. لەڕاستیدا مەسەلەکە پێش هەمو شتێك پێویستی بە سەرکەوتنی کەسێتی هەیە، پێویستی بەوە هەیە کە لەسەر ئاستی کەسێتیدا سەرکەوتنێکی هێندە گەورەت بەدەستهێنابێت کە هەستکردنت بە ئاسایش شتێکی هەڵقوڵاوی ناخی خۆت بێت نەك هی ئەوەی کە لەسەر حەقیت یاخود خەڵکەکە رایان وایە لەسەرت. هێز لەوەدایە رەخنەت قبوڵ بێت چونکە لەناخی خۆتدا وات لێ دەکات هەست بە هاوئاهەنگی بکەیت لەگەڵ سیستمی بەها تایبەتەکانی خۆتدا کە پشتیان بە پرنسیپەکان بەستوە و هەستی ئاسایش و متمانە بە خۆکردنیان پێبەخشیویت. ئەمە وات لێ دەکات کراوەیی و ئەرمونیانیی خۆتت پێ قبوڵ بکرێت و لە هەمان کاتیشدا توانای ئەوەت پێدەبەخشێت بڕۆیت و بگەڕێیت بێئەوەی بزانیت دەگەیتە کوێ؟ چونکە دڵنیایت لەوەی بگەیتە هەر شوێنێك لەو شوێنە چاکترە کە خاڵی دەستپێکی خۆت و لایەنەکەی بەرامبەرتە.

## سیستمی شارەزاییەکانی گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا

بێگومان گرنگترین شارەزایی لەم ژیانەدا مەسەلەی پەیوەندییە. پەیوەندییەکانیش چوار جۆری سەرەکیین: خوێندنەوە و نوسین و قسەکردن و گوێگرتن. زۆربەی خەڵك لەکاتی بێدارییاندا سێ لەسەر چواری کاتەکانیان و بگرە زیاتریش لەم چوار کردەوەیەدا بەسەردەبەن. گوێگرتن ٤٠٪ - ٥٠٪ی تێکڕای ئەو کاتە پێك دەهێنێت کە ئێمە لە پەیوەندیدا بەسەری دەبەین، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کەمترین شارەزاییمان تێیدا هەیە لەچاو جۆرەکانی دیکەی پەیوەندیدا. بەشی زۆرمان چەندین ساڵمان لە راهێنانی سەر خوێندنەوە و نوسین و قسەکردندا بەسەربردووە کەچی رێژەی ئەو کەسانەی کە دوو هەفتە زیاتر راهێنانی سەر گوێگرتنیان وەرگرتووە لە ٥٪ کەمترە.

زۆرینەی خەڵك لەبەر ئەوەی هەمیشە خەریکی گوێگرتنن ئیتر وا دەزانن شارەزای گوێگرتنن، بەڵام لەڕاستیدا بەدڵ گوێ لە بەرامبەرەکە ناگرن.

> تەنیا ١٧٪ی کرێکاران باوەڕیان وایە پەیوەندییەکان لە دەزگاکانیاندا ڕێزو پاکی و ڕاشکاویی تێدایە

لە شێوەکەی خوارەوەدا (شێوەی ١٠-٢) پێنج ئاستی گوێگرتن ئاماژەیان پێکراوە کە پێی دەوترێت شەبەنگی گوێگرتن. ئەو پێنج ئاستەش بریتین لە: گوێ پێنەدان، بەدرۆوە گوێگرتن، گوێگرتنی هەڵبژاردەکاریی (ئینتیقائی، گوێ لەو وشانە بگریت کە خۆت دەتەوێن)، گوێگرتن بە وریاییەوە، بەدڵ گوێ لێگرتن (گوێگرتنی هاوسۆزانە). لەناو ئەو پێنج ئاراستەیەدا تەنیا جۆری پێنجەمە (بەدڵ گوێ لێگرتن - گوێگرتنی هاوسۆزیی) کە تێیدا خۆتت لەبیر دەچێتەوە و لە سیستمی بەها تایبەتەکانی خۆت و لە مێژووی تایبەتی خۆت دەردەچیت و ئیتر بە شێوازی خۆت حوکم لەسەر شتەکان نادەیت و بە قووڵی گوێ بۆ تێڕوانینەکانی ئەو دەگریت. ئەمە پێی دەوترێت گوێگرتنی هاوسۆزانە (بەدڵ گوێ لێگرتن) و لەڕاستیدا شارەزاییەکی زۆر دەگمەنە و دەتوانین بڵێین لە شارەزاییش گرنگترە.




شێوەی ١٠—٢

بۆ ئەوەی بایەخی گەورەی ئەم شارەزاییەت بۆ ڕوون ببێتەوە لە مەسەلەی پەیوەندییەکاندا داوات لێ دەکەم تاقیکردنەوەکەی خوارەوە ئەنجام بدە. دەتوانیت بەردەوام بیت لەسەر خوێندنەوە و تاقیکردنەوەکە لە مێشکی خۆتدا بەرجەستە بکەیت، بەڵام ئاستی فێربوونت لە تاقیکردنەوەکە و کاریگەرییەکەی لەسەرت زۆر کەمتر دەبێت لەوەی کە خۆت تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدەیت. زۆر بەلامەوە گرنگە بەشداری

بکەیت. رەنگە تۆ لە کتێبەکانی پێشودا تاقیت کردبێتەوە، بەڵام وێنەکانی ناو ئەم تاقیکردنەوەیە جیاوازن. دووپاتکردنەوەی تاقیکردنەوەکە مەبەستەکەت باشتر فێردەکات و پاڵنەرێکی بەهێزتریش دەبێت بۆئەوەی بەپێی تاقیکردنەوەکە رەفتار بکەیت. لەگەڵ کەسێکی دیکەدا پێکەوە تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدەن.

یەکەم جار تەنیا خۆت (تکایە تەنیا خۆت) ماوەی تەنیا چرکەیەک تەماشای شێوەی (١٠ - ٣) بکە، پاشان بەبێ ئەوەی خۆت بە هیچ جۆرێک تەماشای بکەیت، داوا لە هاوکارەکەت بکە تەماشای شێوەی ژمارە (١٠—٤) بکات لە لاپەرە ٢٧٠دا. لە کۆتاییشدا هەردوکتان پێکەوە تەماشای شێوەی (١٠—٨) بکەن لە لاپەرە ٢٩٠دا ئینجا ئێستا با بەردەوام بین لەسەر تاقیکردنەوەکە. هەر یەکێك لە ئێوە کە تەماشای شێوەی (١٠ - ٨) کرد چی بینی؟



شێوەی ١٠—٣

ئایا وێنەکە وێنەی خانمێکی گەنجە؟ یاخود وێنەی کابرایەکە ئامێری (سەکسیفۆن) لێدەدات؟

کامتان لەسەر هەقن؟

بۆ هاوکارەکەتی باس بکە کە تۆ لەو وێنەیەدا چی دەبینیت.

ئینجا زۆر بەوردی گوێ لەو بگرە بزانە ئەو چی دەبینێت لە شێوەکەدا.

پاشان کە گۆشە نیگای ئەو تێگەیشتیت، گۆشە نیگای خۆتی بۆ روون بکەرەوە.

هەوڵی لەگەڵدا بدە و هاوکاری بکە بۆ ئەوەی ئەویش ئەو شتە ببینێت کە تۆ دەیبینیت.

ئایا سەرچاوەی ئەو جیاوازییە چی‌یە کە هەریەکەتان وێنەکە بە جۆرێکی جیاواز دەبینن؟ تەماشای هەردوو وێنەکەی یەکەمجار بکە کە هەریەکەتان تەنیا یەکێکتان بەجیا بینیبوو.

باشە ئەگەر هاوکارەکەت یەکەمجار وێنەی کابرا مۆسیقاژەنەکەی بدیایە، ئایا شێوەکەی دواجاریشی هەر بە مۆسیقا لێك دەدایەوە؟ بێگومان بەڵێ.

من هەمو جارێك کە ئەم تاقیکرنەوە سادەیە لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئامادەبواندا ئەنجام دەدەم، وێنەی خانمە گەنجەکە نیشانی نیوەیان دەدەم و نیوەکەی دیکەش وێنەی کابرا مۆسیقاژەنەکەیان نیشان دەدەم. پاشان وێنە ئاوێتەکراوەکەی سێیەم نیشانی هەمویان دەدەم. نیوەیان دەڵێن خانمێکی گەنجە، بەڵام نیوەکەی دیکەیان کابرایەکی مۆسیقاژەن دەبینن؛ بێگومان کەم جار بەوجۆرە نابێت. پوختەی بیرۆکەکە ئەوەیە کە هەر گروپە و لە لێکدانەوەیەکی جیاوازەوە تەماشای وێنەکە دەکات.

> بیرکردنەوەی خوڵقێنەر – بریتییە لەوەی نمونە باوەکان تێک بشکێنێت بەمەبەستی ئەوەی بەشێوەیەکی جیاواز تەماشای مەسەلەکان بکات
>
> - ئیدوارد دو بۆنۆ. دانەری کتێبی بیرکردنەوەی لابەلا

دوای ئەمە، روداوێکی سەرنجڕاکێش لەم خولی راهێنانەدا رودەدات کە ئەزمونێکی زۆر کاریگەرە لە بواری فێربووندا. هەردوو گروپەکە تەماشای یەك بابەت دەکەن بەڵام شتێکی جیاواز دەبینن، لەبەرئەوە داوا لە تیمەکەی ئەملا دەکەم گفتوگۆ لەگەڵ تیمەکەی دیکەدا بکات کە وێنەکە بەشێوەیەکی جیاواز دەبینێت. دوای لێدەکەم قسەی لەگەڵدا بکات و بەڕاستیش گوێی لێ بگرێت بۆ ئەوەی لەباری سەرنجی ئەو تێبگات. ئینجا کە لەیەکتری حاڵی بوون غەڵبە غەڵب لە هۆڵەکەدا بڵند دەبێتەوە. دیارە هەندێك کەس درەنگتر لە مەبەستەکە تێ دەگەن و هەندێکی دیکەشیان دەکەونە چەلەحانێ و

هەست بە بێزاری دەکەن چونکە بەلایانەوە شتەکە زۆر ئاشکرایە و سور دەبن لەسەر بۆچونی خۆیان و وادەزانن شێوەکە تەنیا لەم رێیەی ئەوانەوە دەبینرێت. بەڵام لە بەرامبەریشدا خەڵکی دیکەم بینیوە کە لەگەڵ یەکتریدا بە گەرموگوڕی گوێ لەیەکدی دەگرن و زۆر خۆشحاڵن بەوەی شێوەکەی کە بینیویانە روویەکی دیکەشی هەیە.

ئێمە لەم تاقیکردنەوەیەدا چوار مەسەلەی زۆر گرنگ سەبارەت بە پەیوەندیکردن فێردەبین:

١. پێویستە لەگەڵ لایەنەکی دیکەدا تەواو کراوە بیت و گوێی لێ بگریت بۆ ئەوەی تێبگەیت کە ئەو چی دەبینێت و بۆچی ئاوای دەبینێت.دیارە ئەمەش بەردی بناغەی گەرانە بەدوای ئەڵتەرناتیفی سێیەمدا.

٢. ئەو ئەزموونەی کە پێشبینی زانیارییە نوێیەکە تیایدا تێدەپەڕێت کاریگەری گەورەی دەبێت لەسەر چۆنێتی تێگەیشتن لەو زانیارییە. ئەگەر تەنیا (یەك) چرکە ئەزمونی پێشوەخت جەماوەرەکە بکات بە دوو کەرتەوە ئەی ئاخۆ تەمەنێك ئەزمون و ئامادەکاری پێشوەخت چ کاریگەرییەکی دەبێت.

ئەی خێزانەکەت چی؟ ئەوان چۆن مەسەلەکان لێك دەدەنەوە؟ رەنگە خەڵك پێکەوە تەماشای هەقیقەت بکەن، بەڵام لە لێکدانەوەی ئەو هەقیقەتەدا پەنا بۆ ئەزمونە تایبەتەکانی خۆیان دەبەن کە پێشتر وەریان گرتووە. مرۆڤ هەمیشە واتا دادەهێنێت و لەسەر ئەو بناغەیە رەفتار دەکات کە دنیای پێ حاڵی بووە. بیرت نەچێت ئێمە دنیا بەو شێوەیە نابینین کە هەیە بەڵکو بەو شێوەیە دەیبینین کە خۆمان هەین. مرۆڤ پێش ئەوەی هەوڵبدات هاوکاریی خوڵقێنەر لەگەڵ کەسێکدا دروست بکات پێویستە بزانێت ئەو کەسە چۆن لە دنیا تێگەیشتووە. گرنگترین مەرج بۆ بەدیهێنانی لێك تێگەیشتن بریتییە لە پەیوەندی.

٣. لە دنیادا هیچ بابەت و مەسەلەیەك نییە تەنیا هەریەك لێکدانەوەی هەبێت، لەبەرئەوە دەستکەوتی مەزن ئەوەیە تێڕوانینێکی هاوبەش بدۆزینەوە کە بتوانێت راست و راستگۆیانە هەمو تێڕوانینە جیاوازەکان رەچاو بکات و لە هەمان کاتیشدا بگونجێت لەگەڵ تێڕوانینە بنەڕەتییەکەدا. ئەگەر کێشە و مەسەلەکان لەلایەن خەڵکی جیاجیاوە لێکدانەوەی جیاجیایان بۆکرا، ئەو کاتە کێ لەسەر هەقە؟ کاتێك کە بیروبۆچونی تۆ لەگەڵ بیروبۆچونی هاوسەرەکەت و منداڵەکەت

ئاگونجێت کامتان لەسەرهەقن و کامتان ئەوی دیکە بە ناهەق دەزانێت؟
دیارە خەڵکە دەسەڵاتدارەکان و ئەوانەی کە پۆستی رەسمییان هەیە هەمیشە تەنیا یەك وەڵام بەڕاست دەزانن کە وەڵامەکەی خۆیانە.بەڵام وریابە مرۆڤ هەتاکو زیاتر وشەی (من) بەکاربهێنێت بۆ بەرجەستەکردنی لێکدانەوە و تێگەیشتنەکانی ئەوا زیاتر مێشکی دەبێتە بەرد و کاردانەوەکانیشی زیاتر و زیاتر دەپوکێنەوە.

٤. هۆکاری زۆربەی شکستەکانی بواری پەیوەندی خەتای ئەوەیە کە هەریەکەمان بەجۆرێکی تایبەت لە واتای وشەکان دەگەین. واتە وشەکان پێناسەی جیاجیایان هەیە. زۆرجار هاوسۆزی دەتوانێت ئەم کێشەیە دەستبەجێ چارسەر بکات، بۆچی؟ چونکە تۆ کاتێك بەدڵ گوێ لە کەسێك دەگریت بۆ ئەوەی لێی تێبگەیت وشەکانیت لێدەبێتە رەمزی واتاکان. کلیلە بنەڕەتیەکە لێرەدا تێگەیشتنی واتاکەیە نەك مشتومڕ لەسەر رەمزەکە.

با ئێستاش بگەڕێینەوە بۆ تاقیکردنەوەی پێشومان و بیهێنەرە بەرچاوی خۆت ئەگەر قەناعەتت وابو کە تۆ راست دەکەیت و ئەوەی تۆ بینیوتە هەقیقەتەکەیە و کابرای بەرامبەرت هەڵەیە، ئایا لە حاڵەتی وادا هەمو گفتوگۆیەك لەسەر ئەو وێنەیە نابێتە شەڕو حانەحەپەشێ؟ ئەگەر هاوێنەکەی کە تەماشای پێدەکەیت تەڵخ و شێواو بێت بەهۆی کاریگەری ئەم و ئەوەوە لەسەرت، ئەوا ناتوانیت شێوازی تێڕوانینی بەرامبەرەکەت بۆ بابەتەکە وا تێبگەیت کە تەواوکەری تێڕوانینی تۆیە ئینجا وەرە بزانە کابرا ئەگەر لەژێر کاریگەری ئەم و ئەودا گەیشتبێتە قەناعەتی تەواو کە هەر تەنیا تێڕوانینەکەی خۆی راستە و سەرباری ئەمەش، لە پۆستێکی رەسمی وادابێت کە هێزو دەسەڵاتی پێدەبەخشێت، ئیتر بزانە چۆن تەماشای کێشەکان دەکات و تا چ ئەندازەیەك راو بۆچونی خۆی بەسەر دەزگاکەدا دەسەپێنێت. دەسەڵاتداران مەسەلەکە زۆر ئاسان و ئاسایی نیشان دەدەن و بانگەوازی ئەوە دەکەن کە دەزگاکە وەکو جەستەیەکی یەك و یەکگرتو کاربکات، بەڵام ئەوانی خوارەوە لەم جۆرە بانگەوازانە بێزاربون و کار گەیشتۆتە ئەوەی کەلتوری باو کەلتوری (چاوەڕێ بکە تا خۆیان پێت رادەگەیەنن) بێت و هەمو جیاوازییەك نکوڵیلێکراو و پشتگوێخراوە. لەمەوە دەتوانیت بزانیت چ بێ سەروبەرییەك لەئەنجامدا رو دەکاتە دەزگاکە.



شێوەی ١٠-٤

مرۆڤ ئەگەر هەموو هێزی خۆی تەنیا لەو پۆستەوە وەرگرت کە هەیەتی و خۆی خاوەنی هیچ دەسەڵاتێکی رەوشتی نەبو ئەوا تۆوی لاوازیی لەناخی خۆی و ئەوانی دیکە و هەروەها لەناو پەیوەندییەکانیشدا دەچێنێت و هەریەکەو ئیشەکە دەخاتە ئەستۆی ئەوی دیکە و ئەم بەتەمای ئەو دەبێت.

## تێڵا هندییەکەی قسەکردن

پاش ئەوەی لە کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتووەکاندا مەشقم بەچەند سەرکردەیەکی هند کرد کە رابەرایەتی تیرە هندییەکانیان دەکرد، ئەو سەرکردانە لەکۆتایی خولەکەدا دیارییەکی جوانیان بۆ هێنام کە بریتی بو لە تێڵایەکی قسەکردن و بەوردی کاری هەڵکۆڵینی لەسەر کرابو. تێڵاکە پێنج پێ درێژبو، ناوی (وشەی) سیسارکە کەچەڵەی لەسەر نوسرابو. تێڵاکەی قسەکردن ماوەی چەندین سەدە رۆڵێکی گرنگی گێڕا لە حکومەتی ئەمریکییە رەسەنەکاندا. لەڕاستیدا هەندێك لە دامەزرێنەرەکانی کۆماری ئەمریکی – بەتایبەت بینیامین فرانکلین – سودی چاکیان لە بیرۆکەی ئەم تێڵای قسەکردنە وەرگرت کە سەرۆکە هندییەکانی (یەکێتی ئیرۆکیۆس) بەکاریان دەهێنا. ئەو تێڵایە یەکێکە لە کەرەسە هەرە بەهێزەکانی پەیوەندی کە تا ئێستا دیبێتم. هەرچەندە

ئامرازەکە کەرەسەیەکی سادەیە بەڵام بیرۆکەیەکی لەخۆیدا هەڵگرتووە کە مرۆڤ هان دەدات لەسەر یەکتر تەواوکردن (هاوکاریی خوڵقێنەر). تێلای قسەکردن ڕێگایەکە پارمەتی خەڵکی جۆراوجۆر دەدات بە ڕێزگرتنی یەکتری حاڵی ببن، ئەمەش پارمەتیدەریان دەبێت کە بە هاودەستبون لەگەڵ یەکتریدا جیاوازی و ناکۆکیەکان چارەسەر بکەن، یاخود هەر هیچ نەبێت بگەنە سازشێك. ڕێکەوتنی تیۆری پشت تێلای قسەکردن بریتییە لەمە. کە خەڵك پێکەوە کۆدەبنەوە، تێلاکەشی لێ دەبێت. تەنیا ئەو کەسە بۆی هەیە قسە بکات کە تێلاکەی بەدەستەوە بێت. چەندێك ئەو تێلایەت بەدەستەوە بێت بۆت هەیە تەنیا هەر خۆت قسە بکەیت و قسە بکەیت تا ئەو کاتەی کە هەست دەکەیت خەڵکەکە تێگەیشتون. لەو ماوەیەدا ڕێگە بە هیچ کەسێکی دیکە نادرێت بیرو بۆچونی خۆیان دەربڕن یاخود مشتومڕ دابمەزرێنن یاخود هەڵوێستی خۆیان دەربڕن لەسەر قسەکانی تۆ. تەنیا ڕێیان پێدراوە لەو ماوەیەدا هەوڵبدەن تێبگەن و گوزارشت لە تێگەییشتنەکانیان بکەن. تۆ بۆت هەیە داوایان لێبکەیت قسەکانی تۆ بڵێنەوە تا بزانن لێت تێگەیشتون، بەڵام ئەگەر هەستت کرد تێت نەگەیشتون پێویست بەوەش ناکات.

کە هەستت کرد لێت تێگەیشتون پێویستە تێلاکە بدەیتە کەسی پاش خۆت بۆئەوەی ئەویش بە نۆرەی خۆی قسە بکات و تۆ گوێی لێبگریت و هاوسۆزی لەگەڵدا بنوێنیت. تا تەواو دڵنیا دەبێت کە تێگەیشتویت. بەم شێوەیە هەمو لایەنە بەشدارەکان لەرێگەی قسەکردن و گوێگرتنەوە ئەرکی ئەوە دەگرنە ئەستۆ کە پەیوەندییەکی ١٠٠٪ بگاتە ئەنجام. مرۆڤ کە هەستی کرد بەرامبەرەکەی تێیگەیشتووە، شتێکی سەرنجڕاکێشی لێ ڕودەدات. وزە ئەرێنییەکە دەڕەوێتەوە و ناکۆکی نامێنێت و ڕێز لە یەکگرتن گەشە دەکات و خەڵکەکە دەبنە خەڵکی داهێنەر. لەمەشەوە بیرۆکەی تازە دروست دەبێت و ئەلتەرناتیفی سێیەم سەر هەڵدەدات. بیرت نەچێت کە تێگەیشتن لە بەرامبەرەکەت مانای وانییە قسەکانی بسەلمێنیت و هەرچییەکی وت بڵێی وایە. تێگەیشتن تەنیا مانای وایە هەر بە چاوی ئەو و ئەقڵی ئەو و بەدڵی ئەو و بەڕۆحی ئەو شتەکان ببینیت.

یەکێك لە پێویستییە هەرە قوڵەکانی ڕۆحی مرۆڤ ئەوەیە کە تێبگەن. کاتێك ئەم پێویستییە تێر دەکرێت ئیتر مێشکی مرۆڤ دەچێت بەلای چارەسەرکردنی کێشەکەوە بە هاوکاری لەگەڵ ئەوانی دیکەدا. بەڵام ئەگەر ئەم پێویستییە بەهێزەی لێ تێگەیشتن بە

تێرنەکراوی بمێنێتەوە ئەوا ئیتر دەست دەکات بە بەرگریلەخۆکردن. هەروەها ململانێی گەرموتوند سەر هەڵدەدات و ئەو پەیوەندییەش کە هەیە، تەنیا لەسەر بناغەی بەرگریلەخۆکردن و خۆپاراستن دەبێت. هەندێك جاریش ناکۆکی دروست دەبێت و رەنگە بگاتە ئاستی توندوتیژییش.

کۆئەندامی هەناسەی مرۆڤ چەند پێویستی بە هەوا هەیە، رۆحی مرۆڤیش هێندە پێویستی بەوە هەیە کە هەست بکات خەڵکەکە لێی تێگەیشتون. ئەگەر لەپرێکدا هیچ هەوایەك لە ژورەکەتدا نەما ئایا تۆ چۆن دەکەویتە پەلەقاژێی بەدەستهێنانی هەوا؟ ئایا لە بارودۆخی وادا گرنگترین مەسەلە بەلاتەوە مشتومڕ و یەکلاییکردنەوەی کێشەکانت دەبێت لەگەڵ ئەوانی دیکەدا یاخود هەڵمژینی هەوایە؟ بێگومان بەدەستهێنان و هەڵمژینی هەوایە و هەتا ئەوەت بۆ مەیسەر نەبێت بیرت لای شتەکانی دیکە نابێت. هەستکردن بەوەی خەڵکەکە تێت گەیشتون پێویستیەکە رێك ئەوەندەی هەوا گرنگە. هەوا لەڕوی جەستەییەوە گرنگە و لێ تێگەیشتنیش لەڕوی دەروونییەوە. ئەو پرۆسەیەی کە باسمان کرد، بەبێ تێلای قسەکردنیش دەکرێت. بەڵام هێندەی ئەو دیسپلینی تێدا نابێت کە بەرپرسیارێتی قسەکردن ئازایانە لە کەسێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی دیکە و بە هەمان ئازایەتی و دیسپلینەوە گوێگرتنەکە جددی و هاوسۆزانە بێت. تۆ لەجیاتی تێلاکە دەتوانیت قەڵەمێك، کەوچکێك، پارچە پەڕۆیەك یان هەر شتێکی دیکە بەکاربهێنێت. گرنگ ئەوەیە قسەکەر کە بۆی دەرکەوت بەرامبەرەکە لێی تێگەیشتووە ئیتر بەرپرسیارێتی قسەکردن بسپێرێت بە بەرامبەرەکە و هەتاکو هەست نەکات لێی تێگەیشتون پێویستە هەر ئەو قسە بکات. ئایا هەرگیز لە کۆبونەوەیەکدا دانیشتویت هەست بکەیت چەند ئەجێندایەکی نهێنی کۆبونەوەکە بەڕێوە دەبەن؟ بیربکەرەوە بزانە لە کۆبونەوەیەکی ئاوادا بەکارهێنانی تێلای قسەکردن چ کاریگەرییەکی دەبێت. ئەگەر دەزانیت بەکارهێنانی تێلای قسەکردن یاخود پێنوس کارێکی نەگونجاوە، خۆت چەمك و بیرۆکە بنەڕەتییەکە دەربڕە. لە سەرەتای کۆبونەوەکەدا پێش ئەوەی خەڵکەکە بکەونە ژێر کاریگەریی هەڵچونیان لە ئاست مەسەلە ئاڵۆزەکاندا تۆ قسە بکە. تەنانەت ئەگەر سەرۆکی کۆبونەوەکەش نەبویت هەر تۆ قسەی سەرەتا بکە و دەتوانیت بۆ نمونە بڵێیت:- ئەمڕۆ باسی کۆمەڵێك بابەتی گرنگ دەکەین کە بە لای هەمومانەوە زۆر هەستیارن. جا بۆ ئەوەی باشتر لە یەکتری

تێبگەین با بڕیار بدەین هیچ کەسێک قسە بە بەرامبەرەکەی نەبڕێت و بیرو بۆچوونی خۆی نەڵێت هەتاوەکو قسەکەرەکە هەمو قسەکانی خۆی دەکات و دڵنیا دەبێت لەوەی کە ئێمە لێی تێگەیشتوین. ڕاستە ئەم جۆرە دەربڕینە ئاگاتە ئاستی کاریگەرییەکەی تێڵای قسەکردن بەڵام کرۆکی مەسەلەکە دەپێکێت، چونکە کەس ناتوانێت سەرنجی خۆی دەربڕێت هەتاکو بەرامبەرەکەی نەڵێت: وا هەست دەکەم تەواو لێم تێگەیشتون

هەندێک کەس دوودڵن لە بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە چونکە بە بەشێکی هیچ و منااڵنە و بێهوودە و بێکەڵکی دەزانن، بەڵام من گەرەنتیت دەدەمێ کە بە پێچەوانەوەیە. ئەم ڕێگەیە پێویستی زۆری بەوەیە کەسەکە بتوانێت تەواو کۆنترۆڵی خۆی بکات و پێگەیشتنێکی تەواو بە پەیوەندییەکە دەبەخشێت. ڕاستە لە سەرەتادا وا دێتە پێش چاو کە کارێکی بێ ئاکام و ناتەواوە، بەڵام دواتر زۆر کاریگەر دەبێت و ئامانجە چاوەڕوانکراوەکان بەدی دەهێنێت کە بریتین لە بڕیار و پەیوەندی هاوسۆزانە و بەکارهێنانی متمانە و پێکەوەیی. کەواتە ئەگەر تۆ ئاسانکاری بکەیت بۆ جێبەجێبوونی چەمکی تێڵا هێنییەکەی قسەکردن، کۆبونەوەکە ئەم ڕێڕەوە دەگرێتەبەر.

گریمان نەسرین و ئازاد لە کۆبونەوەیەکدان. کاتێک نەسرین بیرو بۆچونی خۆی دەردەبڕێت، ئازاد دەڵێت: من باوەڕناکەم شتەکە وابێت، بەڵکو پێویستە/ تا لێرەدا تۆ قسەی پێدەبڕیت و دەڵێت:

ببورە کاک ئازاد. ئێمە بڕیارەکامان وابو کەس قسە بە کەس نەبڕێت بۆئەوەی بەباشی لەیەکدی حاڵی ببین.

ئازاد وەڵام دەداتەوە: ئۆی، ببورە، ڕاست دەکەیت. دەبێت بوار بدەم نەسرین خان راوبۆچونی خۆی بە تەواوی دەربڕێت و ئینجا من ڕای خۆم دەربڕم.

تۆ وەڵام دەدەیتەوە: نەخێر کاک ئازاد. ئێمە تەنیا هەر بواری ئەوەی پێنادەین بیرو بۆچونی خۆی باس بکات و بەس، بەڵکو بواری دەدەینێ چەندی پێخۆشە قسە بکات. پاشان تۆش دەتوانیت ڕای خۆت دەربڕیت.

ئازاد وەڵام دەداتەوە: بەڵێ وایە، ڕاستە (هەوڵدەدات بەقسەت بکات)

"وایە نەسرین خان؟"

"نەخێر دەزانیت چی، من دەمەوێت"

ئیسان ئازاد قسەکانی پێدەبڕێت

هەمدیس؟! ئێمە بەڵێنی چیمان دا؟!

ببورە، راست دەکەیت. پێویستە رێگە بە نەسرین خان بدەم چەندی پێخۆشە بیرو بۆچونی خۆی روون بکاتەوە.

بەمجۆرە بۆ یەکەمین جار ئازاد هەوڵدەدات قوڵتر گوێبگرێت، هەرچییەک نەسرین بیڵێت ئەم دەیڵێتەوە

تۆش دەپرسیت. ها نەسرین، چۆنە بەلاتەوە؟

نەسرین وەڵام دەداتەوە: بەلامەوە چۆن بێت؟ ئەو هەر قسەکانی من دەڵێتەوە بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەك لێم تێگەیشتبێت

"ببورە کاك ئازاد، هەوڵبدە تێبگەیت"

"باشە من کەی نۆرەی قسەکردنم دێت؟ دوو شەوە خۆم بۆ ئەم کۆبونەوەیە ئامادە دەکەم"

"یاسا بنەڕەتییەکەت بیرنەچێت کاك ئازاد. هەتا بەرامبەرەکەت پێت دڵنیا نەبێت کە تۆ لێی حاڵی بویت، رێگەت پێنادرێت رای خۆت دەربڕیت"

بەمجۆرە ئازاد دەکەوێتە نێوان چەند بەرداشێکەوە. لەسەرێکەوە ئارەزوە خودپەسەندەکانی خۆی و ئەجێندا شاراوەکانی و ئارەزوی قسەکردن، لەسەرێکی دیکەشەوە زانینی ئەو یاسایەی کە دەڵێت بۆی نیە هیچ بکات هەتاکو لە بەرامبەرەکەی تێدەگات بە ئەندازەیەك کە قایلی بکات. (بۆ یەکەمین جار) بە هاوسۆزییەوە گوێ دەگرێت.

نەسرین دەڵێت: "سوپاس کاك ئازاد، وا هەست دەکەم لێم تێگەیشتویت "

"زۆر چاکە کاك ئازاد، ئێستا نۆرەی تۆیە"

ئازاد تەماشای دەکات و دەڵێت: "بە تەواوی هاوڕام لەگەڵت نەسرین خان"

بەپێی ئەزمونی خۆم، ئەگەر خەڵك راستگۆیانە هەوڵبدەن لەیەکتری تێبگەن، ئەوا لە زوربەی زۆری هەوڵەکانیاندا، نەك لە هەمویدا، سەرکەوتو دەبن. بۆچی؟

چونکە ٩٠٪ ی کێشەکانی پەیوەندی لە ناکامی ئەوە رودەدەن کە دوو لایەنەکە لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە هەم بۆ مانا و مەبەستی وشە و زاراوەکان و هەم بۆ تێگەیشتنی مەسەلەکە. مانا و مەبەست ئەو رێگەیە دەگرێتەوە کە وشە و زاراوەکانیان پێ پێناسە دەکەین. تێگەیشتنیش لە هەر مەسەلەیەك بە چۆنێتی لێکدانەوەی زانیارییەکان. کاتێك کە خەڵکەکە بە هاوسۆزییەکی راستەقینەوە گوێ لە یەکتری

دەگرن (بەدڵ گوێ لێگرتن) ئەوا هەردوو کێشەکەی تایبەت بە مانا و مەبەستی وشە و زاراوەکان و بە چۆنێتی تێگەیشتن لە مەسەلەکە بە تەواوی لەناو دەچن، وەك ئەوەی لە راهێنانی خانمە گەنجەکە و کابرا مۆسیقاژەنەکەدا بینیمان، چونکە بەدڵ گوێ لەیەکتری دەگرن و ئەمیان لەڕوانگە و لەچاوی ئەوی بەرامبەریەوە شتەکان دەبینێت. تێدەگەن کە برادەرەکەی دیکە وشە و زاراوەکان چۆن پێناسە دەکات و چۆن واتاکان و زانیارییەکان لێك دەداتەوە. ئەمە وایان لێ دەکات هەمان زمان بەکاربهێنن و بشتوانن ٩٠٪ی باقییاتی هۆکاری کێشەکان چارەسەر بکەن کە دەرەنجامی جیاوازییە راستەقینەکەیە.

رۆحی لەیەکتر تێگەیشتن وا دەکات لایەنەکان زیاتر متمانە بە یەکدی بکەن و جۆرێك لە پێکەوەیی وا بەدی دەهێنێت کە کاتێك خەڵکەکە جیاوازییەکانی نێوانیان مشتومالّ دەکەن بە رێگەیەکی هێندە هاوکارانە دەیکەن کە جیاوازییەکان چارەسەر بىن، ئەمیش یان لەرێگەی یەکتر تەواوکردن و هاوکاریی خوڵقێنەرەوە یاخود بەشێوەی سازش.

لە مەسەلەی پەیوەندیکردندا لەگەڵ خەڵکی بەشێوەی تێلاّ هندییەکەی قسەکردن، بێدەنگی بە هۆکارێکی گرنگ ئەژمار دەکرێت. بۆ ئەوەی بتوانین هاوسۆزییەکی قووڵ لەگەڵ خەڵکیدا دەست پێبکەین پێویستە هێمن بین، بگرە بێدەنگ بین. رۆبەرت گرینلینت دەربارەی هێزی ئەم بێدەنگییە دەڵێت: پێویست ناکات لە هەندێك بێدەنگیی بترسین. خەڵکی وا هەیە رقیان لە بێدەنگییە یاخود بە کارێکی ناپەسندی دەزانن، بەڵام مرۆڤ ئەگەر بیەوێت بە ئیسراحەت مامەڵە لەگەڵ دیالۆگدا بکات پێویستە کەمێك بێدەنگی پێخۆش بێت. رەنگە کارێکی زۆر نارەحەت و ناخۆش بێت مرۆڤ پرسیار لە خۆی بکات، بەڵام هەندێك جار پێویستە پرسیارەکە بکەیت. کامیان بەلاتانەوە باشترە؟

بێدەنگ بم یاخود پێتان بڵێم مێشکم بیر لەچی دەکاتەوە؟

رێگەم بدەن چیرۆکێکتان بۆ بگێڕمەوە کە بەم دواییە بۆیان باس کردم سەبارەت بەوەی مرۆڤ ئەگەر لە بەرامبەرەکەی تێنەگات یاخود چەمکی تێلاّ هندییەکەی قسەکردن بەکارنەهێنێت چۆن چۆنی رەفتار دەکات؟

جوتیارێك دەچێتە لای پارێزەرەکەی بۆئەوەی دەعوایەکی تەلاق تۆمار بکات دژی ژنەکەی بەمەبەستی تەلاقدانی لە دادگا.

پارێزەرەکە لێی دەپرسێت: فەرمو چ ئەمرێکت هەیە؟

دەڵێت: دەمەوێت ژنەکەم تەلاق بدەم.

پارێزەرەکە دەڵێت: باشە تۆ چ زەمینەیەکت هەیە؟
جوتیارەکە وەڵامی دەداتەوە: پارچە زەوییەکم هەیە ٢٠٠ دۆنمە.
پارێزەرەکە دەڵێت: ببورە لە مەبەستم تێنەگەیشتیت، دەمەوێت بزانم کێ و چی پاڵی پێوە ناویت بۆ ئەم کارە؟
جوتیارەکە تورە دەبێت دەڵێت: کەس حەددی نییە پاڵ بە منەوە بنێت.
پارێزەرەکە دەڵێت: نا بەرێز، مەبەستم ئەوە نییە، ئایا ژنەکەت ماڵداریکەرە؟
جوتیارەکە دەڵێت: نەخێر ئێمە کەرمان نییە، چوار سەر مانگامان هەیە.
دواجار پارێزەرەکە دەڵێت: زۆر چاکە، با پرسیارەکە ئاوا بڵێم، بۆچی دەتەوێت تەلاقی بدەیت؟
جوتیارەکە دەڵێت: لەبەر ئەوەی لێم تێناگات.

## دوو هەنگاو بۆ گەڕان بە دوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا

گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا دوو هەنگاوی بنەڕەتی هەیە (بڕوانە شێوەی ١٠ – ٥). لەڕاستیدا پرۆسەی گەڕان لەرێی ئەم دوو هەنگاوەوە یارمەتی دروستکردنی ئەم متمانەیە دەدات (دەسەڵاتی رەوشتی) کە هانی گەڕان و لێکۆڵینەوە دەدات.

**دوو هەنگاو لە پێناوی بەدیهێنانی هاوکاریی خولقێنەر**

(سێ ئەڵتەرناتیڤەکە)

ئایا پێت خۆشە بەدوای چارەسەرێکدا بگەڕێیت باشتر بێت لەو چارەسەرەی کە هەریەکەتان پێشکەشی کردووە؟

ئایا باوەڕت بەم یاسا بنەڕەتییە سادەیە هەیە کە دەڵێت: بۆئەوەی بتوانیت بیرو بۆچوونی خۆت روون بکەیتەوە، پێویستە بیرو بۆچوونی بەرامبەرەکەت بەشێوەیەك بڵێیتەوە کە لێی رازی بێت.

شێوەی (١٠ ـ ٥)

پێویستە ئەوەش بزانیت کە مەرج نییە هەمیشە هەنگاوەکان یەك لەدوای یەك بێن. هەندێك جار بە هەنگاوی یەکەم دەست پێدەکەیت و هەندێك جاری دیکەش بە هەنگاوی دووەم.

زۆرجار بە شێوەیەکی ئاسایی دەست دەکەیت بە کارلێك و گوێگرتنی راستەقینە لە کەسێك کە بیرو بۆچوونەکەی رێك پێچەوانەی بیرو بۆچوونەکەی تۆیە، پاشان داوای لێ دەکەیت گوێت لێ بگرێت وەك چۆن تۆ گوێت لەو راگرت بۆئەوەی بزانیت ئایا پێی خۆشە بەدوای ئەڵتەرناتیڤێکی سێیەمدا بگەڕێت.

هەندێك جاریش هەست دەکەیت کەوتویتە نێوان ئەم دوو هەنگاوەوە. هەموو بارودۆخێك تایبەتمەندی خۆی هەیە و هەموو پەیوەندییەکیش خۆی لە خۆیدا پەیوەندییەکی بێهاوتایە. خاڵە گەوهەرییەکە لێرەدا ئەوەیە کە مەسەلەکە پێویستی بە وریایی و زیرەکی و خۆکۆنترۆڵکردن و بڕیاردانی باش و زەینی باش هەیە بۆئەوەی بزانیت بەکام هەنگاویان دەست پێدەکەیت.

## چەند ئەزموونێك دەربارەی گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیڤی سێیەمدا

بە درێژایی ساڵانی رابردو، بەتامترین و پڕ ململانێترین ئەزموونە پیشەییەکانم ئەوانەبون کە تیایاندا رۆڵی ئەو تیمی سێیەمەم دەبینی کە هاوکاری خەڵکە ناکۆکەکان دەکات لەیەکتری نزیك ببنەوە لەڕێگەی گەڕان و دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤێکی سێیەم و یەکترتەواوکەر. خەڵکە ناکۆکەکە لەروی سۆزدارییەوە هێندە پابەندی بیرو بۆچونی خۆیان بون کە زۆرجار دەگەیشتە ئاستێکی نارەوشتی.

جۆرەکانی هەوڵ و تەقەلای خەڵك بۆ دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی سێیەم لەڕێی شێوە جۆراو جۆرەکانی پەیوەندییەوە لەشێوەی (١٠ - ٦)دا روون کراونەتەوە.




شێوەی (١٠ - ٦)

یەکێك لە ئەزمونە سەرەتاییەکانم ئەوەبو کە لە کۆمپانیاکەماندا پێویستمان بە فیلمێك بو لەڕێی نمایشکردنی ئەزمونێکی خۆڕسك و راستەقینەوە بینەر فێری هاوکاریی خوڵقێنەر بکات. لەکاتی ئامادەکردنی بەرهەمەکەدا کە خەریکی داهێنانی بوین ئەزمونەکە دەستی پێکرد. من بڕیارم دا یەکێك لە خولە راستەقینەکانی فێرکردن بەکاربهێنم. بابەتێکی ئاڵۆزم هەڵبژارد -ژینگە- و داوام کرد لەناو ئامادەبوانەوە دوو کەس بێنە سەر شانۆی نمایشەکە. خانمێکی لایەنگری سەرسەختی ژینگە و بزنسمانێکی سەرسەختی ئەوانەی سەرچاوە سروشتییەکان بۆ ئامانجی ئابوری خۆیان بەکاردەهێنن هێندە ناکۆك بون تەنانەت تەوقەشیان لەگەڵ یەکدیدا نەکرد (کەچی بۆکس وەشێنەکان دەستکێشەکانیان دەدەن لەیەکتری) کە کابراکە بەرێ کەوت بەرەو سەکۆی نمایشەکە، خاتونەکە بە قسەیەکی ناخۆش هێرشی کردە سەری و وتی: چینەکەی ئێوە ئاو و هەوا و ئایندەی منداڵەکانمانیان خراپ کردووە.

پیاوەکە تەماشای پێڵاوەکانی ژنەکەی کردو وتی: "پێڵاوێکی جوانە، لە پێست دروست نەکراوە؟"

ژنەکە تەماشایەکی پێڵاوەکانی خۆی کردو ئینجا روی کردە کابراکە و وتی: "ئەمە چ پەیوەندییەکی هەیە بە بابەتەکەوە؟"

کابراکە وتی: "هیچ، بەس ویستم بزانم چ ئاژەڵێکت کوشتووە".

ژنەکە لە وەڵامدا وتی: "من ئاژەڵ ناکوژم ".

کابراکە وتی: "ڕاست دەکەیت، خەڵکی دیکە رادەسپێریت بۆت بکوژن".

ئەمە سەرەتای پەیوەندییەکە بو

پاشان چل و پێنج خولەکی رەبەق ئەم دوانە لەم هەنگاوەوە دەچونە هەنگاوەکەی دیکەوە و هەردووکیشیان بونە داواکاری ئەوەی هەم لەسەر ئاستی کۆمپانیاکان و هەم لەسەر ئاستی حکومەت کۆمەڵێك سیاسەتی هەمیشەیی پەیرەو بکرێت لە پێناوی گەشەسەندن و برەودان بە مەسەلەکانی ژینگە. خەڵکەکە بەم ئەنجامە سەرسام بون، کاتێك کە ئەو جۆرە دوو کەسە هەنگاوی یەکەم تێدەگەن، من هەمیشە ئەم پرسیارەیان لێ دەکەم، ئایا پێت خۆشە بەدوای رێگە چارەیەکدا بگەرێیت باشتر بێت لەو رێگەچارانەی کە هەریەکە بە جیا پێشکەشتان کردون؟ لە زۆربەی هەرە زۆری حاڵەتەکاندا هەریەکەیان دەڵێت: "نازانم مەسەلەکە چۆن دەکەوێتەوە". " چەندین

ساڵە خەریکی ئەم مەسەلەیەم و باوەڕی تەواوم پێیەتی".

تا لێرەدا پێویستە بڵێیت: "زۆر راستە، وایە. کەس نازانێت مەسەلەکە چۆن دەکەوێتەوە. پێویستە پێکەوە بیخولقێنین و ئایا ئامادەیت بەدوای چارەسەرێکی لەم جۆرەدا بگەڕێیت؟"

وەڵامەکە هەمیشە ئەمەیە: "سازشم قبوڵ نییە"

وەڵامەکەی تۆش ئەمە دەبێت: "کێ باسی سازشی کردووە؟

یەکترتەواوکردن سازشکردن نییە. پێویستە رێگە چارەیەکی باشتر بێت

پێویستە هەم تۆ ئەمە بزانیت و هەم بەرامبەرەکەت. پێویستە هەر یەکەتان بزانن کە بەرامبەرەکە ئەوە دەزانێت. نەخێر بۆ سازش".

"ئەی دوای ئەمە؟

"دوای ئەمە دەچینە هەنگاوی دووەم. بەڵام رێگە بە هیچ کەس نادرێت بیرو بۆچونی خۆی روون بکاتەوە هەتاکو بیرو بۆچونی بەرامبەرەکەی نەڵێتەوە بەشێوازێك کەسی بەرامبەر رازی بکات و هەستی ئەوەی لا بچەسپێنێت کە بەتەواوی لێی تێگەیشتووە." سەنگی مەحەکەکە ئێستا ئەمەیە.

دیارە گوێگرتنی راستەقینە لە لایەنی بەرامبەر کارێکی ئاسان نییە بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە بۆ بەرگریکردن لە بیرو بۆچونی خۆیان مشتومڕی زۆریان کردووە. بەڵام مرۆڤ ئەگەر بەڕاستی گوێ لە بەرامبەرەکەی نەگرێت و بیرو بۆچونەکەی ئەو بەشێوەیەك دووپات نەکاتەوە کە بەرامبەرەکە لێی رازی بێت ئەوا هەرگیز ناتوانێت بیرو بۆچونی خۆی روون بکاتەوە کەواتە ئەمە پاسپۆرتێکە رێگەی مرۆڤ دەدات بیرو بۆچونی خۆی روون بکاتەوە. من جارێکیان لە زانکۆ ئەم شێوازەم گرتەبەر لە مەسەلەی مناڵ لەباربردندا. دوو کەسم بانگ کرد لەوانەی کە بیرو بۆچونیان لەو مەسەلەیەدا دژ بەیەك بون. داوام لێ کردن بێنە سەر سەکۆی نمایشەکە و بە بەرچاوی خەڵکەکەوە گفتوگۆ بکەن. دیارە هەریەکەیان هەستی دەکرد ئەرکێکی رەوشتی لەسەرە بەرامبەر بە هەڵوێستەکەی. وام لێ کردن بە بەرچاوی زیاتر لە چوارسەد کەسەوە بە دوو هەنگاوەکەدا تێپەڕبن. ئامادەبوان هەندێك خوێندکاری ماجستێری زانستی کارگێڕی و چەند مامۆستایەك و هەندێك میوانیشی تێدابو. جارێکی دیکەو باش تێپەڕبونی چل خولەك لە ئەمسەرو ئەوسەرکردنی هێواش لەنێوان ئەم دوو هەنگاوەدا دەستیان کرد

بەوەی باس لە فێرکردن و منداڵ لەخۆگرتن و جڵەوگیری بکرێت. سروشتی گفتوگۆکە بە تەواوی گۆڕاو ئامادەبوان لەوە سەرسام بون. فرمێسکیش لەچاوی بەشدارانی گفتوگۆکاندا قەتیس دەبون. لێم پرسین بۆچی ئەم هەمو سۆزە لە دڵتاندا کەوتە جوڵە. هۆکارەکە خودی بابەتەکە نەبو، بەڵکو شەرمەزاری ئەو شێوازە تێڕوانین و پۆلێنکردنە تەنگیدییە بون کە هەریەکەیان لە هەڵسەنگاندنی ئەوی بەرامبەریدا پەیڕەوی کردبو. شەرمەزاری ئەو شێوازە بون یەکتریان پێ تۆمەتبار دەکردو چۆن بە لوتبەرزییەوە روانیویانەتە ئەو کەسانەی لەم مەسەلەیەدا هاوڕای ئەوان نەبون. گوێگرتنی راستەقینە و قوڵ هەردووکیانی گەیاندە ئەم ئەنجامەی خوارەوە: "بەرامبەرەکەم کەسێکی باشە. من ئەم کەسەم خۆش دەوێت، من رێزی لێ دەگرم، راستە من هاوڕا نیم لەگەڵیدا بەڵام پێم خۆشە گوێی لێ بگرم. من ئێستا کەسێکی کراوەم".

کاتێك دەبینین ئەقڵەکان دەکرێنەوە و دڵەکان نەرم دەبن و پێگەکان تێکەڵ دەبن لە چارەسەرێکی سێیەمین هاوکاریی خوڵقێنەردا کە لەچارەسەرەکانی دیکە هەمویان پێشکەوتوتر بێت، لەکاتی وادا هەست بە بزواندنێکی بێسنور دەکەین.

دیارە کاراکردنی ئەم دوو هەنگاوە کارێکی ئاسان نییە چونکە خەڵکەکە هەمیشە جێبەجێیان ناکات.

جارێکیان لە واشنتۆن بوم ئەم بابەتەم بە رێکخراوی سەرۆکە لاوەکان دەگوتەوە و دو کەسم بانگ کرد کە ئەو دوو هەنگاوە جێبەجێ بکەن. یەکێکیان سەرۆکی یەکێتی پەروەردەی نیشتمانیی بو، ئەوی دیکەش بەرپرسیاری بزوتنەوەی هاوکاری بو لە کالیفۆرنیا. ئەم دووانە یەکەم هەنگاویان بەجۆرێك جێبەجێکرد وەك ئەوەی سازشێکی گەورەیان کردبێت و وتیشیان نازانین مەسەلەکە دەگاتە کوێ و بە هیچ سازشێکیش رازی نابین. کە چوینە هەنگاوی دووەمەوە، واتە هەنگاوی دووپاتکردنەوەی بیرو بۆچونی بەرامبەرەکەت بە شێوازێك کە رازیی بکات و هەستی ئەوەی لا بچەسپێنێت کە بە تەواوی لێی تێگەیشتون، هەردووکیان هەوڵیان دا ئەو هەنگاوە بنێن، بەڵام پاشەکشەیان کرد. هەریەکە بەرگری لە خۆی دەکرد و زۆر توندو تیژییان بەرامبەر یەکتر نواند و قسەی ناشرینیان بە یەکتری دەوت.

ئامادەبوان ئەم دوو کەسەیان دەرکرد چونکە پێچەوانەی ئامانجی کۆنگرەکە بون. پاشان ئامادەبوان هاوکارییان نواند. ئەوان پێکهاتبون لە کۆمەڵە باوکێك کە راستگۆیانە

پابەخیان بە بابەتەکە دەدا و دەیانزانی چەند سەخت و ئاڵۆزە و مرۆڤ ناتوانێت هەموویان بە یەک چاو تەماشا بکات و گشتگیری رابگەیەنێت، بەڵکو پێویستە قووڵتر تێبگەین. داهێنانەتر کەوتنە تاوتوێکردنی چۆنێتی بەهێزکردنی سیستمی پەروەردە و فێرکردن، تەنانەت باسی ئەوەشیان کرد چۆن چۆنی بازاڕ و بزنس لە هەندێ حاڵەتدا بهێننە ناو پرۆسەی فێرکردنەوە و لەو حاڵەتانەدا چی بکەین کە ئەگەر مەسەلەکە ئەنجامی زەحمەتی لێ کەوتەوە یاخود ئەنجامی نەرێنی هەبوو.

لەو مەسەلانەدا کە پەیوەستن بە کارەوە من چەند جارێک ئەم نیشەم کردووە. هەمو جارێک لە کڕیارەکانم دەپرسم: "ئەو مەسەلانە چین کە لەڕوی کەلتورییەوە لەسەری ناکۆکن؟ ئەو مەسەلانەی کە وا دەزانن بڕاونەتەوە و بە هیچ شێوەیەک قابیلی گفتوگۆ نین؟"

ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن: "ئۆو، ئەوە بابەتێکی زۆر ئاڵۆز و زەحمەتە، نازانین چۆن ئەنجامی بدەین".

هەمیشە من پرۆسەکەو دوو هەنگاوەکەیان بۆ روون دەکەمەوە، ئینجا جەخت لەوە دەکەمەوە کە ئەگەر کۆمەڵەکە راستگۆیی و دەسەڵاتی رەوشتییان تێدا بێت ئەوا هەوڵی جیدی دەدەن لە جێبەجێکردنی ئەو دوو هەنگاوەدا، ئەمەش هێزێکی وایان لەناو دەزگاکەیاندا پێدەبەخشێت کە لەوەو پێش نەیانبووە، نەک تەنیا بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە، بەڵکو لەمەش گرنگتر - بەڵکو بۆ پێشخستنی سیستمی بەرهەڵستی لەناو دەزگاکەدا بەشێوەیەکی وا کە بتوانن بۆ بەرەنگاربونەوەی هەر کێشەیەک هەمان کار ئەنجام بدەن.

من جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکی بواری تەندروستیدا بوم، لەوانە ژمارەیەک سکرتێر و بەڕێوەبەری جێبەجێکار و بەڕێوەبەر و چەندین پزیشکدا. بابەتی گفتوگۆکەی کە مشتومڕی زۆری هێنابووە ئاراوە بۆ ماوەی چەند مانگێک، مەسەلەی سود وەرگرتن بو لە ژمارەیەک پزیشکی دەرەوەی نەخۆشخانەکە. بەڕێوەبەرە پزیشکییەکە بە ناوی لایەنی یەکەمەوە قسەی دەکردو بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکەش بە ناوی لایەنی دووەمەوە. ئەم دووانەم وا لێ کرد بە هێواشی و بە بەرچاوی سەد کەسەوە هەنگاوی یەکەم و دووەم بنێن و بگەنە ئەڵتەرناتیفی سێیەم کە هەردوکیان زۆریان لا پەسەند بو، نەک لەبەرئەوەی لەو رێگاچارانە باشتر بو کە هەردوکیان جیاجیا پێشکەشیان کردبو، بەڵکو رێگا چارەیەک بو پەیوەندی نێوانیانی چاکتر و بەهێزتر

دەکرد. لە وڵاتی مەکسیك لەگەڵ کۆمەڵێك کارمەندی بواری بیمەدا لە شاری (کانکن) کارم دەکرد. لە یەکێك لە کۆنگرە جیهانییە گەورەکانیاندا داوام لێ کرا قسە بکەم لەسەر ئەو گۆڕانکارییە کەلتورییەی کە لە ئەنجامی سەرکردایەتیکردنی پشتبەستو بە پرەنسیپەکان دێنە ئاراوە. منیش پاش ئەوەی کە لە تاقەتی گروپەکان حاڵی بوم و لە گفتوگۆکانیانەوە تێگەیشتم پەیوەندییەکانیان چەندە روکەشە و چەندێك دورن لە نوێنەرە بەرهەمهێنەرەکانەوە، بڕیارمدا ئەو وتارەم پێشکەش نەکەم کە ئامادەم کردبو. لەجیاتی ئەوە بڕیارمدا یارمەتییان بدەم لە درك کردن بە مەترسییەکانی ئەو نەخۆشییە کەلتورییە و دەور و تەئسیری لەسەر کار و کڕیارەکانیان. ئینجا یەك پرسیارم ئاڕاستەکردن: کڕیار هی کێیە؟ هەمویان لە سێ کۆمەڵ پێکهاتبون - سەرکردایەتی گشتی و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و نوێنەرە بەرهەمهێنەکان — لە هەر کۆمەڵێکدا داوام لە دوو کەس کرد پێکەوە دابنیشن و رووبکەنە کۆنگرەکە.

هەر تیمێك لە تیمەکان دەستیکرد بە روونکردنەوەی ئەو هۆکارانەی وای لێ دەکات باوەڕی وابێت خۆی خاوەنی کڕیارە. نوێنەرە بەرهەمهێنەرەکان وتیان ئەمان خاوەنی کڕیارەکەن چونکە ئەمانن کە دەیاندۆزنەوە و پەیوەندییان لەگەڵدا دروست دەکەن. بەڕێوەبەرە گشتییەکان بە بێزارییەوە تەماشای ئەم بیانوومیان کرد و وتیان: "خزمەتکردنی بەردەوامی ئەو خەڵکە لەسەر ئێمەیە. ئێوە دەتوانن بڕۆن، بەڵام ئێمە ناچارین دەبێت هەر بمێنینەوە و بەڵێنەکەمان بەرینەسەر" بەڕێوەبەرە جێبەجێکارەکانیش کە پۆستەکەیان لە هەموان باڵاترە بە بێزارییەوە تەماشای هەردوو گروپەکەیان کردو وتیان: "ئێوە هیچ پەیوەندییەکتان بە مەسەلەکەوە نییە. کێیە بەرهەمەکان گەشە پێدەدات؟ کێ پرۆسەی بەرهەمهێنانەکە دەگەیەنێتە ئەنجام؟ کێ ئەو سیستمە دامەزراوییەی دروست کردووە کە بەبێ ئەو ئیشەکە دەوەستێت؟ پاش ئەم قسانە هەمو لایەك بۆی دەرکەوت کە ئەم جۆرە کەلتورە چەند نەخۆشە. هیچ گروپێك خاوەنی لە سەدا سەدی کڕیار نییە - بەڵکو کڕیار موڵکی تایبەتی خۆیەتی- و ئەگەر گروپەکان پێکەوە کار نەکەن ناتوانن کڕیار پەیدا بکەن و بیانپارێزن.

ئەم ئەزمونە لوتی شکاندن و وای لێکردن زیاتر بکرێنەوە بە ئاراستەی ئەو دوو هەنگاوەی کە چارەسەری سێیەمی خوڵقێنەری لێ دەکەوێتەوە. چارێکیان سەرۆکی

کۆمپانیایەك بە تەلەفون داوای لێ کردم یارمەتی بدەم لە چارسەرکردنی دەعوایەکی ئاڵۆز و گرانبەهای دادگادا کە کڕیارێکی گەورە دژی ئەمان تۆماری کردووە. کڕیارەکە داوای قەرەبوی لە کۆمپانیاکە دەکرد، چونکە ئەو مەرجانەی جێبەجێ نەکردووە کە لەسەری رێك کەوتبون. من سەرۆکی کۆمپانیاکەم چاك دەناسی، پێشتر راهێنانی وەرگرتبو لەو بابەتەی کە دەموتەوە، بەڵام متمانەی بەوە نەبو کە بتوانێت جێبەجێی بکات. پێم راگەیاند کە ئەو کارە پێویستی بە من نییە و خۆی بە تەنیا دەتوانێت چارسەری بکات. لەبەر ئەوە هەر بە تەلەفون جارێکی دیکە بابەتەکەم فێرکردەوە و داوام لێکرد سەر لەنوێ ئەو بابەتە بخوێنێتەوە کە پێشتریش بۆم روون کردبۆوە. بەرێوەبەرەکە دەترسا و دوودڵ بو، بەڵام پاش ئەوەی زۆر بە توندی هانمدا، رازی بو خۆی بە تەنیا کارەکە ئەنجام بدات.

پەیوەندی بەو کەسەوە کرد کە دەیویست قەرەبوی لێ بسەنێت و بانگهێشتیی کرد بۆ قاوەڵتییەکی دووقۆڵی. کابراکە وتی: "پێویست بەوە ناکات، با یاسا رێچکەی خۆی وەربگرێت".

وای دەزانی سەرۆکی کۆمپانیاکە کە پەیوەندی پێوە کردووە دەیەوێت فێڵێکی لێ بکات یاخود لەگەڵیدا بگاتە سازشێك، لەبەرئەوە بانگهێشتەکەی رەت کردەوە. بۆیە ئاشناکەم مەبەستەکەی خۆی پێ راگەیاند کە دەیەوێت چی بکات و بۆچی. باسی دوو هەنگاوەکەی بۆ کردو پێی وت: من پارێزەرەکەی خۆم ناهێنم، بەڵام تۆ پارێزەرەکەی خۆت بهێنە و بەبێ رەزامەندی ئەو هیچ قسەیەك مەکە، بۆئەوەی توشی هیچ سازشێك نەبیت کە یاسا دوایی لۆمەی تۆ بکات. دووپاتی کردەوە: "بە یەك دوو سەعات هیچت لە کیس ناچێت؟ ئەم مەسەلەیە زیانی دەیان هەزار دۆلاری بە من و تۆ گەیاندووە و هێشتا هەر لەسەرەتاشداین". بەم جۆرە کابراکە بانگهێشتەکەی قبوڵ کردو وتی: پارێزەرەکەم لەگەڵ خۆمدا دەهێنم.

هەرسێکیان لە ژورێکدا کۆبونەوە کە دوو پارچە کاغەزی گەورەی تیادا هەڵواسرابو. ئاشناکە سەرەتا پێی وت: دەمەوێت بزانم ئایا من لەم مەسەلەیەدا لە تۆ تێگەیشتوم؟ ئینجا بە باشترین شێوە قسەکانی کابرای بۆ خودی کابرا دووپات کردەوە. پاش چەند خولەکێك وتی: "ئایا وا هەست دەکەیت من بە تەواوی تێت گەیشتوم؟ ئایا تێگەیشتنەکەم راست و دادپەروەرانەیە؟"

کابراکە وتی: "بەڵێ، تەنیا لە دوو خاڵدا نەبێت"

ئا لێرەدا پارێزەرەکە قسەکەی پێبڕی و وتی: ئیتر بەسە، هیچی دیکەی پێ مەڵێ.

بەڵام کابراکە هەستی بە جوڵەیەکی راستەقینە و بە هەوڵێکی راستگۆیانە کرد، بۆیە بە پارێزەرەکەی وت کە بێدەنگ بێت و دوو خاڵەکەشی بۆ ئاشناکەم ئاشکرا کرد. ئاشناکەم ئەو دووخاڵەی لەسەر کاغەزە هاڵواسراوەکە نوسی و سەر لەنوێ پرسیاری کردەوە: "ئایا وا هەست دەکەیت کە تێت گەیشتوم؟ هیچ شتێکی دیکەت هەیە کە حەز بکەیت تێی بگەم؟ ئایا هیچم فەرامۆش نەکردووە؟"

کابراکە وتی: "نەخێر، هەست دەکەم تەواو لێم تێگەیشتویت"

ئا لێرەدا ئاشناکەم وتی: "ئایا دەکرێت تۆش گوێ لە من بگریت وەك چۆن من گوێم لە تۆ گرت؟ ئایا هەقی وا نییە؟"

بەم شێوەیە خاڵی یەکەم – کە گەڕانە بەدوای ئەلتەرناتیڤی سێیەمدا – لەوەوە دروست بو کە هەردووکیان هەوڵیاندا لە یەکتری تێبگەن. بەمەش پاڵنەری چارسەرکردنی کێشەکە دروست دەبێت. ئەم دوو کەسە نەك هەر کێشەکەیان بەشێوەیەك چارسەر کرد کە هەردووکیان پێی قایل ببن، بەڵکو پەیوەندی نێوانیشیان بەردەوام بو. ئەرکی دواتر ئەوە بو چۆن بتوانن ئەو پەیوەندییە بەردەوامەی بواری کارکردن بگوێزنەوە بۆ کەلتوری هەردو کۆمپانیاکەیان کە لە ئەنجامی ئاکۆکی نێوانیاندا بوبونە ناحەزی یەکتر. خاڵە گەوهەرییەکە ئەوەیە کە خەڵکەکە خۆیان دەتوانن کارەکە بکەن. پێویستیان بە لایەنی سێیەم نییە کارئاسانییان بۆ بکات. سەرکەوتن لە ئەرکەکەدا پەیوەستە بەوەی تا چەند دەتوانیت بەشدار و چاودێر بیت و لە هەمان کاتیشدا رۆڵی لایەنی سێیەم ببینیت و کارئاسانی بکەیت. ئەمەش پێویستی بە بڕێکی زۆری دیسپلینی مێشك و سۆز هەیە، بەڵام ئەگەر مرۆڤ باوەڕی بە پرنسیپەکان هەبێت و سەر راست و ئازا بێت دەتوانێت ئەو دیسپلینە مەیسەر بکات.

هەندێك جار سروشتی ئەم ئەلتەرناتیڤی سێیەمە وەکو سازشێك خۆی دەنوێنێت، واتە لایەنێکیان یان هەردو لایەنەکە وازیان لە هەندێك مافی خۆیان هێناوە، بەڵام مەرج نییە مەسەلەکە ئاوا بەو جۆرە بێت.

ڕەنگە مەسەلە بنەڕەتییەکە بە هیچ شێوەیەك ئەو بابەتە نەبێت کە لەسەری ئاکۆکن، بەڵکو توخمە هەرە گرنگ و بایەخدارەکە سروشتی پەیوەندییەکە و گۆڕانی پاڵنەرەکان و

قوڵیی لێ تێگەیشتنەکان بێت. ئا لێرەدا هاوڕێیەکم بیر دەکەوێتەوە کە بەسەرهاتێکی دایك و باوکی خۆی بۆ گێڕامەوە. بەسەرهاتەکە زۆر بە جوانی ئەم خاڵە روون دەکاتەوە.

"باوکم ماوەی سی ساڵی رەبەق بو لە لادێدا کاری پزیشکی ددانی دەکرد، کە توشی نەخۆشییەکی دەگمەن و ترسناک بو. پزیشکەکان پێیان وت: تەنیا شەش مانگت لە ژیاندا ماوە.

سروشتی نەخۆشییەکە ناچاری کرد واز لە کارەکەی بهێنێت و وای لێ هات ئەم پیاوە گورج و گۆڵە بێ ئیش و بێکار دابنیشێت و هەر بیر لە نەخۆشییە کوشندەکەی بکاتەوە. بۆیە بڕیاری دا ژورێکی پلاستیکی دروست بکا بۆئەوەی بە رواندنی گوڵ و سەوزەوە خۆی سەرقاڵ بکات. دایکم ئەمەی زۆر پێناخۆش بو. دەیگوت بشمکوژیت ناهێڵم ئەو شتە زل و ناشیرینە لە حەوشەکەدا قوت بکەیتەوە، چونکە لای هاوسێکان ئابڕوی دەچێت. ئەمە پەیوەندی نێوان باوکم و دایکمی خراپ کرد و وایان لێهات قسە لەگەڵ یەکتری نەکەن. وابزانم لەناخی خۆیاندا دەیانویست بەمشێوەیە توڕەیی و بێزاریی خۆیان لە نەخۆشییەکە دەرببڕن. رۆژێکیان دایکم پێی وتم بیر لەوە دەکاتەوە بەشێوەیەکی راستەقینە لە بیرو بۆچونی باوکم تێبگات. دەیویست کێشەکە بە شێوەیەک چارەسەر بکات هەردولا پێیان خۆش بێت. دایکم خۆی دەناسی و دەیزانی کە حەز لەو ژوورە ناشرینە ناکات و لەباتی ئەوە پێی خۆش بو حەوشەکە پڕ بێت لە گوڵە وەرزییەکان. بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەیزانی کە دەیەوێت باوکم بەختەوەر و بەرهەمهێن بێت. بۆیە لە هەڵوێستی خۆی پاشەکشەی کرد و ڕێگەی بە باوکم دا چی دەکات بیکات. بڕیاریدا دڵخۆشی و بەختەوەری باوکمی زۆر بەلاوە گرنگتر بێت لە باخچەکە و لە دەرودراوسێ.

دواتر دەرکەوت کە ئەو ژوورە پلاستیکییە تەمەنی باوکمی لەوە درێژتر کرد کە پزیشکەکان دیارییان کردبو. باوکم دو ساڵ و نیو ژیا.

ئێواران کە دەرمانە کیمیاوییەکان توشی خەوزڕاندنیان دەکرد دەچووە ناو ژوورە پلاستیکییەکەوە بۆ تەماشاکردنی زەرعاتەکەی. بەیانیانیش ئاودانی ئەو زەرعاتە وەرەی دەنایەبەر کە هەستێت. ژوورە پلاستیکییەکە وای لێ کرد لەبری ئەوەی بیر لە جەستەی خۆی بکاتەوە کە بەهۆی نەخۆشییەوە دەپوکایەوە، خۆی بە کارێکەوە سەرقاڵ بکات و خووی بداتێ.

بیرمە جارێکیان دایکم وتی: لەژیاندا هیچ بڕیارێکم هێندەی ئەو بڕیارە حەکیمانە نەبووە کە پشتگیری باوکتم کرد لە دروستکردنی ژوورە پلاستیکییەکەدا."

سەرەتا بەلای دایکی هاوڕێکەمەوە ئەو ژورە پلاستیکییە وەك (دۆڕان)ێك تەماشا کراوە تا ئەو کاتەی واز لە ئارەزووە بنەڕەتییەکەی دەهێنێت بۆ ئارەزوویەکی مەزنتر کە پاراستنی تەندروستی و کامەرانیی مێردەکەیەتی.

چیرۆکەکەی سەرەوە فێرمان دەکات کە کاتێك ئێمە لە کەسێك تێدەگەین پێناسەیەکی نوێ بۆ سودی هاوبەش دادەنێین. بەهەرحاڵ ئەگەر ئەو خانمە هێندە ریزی مێردەکەی لەلا نەبوایە کە تێبگات چی بەلاوە گرنگە نەیدەزانی بەو شێوەیە رەفتاری خۆی بگۆڕێت. خاڵە گەوهەرییەکی چیرۆکەکە ئەوەیە کە هاوکارییە خولقێنەرەکەی کە هاتە بەرهەم شێوازی ئەڵتەرناتیفی سێیەم بو نەك چارسەری ئەڵتەرناتیفی سێیەم. ئەڵتەرناتیفی یەکەم ئەوە بو کە رێگە نەدات پیاوەکە ژوورە پلاستیکییەکە دروست بکات. ئەڵتەرناتیفی دوەم ئەوە بو رێگەی بدات ژورە پلاستیکیەکە دروست بکات بەڵام ئەم لە ناخی خۆیدا وا هەست بکات سازشی کردووە. ئەڵتەرناتیفی سێیەم ئەوەیە کە بەراستی لە مێردەکەی تێبگات. بەختەوەری و خۆشحاڵی خۆی لە رازیکردنی ئەودا ببینێتەوە. یەکترتەواوکردن زۆرجار ئاوایە. رەنگە کەسێك لە دەرەوە کە تەماشا دەکات بڵێت ئەمە سازشکردنە، بەڵام ئەگەر قسە لەگەڵ ژنەکەدا بکەیت نکوڵی لەوە دەکات هیچ سازشێکی کردبێت. ئەو رەزامەندی و بەختەوەری خۆی بەستۆتەوە بە کامەرانی و تەندروستی مێردەکەیەوە. ئەمە هەڵوێستی هاوکاریی خولقێنەرانەیە، گوزارشتکردنێکی مەزنە لە خۆشەویستی پێکەیشتو.

بەشی زۆری پەیوەندییەکانی نێوان خەڵك ئەوەیە یان بە سازش کۆتایی دێت یاخود بە قازانج و زیانی لایەنەکەی دیکە تەواو دەبێت. بەڵام چارسەری ئەڵتەرناتیفی سێیەم چ ماددی بێت یان مەعنەوی، هەروەها بەدیهێنانی رێز و تێگەیشتنی بەردەوام کە بێ هیچ رێکەوتنێك بێتە ئاراوە نمونەی وەرچەرخانن.

وەرچەرخان چییە؟

ئەوەیە کە مرۆڤەکە دەگۆڕێت، کە ئەقڵ و دڵی زیاتر دەکرێنەوە، کە گوێ دەگرێت و فێردەبێت، کە مەسەلەکان بە شێوەیەکی دیکە دەبینێت.

شێوەکەی خوارەوە (١٠ - ٧) جیاوازی نێوان ئەو چارسەرانە دەردەخات کە بریتین لە رێکەوتن لەگەڵ ئەو چارسەرانەی کە پشت بە وەرچەرخان دەبەستن.




شێوەی ١٠-٧

من باوەڕی تەواوم هەیە کە پەیوەندیی بەشێوازی ئەڵتەرناتیفی سێیەمی خوڵقێنەر دەتوانێت ڕێگری لەسەرهەڵدانی زۆربەی کێشەکان بکات و چارەسەریان بکات. پەنابردنە بەر یاسا و دادگا پێویستە وەك دوا چارەسەر تەماشا بکرێت و لەسەرەتادا بیری لێنەکرێتەوە. زوو پەنا بردنە بەر دادگا زیان بە کۆمەڵگا دەگەیەنێت و متمانە لەناو دەبات و نمونەیەکی خراپ پێشکەش دەکات و لە باشترین حاڵەتیشدا تەنیا هەر سازشی لێ دەکەوێتەوە.

هیوادارم ڕۆژێك لە ڕۆژان بتوانم یارمەتی دادوەرەکان و ڕاوێژکارانی کۆمپانیاکان بدەم بە نوسینی کتێبێکی تایبەت کە فێریان بکات ئەم بیرۆکانە پەیڕەو بکەن. ناونیشانی کتێبەکە بریتی دەبێت لە (پیرۆزن ئەوانەی ئاشتی دروست دەکەن، لە ژێریشیەوە ناونیشانێکی بچوك هەبێت. هاوکارییکردنی داهێنەرانە لە خۆپاراستن و چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان). کتێبەکە بۆ پارێزەران و بۆ ئەوانەش دەبێت کە پارێزەرەکان فێردەکەن یاخود کاریان تێیان دەکەوێت، هەروەها بۆ ئەوانەش دەبێت کە دەیانەوێت بەبێ یارمەتی پارێزەر کێشە ئاڵۆزەکان چارەسەر بکەن.

## دروستکردنی تیمێکی تەواوکەر لە ڕێی پەیوەندی بە شێوازی (ئەڵتەرناتیڤی سێیەم)

لە دروستکردنی ئەو تیمە تەواوکەرەی کە باسمان کرد، ڕۆڵی پێشەنگ ڕۆڵێکی زۆر پێویستە بۆ بنیادنانی پەیوەندییەکانی ئەڵتەرناتیفی سێیەم و کراوە. گرنگترین شوێن

کە پێویستە ئەم رۆڵەی تێدا بگێردرێت تیمە جێبەجێکارەکەیە. سەرکردە رەسمییەکان، لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی فەرمییان هەیە کەواتە لە خەڵکەکەی دیکە زیاتر پێویستیان بە نیشاندانی دەسەڵاتە رەوشتییەکەی هاوشانی ئەم جۆرە پەیوەندییەیە. هۆکارەکەی دیکەش ئەوەیە کە بەرێوەبەرە جێبەجێکارەکان هەمو کەس بە شێوەیەکی بەردەوام دەیانبینێت و هەر ئەمانیشن تیمە تەواوکەرەکان دروست دەکەن لەنێوان بەشەکان و لەناو بەشەکاندا و تەنانەت لە هەمو دەزگاکەشدا.

بەهەرحاڵ، ئەم جۆرە پەیوەندییەی ئەڵتەرناتیفی سێیەم کە تیمە کامڵەکانی لێ دەکەوێتەوە، مەرج نییە تەنیا هەر لە ئاستە باڵاکاندا دەستی پێبکرێت. ئاساییە سەرەتای دەستپێکردنەکەی لە هەر ئاستێکدا بێت. ئەگەر لەئاستەکانی خوارەوەدا دەست پێ بکرێت، ئەوا ئەنجامە کردەییەکانی دەتوانن بۆچونی رەشبینەکان بگۆڕێت کە لە ئاستە باڵاکانی دەزگاکەدان. ئەمەش جارێکی دیکە ئەو راستییە رووندەکاتەوە کە سەرکردایەتیکردن هەرگیز لەلایەن یەك تاکە کەسەوە ناگرێت بەڵکو لەلایەن تیمێکی کامڵەوە دەکرێت و سەرکردایەتی پۆست نییە بەڵکو بڕیار و هەڵبژاردنە.

لە کوێوە دەست پێبکەین؛ لە دامەزراندنی دیالۆگێکی کراوە لەنێوان هەمواندا هەم لەسەر ئاستی تیمەکەت، هەم لەسەر ئاستی بەشەکەت، هەم لەنێوان ئەو تیم و بەشانەی کە لە دەزگاکەدا پشت بە یەکدی دەبەستن. لەکاتی پەیڕەوکردنی ئەم جۆرە پەیوەندییەدا (پەیوەندی ئەڵتەرناتیفی سێیەم) خەڵکەکە وردە وردە وایان لێ دێت چاکتر یەکدی بناسن و زیاتر یەکدیان خۆش بوێت و زیاتریش کراوە و سەر راست و خۆڕسك دەبن. کەلتوری رێز لەیەکدیگرتن بەرجەستە دەبێت و خەڵکەکە زیاتر بەشوێن خاڵە بەهێزەکانی یەکدیدا دەگەڕێن و کاریگەرانەتر هەوڵی گۆڕینی خاڵە لاوازەکانی خۆیان دەدەن. ئەمەش دەبێتە هۆی بەرکەماڵبونی پێکەوە گونجان وەك ئەوەی لە تیمەکانی وەرزش و مۆسیقادا دەیبینێت.

> ئەگەر لەو هاوێنەیەوە تەماشای یەکدی بکەین کە تەنیا هەر خاڵە لاوازەکانیان دەبینێت، ئەوا ئێمە کاریگەری بەرامبەرەکانمان کەم دەکەینەوە و وا دادەکەین خاڵە لاوازەکانیان دەورو تەئسیری زیاتریان هەبێت.

## فیلم: فرۆشیارە دەستگێڕەکان

چەند ساڵێك لەمەوبەر کۆمپانیایەکی ئەفریقای باشور لە گەڕەکێکی کۆنی شارێکدا فرۆشگایەکی کردەوە بۆ فرۆشتنی جل‌وبەرگ بەدانە.

لە رۆژی کردنەوەی فرۆشگاکەدا فرۆشیارە دەستگێڕەکانی سەوزە و میوە هرۆژمیان بردە شوێنەکە. ئەوان دەمێك بو لەو شوێنەدا سەوزە و میوەیان دەفرۆشت پێش ئەوەی فرۆشگاکە دروست بکرێت.

هێندە دەمێك بو لەوشوێنە شتیان دەفرۆشت خۆیان بە خاوەنی شوێنەکە دەزانی، بۆیە لە رۆژی کردنەوەی فرۆشگاکەدا سەوزە و میوەکانیان لەبەردەم فرۆشگاکەدا دانا و بێ سەروبەرییەکی زۆریان لەوناوەدا دروست کردو خەڵك نەیدەتوانی بە ئاسانی بگاتە فرۆشگاکە.

تۆ بیت لە حاڵەتی وادا چی دەکەیت کە فرۆشیارە دەستگێڕەکان لە دەوری فرۆشگاکە کۆببنەوە و رێگاو بان‌و شۆستەکان داگیربکەن و لە رۆژێکی گرنگی وەکو رۆژی کردنەوەی فرۆشگاکەدا هاتوچۆ زەحمەت بکرێت؟ دوو رێگەت لەبەردەمدایە. دەتوانیت هەوڵ بدەیت کۆنترۆڵی دەستگێڕەکان بکەیت و وەکو داروبەرد تێیان بڕوانیت. پۆلیسیان بۆ بانگ بکەیت و ناچاریان بکەیت بچنە شوێنێکی دیکە و هەمو دەسەڵاتی خۆیشت وەك خاوەنی موڵکەکە بەکاربهێنیت. هەروەها دەشتوانیت وەکو مرۆڤ مامەڵەیان لەگەڵدا بکەیت. هاوکاری خوڵقێنەر بیت لەگەڵیاندا و رێگە چارەیەکی وا بدۆزیتەوە کە بۆ هەردوکتان چاکتر بێت. بەڕێوەبەری فرۆشگاکە دەیتوانی پۆلیسیان بۆ بانگ بکات، بەڵام بڕیاری دا کە بۆ ئەڵتەرناتیڤی سێیەم بگەڕێت. سەرەتا گوێ لە مەبەست و پێویستییەکانیان بگرە ئینجا باسی پێویستییەکانی فرۆشگاکەت بکە. ئەم تیمە تێکەڵوپێکەڵەی کە پێك هاتبو لە بەڕێوەبەرایەتی فرۆشگاکە و لە فرۆشیارە دەستگێڕەکان توانیان بگەنە نەخشەیەکی هاوبەشی وا کە خزمەتی هەردووتیمەکە بکات.

ئێمە فیلمێکمان لەسەر ئەم ئەزمونە بەرهەم هێناوە کە ئەزمونی نێوان فرۆشگا نوێیەکە و فرۆشیارە دەستگێڕەکانی سەوزە و میوەیە. فیلمەکە ناوی فرۆشیارە (دەستگێڕەکان)ە. ئێستا بانگهێشتت دەکەم فیلمەکە تەماشا بکەیت کە لەسەر (سی. دی) ناو کتێبەکەدایە. لە فیلمەکەدا ئەم چارەسەرە هاوکار و هاوبەشانە دەبینیت کە خەڵکی شایستە پێشکەشیان کردون.

لەم فیلمەدا دەبینیت کە لێکتێگەیشتن کلیلی یەکەمی ئەو چارەسەرە داهێنەرانەیەی مەیسەرکرد.

هەروەها دەبینیت ئەم داهێنانە شتێکی دیکەی هێنایە ئاراوە کە پێی دەوترێت سودی لابەلا. مەبەست لە سودی لابەلا ئەو سودەیە کە لە کۆتاییدا دێتە ئاراوە بێ ئەوەی کەس پێشبینی کردبێت.

ئەم سودە لابەلایە دەرئەنجامی متمانە و پەیوەندی بەهێزە. فرۆشیارە دەستگیرەکان بونە پاسەوانی فرۆشگاکە. دزەکانیان دەناسی،



شێوەی ١٠ — ٨

خۆتان دەزانن کە دزیکردن لە فرۆشگاکاندا کێشەیەکی گەورەیە لە ئەفریقای باشوردا. لەبەر ئەوە ئەم کارەی فرۆشیارەکان سودێکی گەورەی بە فرۆشگاکە گەیاند. تەماشاکە بزانە چۆن متمانە و پەیوەندی بنیادنرا. ئەو متمانەیە کە بەخشرا بە کۆمەڵێک خەڵك بو بە کردار. خەڵکەکەش لەگەڵ متمانەدا ژیان و ئەوانیش متمانەیان بە لایەنی بەرامبەر کرد. ئەمە هەمیشە پەیوەندییەکان بەهێز دەکات، هەروەها سیستمی بەرگرییەکی وا دروست دەکات کە بتوانێت مامەڵە لەگەڵ هەمو ئەو کێشەو مەسەلانەدا بکات کە رەنگە لە ئایندەدا سەرهەڵ بدەن.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: گرنگیی سوڕی ژیانی دەزگاکان لە چیدایە؟ ئایا ئەڵتەرناتیفێکی سێیەم هەیە ڕێ لە پوکانەوە و مردنی دەزگاکان بگرێت؟

وەڵام: بە بڕوای من چوار (سێگۆشەی بەرمۆدا) هەن کە دەبنە هۆی پوکانەوەو کارەسات و مردن.

سێگۆشەی یەکەم لە قۆناغی (بیروکە)دا ڕودەدات، کاتێك کە بیرۆکەیەکی باش لەبار دەبەیت بە وزەی نەرێنی و متمانە بەخۆنەبوون و ترس.

سێگۆشەی دووەم لە قۆناغی بەرهەمهێناندا ڕوودەدات، کاتێك کە بیرۆکە مەزنەکە بە شێوەیەکی گونجاو جێبەجێ ناکرێت. ئا لێرەدا زوربەی دەزگا چاکەکان شکست دەهێنن، (٩٠٪)یان لە دوو ساڵی یەکەمی دروستکردنیاندا. بیرۆکە مەزنەکە وەکو خۆی و لەکاتی خۆیدا جێبەجێ ناکرێت.

سێگۆشەی سێیەم لە قۆناغی کارگێڕیدا ڕودەدات کاتێك کە کارگێڕییەکە ناتوانێت بەرهەمێکی وا بەدیبهێنێت توانای زیادبونی هەبێت. سیستمە فەرمییەکان بۆ ئەوە دروست نابن کە شتەکان -بەتایبەت پارەی بەردەست- لەژێر کۆنترۆڵدا بهێڵێتەوە.

سێگۆشەی چوارەم لە قۆناغی گۆڕاندا ڕودەدات، لە کاتێکدا کە دەزگاکە پێویستی بە دووبارە خۆڕێکخستنەوە هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی بازاڕ و فرسەتە نوێیەکاندا خۆی بگونجێنێت بەڵام ژیانی بیرۆکراسی و یاسا و ڕێنماییەکانی کە جیتر ناتوانن وەڵامی داخوازیی کڕیارەکان بدەنەوە، دەبنە کۆسپ و تەگەرە.

تیمی باشی کارگێڕی پێویستە خەڵکی وای تێدا بێت هەڵگری ئەو خەسڵەتانە بن کە بگونجێن لەگەڵ پێویستییەکانی هەرچوار قۆناغەکەدا. گرنگتر لەمەش پێویستە ئەندامانی تیمەکە هێندە ڕێز لە یەکدی بگرن کە بزانن خاڵی بەهێزی هەریەکەیان جییە و چۆن سودی لێ ببینن، هەروەها کاریگەریی خاڵە لاوازەکانی ئەندامەکانی دیکەش بزانن. تۆ پێویستت بە بەڵێندەرێك هەیە (خاوەنی بیرۆکە)کە بێت و بەرهەمهێن بێت و بەڕێوەبەربێت و سەرکردەیەك بێت تیمەکە دروست بکات و یارمەتیدەر بێت لە داهێنانی کەلتوری ڕێز لە یەکگرتن کە تیمێکی کامڵی وا دروست بکات بتوانێت لە قۆناغە جیاجیاکاندا خۆی ڕێك بخاتەوە و درێژە بدات بە چالاکییەکانی.

پرسیار: تۆ چ کارێکت لەدەست دێت کاتێک کە دوو کۆمپانیا تێکەڵی یەکدی دەکەیت و کارمەندانی دوو کۆمپانیا و دوو کەلتوری جیاواز پێکەوە کۆدەکەیتەوە؟ ئایا ئەلتەرناتیڤی سێیەم پلاکێکی سیحریی تێدایە کە هەرکاتێک پەنجەی پێدابنێیت کۆمپانیاکە لەسەر ئاستی هاوکاری بکاتە کۆمپانیایەکی جیهانیی؟

وەڵام: کە کۆمپانیاکان تێکەڵی یەکدی دەبن، یاخود کۆمپانیایەک کۆمپانیایەکی دیکە لەخۆی دەگرێت، دەبینیت لە زۆربەی حاڵەتەکاندا شکست دەهێنن. بۆچی؟ چونکە کارەکە لە ناچاریدا دەکەن و دەیانەوێت بە زۆر ئەنجامی بدەن. مەسەلەکە رێک وەکو ئەوە وایە دوو پارچە (دی ئێن ئەی) بهێنین تێکەڵی یەکدیان بکەیت. ئایا هەرگیز خێزانێکت دیوە تێکەڵ بێت؟ ئایا خێزانی لەوجۆرە بە ئاسایی دەژی؟

مەسەلەی گەیشتنە رێگەچارەی ئەلتەرناتیڤی سێیەم پێویستی بە پشوو درێژیی و بەردەوامی و کاتێکی زۆر هەیە و هەروەها پێویستیشی بەوەیە پەیوەندییەکە بە شێوازی تێلا هەندییەکەی قسەکردن بێت. لەکاتی ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیەدا هەر پێنج دیاردە شێرپەنجەییەکەت دێنە رێ (رەخنە و نارەزایی و بەراوردکاریی و رکابەری و دژایەتی). بیرت نەچێت لە مەسەلەی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵک و لەگەڵ کەلتورەکاندا هێواش خێرا دەبێت و خێراش هێواش دەبێت. لە مامەڵەکردن لەگەڵ شتە بێ رۆحەکاندا خێرا هەر خێرایە، کەچی لەگەڵ مرۆڤدا خێرایی و لێهاتویی کاریگەرنین. من ئەمەم بە ئەزمونگەلێکی زۆر تاڵ بۆ ساغ بۆتەوە و باوەڕی تەواوم بەوە هەیە کە ئێستا پێتی دەڵێم؛ تۆ ئەگەر بتەوێت کەلتوری ئەلتەرناتیڤی سێیەم بەرهەم بهێنیت پێویستت بە پەیوەندییەکی راشکاو و دوولایەنە و رێز لە یەکگرتن هەیە، ئەمەش زۆرجار پێویستی بە سەرکردایەتییەکی فەرمی نوێ هەیە.

من جارێکیان لەگەڵ کۆمپانیایەکی گەورەی کەنەدیدا کارم دەکرد کە خاوەنی کەلتورێکی زۆر پێگەیشتو بو لە بواری تواناسازیدا. بەڵام چونکە سەرکردە ناوەندییەکانی سەرکردایەتی کۆمپانیاکە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا کارەکەیان لە زۆر وڵاتی جیهاندا بەرێوەدەبرد ویستیان هەندێک سیاسەتی ناوەندی دیاری بکەن، بەڵام جێبەجێکەرانی ئەم سیاسەتانە ئەوەیان لەبەرچاوگرت کە کەلتوری لقەکەی کەنەدا زۆر زۆر پێگەیشتوترە لە کەلتوری لقەکانی دیکە. بەرێوەبەری لقەکەی کەنەدا داوای لێکردم یارمەتییان بدەم لە پاراستنی ئەم جۆرە سەربەخۆییەیانەداو سیاسەتە ناوەندییەکان

نەبنە کۆت و پێوەند کە لە بنەڕەتدا بۆ کەلتورە ناپێگەیشتووەکان دانراون. خۆشحاڵ بوم بە پارمەتیدانیان. کاتێکیش کە بەڕێوەبەرە جێبەجێکارە ئەمریکاییەکان بۆیان دەرکەوت پێویست ناکات چاودێری لقەکەی کەنەدا بکەن و دەتوانن ئەو لقە وەکو نمونەیەك بهێننەوە لقەکانی دیکە چاوی لێ بکەن و کەلتورە کەنەدییەکە پێگەیشتوتر و بەرهەمهێنەرترە و قازانجی زیاتریشی دەست دەکەوێت و کەمتر گیرۆدەی کێشە بیرۆکراسییەکان بووە، دەستیان کرد بەو ئامۆژانەی کە لقە کەنەدییەکە بکەنە نمونەیەك لقەکانی دیکە چاوی لێ بکەن. مەسەلەکە لێرەدا ئەوەیە کە نابێت خەڵکەکە ناچار بکەیت زۆر پشت بە یەکدی ببەستن. مەسەلەکە پێویستە بە شێوەیەکی سروشتی بڕوات بەڕێوە و ئەو پشت بەستنە هەر بەو ڕێگایە دێتە دی کە خەڵکەکە یەکدی بناسن و لە یەکدی تێبگەن و متمانەیان بە یەکدی هەبێت. پاش ئەمانە ئینجا دەتوانن بگەنە قۆناغی داهێنان. ئەگەر ئەمانە نەیەنەدی مرۆڤ وا هەست دەکات کە ئەگەر پشت بە کەسێکی دیکە ببەستێت نیشانەی بچوکی و بێ توانایی خۆیەتی.

# بەشی یانزەهەم

## یەک دەنگ
## دۆزینەوەی ڕێگەی دید و بەها و ستراتیجی هاوبەش

ڕۆژێکیان ئەلیس گەیشتە دووڕیانێک و پشیلەیەکی بینی لەسەر درەختێک.
ئەلیس لە پشیلەکەی پرسی: بە کام ڕێگەیەدا بڕۆم؛ پشیلەکە پێی وت:
دەتەوێت بچیت بۆ کوێ، ئەلیس وەڵامی دایەوە:
نازانم. پشیلەکە وتی: کەواتە بە هەر ڕێگەیەکیاندا دەڕۆیت بڕۆ.

لویس کارۆل، ئەلیس لە وڵاتی عاجباتییەکاندا




شێوەی ١١—١

تکایە بیرت نەچێت کە فێربونی خوی هەشتەم پرۆسەیەکی زنجیرەییە و لە ناوەوەیە بۆ دەرەوە. ئەم خووە وەك هەمو خویەکی دیکە پێکهاتووە لە شێواز و لێهاتویی و زانیاری. ئێمە (شێواز)ەکەمان لە بابەتی دەستپێشخەریی بزوێنەری روگاری گۆڕیندا روون کردەوە، هەروەها شارەزاییەکانیشمان باس کرد لە مەسەلەی متمانە و هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئەلتەرناتیڤی سێیەمدا. لەراستیدا چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتیکرن لەجیاتی کاریگەرییەکان و سەرکردایەتیی ئەلتەرناتیڤی سێیەمن و زانیاری تەواوت دەداتێ لەسەر ئەو پرنسیپانەی کە گۆڕانکاری دروست دەکەن. جارێکی دیکە دەیڵێینەوە کە ئەم کاریگەرییە بەوە دەست پێدەکات کە تۆ پێشەنگ بیت لەوەی شایستەی متمانەپێکردن بیت بە جۆرێکی وا خەڵکەکە متمانەت پێبکەن. بەڵام وەك دەزانیت مەسەلەکە لەوە گەورەترە تەنیا هەر شایستەی متمانە بیت. نیازپاکی هەرگیز پاساو نییە بۆ هەڵە و کەموکورتی. مرۆڤ پێویستی بە پێشەنگێکە بیبینێت چۆن کار دەکات و بە شێوازێکی جیاواز رابەرایەتی خەڵکی دەکات، جیاواز لەو رێگەیەی کە ماوەیەکی زۆرە لەسەری راهاتووە و جیاواز لە کەلتوری دەزگاکەیان و جیاواز لە نەریتەکانی چاخی پیشەسازی کە پشتیان بە کۆنترۆڵ و رێکەوتنەکان بەستووە.

گرنگترین رۆڵی پێشەنگ کە پێویستە تۆ بەرجەستەی بکەیت، ئەوەیە نیشانی خەڵکەکەی بدەیت چۆن ئەو کەسە رۆڵە بنەڕەتییەکانی دیکەی سەرکردە دەبینێت کە دەنگی خۆی دۆزیوەتەوە. رۆڵەکانیش بریتیین لە تواناسازی و گونجاندن و دیاریکردنی رێبازەکە. من لەپێناوی ئەوەی تۆی خوێنەر بتوانیت رۆڵی ئەو پێشەنگە بگێڕیت کە ئەم سێ ئەرکە دەبینێت، لە ئێستاوە دەست دەکەم بە نوسینی ئەو بەشانەی کە سێ رۆڵە باقیماوەکەی سەرکردایەتیکردن روون دەکەنەوە بە:

١. دیاریکردنی تیۆری و واقیعی هەمو رۆڵێك.

٢. باسکردنی سێ ئەلتەرناتیڤی پێکەوە نەگونجاو بۆ تێگەیشتنی رۆڵەکان.

٣. کلیلی هەمو تەحەدایەك ئەوەیە هەمیشە بە دوای ئەلتەرناتیڤێکی سێیەمی بەرزتردا بگەڕێیت.

لەم بەشەی کتێبەکەدا روبەروی ئەو مەسەلەیە دەبیتەوە کە تەحەدای سەرکردایەتی دەکات و بریتییە لە یەکخستنی ئەو کەسانەی خاڵی بەهێزی جیاجیایان هەیە و دنیا بە شێوازی جیاجیا دەبینن، واتە یەکخستنیان لە یەك دەنگ و یەك ئامانجی مەزندا. ئەم

ڕۆڵیش ڕۆڵی دۆزینەوەی ڕێگەی ڕیزبەندکردنی بابەتە گرنگەکانی ستراتیج و بەهاکان و تێڕوانینی هاوبەشە. با سەرەتا چاوێك بگێڕین بە تیۆری و واقیع و ئەلتەرناتیڤە پەیوەستەکانی دۆزینەوەی ڕێبازەکەدا.

| | |
|---|---|
| ئەفسانە | بیری کۆن: تەنیا ئەوانە دەتوانن پەیامی دەزگاکە و ڕیزبەندی ستراتیجەکانی دابڕێژن کە لە هەموان زیاتر دەزانن؛ واتە ئەوانەی کە لە لوتکەی هەرەمی دەزگاکەدان |
| واقیع | بیری نوێ: لەڕاستیدا پەیامی دەزگاکە و ڕیزبەندیی ستراتیجەکانی کە بە پەلەپرۆزێ کەسانی لوتکەی هەرەمەکە دایانڕشتووە و دواتر ڕاگەیەندراون، زۆری پێ ناچێت بیر دەچنەوە. ئەگەر خەڵکانی دیکە بەشداری نەکەن لە دیاریکردنی ئەم پەیام و ڕیزبەندیکردنەدا و زۆر لێبڕاوانە نەیگرنە ئەستۆ، ئەوا هیچ پابەندبوونێك دروست نابێت. |

یەکەم ئەلتەرناتیڤی ڕۆڵی سەرکردایەتی لە دیاریکردنی ڕێبازدا ئەوەیە کە تێڕوانین و ستراتیج و بەهاکان بۆ تیمەکەت یاخود بۆ دەزگاکەت ڕابگەیەنیت بێ هیچ بەشداریکردنێکیان.

دووەم ئەلتەرناتیڤ ئەوەیە کە زیادەڕەویی بکەیت لە بەشداریکردندا و سەرەنجام لە زۆنگاوی شیکردنەوە و مشتومڕە بێ کۆتاییەکاندا وا نوقم ببیت کە دیاریکردنی یەك ستراتیجت لەلا بکات بە مەحاڵ.

سێیەمین ئەلتەرناتیڤ ئەوەیە کە تۆ تەنیا هەر بەوە دڵت ئاو نەخواتەوە خەڵکەکە بە شێوەیەکی ماقوڵ بەشدار بکەیت لە پێشخستنی تێڕوانین و پەیام و ستراتیجەکەدا، بەڵکو درکیش بەوە بکەیت کە ئەگەر کەلتورێکی بەهێز دروست بکەیت لە متمانە و خودی خۆیشت کەسێك بیت شایستەی متمانە پێکردن، ئەوا خەڵکەکە هێندە لایەنگری دید و پەیام و ستراتیجەکە دەبن وەك ئەوەی بە کردەوە بەشدارییان کردبێت لە داڕشتنیدا.

ڕێگەم بدە ئەم ئەلتەرناتیڤی سێیەمە ڕوون بکەمەوە.

ماوەیەکی زۆرە من سەرسامم بەو ئاستە خزمەتگوزارییە بەرز و بەردەوام و بێ هاوتایەی کە لە ئوتێلی (ڕیتز کارلتۆن Ritz-Carlton) هەموو جارێك پێشکەشمی دەکەن.

من دوای ئەوەی پەیوەندی و ناشنایەتیم لەگەڵ (هۆرست شۆڵز Horst Schulze)ی دامەزرێنەر و سەرۆك و بەڕێوەبەری ئەو زنجیرە ئوتێلانە بەهێزتر بو چاکتر تێگەیشتم کە کەلتوری هەڵکەوتوی ئەم کۆمپانیایە چۆن دامەزراوە.

کۆمپانیای ئوتێلەکانی ریتزکارلتۆن لەژێر سەرکردایەتی (شۆڵز)دا ئەنجامێکی بێ هاوتای بەدەست هێنا ئەویش دووجار وەرگرتنی خەڵاتی نیشتمانیی (مالکۆڵم بالدریج)ە لە بواری خزمەتگوزارییدا وەك باشترین دەزگای نیشتمانی لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزاریی چاکدا.

جارێکیان من بۆ ئامادەکردنی نوسینێك کە لە سەرتاسەری جیهاندا لە چەند رۆژنامەیەکدا بڵاوم دەکردەوە چاوپێکەوتنم لەگەڵ (هۆرست)دا کرد و لێم پرسی: "تۆ سەرکردایەتیکردن چۆن پێناسە دەکەیت؟ وەڵامەکەی ئەوەبو:

"سەرکردایەتیکردن بریتییە لە خوڵقاندنی ژینگەیەکی وا هەموو خەڵکەکەی کە لە دەزگاکەدا کاردەکەن تەنیا خۆیان هەر بە کرێکار و کارمەند نەزانن بەڵکو بە بەشێک لە دەزگاکە بزانن. سەرکردایەتیکردن ژینەگەیەک دەخوڵقێنێت خەڵک ئارەزومەندانە کار بکەن نەک بە زۆر. خوڵقاندنی ئەم جۆرە ژینگەیە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. سەرکردە نابێت تەنیا هەر ئەرک و کار دیاری بکات بەڵکو پێویستە ئامانجێکیش دابنێت. من وەکو بزنسمانێک پێویستە لەسەرم "ژینگەیەک بخوڵقێنم خەڵکەکە هەست بەوە بکەن بەشێکن لە شتێک، پێویستە هەست بکەن کە شتێکیان بەئەنجام گەیاندووە و خاوەنی ئامانجێکن. ئامانج کە مەسەلەیەکی بەهادارە لە ژیانیاندا –ئەو هێزەیە کە پاڵ بە خەڵکەکەوە دەنێت باشترین تواناو زانیاری خۆیانت پێ ببەخشن. بەم شێوەیە تۆ باشترین تواناو زانیاری خەڵکەکەت دەست دەکەوێت و تۆش باشترین توانا و زانیاری خۆتیان دەدەیتێ. هەر شتێکی کەمتر لەمە لە بەرپرسیارێتی کۆمپانیاکەدا نییە و پێویستە بە شێوەیەکی کەسی چارەسەر بکرێت. تۆ ئەگەر هەر بەو چاوە تەماشای بەرامبەرەکەت بکەیت کە تەنیا ئەرکێک بەجێدەهێنێت، ئەوا خەسڵەتە مرۆییەکەت لێ داماڵیوە و وەکو داروبەرد تەماشات کردووە. وەک ئەو کورسییە تەماشای دەکەیت کە لەسەری دادەنیشیت. باوەڕناکەم ئێمەی مرۆڤ مافی کاری لەوجۆرەمان هەبێت. کەس لە ئێمە پێی خۆش نییە بریتیی بێت لە شتێک لە گۆشەیەکدا دانرابێت. ئێمە بە کردەوە بۆمان دەرکەوتووە کە هیچ شتێک هێندەی ئەوە کارمەند خۆشحاڵ و رازی ناکات کە هەست بکات بەشێکە لە

شتێک و بایی ئەوەندەش جێی متمانەیە کە بتوانێت بەشداری بکات و بڕیار بدات. هەرکەسێک لە بوارەکەی خۆیدا زانایە. هەرگیز گومانم لەو ڕاستییە نییە کە ئەو کرێکارەی قاپ دەشوات زۆر لە من زیاتر شارەزای بواری قاپشۆردنە. لەبەر ئەوە قاپشۆر دەتوانێت بەشداری بکات لە چاککردنی ژینگەی کارەکەی و زیادکردنی بەرهەم و کەمکردنەوەی ژمارەی قاپە شکاوەکاندا .. تاد. هەرکەسێک لە بواری کارەکەی خۆیدا دەتوانێت بەشداری گەورە و سەرنجڕاکێشی هەبێت.

من گەنجێکی خەڵکی وڵاتی انایرۆبیەم لابو کە شانزە ساڵ لەمەوبەر وەکو قاپشۆرێک هاتە ئیشەکەوە. ئەو زمانی ئینگلیزی نەدەزانی، بەڵام زۆر دڵسۆزی ئیشەکەی بو. پاش ماوەیەک داوایان لێ کرد لە خزمەتگوزاری ژوورەکاندا کاربکات، پاشان کرایە بەڕێوەبەری ئەو بەشە، ئینجا گواسترایەوە بۆ هۆڵی چاوەڕوانی، ئینجا کرا بە کرێکاری ناوبارەکە، ئینجا بو بە جێگری یاریدەدەری هۆڵی چاوەڕوانی و ئێستا بەڕێوەبەری بەشی خواردن و خواردنەوەکانی ئوتێلەکەیە. واتە ئەو گەنجەی کە بە قاپشۆریی دەستی پێکرد ئێستا کەسی دووەمی ئوتێلەکەیە.

من لە تەمەنی شانزە ساڵیدا بوم کە دایکم بە خۆم و جانتا بچکۆلەکەمەوە بردمی بۆ ئوتێلێک بۆ ئەوەی فێری کارکردن ببم لە ئوتێلدا. ئوتێلەکە نەفەری زۆر گرنگی لێ دابەزیبو. وام هەست دەکرد هەمویان لە من باشترن. دواتر پەیوەندیم لەگەڵ سەرۆکی خزمەتگوزارەکاندا پتەو بو کە پیرەمێردێکی حەفتا ساڵە بو. لەگەڵ ئەودا بوم کە کابرایەکی باش و خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بو، هەموان پێی سەرسام بون. هەمیشە هەوڵی دەدا لە جلوبەرگ و کردار و گفتاردا یەکەم بێت. من لەم پیاوەوە فێری ئەوەبوم کە مرۆڤ ئەگەر بە شێوەیەکی نائاسایی کارەکان ئەنجام بدات ئەوا لە نرخ و بایەخدا دەچێتە ریزی کڕیارەکانەوە. واتە هێندەی کڕیارەکان و نەفەرەکان تۆش گرنگ و بەنرخیت. لەم پیاوەوە بۆم دەرکەوت، کە سروشتی ئیشەکەشم هەرچییەک بێت بەڵام ئەگەر بە باشی ئەنجامی بدەم هێندەی کڕیارەکە و نەفەرەکە بەنرخ دەبم. لەڕاستیدا دواتر ئەمە بو بە دروشمی ئوتێلەکانی ریتزکارلتوت: "ئێمە خاتون و ئاغاین خزمەتی خاتون و ئاغا دەکەین".

لە ماوەی بیستوپێنج ساڵی ڕابردودا لێکۆڵینەوەمان لەسەر نزیکەی پێنج ملیۆن کەسدا کرد، مەبەستەکەش دۆزینەوەی ئەو توانا و تایبەتمەندییانە بو کە سەرکردە و

بەڕێوەبەرە کاریگەرەکان هەیانە. یەکێک لە ئەنجامە روونەکان کە لەم لێکۆڵینەوە فراوانەدا دەستمان کەوت دەڵێت: بەڕێوەبەرەکان هەمیشە نمرەی بەرزتر لە لایەنە رەوشتییەکەی کارەکەدا (پیشەنگی باش) وەردەگرن بەڵام لە مەسەلەی بەخشینی فۆکەس کردن و دۆزینەوەی رێبازدا (دیاریکردنی رێبازەکەدا) نمرەی نزم وەردەگرن. لە ئەنجامی ئەمەدا، خەڵک لایان روون نابێت مەسەلە گرنگەکان کامانەن و بەرپرسیاریش نابن لێیان و بەمجۆرە دەزگاکان شکست دەهێنن لە جێبەجێکردندا. سەیرەکە لەوەدایە هەرچەندە خەڵکەکە زۆر خۆیان ماندو دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی بەرچاویان روون نییە، ئەنجامی گەورە بەدەست ناهێنن. شتەکە وەکو ئەوەی لێ دێت بە هەمو هێزی خۆت پاڵ بە پەتێکەوە بنێیت.

نمونەسازیی متمانە دروست دەکات، بەڵام دیاریکردنی رێباز سیستەمەکە بنیاد دەنێت تەنانەت بێ ئەوەی داواشی لە خەڵکەکە کردبێت. مرۆڤ کاتێک کە لەسەر مەسەلە هەرە گرنگەکانی دەزگاکە رەزامەندی نیشان دەدات مانای وایە بە دڵنیاییشەوە بەشداری دەکات لەو پێوەرانەی کە بڕیارەکانیان پێ دادەڕێژرێت. ئەم جۆرە پەیوەندییەی کە رووتکردنەوەی تێدایە دەبێتە هۆی جەختکردنەوە. سیستەم و سەقامگیری لێ دەکەوێتەوە و وا لە خەڵکەکە دەکات سەلیقەی خۆیان بەکاربهێنن. ئێمە دواتر باسی ئەم خاڵە دەکەین لە مەسەلەی تواناسازیدا. دید و بۆچونت لەسەر تاکەکان دەبێتە دیاریکردنی رێبازەکە لەسەر ئاستی دەزگاکە.

> ناوەڕۆکی سەرکردایەتی ئەوەیە کە پێویستە بەرچاوت روون بێت و دیدێکت هەبێت. مرۆڤ ناتوانێت ئاوازێک بژەنێت کە نەیزانێت.
>
> تیۆدۆر ئێم. هیسۆرگ، سەرۆک، نۆتردام

کاتێک تۆ لە دڵی خۆتدا مەسەلە گرنگەکان دیاری دەکەیت، ئیتر گرنگترین رۆڵ و کێشەی بەردەمت بریتی دەبێت لەوەی بە بەشداریکردنی خەڵک تێڕوانینێک لەسەر ئەو شتە دروست بکەیت کە گرنگە. تکایە نەختێک بیر لەم دو پرسیارە بکەرەوە دەربارەی کارمەندەکانت:

١. ئایا کارمەندەکانت بە روونی لە ئامانجی دەزگاکە تێگەیشتون؟
٢. ئایا پابەندن بە جێبەجێکردنیانەوە؟

لە راستیدا تۆ ئەگەر بتەوێت یارمەتی خەڵکی بدەیت بۆ تێگەیشتن و پابەندبوون بە جێبەجێکردنی ئامانجگەلێکی گرنگ، پێویستە لەسەرت کە بەشداریان بکەیت لە پرۆسەی بڕیارداندا. پێویستە لەگەڵ ئەواندا ئاراستەی دەزگاکە دیاری بکەیت (تێڕوانین و پەیام)، ئەوکاتە ئیتر هەمو کەس هەست دەکەن کە خاوەنی رێگەکەن بەرەو ئەو ئاراستە و ئامانجانە (بەهاکان و نەخشە ستراتیجییەکە).

کاتێك لەگەڵ ئەوانی دیکەدا سەرگەرمی دیاریکردنی مەسەلە هەرە گرنگەکانی دەزگاکە و تیمەکەن، پێویستە لە واقیعەکەش تێبگەن کە روبەروی دەبنەوە .. تێگەیشتنی واقیع و رووداوەکان یارمەتی مرۆڤ دەدات سیستمێکی بەهاو تێڕوانینە هاوبەشەکان بدۆزێتەوە، کە پەیامی دەزگاکە و نەخشە ستراتیجییەکەشی لەخۆ بگرێت. بەمجۆرە قسەکردن لەسەر پێویستییەکان لە واقیعەوە سەرچاوە دەگرێت.

نوسەرێکی وەکو (کلەیتۆن ئێم. کریستینسن) دەڵێت:

"هەمو پیشەسازییەک لەژێر کاریگەری چەند هێزێکی دیاریکراودا کاردەکات کە پێیان دەوترێت: یاساکانی سروشتی دەزگا. ئەم یاسایانە زۆر گرنگن لە دیاریکردنی ئەوەی کە دەزگاکە دەتوانێت چی بکات و چی نەکات.

هەر بەڕێوەبەرێک روبەروی تەکنیکی بێسەروبەر بوەوە و ئەو هێزانەی سروشتی دەزگاکە بەسەریدا زاڵبوون ئەوا کۆمپانیاکە توشی شکست دەکەن. نمونەیەک لەسەر ئەوە: خەڵک لە زەمانی زوودا کە هەوڵی فڕینی دا چی‌کرد؟ پەڕوباڵی بەست بە قۆڵییەوە و ئینجا لە شوێنێکی بەرزەوە بە هەمو هێزی خۆی قۆڵی خستە جوڵەو خۆی فڕێدایە خوارەوە. بەڵام ئەنجامەکەی بە شکست کۆتایی هات. شکستێکی گەورە. ئەو خەڵکە هەرچەندە خاوەنی خەونی جوانیش بون و خۆیشیان بە مەسەلەکەوە زۆر ماندوکرد بەڵام شەڕێکی دۆڕاویان دەکرد دژی هێزە زەبەلاحەکانی سروشت.

کەس هێندە بەهێز نییە لە جەنگێکی وادا براوەبێت. فڕین بۆ مرۆڤ کاتێك دەستەبەر بو کە مرۆڤ وردە وردە لە مەسەلەکانی ئەم بوارە تێگەیشت، لەو یاسایانەی کە پەیوەستن بە فڕینەوە، لەو پرنسیپانەی کە چۆنێتی کارکردنی سروشت دیاری

دەکەن، لە یاسای کێشی زەوی و لە پرنسیپی (بێرنۆلی) و لە چەمکەکانی بەرزکردنەوە و ڕاکێشان و دژە هێز. ئەوکاتەی کە مـرۆڤ سیستمگەلێکی فڕینی وای دارشت کە گونجاو بێت نـەک نـاکۆک لەگەڵ ئـەم یاسا و پرنسیپانەداو بەرجەستەیان بکات ئینجا توانی بفڕێت لە بەرزیدا بۆ ماوەی درێـژی ئـەوتۆ کە پێشتر خەونیشی پێوەنەدیبو. دیارە ئەگەر سیستمەگەلەکە نـاکۆک و نـەگونجاو بونایە لەگەڵ یاسا و پرنسیپەکانی فڕیندا مەحاڵ بوو ئەنجامی وای لێ بکەوێتەوە.

پێویستە تۆ بە تەواوی لە چوار هەقیقەت تێبگەیت —هەقیقەتـەکانی بـازاڕ، توانا بنەڕەتییەکان، پێداویستی و ئارەزوی خەڵکانی ئەو بوارە، بەهاکان — تێگەیشتنی تـەواو و پێشوەخت لەم هەقیقەتانە زۆر پێویستن و بەبێ ئەوە کەس ناتوانێت لە دیاریکردنی ڕێبازەکەدا سەرکەوتوبێت:

• **هەقیقەتەکانی بازاڕ:** ئایا خەڵکی نـاو تـیم و دەزگاکـەی تـۆ چۆن تەماشای بـازاڕ دەکـەن؟ رەوتـە سیاسی و ئـابوری و تـەکنۆلۆجی‌یـە باوەکان چـین؟ هێـزە ڕکابـەرەکان کامانەن؟ مەیل و تایبەتمەندییەکان و پیشەسازییەکان بـریتین لـە چی؟ ئەگـەری ئـەوە چەندە کە تەکنیک و ستایلی کارکردنی وا بێتە ئاراوە کە تێکڕای پیشەسازییەکە وا لێ بکات کۆن ببێت و کاتی بەسەرچوبێت؟

• **توانـا بنەڕەتییـەکان:** ئـەو خاڵە بەهێزانـەی تـۆ چـین کـە لـە خـەڵکی دیکـەت جیادەکەنەوە.

من زۆر سەرسامم بە شێوازی (جیم کۆلنس Jim Collins) لـە دیاریکردنی ڕێبازدا. ئەو کتێبێکی هەیە بـە ناونیشانی (لـە چاکەوە بـۆ مـەزنی). کـۆلنس لـەو کتێبـەدا سێ بازنەی بەیەکداچو نیشان دەدات، سێ بازنەکە بازنەی خاڵە بنەڕەتییەکانی هێزی تۆن و ناوی لێ ناون (چەمکی هێدگیهۆك Hedgehog conce). ئـەم سێ بازنەیـە بـریتین لە سێ پرسیار: یەکەم: ئەو شتە چییە کە باشیت تێیـدا، یـاخود باشـترین ئاستی تـۆ لـە چ بابەتێکدایە؟ دووەم: ئەو شتانە چین کە زۆر عاشقیانیت؟ سێیەم: خـەڵك لـە بەرامبـەر چیدا شتت پێ دەدەن؟ بە واتایەکی دیکە ئەو پێویستی و ئـارەزووە مرۆییانـە چین کە جێبەجێکردنیان دەیبەخشێتە بزوێنەرە ئابورییەکەت؟

شوێنی یەکتربڕینی ئەو سێ بازنە بەیەکداچووە بریتـی دەبێت لـەو بناغەیـەی کە

بەھا گریمانە کراوەکانی تۆی لەسەر بنیاد دەنرێت. ئەگەر پرسیارێکی دیکە بخەینە سەر ئەو سێ پرسیارە و بڵێین؛ ویژدانت چیت پێ دەڵێت؟ ئەوا لە مرۆڤی کامڵ نزیک دەبێتەوە (جەستە —بزوێنەرە ئابورییەکە، ئەقڵ- لە هەموان باشتربیت، دڵ — عیشق و جۆش‌وخرۆش، رۆح — ویژدان).

ئەو پانتاییەی کە هەرچوار رەهەندەکەی تێدا تێکەڵ دەبن بریتییە لەو جێگەیەی کە تۆ دەنگی خۆتی تێدا دەدۆزیتەوە. (٣-١١) وەك پێشتر باسمان کرد ئەم مێتۆدە بەسەر کەسێکدا جێبەجێ دەبێت کە بیەوێت دەنگی خۆی بدۆزێتەوە و دەتوانێت سودی لێ وەربگرێت. نەك تەنیا مرۆڤ بەڵکو بۆ دەزگاکانیش ئاسانکەرێکە کە دەتوانن بۆ هەمان مەبەست بەکاریبهێنن.




شێوەی ٣-١١

• پێویستی و ئارەزووەکانی لایەنە پەیوەندیدارەکان؛ بیر لە خەڵکە پەیوەندیدارەکە بکەرەوە. یەکەم و لە هەموویان گرنگتر لەو کڕیارانەی کە ئامانجن، بزانە لەراستیدا

پێویستیان بە چییە و حەزیان لە چییە؟ ئەو بابەتانەی کە بەلایانەوە گرنگن بریتین لە چی و چی، کێشەیان چییە و لە چی دەترسن؟ ئەی پێویستی و ئارەزوی بەکاربەرەکان چین. بارودۆخی بازاڕی پیشەسازییەکە کە ئەمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن چۆنە؟ ئەو تەکنیك و ستایلی کارکردنانە چین کە رەنگە بەرهەمەکانی ئەو دەزگایە بکەن بە شتێکی کۆن و مۆدە بەسەرچو؟

سەبارەت بە خاوەنی دەزگاکە، ئەوانەی کە سەرمایەکەی دابین دەکەن و باج دەدەنە دەوڵەت، ئەوانیش پێویستە هەمو شتێکی پێویستیان لە بارەوە بزانیت، پێویستی و ئارەزووەکانیان چین؟ ئەی هاوکار و کارمەند و هاوبەشەکان چی؟ پێویستی و ئارەزووەکانی ئەوان چین؟ ئەی دەڵاڵ و دابەشکەرانی بەرهەم و هاوردەکاران و هەمو ئەڵقەکانی زنجیری هاوردەکردن چییە؟ ئەی کۆمەڵگا و ژینگە؟

• **بەهاکان**: بەهاکانی خەڵك کامانەن؟ ئەی بەهاکانی تۆ؟ دەزگاکە چ ئامانجێکی بنەڕەتیی هەیە؟ بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە ئایا چ ستراتیجێکی بنەڕەتی پەیڕەو دەکات؟ ئەو کارە چییە کە تۆیان راسپاردووە ئەنجامی بدەیت؟ ئەو بەهایانە چین کە دەبنە رێنمات؟ بەهاکان چۆنی ریزبەندی دەکەیت بۆ ئەوکاتە نائاساییانەی کە گوشارت دێتە سەرو روبەروی گیروگرفت دەبیتەوە؟ دیارە زۆربەی خەڵك هێشتا بابەتە هەرە گرنگەکانیان دیاری نەکردووە. واتە هێشتا ئەو پێوەرانەیان یەکلایی نەکردۆتەوە کە بەردی بناغەی هەمو بڕیارەکانی دیکەن و ئێستا ئەرکی ئێمە هەوڵی دیاریکردنی ئەو پێوەرانەیە بۆ گروپ و تیمێکی دیاریکراو و تەنانەت بۆ هەمو دەزگاکە. دیارە ئەمە مەسەلەیەکی تەواو سەخت و ئاڵۆزە و لە هەمو بابەتێك زیاتر پێویستی بە متمانەکردن بە یەکتر هەیە. کەواتە ئێمە هەتاکو ئەم پرسیار و بابەتانەمان لا رون نەبنەوە ناتوانین فۆکەس بخەینە سەر هیچ شتێك. لەبەر ئەوە مەسەلەکە زۆر پێویستی بە رەوشت و لێهاتویی و تێڕوانین و دیسپلین و عیشق هەیە و پێویستە لە هەمو ئەمانەشدا جڵەوکە بەدەست ویژدانەوە بێت. لەراستیشدا زەحمەتترین بەشی ئەرکەکە دیاریکردنی رێبازەکەیە، چونکە تۆ مامەڵە لەگەڵ زۆر ئەجێنداو کەسایەتی و گۆشەنیگاو واقیعی جۆراوجۆردا دەکەیت. ئاستەکانی متمانەکردنیش جۆراوجۆرن و هەر یەکەو جۆرە ئەفسیەتێکی هەیە. هەر لەبەر ئەمانەشە کە پێشەنگی باش رۆڵی هەرە گرنگ و بنەڕەتی دەبینێت. ئەگەر خەڵکەکە نەیانتوانی متمانە بەو کەس و تیمە

یەکەن کە دەستپێشخەریی دەکات لە دیاریکردنی ڕێبازەکەدا، ئەوا ناتوانن تێڕوانی ئەو کەس و تیمە بکەنە تێڕوانینی خۆیان و بەمەش لەبری ئەوەی ببنە هاوبەشی کارەکە، کۆسپ و تەگەرەی دەخەنە ڕێ.

مەسەلەکە پێویستی بە سەرڕاستی و توانای جۆرج واشنتۆن بو تا بتوانرێت بلیمەتییەکانی جیفرسۆن و جۆن ئادامس و بنیامین فرانکلین و ئەلێکساندەر هامیلتۆن و تێکڕای دامەزرێنەرانی کۆماری ئەمریکی بە هەمو جیاوازییەکانیانەوە کۆبکرێنەوە و هاوئاهەنگ بکرێن و ڕێك بخرێن، تا لە ئەنجامدا توانرا دەستور و سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکان رابگەیەنرێت. لەگەڵ ڕاگەیاندنی (دە) بابەتی دیکە، کە ناوی لێ نرا ڕاگەیاندنی مافەکان.

لە مەسەلەی دامەزراندنی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئەم ئەرکی دۆزینەوەیەی ڕێباز زەحمەتترین ئەرك بو. بەلام ئەم بەڵگەنامە گرنگ و قوڵ و ڕێنماییکەرانە کارێکی وایان کرد ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ژیانی نیشتمانی خۆیدا؛ بەرگەی ئەرکەکان و ڕووداوەکانی جەنگی ناوخۆ و هەردو جەنگی جیهانی و قەیرانە گەورەکەی دارایی و جەنگی ڤێتنام و ریسوایی وۆتەرگێت و رسوایيە سەرۆکایەتییەکان و هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکان بگرێت. لە بواری تواناسازیشدا هێندە بەسە کە بڵێین تەنیا ٤،٥٪ی دانیشتوانی جیهان (واتا دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتووەکان) یەك لەسەر سێی کەلوپەلەکانی هەمو جیهان بەرهەم دێنن.

## گەیشتن بە بەهاو تێڕوانینی هاوبەش

بۆ وەسفکردنی حاڵەتی گەیشتن بە هاوتێڕوانینی هاوبەش، مرۆڤ لە کەلتورە جیاجیاکاندا وشە و زاراوە و دەستەواژەی جیاجیا بەکاردەهێنێت. هەیە دەڵێت یەك دڵین، هەیە دەڵێت پێکەوە یەك گۆرانیی دەچڕین.

ئەمە لێکچواندنێکی نایابە و واتای ئەوە دەگەیەنێت کە لە مەسەلە هەرە گرنگەکانی تێڕوانین و ستراتیج و بەهاکاندا وەکو یەکین. ژەنینی مۆسیقا بە شێوەی گروپ و چڕاندنی ستران بە کۆمەڵ هاوئاهەنگییەکی جوانیان تێدایە.

هاوبەشیکردن وشەیەکی سەرنجڕاکێشە. کە من لە مەسەلەیەکدا دەتکەمە هاوبەش، مانای وایە ئەوەی هەمە پێشکەشم کردویت. تۆ ئەگەر بۆچونەکەی من بەیرەو بکەیت

و بڕوات هەبێت بەو کارەی دەیکەم و متمانەت پێکردم، ئەوا منیش تۆم کردۆتە بەشداری تێڕوانینەکەم. ڕەنگە تۆ لەم بارەدا هەوڵی زۆرتر بدەیت لەوەی کە ئەگەر خۆت بە تەنیا کارەکەت گەشە پێبدایە، چونکە بڕوات بە ئەزموونەکەی من لە ئەزموونەکەی خۆت زیاترە. بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر تۆ پێت وابێت خۆت بایی ئەوە لێهاتویت بەشداری بکەیت لە داڕشتنی بیرۆکەکەدا و ئارەزوشت لێ بو، منیش تەنیا نەخشەکەی خۆم وەك نەخشەی هەردووکمان خستەڕو، ڕەنگە تۆ هیچ هەستێکت بۆی نەبزوێت. ئەمە هاوبەشی نییە. تۆ وا هەست دەکەیت پەیامەکە و بەها دەرخراوەکان سەپێنراون بەسەرتدا. واتا ئێمە پێکەوە یەك گۆرانی نائێین.

بە کورتییەکەی دەتوانین بڵێین پەیامی دەزگا و نەخشە ستراتیجییەکە مەسەلەیەکن، پرۆسەی بەشدارکردنی خەڵکیش لە گۆڕانییەکەدا شتێکی دیکەیە. ئەم دوو شتە بایەخیان بەقەدەر یەکە. ئەم کارە بەڵێنبردنە سەرێکی مەزنە.

بۆ ئەوەی بزانیت سەرکردایەتیەك چەندە باشە و تا چ ئەندازەیەك پێشەنگێکی سەرکەوتووە، تەماشا بکە بزانە لە دیاریکردنی ڕێبازەکەدا چۆنە. بەبێ دیاریکردنی ڕێباز، خەڵك لە گۆڕانییەکەدا بەشداریت ناکەن و لە مەسەلە ستراتیجییەکانیشدا هیچ هاوسۆزییەکت نیشان نادەن و پاشان تەواوی شتەکان لە ڕێڕەوی خۆیان دەردەچن. لەم حاڵەتەدا تەنیا شتێك و نیعمەتێك کە دەتپارێزێت غەریزەی ئارەزووکردنی مانەوەیە کە هەمو کەس هەیەتی. خۆ ئەگەر بەخت یاوەرت بێت و ڕکابەرەکەت لە بارودۆخێکی بێ سەروبەردابێت، ئەوا تۆ ڕەنگە ڕزگارت ببێت، بەڵام ئەگەر ڕکابەرەکانت هاودەست بون لەگەڵ یەکدیدا، بە تایبەت ئەگەر لەسەر ئاستی جیهاندا هەڵکەوتوتر بون- ئەوا دەست لەخۆت بشۆ.

## فیلم: *ئامانج*

ئەگەر بێشتر منداڵ و نەوەکانی خۆتت بینیبێت بەیانییەکی کۆتایی هەفتە خەریکی فتبۆڵێنن، ئەوا ئەم فیلمە بچوك و مەزنە دەبێتە مایەی خۆشحاڵییەکی زۆرت. فیلمەکە وات لێ دەکات هەست بکەیت لایەنگری ئەو منداڵە بچوکانەیت. تکایە تەماشا بکە بزانە چەند لێکچون هەیە لەنێوان بابەتەکانی ناو فیلمەکە لەگەڵ ئەو گیروگرفتانەی کە لە شوێنی کارەکەتدا دێنە ڕێت. تەنیا لەبەر ئەوەی هەوڵت داوە هەموان فۆکەس بخەنە

سەر یەک ئامانجی گەورە. ئێستا (سی دی)یەکە بخەرە ناو ئامێرەکەوە و تەماشای فیلمەکە بکە، فیلمی ئامانج – دڵنیام چێژی لێ دەبینیت.

## ئامرازەکانی دیاریکردنی ڕێباز ( فۆکەسکردن )
## پەیامی دەزگا و نەخشە ستراتیجییەکە

دیاریکردنی ڕێباز لەسەر ئاستی دەزگاکە هەمان ڕۆڵی پێشەنگی چاکی هەیە کە لەسەر ئاستی تاکە کەسی هەیەتی و ئەو مەسەلانە دەگرێتەوە کە دەزگا و خێزان و تیمەکە فۆکەسی دەخەنە سەر. لە دیاریکردنی ڕێبازدا تۆ هەمان ئەو پرسیارانە دەکەیت کە لەسەر ئاستی تاکە کەس بەهاکان ئامانجەکان دیاری دەکەن، بەڵام وەڵامەکان لێرەدا گروپەکە دەیداتەوە بە شێوەیەکی دەستەجەمعی وا کە بگونجێن لەگەڵ ئەرک و بەرپرسیارێتییەکانیاندا. کەواتە پەیامی دەزگاکە و پلانە ستراتیجییەکەی، بەم پرۆسە پڕ لە کارلێکردنە دەنوسرێت. (ئامانجەکان و ختسنەڕوی بەهاکان).

پەیامی دەزگاکە پێویستە هەم ئامانجەکەی تێدابێت، هەم تێڕوانین و بەهاکانیش لەخۆ بگرێت.

بەڵام نەخشە ستراتیجییەکە ڕوونکردنەوەی ئەو میکانیزمەیە کە لە ڕێگەیەوە نرخ و بەها دەبەخشێت بە کڕیارەکانت و بە تێکڕای ئەو کەسانەی پەیوەندییان بە دەزگاکەتەوە هەیە. بە کورتییەکەی دەتوانین بڵێین نەخشەی ستراتیجی لە ڕاستیدا دەنگی دەزگاکەیە ... مرۆڤ کاتێک پلانە ستراتیجییەکەی خۆی دادەنێت پێویستە کڕیارەکان و خەڵکە پەیوەندیدارەکان بناسێت و بشزانیت دەیەوێت بیانکات بە چی؟ چ بەرهەم و خزمەتگوزارییەکیان پێشکەش دەکات؟ نەخشەکەی چییە، ئایا فلانە ئامانج بۆ ڕاکێشانی کڕیار و پارێزگاریکردن لێی چەند کاتی بۆ دانراوە؟ سەبارەت بە خێزانیش پێویستە بڵێین کە نەخشە ستراتیجییەکەی خێزان هەر هەمان نەخشە و کارکردنی خۆتە لەپێناو بەدیهێنانی تێڕوانین و بەهاکانت لە ژیانی ڕۆژانەی خێزانەکەوە.

## ئەو پایەمەی دەزگا کە دەبێتە هۆی تواناسازی

بە بۆچوونی من و هێندەی کە بە ئەزموون لە ژیاندا فێریان بووم، پەیامی ئەو دەزگایانەی کە کارمەندەکانیش بەشدارن تیایدا و دەبنە هۆی بەدیهێنانی تواناسازی

دەرئەنجامی بەدیهاتنی مەرجەکانی خوارەوەن:

١. ژمارەیەکی گونجاو لە خەڵکێک کە
٢. بە تەواوی ئاگادار کرابنەوە لە مەسەلەکە
٣. بە ئازادی و هاوکاریی تەواو کارلێك دەکەنە سەر یەکتری
٤. لە ژینگەیەکدا کە متمانە تیایدا باڵادەست بێت.

بە راستی، هەر دەزگایەك لە بارودۆخی ئاوادا دروست بکرێت هەمان بنەماو بیرۆکە سەرەکییەکانی تێدا دەبن. رەنگە وشەکان جیاواز بن، بەڵام هەموویان دەربارەی پێویستییەکان و چوار رەهەندەکەی ژیانن (رەهەندە جەستەیی و ئەقڵی و سۆزداری و رۆحییەکان). هێزی کەلتورە خزمەتگوزارییە نایابەکەی ئوتێلەکانی (ریتزکالتۆن) لەوەدایە کە لە بنەڕەتدا چۆن دەڕوانێتە مرۆڤ چ ئەوانەی کاری تێدا دەکەن، چ میوانەکانیش (ئێمەی خاتون و ئاغا خزمەتی خاتوون و ئاغا دەکەین). کرۆکی ئەو سەرکردایەتییەی کە (هۆرست شۆلز) پەیڕەوی دەکات، لەو گۆشەنیگایەدا هەیە کە تەماشای کەرامەتی مرۆڤی کامڵی پێدەکات و کە تێدەگات مرۆڤ چەند پێویستی بەوەیە رێزی لێ بگیرێت. تکایە جارێکی دیکە قسەکانی بخوێنەرەوە و سەرنجیان لێ بدە. بیرت نەچێت تەنیا ئەو مرۆڤانە دەنگی تایبەتی خۆیان دەدۆزنەوە کە رێگایان پێ دەدرێت و بواریان بۆ دەرخسێنرێن پێویستییەکانی چوار رەهەندەکەیان تێر بکرێن. بەمەش دەتوانن ئەوپەڕی بەشداریی بکەن. دیارە مانەوە –گەشەی ئابوری- پێویستەیەکی جەستەیە و هاندەریشێتی. پێویستییەکانی ئەقڵیش و هاندەرەکانیشی بریتین لە گەشەکردن و پێشکەوتن. خۆشەویستی و پەیوەندییەکانیش پێویستییەکانی دڵ و هاندەرەکانی پێك دەهێنن. پێویستییەکانی رۆح و هاندەرەکانیشی بریتین لە واتاو سەرڕاستی و بەشداریکردن. هەمو دەزگایەکیش ئەم چوار پێویستییەی هەیە:

١. مانەوە – تەندروستیی دارایی (جەستە)
٢. ئەشونما و گەشەکردن – گەشەی ئابوری، گەشەی کڕیارەکان، داهێنانی خزمەتگوزاری و بەرهەمی نوێ، زیادکردنی توانا پیشەیی و دەزگاییەکان (ئەقڵ)
٣. پەیوەندییەکان و هاوکاریی خوڵقێنەری بەهێز، بەشداریکردنەکان و تۆڕی دەرەکی بەهێز، کاری تیمەکە، متمانە، چاودێریی، رێزگرتن لە جیاوازییەکان، (دڵ)

٤. واتــاو سەرڕاســتی و بەشــداریکردن – خزمــەتکردنی خــاوەن پەیوەندییــەکان و هاوکاریکردنیــان؛ کڕیــاران، هاوردەکــاران، کارمەنــدان و خێزانــەکانیان، کۆمــەڵگاکان، گەڕەکەکان – دروستکردنی جیاوازییەك لە جیهانـدا (ڕۆح). مەبەست لە دارشتنی پـەیامی هاوبـەش ئـازادکردنی وزەی هێـزی کـارە. دیـاریکردنی پـەیام و تیـڕوانین و بەهاکانە لەناو دەزگاکەدا بە جۆرێك کە بتـوانن هـەر چوار پێویستییەکەی تاکەکان و هەر چوار پێویستییەکەی دەزگاکە وەکو یەك تێر بکەن. ئەو کارەی کە هـەر تاکێك لـە دەزگاکەدا ئەنجامی ئەدەن پێویستە پـەیامێکی هاوبـەش بگەیـەنێت بـە جۆرێکی وا کـە ئاشکرا هەرچوار پێویستییەکەی تاك و دەزگا تێر بکات. ئەگـەر بمانـەوێت پـەیامێکی وا دابڕێژین کە بۆ هەمو دەزگایەك دەست بدات پێویستە بنوسین:

(پەیامەکەمان بریتییە لە: چاککردنی تەندروستی ئابوری و چاککردنی ژیانی هەمو خەڵکە پەیوەندیدارەکە).

پەیامی خێزان و تـیم و بـەش و دەزگاکەی تـۆش نـەك هـەر پێویستە ئـەم پەیامـە جیهانییە بگرێتە خۆ بەڵکو پێویستە ئەو ڕێگە بێ هاوتایەش بەرجەستە بکات کـە تـۆ پەیامەکەی پێ جێبەجێ دەکەیت – واتە پێویستە توانا و بارودۆخەکە دەنگی تایبـەتی تۆ بەرجەستە بکات.

## ئەگەر قازانج نەبێت پەیامیش نابێت

من ساڵانێکی زۆر تەنیا لەژێر کاریگەری چەمکەکانی ئامانج و پەیامدا بوم بـەڵام پاش ئـەوەی کـە کۆمپانیاکەم دامەزرانـد گەیشتمە ئـەو ڕاستییەی کـە دەڵێت: قازانج نـەبێت پـەیام نابێـت. بـە واتایـەکی دیکـە ئەگـەر پرۆژەکەت قازانجێکی بـەردەوامی بـۆ دابین نەکردبێت ئەوا لە کۆتاییدا توانای ئەوە لەدەست دەدەیت پەیامەکە بهێنیتە دی.

لە بەرامبـەر ئەمـەدا زۆربـەی خـاوەن کۆمپانیاکان جـەخت دەکەنـە سـەر قـازانج و بەدەستهێنانی سودی چاوەڕوانکراو بـە ڕادەیـەکی وا کـە ئـەو دیـد و مەبەستەیان لـەبیر دەچێت کە سەرەتا ئیلهامی دامەزراندنی کۆمپانیاکەیان پێ بەخشیوە. واتـە نـاتوانن بـە قوڵی تەماشای کارمەنـدەکان و خێزانـەکانیان و تەنانـەت تەماشـای ئـەو کۆمەڵگایـەش بکەن کە خزمەتیان دەکات. بیریان دەچێتەوە کە چەندە پشت بەستن بـە یـەکتر لەگـەڵ هەمو ئەوانەدا گرنگە کە سود لە کۆمپانیاکانی ئەمان وەردەگرن.

ئەوەیان بیردەخەنەوە کە خاوەنی پەیامێکن و پەیوەندییەکی خولقێنەریان بە خاوەن پشکەکان و هەموو ئەوانی دیکەشەوە هەیە. ئەو گێروگرفتانەی کە ئەم شێوازەی دوایی دروستیان دەکات منی لە بەشێکی زۆری کارە پیشەییەکەم دابڕی لەگەڵ دەزگاکاندا لە ماوەی ٤٠ ساڵی رابردوودا. پەیڕەوکردنی ئەم شێوازە بە ڕێگەی (پەیام/ بێ قازانج) یاخود (قازانج/ بێ پەیام) (بڕوانە شێوەی ١١-٤) ئەنجام گەلێکی زۆر خراپییان لێ دەکەوێتەوە. تەمەنی هیچکام لەم شێوازانە درێژ نابێت، بەتایبەت لە ئابوریبە جیهانییەکەی ئەمڕۆدا. چارەسەرەکەش ئەوەیە هەردوو شێوازەکە پێکەوە پەیڕەو بکەین، کلیلەکە هاوسەنگییە.




شێوەی ١١ — ٤

## جێبەجێکردنی نەخشە ستراتیجیەکە

بێگومان نەخشە ستراتیجییەکە لەگەڵ کڕیاردا دەست پێدەکات. لەراستیدا دەزگاکان تەنیا دوو رۆڵیان تێدایە،

رۆڵی کڕیارەکان و رۆڵی هەناردەکاران. چ لەناو دەزگاو چ لە دەرەوەی دەزگاشدا مرۆڤ لەرێی ئەم دوو رۆڵەوە کار لەگەڵ خەڵکیدا دەکات. مەبەستمان ئەو مرۆڤەیە کە لە

زنجیرەی هەناردە کردن و دەرهێنانی بەرهەمەکە و سپۆنسەرکاران و هەروەها ئەوانەشە کە پرۆژە و کاری جیاجیا پێشکەشی دەزگاکە دەکەن، هەروەها ئەوانەش کە کەرەسەی پێدەبەخشن. هەروەها خێزانی کارمەندەکانیش. هەروەها ئەو کۆمەڵگا و ژینگەیەش کە چاودێری کاری هەناردەکردن دەکەن و هاوکاری دەکەن. کرۆکی کاری باش ئەوەیە پەیوەندی نێوان کڕیار و هەناردەکار پەیوەندییەکی باش بێت. تۆ کاتێک کە کەرەسەیەك یاخود خزمەتگوزارییەك بە کەسێك دەفرۆشیت، تەنیا ئەوەی پێ نافرۆشیت بەڵکو چارەسەری کێشە و گیروگرفتەکانیشی پێ دەفرۆشیت (ئەو کارانەی کە ئەوت لێ دەکات بە شێوەی کەرەسە و خزمەتگوزاری بۆی دابین بکەیت). چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانە بە شێوەیەکی کاریگەر وا پێویست دەکات تۆ زۆر بە باشی لە پێویستییە جۆرەکانی هەمو خەڵکە پەیوەندیدارەکە تێبگەیت و تەنیا هەر کارێکی روکەش و ناڕێکگەرانە نەبێت. ئەمەش باجی خۆی هەیە. تێگەیشتن لەو مەسەلانەی کە بەلای کەسێکەوە پڕ بایەختریت مەسەلەیە، هەنگاوێکی گرنگە بەرەو دارشتنی نەخشەیەکی ستراتیجی کە بەراستی واتای هەبێت. لە پرۆسەی پلاندانانەدا بەهاکان دەچنە ریزبەندییەکانی سەرەوە چونکە ئەو بەهایانەی کە پشتیان بە پرنسیپەکان بەستوە نەگۆڕن. کڕیارەکان دەگۆڕێن. لەبەر ئەوە پێویستە ستراتیجەکە لەگەڵ ئەم گۆڕانەدا بگونجێت، بەڵام ئەگەر بەهاکانت پەیوەست بون بە پریسنیپی نەگۆڕەوە ئەوا دەبێتە خاوەنی مێخێکی بەهێز و ناوەندیی وا کە لە ناوەڕاستی ئەو هەمو گۆڕانکارییە حەتمیانەدا خۆتی پێوە ببەستیتەوە. بۆ ئەوەی بزانین پەیامی دەزگا و نرخە ستراتیجییەکەی باشن یان نا، پێویستە تاقییان بکەینەوە بۆ ئەوەی بزانین ئەو پەیام و نەخشە ستراتیجە چەند دەتوانن وەڵامی هەر تاکێکی ناو دەزگاکە بدەنەوە. بە چی؟ بەوەی ئایا ئەو تاکانە چۆن بەشداری دەکەن لە بەدیهێنانی نەخشە ستراتیجییەکەدا بە جۆرێك کە بگونجێت لەگەڵ ئەو بەهایانەی کە دەزگاکە بەڕێوە دەبەن. ئەگەر فیبلەمان بۆ رونکردنەوە بە نمونە بهێنینەوە ئەوا دەڵێین هەمو کەس دەزانێت باکور لەکوێیە و دەزانێت رۆڵی خۆیشی چییە لە جوڵاندنی دەزگاکەدا بە ئاراستە باشەکە.

کاتێك کە هەموان بە قوڵی بەشداری دەکەن لە پەیامی نەخشە ستراتیجییەکەی دەزگاکەدا، ئەوا نیوەی شەڕەکە دەبەنەوە، چونکە پرۆسەی داهێنانی فکری و رۆحی و سۆزداری لەو کاتەدا بەدی هاتووە. تەنیا داهێنانە ماددییەکە دەمێنێتەوە کە دەکەوێتە

دواییەوە. بەشداریکردنەکەش یان لەڕێی پشتگیریکردنی پەیامی نەخشەکەدا دەبێت یاخود لە هاوبەشی کردندا دەبێت لە دارشتنیاندا. مەسەلەکە هەموی بریتییە لە جێبەجێکردنی ستراتیجەکە، واتە بەدیهێنانی لەڕێی کارو بەرهەمهێنان و تواناسازی و رازیکردنی لایەنەکان. ئەمە مانای وایە کە تۆ پێویستت بە دروستکردنی پێکهاتەیەکەو دەبێت کەسی شیاو لە شوێنی شیاو دابنێیت و هەمو کەرەسە و پشتگیریەکی گونجاوی بۆ مەیسەر بکەیت و ئیتر وازی لێ بهێنیت و نەبیتە کۆسپ و تەگەرە بۆی. هەر کاتێکیش پێویستی کرد یارمەتیی بدەیت.

پرۆسەی داهێنان لە هەمو کۆمەڵە و دەزگا و بەش و پرۆژە و تیم و گروپێکدا دووجار روودەدات. جارێکیان لەسەر ئاستی ئەقڵ و ئینجا پاش ئەوە لەسەر ئاستە مادییەکە. یەکەمجار نەخشەکە، ئینجا بیناسازی. نوسینەوەی نۆتە مۆسیقیەکە ئینجا ژەنینی. هەمو شتێك دووجار دەخولقێنرێت.

دیاریکردنی رێبازەکە خولقاندنی یەکەمە. هەر لەسەر بناغەی ئەمیش نەخشە ستراتیجییەکە وێنەی دەکێشرێت و مەسەلەکان لە واقیعدا بەرجەستە دەکرێن. ئەگەر ئەم پرۆسەیە بە شێوەیەکی باش بەرێوە بچێت و پەیوەندیەکی سۆزداری بەهێز بێتە ئاراوە لە ئەنجامی پشتگیریکردن و بەشداریکردن لە دروستبونیدا، ئەوا دەتوانیت لە کاتی پێویستدا تا ئەندازەیەکی زۆر خەرجییەکان کەم بکەیتەوە. دەزگاکەش وەکو مرۆڤ وایە بۆی هەیە خۆی لە کاری هەنوکەیی وادا نغرۆ بکات کە هەرچەندە هەنوکەیین بەڵام گرنگ نین. خەسڵەتێکی گرنگی کەلتور ئەوەیە کە هەمیشە ئەو شتە بەرهەم دەهێنێت کە مانەوەی کەلتورەکە زامن دەکات، لەبەر ئەوە پێویستە بەردەوام ئامانجە گشتییەکە و بەهاکان و نەخشە ستراتیجیەکە بەکاربهێنیت و جەختیان بخەیتە سەرو لە روانگەی ئەوانەوە بریارەکانت دابرێژیت. ئەمە وریات دەکاتەوە و هانت دەدات لەکاتی کارکردندا لەو ئارەزوانەت دوربکەویتەوە کە هیچ گرنگییەکیان بۆ ئامانجە بنەرەتییەکە نیە.

یەکێك لە کێشە هەرە مەزنەکانی کە لە بواری کاردا روبەروی سەرکردەکان دەبنەوە ئەوەیە چۆن ئەو تێروانینە رەقوتەقە بکەن بە رەفتارێکی کردەنی پەیوەست بەو تێروانینەوە، بە شێوەیەك کە کرێکارانی هێڵی پێشەوە پەیرەوی بکەن لە پێناوی بەدیهێنانی ئامانجگەلێکی گرنگدا. ئەرکەکە هەر لەوەدا کۆتایی نایەت کە خەڵکەکە

گەشە بدەن بە پەیام و نەخشە ستراتیجیەکەی دەزگاکە بەڵکو پێویستە کارێک بکەن لاستیکی تایەکە بە ئاسانی بکەوێتە سەرشەقەمەکە. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت. ئێمە بەرهەمەکەمان چەند زیاد دەبێت ئەگەر کەسی شیاومان وا لێ کرد لەکاتی گونجاودا کاری گونجاو ئەنجام بدات. واتە ئەگەر وامان لێ کرد ئەو پرۆژە و ئامانجە بچوکانە ئەنجام بدات کە بە رواڵەت بایەخیان کەمترە بەڵام لە کۆتاییدا دەردەکەوێت لە هەموان گرنگتر بون. بەڵام کێشەکە لێرەدایە کە زۆرجار نەخشەکانمان ئاڵۆز و پڕ باقو بریقن، سەرکردەکان شکست دەهێنن لەوەی ستراتیجەکە بکەن بە چەند ئامانجێکی گرنگ و کەم کە پێویستە لە ماوەیەکی نزیکدا ئەنجام بدرێن، یاخود (ئەمەش دیسان کێشەیەکە) ستراتیجەکە دەکرێتە ئامانجگەلێکی تازەی گرنگ کە بە ژمارە زۆرن و فۆکەس کردنە سەریان کارێکی ئاسان نییە. هەرکەسێك کە زۆر مەسەلەی گرنگی لەبەردەستدا بوو مانای وایە هیچ مەسەلەیەکی گرنگی لەبەردەستدا نییە. ئامانجە ستراتیجییەکان بە ژمارەیەکی کەم بن و بەپێی گرنگی ریزبەندی کراین و قابیلی بەراوردکاری بن و خرابنە سەر تابلۆی ئەرکەکان بۆ ئەوەی لای هەموان ئاشکرا بێت کە ئامانجەکان بە دیاریکراوی کامانەن و چۆن دەتوانرێت بەدیهێنرێن. ئێمە لە بەشەکانی داهاتوی ئەم کتێبەدا تیشکی زیاتر دەخەینە سەر چۆنێتی فۆکەس کردنە سەر ئامانجی کەم و هەرە گرنگ. دابینکردنی ژینگەیەکی وا کە هەمو خەڵکەکە لە لوتکەی هەرەمەکەوە هەتاکو بنکەکەی چالاك و بەدیققەت بن، پێویستی بەوەیە هەمو کارمەندەکان بزانن بابەتە هەرە گرنگەکان چین و پابەندبن پێیانەوەو چوارچێوەی بۆ دابنێن. هەروەها پێویستیشە بایی ئەوەندە دیسپلینیان تێدابێت کە لە نەخشەکە لانەدەن و متمانە بە یەکتری هەبێت و کاریگەرانە هاوکاری یەکتری بکەن. بە داخەوە زۆربەی کارمەندەکان نازانن چۆن سەرمایەگوزاری بکەن لە وزەو کاتی خۆیاندا. ئەمەش یان لەبەر ئەوەیە ئامانجی دەزگاکە بە ئاشکرا دیاری نەکراوە، یاخود پێیان رانەگەیەنراوە یاخود ئامانجەکان بەراورد ناکرێن بە ئەنجامی شتی دیکە. ئەو کارمەندەی کە هەست بکات لێپرسراو نییە لە ستراتیجەکە و یاخود ستراتیجەکەی بەدڵ نەبێت یاخود ریزبەندی بابەتە گرنگەکانی لەلا نەبێت یاخود ئەو پەیوەندییە نەبینێت لەنێوان کارەکەی ئەم و تێڕوانینی دەزگاکەدا ئەوا ناتوانێت ئەو تێڕوانینە جێبەجێ بکات. لە ئەنجامیشدا ئاستی متمانەی لەناو تیمەکەدا دێتە خوارەوەو پێکهاتەو رێ‌وشوێنەکانی لەکار دەکەون

و گلەیی و بۆڵە بۆڵ و خەنجەر لێدان لە پشتەوە سەرهەڵدەدات. ئەو دەزگایانەی کە دەتوانن هەستکردنێکی هاوبەش بە پەیامەکە بخولقێنن بە جۆرێکی وا کە هەرکەسێک بزانێت چی دەکات و بۆچی دەیکات، و کێ چی دەکات؟ هەروەها ئەو دەزگایانەی کە دەتوانن ستراتیجێک بخولقێنن بە تێڕوانینێکی روون و ئاشکراوە (چۆن ئیش دەکەن و لەکوێ دەیکەن). بە جۆرێک کە بەشەکان و تیمەکان و تاکەکان بەردەوام دڵیان لای ئامانجەکانیان بێت و هەمو کارمەندەکان هەست بە لێپرسراوێتی بکەن، ئەوا ئەو دەزگایانە دەنگی خۆیان دەدۆزنەوەو کەلتورێکی بە هێزی وا لە خۆدەگرن کە سەنتەرەکەی پێک هاتبێت لە پرنسیپەکان (تەماشای شێوەی ١١-٥ بکە) ئەمەش سەرچاوە سەرەکییەکەی رۆڵی دیاریکردنی رێبازە. (رێ دەرکردنە).




شێوەی ١١—٥

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: ئەگەر خاوەنی کارێک چوار نەوە کرێکاری لەلا بێ کە هەریەکەیان سەر بە تەمەنێک بن، ئایا دەکرێت تێڕوانینێکی هاوبەش لەنێوانیاندا دروست بکرێت؟

وەڵام: باشترین چارەسەر بۆ ئەو حاڵەتەی کە تۆ باسی دەکەیت پەیڕەوکردنی نمونەیەکە کە پشت بە پرنسیپەکان دەبەستێت. ئەقڵیەتی جیاوازی خەڵکەکە نیشانەی ئەوەیە کە لە بەهای جیاجیاوە هاتون و لە هاوێنەی جیاجیاوە تەماشای ژیان دەکەن. تاقە شتێکیش کە یەکیان دەخات پرنسیپە هەمیشەییە جیهانییەکانن کە دەتوانین بەکاریان بهێنین وەك بناغەیەك بۆ دروستکردنی بڕەودان بە سستمێکی هاوبەشی خەون و بەهاکان.

من دەزانم مەسەلەکە بەو ئاسانییە نییە کە باسی دەکەم بەڵام دڵنیاشم لەوەی کە دەتوانیت بگەیتە ئەڵتەرناتیفی سێیەم، بە چی؟ بە ڕێزگرتنی هەمو ئەوەکان و بەشدارکردنیان لە پەیوەندییەکی هاوکارانەی خوڵقێنەردا. تکایە ئەم پرنسیپەت بیر نەچێت. با خەڵکەکە هاوبەشی بکەن لە کێشەکەدا و پێکەوە بەدوای چارەسەردا بگەڕێن. بەم جۆرە وایان لێ دێت پەیوەندیەکی سۆزداریان هەبێت بە چارەسەرەکەوە. تۆ ئەگەر بە قوڵی لە کێشەکە تێبگەیت و هەر لە هاوێنەی هاوتەمەنەکانی خۆتەوە تەماشات نەکرد، ئەوا دەبیتە بەشێك لە سیستمە ڕەوشتییە کۆمەڵایەتییەکە.

پرسیار: تۆ هەمیشە پرنسیپ لە بەهاکان جیادەکەیتەوە، بەڵام من پێم وایە یەك شتن، وایە؟

وەڵام: هۆکاری ئەم جۆرە بۆچوونە ئەوەیە کە زۆربەی بەها پێشکەوتوەکان لە ڕاستیدا پرنسیپ و یاسای سروشتین. تۆ ئەگەر ژمارەیەکی گونجاوی خەڵك بەشدار بکەیت لە کارێکدا و کەش‌وهەوایەکی پڕ متمانەیان بۆ دەستەبەر ببێت و بە کراوەیی و سۆزی خوڵقێنەرەوە لەگەڵ یەکتریدا بێن و بچن، ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەو بەها هاوبەشانەی کە دروست دەبن، لە بنەڕەتدا بەهای پرنسیپەکانن. ئەنجامەکان هەر هەمان ئەنجام دەبن. ڕەنگە جیاوازی لە شێوەی دەربڕیندا هەبێت. مەسەلە کەلتورییەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە بەڵام بەپێی ئەو ئەزمونەی کە من هەمە و بێ گوێدانە جۆری دەزگاکە بۆم دەرکەوتوە کاتێك کە پێکهاتە و بەهاکان بەم شێوەیە بەرهەم دەهێنرێن، ئەوا بەشێوەیەکی بنەڕەتی مامەڵە دەکەن لەگەڵ چوار بەشەکەی سروشتدا: پێویستیەکانی ژیان، پێویستی خۆشەویستی، پێویستی فێربوون، پێویستی بەجێ هێشتنی شوێندەست. ئەمە بۆ مرۆڤیش و بۆ دەزگاش یەك شتە. لەبەر ئەوە

مەرج نییە بەهاکان پرنسیپەکانیش لە خۆیان بگرن چونکە تەنانەت تاوانکارەکانیش بەهای تایبەتی خۆیان هەیە.

پرسیار: ئایا بۆ نوسینی پەیامی دەزگاو دیاریکردنی نەخشە ستراتیجەکە پێویست بە وۆرکشۆپ و خولی ڕاهێنان دەکات؟

وەڵام: ئەمە پەیوەندی بە بارودۆخەکەوە هەیە. گشتاندنی وەرشەی کارکردن لە سەرتاسەری دەزگاکەدا کارێکی زۆر سەرکەوتو دەبێت ئەگەر مەبەستەکە بۆ زانینی بیرو بۆچونی هەمو کارمەندەکان بێت. بەڵام ئەگەر وەرشەکە ئەوەی لێ کەوتەوە کە پەیامێك لە سەرەوە بگەیەنێتە خوارەوە ئەوا هیچ سودێکی نابێت. گرنگ ئەوەیە پەیوەندیەکی سۆزداری هەبێت، ئەگینا ئەو پێوەرەی کە بەدەست دێت ناتوانێت پێکهاتە و سیستەم و کەلتور و ڕێوشوێنەکانی بگونجێنێت و قایلی بکات. هەر پەیامێك بە پەلەپروزێ دابڕێژرێت و بۆ خەڵکەکە ڕابگەیەنرێت، بە خێرایی بیردەچێتەوە. ڕێك لەو بەیاننامەیە دەچێت کە بۆ پەیوەندییە گشتییەکان بەکاردەهێنرێت. بیرت نەچێت کە پرۆسەی ئامادەکردنی پەیام و نەخشە ستراتیجەکەی دەزگا هیچی کەمتر نییە لە خودی نەخشەو پەیامەکە. دووپاتی دەکەمەوە کە ئەم کارە پێویستی بە تێکەڵەیەکە لە هاوبەشیکردن و پشتگیریکردن. ئەگەر تۆ متمانەت بە تێڕوانینی خەڵکەکە زۆرتر بێت لە متمانە بە تێڕوانینەکەی خۆت، ئەوا دەبیتە لایەنگری تێڕوانینەکەی ئەو. ئەم کارە پێویستی بە پەیوەندی و فیدباك و هاوبەشیکردن هەیە بۆ ئەوەی پەیوەندییەکی سۆزداریی دروست ببێت سەبارەت بە پەیام و ستراتیجی دەزگاکە. من زۆرجار بینیومە، بۆ بەرهەم هێنانی بەیاننامەیەك زیادەڕەوەی زۆر دەکرێت لە بەکارهێنانی تەکنەلۆجیادا.

لیژنەیەکی دووسێ کەسیش دەتوانێت هێڵە سەرەکیەکانی پەیامێکی سەرەتایی ئامادە بکات. دواتر وردە وردە و لە ڕێی فیدباك و هاوبەشی و گوێگرتنەوە پەیامەکە چاکتر و قوڵتر بیروبۆچونی کارمەندەکانی تیادا ڕەنگ دەداتەوە تا دەگاتە ئەوەی پەیوەندیەکی کەلتوری ڕاستەقینە دروست ببێت.

# بەشی دوازدەهەم

## دەنگ و یاساکانی جێبەجێکردن
## ڕێزکردنی ئامانج و سیستەمەکان لە پێناوی ئامانجەکاندا

"ئەسپ ئەگەر زینی نەکەیت ناگاتە هیچ شوێنێک، هیچ هەڵم و گازێک ناتوانن پاڵ بە هیچ شتێکەوە بنێن هەتا بە تەنگەبەرێکدا تێنەپەڕێنرێن، تاڤگەکانی نیاگارا ئەگەر بە کەناڵێکا تێنەبەڕێنرێن نابن بە کارەبا، هیچ ژیانێکیش نابێتە ژیانێکی مەزن ئەگەر دیسپلینی بۆ دانەنرێت و فۆکەسی نەخرێتە سەر و تەرخان نەکرێت".

- هێنری ئیمرسۆن فۆسدیک




شێوەی ١٢-١

| | |
|---|---|
| ئەفسانە | ئەفسانە (پارادایمی کۆن): بە راهێنانی خەڵکەکە و پاداشت کردنیان لەسەر ئەوەی سەربەخۆن پێشبینی دەکرێت بە شێوەیەك رەفتار بکەن یارمەتی و هاوکاریکردنی تیادا بەرکەماڵ بێت. |
| واقیع | کاری لەو جۆرە وەك ئەوە وایە لە یاریگای گۆلفدا یاری تێنس بکەیت، یاخود لە دنیایەکی دیجیتاڵیدا خاوەنی مێشکێکی ئەنەلۆگ بێت. ئەم سیستەم و پێکهاتە دامەزراوەییانەی کە هانی سەربەخۆیی و کێبڕکێ و سیستەمەکانیان دەدەن و خەڵاتیان دەکەن کەلتورێك بەرهەم دەهێنێت پشت بەستوو بە سەربەخۆیی.<br>ئەگەر بتەوێت رووەکێك بڕوێنیت ئاوی بدە.<br>ئەگەر هانی هاوکاریکردن و یەکترتەواوکردن بدەیت و خەڵکەکەی لەسەر رابهێنیت ئەوا رەفتاری یەکتر تەواوکردن دەستەبەر دەکەیت (پارادایمی نوێ) |

شێوەی ١٢ — ٢

ئەڵتەرناتیڤی یەکەم: بۆ رۆڵی سەرکردایەتی لە گونجاندندا ئەوەیە کە باوەڕت وابێت پێشەنگی باش بەسە بۆ ئەوەی دەزگاکە لەسەر رێگایەکی باش بمێنێتەوە و گەشەیەکی تەندروست بکات.

ئەڵتەرناتیڤی دووەم ئەوەیە کە باوەڕ بکەیت گەیاندنی دید و ستراتیجەکە بە شێوەیەکی چاك و بەردەوام زامنی دەستەبەرکردنی ئامانجی دەزگاکە دەبن. پێکهاتە و سیستەمەکانیش رۆڵی لاوەکییان هەیە.

ئەڵتەرناتیڤی سێهەم بریتی دەبێت لە:

١. هەمو دەسەڵاتە رەوشتییە تایبەتەکەی خۆت و هەمو دەسەڵاتە رەسمییەکەت بۆ دامەزراندنی کۆمەڵە شتێك بەکاربهێنیت کە خەسڵەتێکی رەسمی و دەزگایی ببەخشێت بەو ستراتیج و پرنسیپانەی کە لەناو تێڕوانینەکانی تۆدان و خەڵکەکەش بەشدارن لەگەڵتدا.
٢. لە سەرانسەری دەزگاکەدا زنجیرە ئامانجێك دابمەزرێنیت کۆك بن لەگەڵ تێڕوانینە هاوبەشەکە و بەهاکان و مەسەلە ستراتیجییە هەرە گرنگەکاندا.
٣. چاکسازی و راستکردنەوە و خۆگونجاندنی سەرلەنوێ. بەپێی ئەو فیدباکەی کە

بە شێوەیەکی رێکوپێک لە بازاڕ و دەزگاکەوە پێت دەگات و ئاستی سەرکەوتنی خۆتت نیشان دەدەن لە دەستەبەرکردنی پێویستیەکان و توانای گەیاندنی بەهاکاندا.

بۆ نمونە ئەگەر وتت من هاوکارییم بەلاوە گرنگە، پێویستە خەڵکەکە لەسەر هاوکاریی خەڵات بکەیت نەك لەسەر کێبڕکێ. ئەگەر وتیشت هەمو خەڵکە پەیوەندیدارەکەت بەلاوە گرنگن، پێویستە بەردەوام زانیاری لەسەر هەمویان کۆبکەیتەوە و لە پرۆسەی گونجاندنی سەرلەنوێدا بەکاری بهێنیت. پێویستە ئەو رووەکە ئاو بدەیت کە دەتەوێت بیروێنیت.

ئەگەر تۆ پێشەنگێکی باش بیت لە ژیانی تایبەتی خۆت و شێوازی سەرکردایەتیکردنندا بە ئاسانی دەتوانیت متمانە لە دەزگاکەتدا دروست بکەیت. دیاریکردنی رێبازەکە تێڕوانینی هاوبەش و سیستم دروست دەکات بۆ ئەوەی داوا لە کەس بکەیت.

ئێستا پرسیارە گرنگەکە ئەوەیە کە بۆ ئەوەی پێویست بکات سەرکردە فەرمییەکان هەمیشە ئامادەبن چۆن دەتوانین بەردەوام هەمو ستراتیج و بەهاکان جێبەجێ بکەن بە مەبەستی ئەوەی هەر تاکێکی ناو دەزگاکە لە ئاڕاستە گونجاوەکەدا بمێنێتەوە؟ وەڵامەکە ریزکردنە، داڕشتنی سیستم و پێکهاتەی وایە کە بەها بنەڕەتییەکان و مەسەلە گرنگەکانی ستراتیجی دەزگاکە بەرجەستە بکەن کە لە کاتی پرۆسەی دیاریکردنی ئاراستە و جێبەجێکردنی سیستم و پێکهاتەکاندا هەڵمانبژاردون. بیر لەو رێوشوێن و سیستم و پێکهاتانە بکەرەوە کە حاڵی حازر لە دەزگاکەدا هەن.

ئایا ئەمانە یارمەتیدەرن بۆ جێبەجێکردنی مەسەلە هەرە گرنگەکان یاخود کێشە و تەگەرە بۆ خەڵکەکە دروست دەکەن؟ ئایا ئەمانە لەگەڵ ئەو بەهایانەدا گونجاون کە دەزگاکە گرتونێتی‌یە خۆی؟

ئەرکی سەرکردایەتی بریتییە لە لابردنی کۆسپ و تەگەرەکان، نەك دانانیان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرۆسەی ریزکردن پێویستی بەوە هەیە زۆر قوڵ و لێبڕاوانە لە خۆمان و لە بەشێکی زۆری سیستم و پێکهاتەکانی دەزگاکە ورد ببینەوە (کە وەکو شتێکی پیرۆز تەماشا دەکرێن).

## متمانە پێکراویی دەزگایی

وەك پێشتر باسم کرد دەزگا دووەمین سەرچاوەی سەرەکی متمانەیە. کاتێك کە خەڵکی شایستەی متمانە لە چوارچێوەی سیستم و پێکهاتەگەلێکدا نیش دەکەن کە

نـاگونجێن لەگـەڵ بـەهاکانی دەزگاکـەدا ئـەوا دەزگاکـە دەکەوێتـە ژێـر کـۆنترۆڵی ئـەو سیستمانەوە کـە شایستـەی متمانـە نـین. بـە کورتییەکـەی هـیچ متمانەیـەک نامێنێت. نەریت و مەسەلە کەلتورییەکان کارێک دەکەن کـە ئـەو سیستـم و ڕێوشوێنانە ڕۆبچنە ناو ناخی دەزگاکەوە بە جۆرێکی وا کـە گـۆڕینی ئـەو ڕێوشـوێن و سیستمە لـە گـۆڕینی ڕەوشتی خەڵکەکە زەحمەتتر بێت.

زانیارییەکان دەربارەی زیرەکی جێبەجێکاریی ئەوە دەردەخەن کە دەزگاکان بەدەست نەبوونی متمانەوە دەناڵێنن. تەنیا لە ٤٨٪ ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کراوە دەڵێن بە شێوەیەکی گشتی دەزگاکانیان بەپێی بەهاکانی دەزگاکان دەڕۆن بەڕێوە.

بۆ نمونە زۆربەی زۆری دەزگاکان کاری بەکۆمەڵ و هاوکاریی بە مەسەلەیەکی گرنگ دەزانن، بەڵام کۆمەڵە سیستمێکی وا لە ناخیاندا هەیە کە هانی کێبڕکێی ناوخۆ دەدات.

زۆرجار من ئەو چیرۆکە بە نمونە دەهێنمەوە کە چۆن جارێکیان لەگەڵ کۆمپانیایەکدا کارم کرد هیچ گیانێکی یارمەتیدانی تیا نـەبو. بەڕێوەبـەری گشتیی جێبـەجێکاریی ئـەو کۆمپانیایـە نەیـدەزانی بۆچـی کارمەنـدەکانی یارمـەتی یـەکتری نـادەن. زۆر ئامۆژگـاری کردن و لەو بارەیەوە زۆر مەشق و ڕاهێنـانی پـێ کـردن و لـەڕووی دەروونییشـەوە ئامادەی دەکردن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی گیانی هاوکاریی بهێنێتە ئاراوە.

ئێمە کاتێک پێکەوە قسەمان دەکرد تەماشایەکی پشتـەوەی ئۆفیسی بەڕێوەبەرەکەم کـردو بـە ڕێکـەوت پەردەیـەکم بینـی کـە لادرابـو. لـە پشـتی پەردەکـەوە نمونەیـەکی گاڵتەجاڕیی پێشبڕکێی ئەسپ دانرابو. ئەسپەکان لەلای چەپەوە ریزکرابون و وێنەیەکی دەموچاوی هـەر بەڕێوەبـەرێك بەرامبـەر ئەسـپێك لـەو ئەسـپانە دانرابـوو، بـە دەسـتە ڕاستیشـدا ریکلامێـك هەڵواسـرابو تایبـەت بـە گەشـتکردن بـۆ (بێرمـۆدا Bermuda). وێنەی رۆمانسیی ژنو پیاوێك بو کە بەسەر کـەناری دەریایەکدا دەڕۆیشـتن و دەسـتیان خستبۆوە دەستی یەکترییەوە. تا لێرەدا دەتوانیت ببینیت تـا چ ئەندازەیـەك شتەکانی لەگەڵ یەکتریدا نایەنەوە. (خێراکە: با پێکەوە کاربکەین. با هاوکاری یـەکتری بکـەین. بـەو هاوکارییـەوە بەرهەمەکـەمان زیـاد دەکـات. باشـتر دەتـوانین کاربکـەین. بەختـەوەرتر

دەبن. زیاتر چێشژ لە کارەکە وەردەگرن). ئینجا پاش ئەوە پەردەکە لادەبە (کێ لە ئێوە خەڵاتی ئەو گەشتەی بێرمۆدا دەباتەوە؟)

جارێکی دیکە پرسیاری لێ کردمەوە: (بۆچی کارمەندەکان یارمەتی یەکتری نادەن؟)

ئامۆژگارییەکە چەند کاریگەریش بێت ناگاتە ئاستی سیستمەکە. تۆ هەموو رۆژێکیش ئامۆژگاری خەڵکەکە بکەیت بۆ یارمەتیدانی یەکتری بەڵام ئەگەر سستمەکەت هانی پێشبڕکێی تاکە کەسی بدات، ئەوا نابێت چاوەڕوانی گیانی هاوکاریکردن بیت. لەو دەزگایەدا. یەکێك لە قسە گرنگەکانی (ئیدواردز دیمینگ Edwards Deming) ئەوەیە کە دەڵێت: ٩٠٪ گیروگرفتی دەزگاکان هۆکارەکەی ناتەواوی سیستەمەکەیە. گیروگرفتەکان دەرئەنجامی سیستم و پێکهاتەکانن. ئەگەر وابزانین خەتای خەڵك و هۆی تایبەتە، بە هەڵەدا چوین. بە هەرحاڵ لە لێکدانەوەی کۆتاییدا مادام خەڵکەکە بەرنامەکانیان داڕشتووەو سیستەمەکانیش بریتین لە بەرنامەکان کەواتە خەڵکەکە بەرپرسیاری ئەو سیستمانەن.

سیستم و پێکهاتەکان کۆمەڵە شتێکی بێ رۆحن، تەنیا هەر پرۆگرامن و هیچ ئازادییەکیان نییە. لەبەر ئەوەیە کە سەرکردایەتی بەدەست مرۆڤەوەیە. مرۆڤ سیستەمەکانیش دادەڕێژێت و ئەوەی دەزگاش دەستی دەکەوێت ئەنجامی سیستەمەکەیە.

زۆربەی خەڵکە دڵسۆزەکە هێندە لێهاتوو نین کە سیستمی دامودەزگایی دروست بکەن. بە پێچەوانەشەوە هەندێك لەو خەڵکە لێهاتووە کە دەتوانن سیستمی باش دابڕێژن درۆزن و ریاکارن. بەدیهێنانی متمانە لە دەزگادا پێویستی بە هەردوو مەسەلەکە هەیە، پێویستی بە سەر راستی هەیە و بە لێهاتوییش. دەتوانین بە شێوەیەکی دیکە گوزارشت لە مەسەلەکە بکەین و بڵێین گونجاندن بریتییە لە شایستەی متمانەبون لەسەر ئاستی دەزگاکە. واتە ئەوەی کە لەسەر ئاستی دەزگاکە پێی دەوترێت گونجاندن. ئەمەش مانای وایە ئەو پرنسیپانەی کە بەردی بناغەی سیستمی بەها تایبەتەکانن لە هەمان کاتیشدا بەردی بناغەی پێکهاتەی سیستم و رێوشوێنەکانن. پێویستە بزانین کە گۆڕانی ژینگەو خەڵکەکە و بارودۆخەکانی بازاڕ نابنە مایەی گۆڕینی پرەنسیپەکان.

ئەم خاڵە زۆر بە جوانی لە زمانی ئەندازەدا گوزارشتی لێ کراوە: ئەرکەکە شێوەکە دیاری دەکات. بە واتایەکی دیکە پێکهاتەی هەموو شتێك بەپێی ئامانجەکەیەتی. دیاریکردنی رێبازەکەش گونجاندن بەدوای خۆیدا رادەکێشێت. دیسپلین لەسەر ئاستی تاکەکان و دەزگاکانە. لەسەر ئاستی دەزگا دیسپلین پێی دەوترێت گونجاندن چونکە تۆ

پێکهاتــە و سیستــم و ڕێوشــوێن و کەلتورەکــە بــە جــۆرێکی وا دەگونجێنێــت و ڕێکی دەخەیت کە بنەمایەی بەدیهێنانی تێڕوانینەکەت.

| |
|---|
| زۆر هەڵەیە مرۆڤ بە دەستەجەمعی (کۆمەڵ)بگاتە بڕیار<br>بەڵام بە تەنیا خۆی لەسەرەوە جێبەجێی بکات |

ئەگەر بەهاکانت بە یـەك چاو تەماشای دورمـەوداو کورت مـەودای کـرد پێویستە سیستمی زانیارییەکانیشت بە یەك چاو بایەخ بە دورمەودا و کورت مەودا بدات.

ئەگـەر بـەهاکانت هاوکـاری و یەکترتـەواوکردنیان خستـە پـێش مەسـەلەکانی دیکـەوە، پێویسـتە سیسـتمی خەڵاتکردنەکەشـت خـەڵاتی هاوکـاریی خوڵقێنـەر و یەکترتـەواوکردن بکات. ئەمە مانای وا نـیـیە کە هـەوڵی تاکە کـەس و جـۆری کـارکردن پێویستە ڕێزیـان لێ نەگیرێت و خەڵات نەکرێن. بۆ نمونە قـەبارەی کێکی پاداشـتەکە پەیوەنـدی بـە هاوکـاری و یەکترتەواوکردنەوە هەیە، بەڵام بەشی کەسێکی دیـاریکراو لـەو کێکـە دەتوانێت پەیوەنـدی بە هەوڵ و تەقەلای ئەو کەسەوە هەبێت لەناو تیمە کامڵەکەدا. بەم شێوەیە هـەم دەتوانین پارمـەتیـدانی یەکـدی هـان بـدەین و هـەم سـەربەخۆیی تاکـەکانیش. زۆر دەزگـا کەوتونەتە هەڵـەی ئـەوەوە کـە تـەنیا لەسـەر حسابی هـەوڵی هاوکاریکارانـەی دەسـتەجەمعی، هەوڵە تاکەکەسییەکان خەڵات دەکەن. بۆ ئەوەی قسەکەم هیچ ڕیاکارییەکی تێـدا نـەبێت پێویستە بڵێم کە هاوکاریکردن بە سیستمی خەڵات و ڕێزلێنان دروست نابێت. مرۆڤ چونکە هەمیشە بەپێی ئەجیندا تایبەتەکانی خۆی کار دەکات لەبەر ئەوە هەمیشە ئـەو سیستمی هاندانـەی پێ خۆشە کە هەوڵە تاکە کەسییەکان خـەڵات دەکات، سیستـمی ئـاوا کـاری سـەرکەوتوی بەکۆمەڵی لێ بەرهەم نایـەت، تەنانـەت ئەگـەر حزمـەتکردنی بڕیارەکە بـە باشـترین شێوە پێویستی بە کاری دەستەجەمعی هەبێت، ئەمەش نـەك لەبـەر ئـەوەی خەڵکەکە حەز بە هاوکاری و یارمەتی ناکەن. بەڵکو لەبەر ئەوەی سیستمەکە هەوڵی تاکەکەسی و پێشبڕکێی ناوخۆ هان دەدات. بیرت نـەچێت هەمیشە سیستم لە نیازپاکی و ئامۆژگاری دەباتەوە.

## ئایا هەمو ئەو خەڵکەت بۆ ئەوە دانەمەزراندووە کە براوەبن؟

جارێکیـان مـن ڕێکـەوتی سیسـتمێکی نـەگونجاوم کـرد، ئەوکاتـە مـن لـە کۆنگرەی ساڵانەیاندا قسـەم بـۆ گروپێـك دەکـرد هەشتسـەد کارمەنـدی لـەخۆگرتبو. بـەپێی ئەو

سیستمەیان، تەنیا ٣٠ کەس لە کۆی هەشتسەد کارمەند پاداشتیان وەرگرت. سی کەس لە هەشتسەد کەس! رووم کردە سەرۆکەکە و لێم پرسی: ئایا تۆ هەمو ئەم خەڵکەت بۆ ئەوە نە دامەزراندووە براوەو سەرکەوتو بن؟

- با

+ هیچ دۆڕاوێکت دامەزراندووە؟

- نەخێر

+ بەڵام ئەمشەو حەوتسەد و حەفتا دۆڕاوت هەیە

- چی بکەم خۆیان لە پێشبڕکێکەدا دۆڕان

+ دەزانیت بۆچی دۆڕانیان؟

- بۆچی؟

+ چونکە تۆ بە شێوازی براوە – دۆڕاو بیردەکەیتەوە.

- ئەی ڕێگەی دیکە هەیە؟

+ بەڵێ. وایان لێ بکە هەمویان براوە بن. ئەسڵەن تۆ بۆچی بیر لە کێبڕکێ دەکەیتەوە لەناو کارمەندەکانتدا؟ ئەم کێبڕکێیەی بازاڕ بەس نییە؟

- ژیان وایە چی بکەم؟

+ ئاووا؟ ئەی کەواتە تۆ و هاوسەرەکەت کامتان براوەن.

- هەندێك جار من و هەندێك جاریش ئەو

پێم وت: ئایا دەتەوێت ئەم نمونەیە پێشکەش منالەکانت بکەیت بۆ ئایندەیان؟

وتی: ئەی چی بکەم، سیستمی خەڵاتکردن هەروایە. خەڵاتکردن واز لێ بهێنم؟

پێم وت: بەڵێن بە خۆت بدە کە لەگەڵ هەرکەس و گروپێکدا ئیشت کرد بیر لە سودگەیاندن بکەرەوە بە هەموان. بیر لە بەرژەوەندی هەموان بکەرەوە، بە جۆرێکی وا کە لە بەدەستهێنانی ئامانجەکەدا هەمویان قازانج بکەن.

ساڵێك دوای ئەوە جارێکی دیکە بانگهێشت کرامەوە بۆ هەمان دەزگا بەڵام پاش ئەوەی بواری دیاریکردنی ڕێباز و گونجاندن کاری زۆریان تێدا کرا.

کێبڕکێی ساڵانە ئەمجارە هەزار کەس بەشداریی تێدا کردبو. ئایا دەزانیت لەو هەزار کەسە چەند کەسیان بردیانەوە، هەشتسەد کەس. تەنیا دووسەدکەس نەیانبردەوە کە خۆیان وا بڕیاریان دابو. ئەوە بڕیاری خۆیان بو کە نەیبەنەوە. کەواتە شتەکە قابیلی

بەراوردکردن نییە. ئایا ئەو هەشتسەد کەسە چیان بەدەست هێناوە؟ هەریەکەیان بەقەدەر هەر یەکێك لەو سێ کەسە ئەنجامی باشی بەدەست هێناوە کە ساڵی رابردوو خەڵاتەکانیان بردەوە. کەواتە کلتورەکە بە تەواوی گۆڕاوە. بیرۆکەکە لە بەرچاوتەنگییەوە بۆتە کەلتوری بەرچاوتێری. ئێستا هەشتسەد کەس دەبینێت لە شوێنی سێ کەسی ساڵی رابردودا بۆچی؟ رێگەم بدەن وەڵامی ئەم پرسیارە بە نمونەی چیرۆکی گەشتەکەی (بێرمۆدا) بدەمەوە. کە پێشتر باسم کرد. لەجیاتی ئەوەی هەرکەسە لە دڵی خۆیدا بپرسێت بڵێت: ئاخۆ کاممان گەشتەکە بباتەوەو بچێتە بێرمۆدا، ئێستا دەپرسێت: حەزدەکەم خۆت و هاوسەرەکەت بچنە بێرمۆدا. پێم خۆشە هەمومان پێکەوە بچین، من دەستی یارمەتیت بۆ درێژدەکەم. ئینجا بزانە بیرکردنەوەی ئاوا چ شۆڕشێك لە دەزگایەکدا دروست دەکات کە پشتی بە پێشبڕکێی ناوخۆ بەستبێت؟ لە هەردوو نمونەکەدا هیچکام لە سەرۆکی کۆمپانیاکان شایستەی متمانە نەبون، سەر ڕاست بون، بەڵام بەرچاوتێر نەبون. نە بیرکردنەوەیان و نە شارەزاییان هی ئەوە نەبو بتوانن سیستمی گونجاویش بدۆزنەوە بۆ خەڵاتکردن و هاندان. سیستمی زانیارییەکانیان کامڵ نەبون. مەسەلەکە رێك لەوە دەچێت لە زۆری کاپتنی فڕۆکەکەدا تەنیا یەك قیبلەنما کاربکات. ئەمە کارەساتە. جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە، ئەم دوو سەرۆك کۆمپانیایە کێشەیان لەگەڵ راستگۆیی و سەرڕاستیدا نەبو، کێشەکەیان نەشارەزایی بو. لەبەر ئەوە کەوتنە داوی سیستمێکەوە کە عەقڵییەتی بەرچاوتەنگی و کۆیلەبونی نەریتەکان و دوفاقیی حوکمیان دەکرد و تەنیا ئەوکاتە رزگاریان بو کە شارەزاییان پەیداکرد.

## گونجاندن پێویست بەوە دەکات هەمیشە وریابین

پرۆسەی گونجاندن هەرگیز ناوەستێت. پێویستی بە هەوڵ و چاکسازیی هەمیشەیی هەیە چونکە پرۆسەیەکە مامەڵە لەگەڵ زۆر هەقیقەتدا دەکات کە هەمیشە لە گۆڕاندان. پێویستە سیستم و پێکهاتە و رێوشوێنەکان نەرم بن بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ هەقیقەتە بگۆڕەکاندا بگونجێن. لەهەمان کاتیشدا پێویستە لەسەر بنەمای پرنسیپە نەگۆڕەکان بمێننەوە. بەم تێکەڵەیە لە نەگۆڕی و نەرمیدا دەتوانیت دەزگایەك بهێنیتە ئاراوە کە هەم سەقامگیر بێت و هەم زۆر بزێویش بێت.

پرنسیپ وەکو بیری قوڵ وایە. ئەم بیرە قوڵەی پرنسیپەکان هەم پێویستیی بیرە کورتەکان دابین دەکات و هەم هەمو رەگەکانی چاکی و تواناسازییش پاراو دەکات و بە کەمترین نرخیش بەرهەم زیاتر دەکات. بەردەوامی و خێرایی و زیادبونی قازانجیش مسۆگەر دەکات.

یەکێك لە رێگاکانی زیادکردنی توانای دەزگاکەت لە بەدیهێنانی گۆڕانکاریی بەردەوام و پێویست لە پرۆسەی گونجاندندا ئەوەیە کە بە شێوەیەکی جددی شوێن پێی ئەو خەڵکە سەرکەوتوانە هەڵبگریت کە ئەرکێك بەجێ دەهێنن لە شێوەی ئەرکەکەی تۆدا چ لەناو هەمان دەزگاکەی تۆدا و چ لە پیشە و پیشەسازییەکانی سەرتاسەری جیهاندا. ئەمە وا لە کارمەندەکان دەکات کە لەجیاتی تەماشاکردنی رابردوو یاخود نوقڵانە لێدان بۆ حەزو ئارەزووەکان، هەوڵی پێشبڕکێکردن بدەن لەسەر ئاستی جیهانی. تەماشای ئەو دەزگایانە بکە کە باشترین بەرهەم پێشکەش دەکەن. بەردەوام سەرنجیان لێ بدەو لێیانەوە فێر ببە.

بە لۆجیك و تێبینیکردن و هەروەها لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زۆردا بۆمان روون بۆتەوە کە سەرکەوتنی دەزگاکان دەرئەنجامی خەسڵەتی تایبەت و رەفتاری تاك لایەنەنانەی سەرکردە فەرمییەکان نییە. سەرکەوتنی دەزگا دەرەنجامی خەسڵەتە گشتییەکانی هەمو دەزگاکەیە پێکەوە. سەرکەوتن لێرەدا پەیوەندی بە کەسێکی دیاریکراوەوە نییە، بەڵکو پەیوەستە بە سیستەم و کەلتورەکانەوە. (ئێمە لە بەشی تواناسازیدا زیاتر و قوڵتر باسی کەلتور دەکەین). نمونەیەکی ئاشکرای ئەو کۆمپانیانەی کە لە چاخی پیشەسازییەوە گواستویانەتەوە بۆ چاخی کرێکارانی زانیاری لە زۆربەی بەشەکانیاندا، جێنەراڵ ئەلکتریکە. جاك وێڵش و دکتۆر نۆئێل تایچی کە دوو بەڕێوەبەری فێرکردنی کارگێڕی کۆمپانیای ناوبراو بون هەمیشە جەختیان لەوە کردۆتەوە کە پێشخستنی ئاستی سەرکردەکان بکەنە بەشێکی دانەبڕاوی خەسڵەتە گشتییەکانی کۆمپانیای جێنەراڵ ئەلکتریك و ئەو مەشق و راهێنانەی کە بۆ سەرکردەکانی دابین دەکات:

تێڕوانینی (وێڵش) کە لەوسەردەمەدا تێڕوانینێکی هێندە ناسراو نەبو بریتی بو لەوەی کە سەرکردایەتیکردن نابێت تەنیا لە بەڕێوەبەری جێبەجێکاردا قەتیس بکرێت

بەڵکو پێویستە بکرێتە سیستمێکی دامەزراوەیی فراوان لە سەرتاسەری کۆمپانیاکەدا. ئابورییەکەی سەردەمی جیهانگیری ئەو مانایە دەبەخشێت کە دنیای بزنس گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەو دنیایە جاران نەگۆڕ بو، ڕۆڵی تاکە کەس و ڕێوشوێنە دیاریکراوەکان تیایدا کاریگەربون، بەڵام لەسەردەمی جیهانگیریدا گۆڕانی وا بنەڕەتییان بەسەردا دێت کە پێویست بکات لە لوتکەو بنکەی هەرەمەکەدا سەرکردەی نەرمو لێوەشاوەو زیرەك پێشبخرێن. ئەمەش پێویستی بە داهێنان و فێرکردنی پیاوان و ژنانی دەزگاکە هەیە، نەك تەنیا لەسەر چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ گۆڕاندا بەڵکو لەسەر چۆنێتی دروستکردنیشی.

## گۆڕینی دەسەڵاتی ڕەوشتی بۆ سیستمێکی دامەزراوەیی

ئەو دەزگا و ڕێکخراوانەی کە پرنسیپەکان تیایاندا ناوەند بن و پرۆسەی ڕیزکردن پەیڕەو دەکەن، هەمیشە دەسەڵاتە ڕەوشتیەکە دەکەنە سیستمێکی دامەزراوەیی.

گۆڕینی دەسەڵاتە ڕەوشتییەکە بۆ سیستمێکی دامەزراوەیی، واتە بەرخورداربونی دەزگاکە لە توانای بەردەوامبوون بۆ بەرهەمهێنانی ئەو پەیوەندییە گشتییانەی کە جێی متمانەی هەمو لایەنە پەیوەندیدارەکانەو بەردەوامیش دەتوانێت جەخت بکاتە سەر تواناو خێرایی و نەرمونیانی لەگەڵ بازاڕدا. ڕەنگە هەندێك کەس ناوبەناو مەسەلەکە بشێوێنن بەڵام دەزگاکە چارەسەریان دەکات و بەردەوام دەبێت لە کاری ئاسایی خۆی.

ئێمە ئەم دەسەڵاتە ڕەوشتییە کە بۆتە سیستمێکی دامەزراوەیی، لەو دەوڵەتانەدا بەدی دەکەین کە دەستورێکی نەگۆڕیان هەیە، چ نوسراو چ نەنوسراو. ڕەنگە سەرکردەکانی ئەو جۆرە وڵاتانە هەمیشە و بە بەردەوامی پابەندی دەستورەکە نەبن، بەڵام ئەو جۆرە وڵاتانە دەتوانن سود لە خاڵە بەهێزەکانی ئەو سەرکردانە وەربگرن و لەهەمان کاتیشدا بۆ ئەوەی خاڵە لاوازەکانیان گرنگییەکی ئەوتۆیان نەبێت، دەتوانن پشت بە ماباقییەکەی حکومەت ببەستن. دیارە ئەم مەسەلەیە نە بەسەر سیستەمە دیکتاتۆرییەکاندا جێبەجێ دەبێت نە بەسەر سیستەمە دیموکراسییە تازەو قرچۆکەکانیشدا کە هێشتا پڕن لە گەندەڵی و دیاردە دواکەوتووەکانی دیکە کە کەلتوری کۆمەڵگاکە بەرجەستەیان دەکات.

پێویستە ددان بەو راستییەدا بنێین کە سەرکردە دیکتاتۆرە گەندەڵەکان لەژێر کاریگەریی هێزی خۆپەرستیدا دەتوانن ماوەیەك زیان بە وڵاتەکە بگەیەنن، تەنانەت ئەگەر لە دامودەزگاکانیشدا دەسەڵاتە رەوشتییەکە ببێتە سیستمێکی دامەزراوەیی. بەڵام زۆری پێ ناچێت ئەو دەزگایانە چاك دەبنەوە. سەرچاوەی هێز هەمیشە لە سیستمەکەوەیە نەك لە کارمەندە هەڵبژێردراوەکان یاخود دامەزراوەکان. سیستم هەمیشە بەهێزترە لە خاڵە لاوازەکانی خەڵکە بەشدارەکە. لەبەر ئەوەیە کۆمپانیای (ماریۆت) کارمەندەکانی فێر دەکات کە ئەهریمەن لە وردەکارییەکاندا خۆی مت کردووە، بەڵام سەرکەوتن لەناو سیستمەکاندایە.

بەم دواییە سەردانی جی. دەبلیو. بیڵ ماریۆتم کرد کە سەرۆك و بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیای ماریۆتی جیهانییە، گەورەترین کۆمپانیای ئوتێل لە جیهاندا. لەراستیدا بیڵ و پێش ئەویش باوکی دەزگایەکیان دروست کرد کە جوانترین دەزگایە لە جیهاندا. هۆکاری سەرکەوتنەکەشیان لەوەدایە کە سیستمێکی پەیوەندیداریان دروست کردووە هەرکەسێك لەگەڵیاندا کاربکات بلیمەتییەکەی دەجوڵێت.

بیڵ پێی وتم: گەورەترین وانە کە بە درێژایی چەندین ساڵ فێری بوم ئەوەیە گوێ لە کارمەندەکانت بگریت.

بە ئەزمون بۆم دەرکەوتووە کە ئەگەر خەڵکی وات لابێت ماوەیەك لە کارگێڕیدا کاریان کردبێت و سەرکەوتنی راستەقینەشیان لە کۆکردنەوەی خەڵکدا بەدیهێنابێت، پێویستە تۆ گوێیان لێ بگریت و بیروبۆچونەکانیان کۆبکەیتەوە. دواتر ئەگەر لەسەر مێزێك لەگەڵیاندا دانیشتیت و گوێت لە بیرو بۆچونەکانیان گرت ئەوا بە دڵنیاییەوە دەگەیتە بڕیاری باشتر".

بیڵ پێی راگەیاندم کە زۆر زوو فێری ئەم شێوازە راستەقینەیەی رەفتارکردن بووە، ئەویش لە رێی دویت دەیفید ئایزنهاوەرەوە کە یەکێکە لە سەرکردە مەزنەکانی مێژوو.

"خوێندنی زانکۆ و شەش مانگ خزمەتی سەربازیشم تەواو کردبو، لە یەکەم مۆڵەتی سەربازییەکە گەڕابومەوە ماڵەوە بۆ جەژنی کریسمس.

لەپڕ رۆژێکیان ئیزرا تاف بیتسۆن کە وەزیری کشتوکاڵ بو لەگەڵ ژەنەراڵ ئایزەنهاوەردا هاتن بۆ باخەکەمان. ئایزنهاوەر سەرۆك بو منیش ئەفسەرێکی یەك ئەستێرە.

- دەرەوە زۆر ساردبو، بەلام باوکم چەند نیشانەیەکی نابۆوە تا تەقەیان لێ بکرێت.

باوکم لە سەرۆك ئایزنهاوەری پرسی: ئایا دەتەوێت لە ژوورەوە بمێنێتەوە لای ئاگرەکەوە یاخود حەزدەکەیت بچیتە دەرەوە تەقە لە نیشانەکان بکەیت؟

سەرۆك تەماشایەکی منی کردو لێی پرسیم: تۆ رات چی‌یە ئەفسەر ؟

ماریۆت کە ئێستاش ئەو روداوە دەگێڕێتەوە واقی وڕماوە: ئەو رۆژە بە خۆمم وت تەماشای ئەم کابرایە، کە هەڵسوکەوت لەگەڵ دیگۆڵ و چەرچل و مارشاڵ و رۆزفلت ستالین و مۆنتی گۆمری و براولی و پاتون دەکات، کەچی ئەو پرسیارە ئاڵتونی‌یە لە من دەکات و دەڵێت: تۆ رات چی‌یە؟

پێم وت: گەورەم دەرەوە زۆر ساردە، لە ژوورەوە بمێنەرەوە لای ئاگرەکەوە.

ماریۆت وتی: ئەم وانەیە ئێستاش لە مێشکمدا دەزرنگێتەوە. چرکەساتێکی یەکلاکەرەوە بو لە ژیانمدا .. ئیتر منیش بریارم دا لە هەمو شتێکدا رای خەڵی وەربگرم و دڵنیاشم وەلامی بەنرخم چنگ دەکەوێت. بۆیە بیلَ ماریۆت زنجیرە ئوتێلەکانی بەم رێگایە دروست کرد و کەلتورێکی وای دامەزراند کە پەیوەندیی لەلا گرنگە، هەم لەگەڵ خەڵکی سەرەوە و هەم لەگەڵ ئەوانەی خوارێشەوەدا.

ماریۆت بۆی دەرکەوت کە ئەگەر لە کرێکارێك بپرسیت (ئەی رای تۆ چی‌یە) ئەگەری ئەوە زۆرە لە کرێکارێکی دەستییەوە بیکەیتە کرێکارێکی زانیاری، بە چی، بە گوێگرتن لێی و بە رێزگرتنی ئەزمون و بۆچونەکانی. ماریۆت قسەکانی بەم رستەیە کۆتایی هێنا کە وتی: "جۆنی کورم لە شاری نیویۆرك لە کۆمپانیایەکدا کاری دەکرد کە بوبووە موڵکی ئێمە. کاتێك کە لە چێشتخانەکەدا دەبێت دەچێتە لای کارمەندێك و پێی دەڵێت فلانە کێشەمان هاتۆتە رێ، بە رای تۆ چی بکەین باشە؟ کرێکارەکە چاوی پردەبێت لە گریان و دەڵێت بیست ساڵی رەبەقە لەم کۆمپانیایەدا کاردەکەم ئەمە یەکەمجارە یەکێك لێم بپرسێت بڵێت دەربارەی فلانە مەسەلە رات چی‌یە؟

## کەرەسەی گونجاندن: سیستمەکانی فیدباك

ئامرازەکانی سەرکردایەتیکردن و سێ لەسەرچواری ئەو رۆڵانەی کە سەرکردایەتیکردن دەیانگێڕێت پەیوەستن بە پرسیارێکی بنەڕەتی‌یەوە: مەسەلە هەرە گرنگەکان کامانەن؟ سێیەمین رۆڵیش کە بریتییە لە گونجاندن (ریزکردن، رێك کردن)

سەروكاری لەگەڵ ئەم پرسیارەدا هەیە. ئایا ئێمە بەرەو مەسەلە هەرە بایەخدارەكان بەرێ كەوتوین؟ لە راستیدا ئێمە – وەك پێشتریش باسم كرد- لەو رێیە لادەدەین كە دەمانگەیەنێتە ئامانجەكانمان. درك كردن بەم راستی‌یە هەنگاوێكی گرنگە. كەچی زۆربەمان كە دەزانین لە رێرەو دەرچوین هەست بە شكست و نائومێدیی دەكەین. ئەم هەستە هیچ پێویست نییە. بەڵكو هەق وایە مەسەلەكە پێچەوانە بكرێتەوە چونكە تۆ لە رێگە لات داوە ئەوە بانگەوازێكە بۆ ئەوەی روبكەیتەوە ئاراستە دیاریكراوەكە بەرەو باكوری راستەقینە (پرنسیپەكان) مەبەستیش نوێكردنەوەی پابەندبونمانە بەو شوێنەی كە دەمانەوێت بیگەینێ.

بیرت نەچێت گەشتی ئێمە چ وەك تاك و چ وەك تیم و چ وەك دەزگا، لە گەشتی فڕۆكەیەك دەچێت. پێش ئەوەی فڕۆكەكە بفڕێت، فڕۆكەوانەكە فۆڕمی تایبەت بە نەخشەی گەشتەكە پڕ دەكاتەوە. زۆر باش دەزانێت بۆ كوێ دەچێت. بەڵام لەكاتی گەشتەكەدا رەشەباو باران و هاتوچۆی ئاسمانی و ئاثارامی چینەكانی هەوا و هەڵە مرۆڤكردەكان و .. تاد، ناچاری دەكەن كەمێك فڕۆكەكە بجوڵێنێت بە ئاراستەی جیاجیادا بە جۆرێكی وا كە فڕۆكەكە زۆربەی كات لەسەر ئەو هێڵی فڕینە نابێت كە بۆی دیاری كراوە كەچی لەگەڵ ئەوەشدا فڕۆكەكە دەگاتە شوێنی مەبەست مەگەر كێشەیەكی گەورە روبدات. ئەمە چۆن رودەدات؟ فڕۆكەوانەكە لەكاتی گەشتەكەدا زانیاری پێدەگات لە چەندین سەرچاوەی وەك ئامێرەكانی ناو فڕۆكە، كە ژینگەی دەوروبەر دەخوێننەوە، هەروەها لە بورجەكانی كۆنترۆڵ و لە فڕۆكەكانی دیكە و تەنانەت لە ئەستێرەكانیشەوە. ئەویش بەپێی ئەم فیدباكانە رەفتار دەكات بە جۆرێك كە چەندین جار دەگەڕێتەوە بۆ نەخشە سەرەكییەكە. ئەم گەشتەی فڕۆكە، بە بڕوای من باشترین نمونەیە بۆ رونكردنەوەی هەرچوار رۆڵەكەی سەركردایەتیكردن (نمونەسازیی باش، دیاریكردنی رێبازەكە (رێ دەكردن)، گونجاندن، تواناسازی، كە یارمەتیمان دەدەن بۆ دیاریكردنی مەسەلە هەرە گرنگەكانی ژیان و كار و خێزان و دەزگاكانمان. ئەمە نەخشە تایبەتەكەی فڕینی ئێمەیە. بەڵام ئەو فیدباكە بەردەوامانەی كە وەریان دەگرین (وەك فڕۆكەوانەكان) لە راستیدا هەلی ئەوەمان بۆ دەرەخسێنن تا بزانین چەند بەرەو پێشەوە چوین و چۆن گونجاندن دروست بكەین لەنێوان خۆمان و ئەو نەخشە بنەڕەتییەدا كە سەركردایەتیمان دەكەن. لە راستیدا ئەم

رۆڵ و ئامرازانـە پێکـەوە وامـان لێ دەکـەن بگەینـە ئـەو ئاراسـتەیەی کـە تێڕوانینمـان (خەونەکەمان) بۆی دیاری کردووین.

## بەدیهێنانی هاوسەنگی لەنێوان گەیشتنە ئەنجام و پێشخستنی تواناکاندا

کلیلی پرنسیپی گونجانـدن ئەوەیـە هەمیشە بـە ئەنجامـەکان دەست پێبکـەین. لە بازاڕدا چ جۆرە ئەنجامێکت دەست دەکەوێت؟ ئایا بەشـدارانی دەزگاکەت دڵخۆشن بەو دەستکەوتانەی کە لە سەرمایەگوزاریەکانیانەوە پێیان دەگات؟ ئەی کارمەندەکانت چی؟ ئایـا دڵخۆشـن بـە دەسـتکەوتی سـەرمایەگوزاریە ئـەقڵی و جەسـتەیی و رۆحـی و سۆزدارییەکانیان؟ ئـەی هاوردەکـاران چـی؟ ئـەی کۆمـەڵگا چـی؟ ئایـا هەست بـە هیچ بەرپرسیارییەتییەك دەکەیت بەرامبەر منداڵان و خوێندنگا و شەقام و هەواو ئـاو و ئـەو ژینگەیـەی کارمەنـدەکانت تیایـدا دەژیـن و خێزانـەکانیان تێیـدا بـەخێو دەکـەن؟ ئـەی کڕیارەکـان چـی؟ هەسـت بـە چـی دەکـەن؟ ئەنجامـەکان چـی؟ ئایـا لـەناو دەزگـا هـەرە چاکەکان و لە دنیادا تۆ لە چ خانەیەکدا دادەنێن؟

پێویستە تۆ لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە ئەنجام بدەیت لەسەر تێکڕای ئـەم ئەنجامانـەی کە لە خەڵکە پەیوەندیدارەکانەوە دێن و ئینجا لەو بۆشاییە وردببیتەوە کە کەوتۆتـە نێو ئەم ئەنجامانە و ستراتیجەکەی تۆوە. لەراستیدا کاریگەریی بریتییـە لـە هاوسـەنگی نێوان بەرهـەمهێنانی خـوازراودا (ب) لەگـەڵ توانـای بەرهەمهێنانـدا (ت ب) بـە واتایـەکی دیکە هاوسەنگی لەنێوان هێلکە ئاڵتونییەکانی کە خەڵکی دەیانەوێن و ئەو قازەی کە ئەو هێلکانە دەکات. گەوهەری کاریگەربوون لە بەدەستهێنانی ئامانجە خوازراوەکاندایە بە جۆرێکی وا کە یارمەتیت بدات لە ئایندەدا بتوانیت زۆرتر و زۆرتر لەو ئامانجانە بەدەست بهێنیت.

بـۆ پێوانـەکردنی ئـەم هاوسـەنگییەی نێـوان بەرهـەمهێنانی خـوازراو و توانـای بەرهەمهێنان (ب/ ت ب) لە ماوەی دە ساڵی رابردوودا چـەندین رێگـا خراونەتـە ئاراوە. مـن زۆرجـار خەڵکەکـە ئاگـادار دەکـەم لـە بایـەخی فیـدباك (ئاگـاداربوون لـە گۆڕانکارییەکان) کە لە مەودایەکی ٣٦٠ پلەییدایە. (٩٠) پلەکەی یەکەمی بۆ ژمێریارییە داراییەکانـە، بـەڵام (٢٧٠) پلـەی دیکە بریتییـە لـە زانیارییـە گۆڕاوەکـان بـە شێوەیەکی زانستی دەربارەی بیروبۆچونی خەڵکە پەیوەندیـدارە بنەڕەتییـەکان و هەسـتو سۆزیان دەربارەی ئەو بیروبۆچوونانە.

ئەم جۆرە فیدباکە کۆمەڵێک ناوی لێ نراوە. یەکێک لە ئاراستە بەهێزە تازەکان پێی دەڵێت بۆردی ئەنجامە هاوسەنگەکان. من زۆرجار پێی دەڵێم خەمڵاندنی جووت هێڵی خوارەوە. دیارە دەزانن کە خەمڵاندنە کلاسیکییەکان هەمیشە فۆکەس دەخەنە سەر یەک تاکە هێڵی خوارەوە (هێلکە ئاڵتونییەکان). خەمڵاندنی جوتهێڵی خوارەوە رێز لە قازەکەش دەگرێت. ئەم جۆرە خەمڵاندنە جوتهێڵییە تەندروستی قازەکە دەخەمڵێنێت لەرێی پێوانەکردنی ئاستی پەیوەندی دەزگاکە بە هەمو پەیوەندیدارەکانەوە؛ کرپار و هاوردەکار و هاوبەش و خێزانەکانیان و حکومەت و کۆمەڵگا. ئەوە دەستکەوتێکی زۆر باشە ئەگەر پوختەیەکی دوولاپەڕەییت لابێت لەسەر تەندروستی دەزگاکەت و هەروەها لەسەر هێزی دەزگاکە لە ئێستا و لە داهاتودا. لاپەڕەیەکیان تەرخان بێت بۆ روونکردنەوەی دارایی (بەرهەمی ئێستای هەوڵەکانی پێشوو)؛ لاپەڕەکەی دیکەش ئاماژەت بداتێ دەربارەی پەیوەندییەکانت لەگەڵ کەس و لایەنە پەیوەندیدارەکان واتە ئەو هەمو پەیوەندییانەی کە هەمو ئەنجامە ئایندەییەکانت دەدەنێ. گرنگ لێرەدا ئەوەیە بۆردێکی سەرنجڕاکێشت دەربارەی ئەنجامەکان دەست بکەوێت.

| |
|---|
| کەم کەس ئاستی بە رێکەوتنی خۆیان دەبێون بەرەو ئامانجە هەرە گرنگەکان. تەنیا ١٠٪ی ئەو کەسانەی تاقیکردنەوەیان لەسەرکراوە بۆ پێوانەکردنی زیرەکی جێبەجێکاری XQ دەڵێن: خاوەنی بۆردی روون و ئاشکرای وردی ئەنجامەکانن کە فیدباکی راست و دروستیان دەدەنێ. لەراستیدا بونی زانیاری بەهێز لەبەردەستی خاوەن بڕیارەکاندا مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. |

لێرەدا بە باشی دەزانم جەخت بکەینەوە لەسەرئەوەی کە پێویستە لە دامەزراندنی بۆردی رونکردنەوەی چۆنێتی بەرێوەچونی ئیش‌وکارەکاندا ئەو کەسانەش بەشدارییان پێ بکرێت کە هاوبەشی دەکەن لە پلانە ستراتیجییەکەدا و دواتریش هەڵدەسەنگێندرێن. ئەو بۆردەی کە ئاماژەمان پێ کرد هەم شێوەی کارکردنی کارمەندەکان روون دەکاتەوە، هەم بیرۆکەیەکیشمان دەداتێ لەسەر ستراتیج و پەیام. رێگەم بدە بایەخی ئەم بیرۆکەیەت سەبارەت بەوەی لە رێگەی گێڕانەوەی ئەزمونێکەوە بۆ روون بکەمەوە کە رێکخراوێک رووبەرووی ئەم پرسیارە دەستنیشانکراوە بووەوە

هەمیشە خۆمان لەگەڵ نەخشە ستراتیجییەکەدا بگونجێنین، بە جۆرێکی وا کە لەیەک کاتدا هەم لێپێچینەوەمان لەگەڵدا بکرێت و هەم لێپێچینەوەش بکەین. هەموکەس پێویستە بەشداریی بکات. ئەمە بۆ تاکیش و بۆ تیمەکانیش و بۆ بەشەکانیش راستەو بەسەر هەمو کەسێکدا جێبەجێ دەبێت کە بەرپرسیاری تەواوکردنی ئەرکێکە یاخود جێبەجێکردنی پرۆژەکەیە لە پێشخستنی بۆردی ئیش‌وکارەکاندا و دوایش ببێتە لێپرسراوی. ئێمە لە بەشی چواردەهەمدا پێشنیاری زیاتر دەخەینە رو دەربارەی لایەنە پراکتیکییەکەی ئەم بۆردە. ئێستاش رێگەم بدەن بایەخی ئەم بیرۆکەیەتان بۆ باس بکەم دەربارەی فیدباگ لەرێی بۆردی ئیش‌وکارەکەوە. چیرۆکەکە نیشاندانی ئەزمونی دەزگایەکە کە روبەروی کۆمەڵێک پرسیاری دەستنیشانکەر کرابۆوە.

من لە کۆنگرەی گەورەی کۆمەڵەی نیشتمانی رۆژنامەنوسان و دەزگاکانی بڵاوکردنەوەدا وتارم هەبو. لە کاتی ئامادەکردنی وتارەکەمدا کۆمەڵێک زانیاریم کۆکردەوە دەربارەی سروشتی کەلتوری باڵادەست لە دەزگا جیاجیاکانی بڵاوکردنەوەدا. زانیارییەکان دەربارەی ئاستەکانی متمانە و یەکێتی ئامانج و بەهاکان و نەبونی گونجاندنی دامودەزگایی و ئاکامە خراپەکانی بو لەسەر ئەو دەزگایانە. پێش ئەوەی زانیارییەکانم پێشکەش بکەم بڕیارم دا رێگەیەکی جیاواز تاقی بکەمەوە. میکرۆفۆنێکم گرت بەدەستەوەو بەناو هۆڵەکەدا کەوتمە گەڕان و دەستم کرد بە پرسیارکردن لە بەشداران: لە کۆمەڵگادا رۆڵی بنەڕەتی رۆژنامە کامەیە؟ ئامانجە بنەڕەتییەکانی ئێوە بریتین لە چی؟

خەڵکەکەش یەک یەک وەڵامی پرسیارەکەیان دەدایەوە پاشان میکرۆفۆنەکەیان دەدایە دەستی کەسی پاش خۆیان. شێلگیرانە باسی ئەو رۆڵە زۆر زیندوانەیان دەکرد کە رۆژنامە لە ژیانی کۆمەڵگادا دەیگێڕێت. لەو باوەڕەدا بون کە شیکارییە قوڵەکانی راگەیاندن وادەکات حکومەت بە راستگۆیی بمێنێتەوە و کارمەندەکان لەبەردەمی گەلدا ئاشکرا دەکات و میللەت دەکاتە بەرپرسیاریان. بیروبۆچونە باڵادەستەکە لای خەڵکەکە جەختکردنەوە بو لەسەر خزمەتکردنی وڵات و کۆمەڵگاکەمان لەرێی پاراستنی بەها بنچینەییەکانمان کە بریتین لە: ئازادی، ئەوەی کە حکومەت لەلایەن خەڵکەکەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت، پاراستنی ئەو یاساو هاوسەنگییانەی کە دەستور دیاری کردون، پارمەتیدان لە رۆشنبیرکردنی خەڵکیدا بۆ پاراستنی سیستمی کاری ئازاد و دروشمەکانی کۆمارە دیموکراسییەکەمان.

پاشان من پرسیاری دیکەم لێ کردن، ئایا بەراستی بڕواتان بەم ئامانجانە هەیە؟ ئایا لە دڵی خۆتاندا هەستی پێدەکەن، هەموو وتیان بەڵێ. پرسیارەکەی دیکە قورستربو، چۆن دەزانیت ئەو کەسە بەراستی بڕوای بە فلانە بەها هەیە، چەند وەڵامێکی جیاجیام دەست کەوت. پێم وتن یەکێك لە تاقیکردنەوەکان بۆ ئەو مەبەستە ئەوەیە بزانیت ئایا ئەو کەسە بەپێی بەهاکانی دەژی؟ هەروەها پێم وتن سەرڕاستی و بێخەوشی بەرامبەر بەهاکان نیشانەی بیروڕایەکی راستەقینەیە. هەموویان پشتگیریان کردم. پاش ئەوە گەیشتمە پرسیارە سەرەکییەکە، چەند دەزگا لە دەزگاکانی ئێوە لەناو دەزگاکە خۆیدا ئەرکێك جێبەجێ و پەیڕەو دەکات لەو ئەرك و پەیڕەوە دەچێت کە لە وڵات و لەناو کۆمەڵگادا پەیڕەوی دەکات؟ پرسیارەکە بە باشی تێنەگەیشتن، بۆیە لێم پرسین چەند کەس لە ئێوە لە رەفتاری رۆژانەی خۆیدا یاخود لە دەزگاکەدا هەوڵ دەدات خەڵکەکە هەست بە لێپرسراوێتی بکات و راستگۆبێت؟ تەنیا ٥٪یان دەستیان بەرزکردەوە. پاش ئەوە من ئەو زانیارییانەم نیشان دان کە دەربارەی دەزگاکانیان کۆمکردبونەوە. جێی متمانە بوون و ململانێی کەسێتییەکان و ناکۆکی نێوان بەشەکان و نەگونجان و داماڵینی خەڵکەکە و تواناکانیانم نیشان دان.

دوابەدوای ئەوە بیرۆکەی چوار رۆڵی سەرکردایەتیم بۆ باس کردن و هانم دان لە خۆیانەوە دەست پێبکەن و خەڵك بەشدار بکەن لە دیاریکردنی ئامانجەکان و دامەزراندنی سیستمەکانی زانیاری و بەرجەستەکردن و پاداشتکردنێك کە بەرزترین ئاستی تواناسازیی دەستەبەر بکات. کە قسەکان تەواوبون، زۆربەی نوسەران و خاوەن دەزگاکانی بڵاوکردنەوە تێڕوانینێکی جیاواز و تازەیان دەربارەی سەرکردایەتی لەلا دروست بو. ئەزمونەکە بۆ هەمومان ئەزمونێکی روناککەرەوەو سەرنجڕاکێش بو.

دیارە ئەم جۆرە زانیاری و فیدباکە هەر بە تەنیا سود بە دەزگاکە ناگەیەنێت، بەڵکو سود بەو کەسانەش دەگەیەنێت کە لە دەزگاکەدا کار دەکەن.

جارێکیان من بەرنامەیەکی راهێنانم دامەزراند لەگەڵ کۆمەڵێك جەنەراڵی هێزی ئاسمانی وڵاتێك کە مێژووەکەی پڕە لە کێشەو ململانێ. لە قسەکانمدا باسی بایەخی فیدباکم دەکرد کە چەند گرنگە بۆ ئەو کەسانەی ئەمان کاریان لەگەڵدا دەکەن. تێبینیم کرد هەموویان قسەکەیان بە دڵەو سەرم بۆ دەلەقێنن. ئاوڕم لە جەنەراڵەکە دایەوە و لێم پرسی، یەعنی ئێوە سیستمێکی لەوجۆرە لە پێوانەکردن و فیدباکدا بەکار دەهێنن.

وتی: بەڵێ، ئێمە دەمێکە خەڵکەکەی خۆمان بەم شێوازە مەشق دەدەین. ئەوان شارەزاترین فرۆکەوانن (راهێنەر نین. هەریەکێك لەوانە ساڵانە راپۆرتێکی پێدەگات دەربارەی بیروبۆچونی هەمو ئەو کەسانەی کە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. راپۆرتەکە رەچاو دەکرێت لە پێشخستنی پیشەیی و کەسێتیاندا و هیچ کەس پلەکەی بەرز ناکرێتەوە ئەگەر نمرەی بەرز وەرنەگرێت، تەنانەت ئەوانەی لەژێر فەرمانی کەسەکەشدا نمرەی بۆ دادەنێن).

پێم وت: لە وڵاتەکەی مندا زۆربەی دەزگاکان مل نادەن بۆ جێبەجێکردنی ئەم چەمکە. چۆن لەلای ئێوە مەسەلەکە هێندە بەربڵاو و میللییە؟

بە فیزێکەوە تەماشای کردم و وتی: "ستیڤن، مانەوەی وڵاتەکەمان پەیوەستە بەو کەسانەوە، خۆیشیان ئەوە دەزانن. تۆ لەوباوەڕەدایت ئێمە رێگە بە خۆمان دەدەین بچینە ناو گفتوگۆ میللییەکانەوە؟ لەراستیدا هەندێکمان —ئەوەی لەناوماندا لە هەمومان نەناسراوترە بەرزترین نمرە دەهێنێت، چونکە بەڵێنەکانیش دەباتەسەر.

زەحمەتترین ئەرکی سەرشانی سەرکردایەتی و کارگێڕی گونجاندنی پێکهاتەو سیستمەکانە لەگەڵ ستراتیج و بەهاکاندا، چونکە زۆر بە سادەیی، پێکهاتەو سیستمەکان بەرجەستەکەری گریمانەکان و پێشبینییەکان و نەریتە کۆنەکانن. زۆرکەس هەر بەمانە دڵیان ئاودەخواتەوە و باوەڕیان بە توانای پێشبینیکردنی ئەم پێکهاتە و سیستمانەیە. رێك وەکو (مانگا پیرۆزەکان) وان کە وازلێهێنانیان و فەرامۆشکردنیان هەڵەیەکی گەورە و کارێکی مەحاڵە، ئەڵلاهومە مەگەر پابەندبونێکی قوڵ و پەیوەندییەکی سۆزداریی بەهێزمان هەبێت بە پێوەرە ستراتیجیەکانی دیاریکردنی رێبازەکەوە.

ئەم نەخشەیەی کە دێت بەراوردکارییەکە لەنێوان پێکهاتەیەکی چاخی پیشەسازی کۆن کە لەسەر کۆنترۆڵکردن و سیستمەکانی کۆنترۆڵکردن بەندە، لەگەڵ نمونەیەکی چاخی تازەی زانیاری کە بنەماکانی بریتین لە ئازادکردن و تواناسازیی. بڕوانە خشتەی (٥). دیارە بەراوردکردنی ئەم دوو نمونەیە کارێکی بەکەڵکە، بەڵام پێویستە بزانیت کە لە ژیانی واقیعدا چون بەیەکدا و شەبەنگێکیان دروستکردوە کە ئەم خشتەیە کۆتاییەکەیەتی. بە هەرحاڵ خشتەکە رەنگە بتوانێت یارمەتی بدات لە رونکردنەوەی ئەو کاریگەرێتییە مەزنەی کە لە ئەنجامی گونجاندنی کەلتور و پێکهاتە و سیستمەکان لەگەڵ پێوەرەکانی دیاریکردنی رێبازدا دێتە ئاراوە.

| بابەت | چاخی کۆنی پیشەسازی نمونەی کۆنترۆڵکردن | چاخی نوێی کرێکارانی زانیاری نمونەی ئازادکردن/ تواناسازیی |
|---|---|---|
| سەرکردایەتی | پۆست (دەسەڵاتی فەرمی) | هەڵبژاردە (دەسەڵاتی رەوشتی) |
| کارگێری | کۆنترۆڵکردنی کەس و شتەکان | کۆنترۆڵکردنی شتەکان و تواناسازیی خەڵکەکە |
| پێکهاتە | هەرەمی، بیرۆکراسی | تەخت، بێ سنور، نەرم |
| پاڵنەر | دەرەکی، تێلا و گێزەر | ناوخۆیی – مرۆڤی کامڵ |
| هەڵسەنگاندنی کارئەنجامدانەکە | دەرەکی، لە هەردولاوە هەڵدەسەنگێنرێت (تەکنیکی سەندویچ) | هەڵسەنگاندنی ناوخۆیی بە بەکارهێنانی فیدباکێك مەوداکەی ٣٦٠ پلە بێت. |
| زانیارییەکان | راپۆرتی دارایی سەرەتایی کورتمەودا | بۆردی ئەنجامە هاوسەنگەکان (لەسەر هەردو مەودای کورت و درێژ) |
| پەیوەندی پێکەوەیی | بە شێوەیەکی سەرەکی لە سەرەوە بۆ خوارەوە | کراوە: سەرەوە/ خوارەوە/ هەمو ئاراستەکان |
| کەلتور | یاسا کۆمەڵایەتییەکان/ نەریتەکانی شوێنی کار | ئەو بەهایانەی پشتیان بە پرنسیپەکان بەستووە. هەروەها یاساکانی ئابوری بازاڕ |
| بودجە | بە شێوەیەکی سەرەکی لە سەرەوە بۆ خوارەوە. | کراوە، نەرم، یەکتر تەواوکەر |
| راهێنان و پێشخستن | نمایشکارانە، بایەخدان بە شارەزاییەکان، قابیلی خراپ بوون. | پاراستن، ستراتیجی، مرۆڤی کامڵ، بەهاکان |
| خەڵك | تێچووەکان لە راپۆرتی زیان و قازانجدا، رپاکارییەکی زۆر. | ئەویەری سەرمایەگوزارییکردن لە وزەکاندا |
| دەنگ | بە شێوەیەکی گشتی زۆر گرنگ نییە بۆ زۆربەی کارمەندان | بۆ هەموان مەسەلەیەکی ستراتیجییە، تیمی کامڵ. |

خشتەی (٥)

## فیلم: دیواری بەرلین

دیواری بەرلین ماوەی چل ساڵی رەبەقی خایاند، واتە دوو نەوەی یەك لەدوای یەك. ئەمەش ماوەیەکی زۆرە بۆ قوڵکردنەوەی دابەشبون لەنێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا لە مێشك و دڵی خەڵکیدا.

ئای کە جیابونەوەیەکی قوڵە و کە پێچەوانەکارییەکی گەورەیە! دیوارەکە ساڵی ١٩٨٩ روخێنرا، بەڵام مەرج نییە لە مێشك و دڵی زۆربەی خەڵکەکەدا هێشتا روخابێت. دیوارەکە وەکو مانگا پیرۆزەکە وابو. وەکو پێکهاتە و سیستمە کۆنەکانی چاخی پیشەسازی وایە. نەریتەکان بە ئاسانی نامرن. ئێستاش لەبیرمە کە جارێکیان پاش روخاندنی دیواری بەرلین، سواری تەکسییەك بوم لە بەرلینی خۆرهەڵات -گوێم لە شۆفێرەکە بو ترس‌ونیگەرانی خۆی دەردەبڕی لەوەی کە نەتوانێت خۆی لەگەڵ بازاڕی ئازاد و کۆمەڵگایەکی دیموکراتیدا بگونجێنێت. شۆفێرەکە ئەو ئاسایش و سەقامگیرییەی پێ باشتربو کە دیوارەکە و سیستمە کۆنەکە مەیسەریان کردبون. من کە گوێم لەو قسانەی بو توشی شۆك بوم. پێی وتم: زۆربەی ئەوە کۆنەکە وەکو ئەم بیردەکەنەوە، رەخنەش لە ئەوەی نوێ دەگرن کە ئازادییان لە ئاسایش پێ باشترە.

تۆ کە تەماشای ئەم فیلمە دەکەیت بیربکەرەوە بزانە چەند زەحمەتە مرۆڤ روبەروی سیستمێکی تازە ببێتەوەو ناچار بکرێت بە شێوازێکی نوێ بیربکاتەوە. ئینجا بیربکەرەوە و بزانە ئەمە پێویستی بە کۆمەڵێك کەرەسەی نوێ و شارەزایی تازە هەیە. فیلمەکە پێت دەڵێت ئەگەر مرۆڤ هێشتا هەر بە سیستمە کۆنەکە بیربکاتەوە. کارێکی بێهودەیە کەرەسەی نوێ و شارەزایی نوێی فێر بکەیت. مەسەلەکە وەکو ئەوە دەردەچێت شەرابێکی تازە بکەیتە قاپێکی کۆنەوە.

تکایە سی دیەکە بخەرە ناو ئامێری پێشکەشکردنەوە و فیلمی دیواری بەرلین هەڵبژێرە. ئێستاش دەچینە دوا رۆڵی سەرکردایەتیکردن کە تواناسازییە.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: چی دەکەیت ئەگەر لە دەزگایەکدا کارت کرد پڕبێت لەو سیستمانەی کە جەخت زۆر دەکەنەوە لەسەر کێبڕکێی ناوخۆیی و لەسەر مەودا کورتخایەنەکان و پشتیان بە پۆستە فەرمییەکان بەستووە. هەروەها کەلتورێکیشیان هێنابووە بەرهەم کە رەخنە قبوڵ نەکات، ئایا مرۆڤ لە بارودۆخێکی ئاوادا چی لەدەست دێت؟

وەڵام: ئەگەر ئەم دەزگایەی کە باسی دەکەیت پەیوەندی هەبو بە هێزە ململانێکەرەکانی ناو بازاڕەوە، ئەوە دەتوانیت ئازادی خۆت بەدەست بهێنیت و بە

مەبەستی فراوانکردنی بازنەی کاریگەرییەکانت رۆڵی ئەو روکارە بچوکە ببینیت کە سوکانە گەورەکە وەردەچەرخێنێت. بەڵام ئەگەر دەزگاکە پەیوەست ئەبو بەهێزە رکابەرەکانی ناو بازاڕەوە، ئەوا دەتوانیت فەلسەفە یۆنانییەکە بەکاربهێنیت (هێزە رەوشتییەکە، هاوسۆزی، لۆجیک) تا خەڵکەکە دەگەنە ئەو باوەڕەی کە ئەگەر ئامۆژگارییەکانی تۆ جێبەجێ بکەن ئامانجەکانیان چاکتر دێنە دی. خۆ ئەگەر لەو جۆرە کەسانەش بیت کە بە رەنجی شانی خۆت لەرووی پیشەیی و کەسێتییەوە هێندە گەشەت کردووە کە دڵت ناو نەخواتەوە هەتا چارسەر بۆ کێشەکان نەدۆزیتەوە و پێویستییە مرۆڤایەتییەکان تێر نەکەیت، مانای وایە هەل بێسنورت لەبەردەمدایە کە کاری دیکە ئەنجام بدەیت. لە حاڵەتی وادا رەنگە باشتر بێت بڕیار بدەیت لە شوێنێکی دیکە کار بکەیت، شوێنێك کە بتوانیت ئەو کارانەی تێدا ئەنجام بدەیت .

پرسیار: گرنگترین چالاکی چییە کە هەر تیمێکی کارگێڕی یاخود سەرکردایەتی باش دیاریکردنی رێبازەکە پێویستە ئەنجامی بدات؟

وەڵام: بە بڕوای من پێویستە خەڵك دابمەزرێنن و هەڵیانبژێرن و لە شوێنی گونجاودا دایان بنێن؛ واتە زمانەکەی (جیم کۆلینس) بەکاربهێنن و دڵنیا بن لەوەی کەسی گونجاویان خستۆتە سەر کورسی گونجاو لە پاسی گونجاودا. بەڵکو دەتوانم بڵێم: خستنە گەڕی خەڵکەکە و هەڵبژاردنیان و دانانیان لە شوێنی گونجاودا زۆر گرنگترە لە مەشق و پێشخستنیان. کێشەکە لەوەدایە کە زوربەی دەزگاکان لە ئابورییەکدا کە بە خێرایی گەشە دەکات، بە خێرایی پێویستی بە کارمەند دەبێت. مرۆڤ ئاسانتر باوەڕ بەو شتانە دەکات کە زیاتر حەزی لێیانە. ئەمەش ناچاری دەکات لەگەڵ کارەساتی راستەقینەدا بژی. جا بۆئەوەی توشی ئەو کارەساتە نەبین پێویستە دامەزراندنی ستراتیجی پەیڕەو بکەین؛ بیرکردنەوەی قوڵ لەرێی پێوەرەکانەوە، دروستکردنی پەیوەندی باش لەگەڵ ئەوانەی کە دایاندەمەزرێنیت، قوڵبونەوە لە دۆسیەی خەڵکی جیاجیا. نرخی ئەو باجە بدە کە پێویستە، بۆ دروستکردنی پەیوەندی راستەقینە لەگەڵ ئەوانەی کە رەنگە دایانبمەزرێنیت. پەیوەندییەکە پێویستە لە ئاستێکی وادا بێت کە بە راستگۆیی و روونکارییەکی تەواوە نیشانی بدەن بەهاکان و دەنگ و تێڕوانینەکانیان تا چەند دەگونجێت لەگەڵ پێوەرە ستراتیجییەکانی کاری ئایندەدا. دواتر کلیکەکە جێبەجێکردنە.

پرسیار: بەپێی ئەزموونی خۆت، باشترین پرسیار چییە ئاراستەی ئەو کەسەی بکەیت کە دایدەمەزرێنیت؟

وەڵام: بەپێی ئەزموونی خۆم باشترین پرسیار ئەوەیە بڵێیت: ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ بیرەوەرییەکانی زۆر زووت، ئەو شتانە چی بوون کە ئارەزوت لێ بو ئەنجامیان بدەیت و بەباشی ئەنجامت داون؟ دوای ئەو هەمان پرسیاری لێ بکە لە قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و ئامادەیی و زانکۆ و هەروەها کارەکانی پاش قۆناغی زانکۆ بۆئەوەی زۆر بەباشی خاڵە بەهێزەکانی و شارەزاییەکانی ببینیت و بزانیت دەنگی ئەوکەسە لە کوێدا خۆی شاردۆتەوە.

دیارە لە وەڵامی ئەم پرسیارەوە هەمو نمونەی کەسایەتییەکان دەبینیت و دەزانیت ئەو کەسە سەربەخۆیە یان کەسێکی پشت بەستووە؟ رۆحی یارمەتیدانی تێدایە یان نا؟ هەر لەم گفتوگۆیەدا پێویستە تۆش ئەو پێوەرە ستراتیجییانەی نیشان بدەیت کە پەیوەستن بەو رۆڵانەی کە چاوەڕوانیت بیانگێڕێت.

پرسیار: چی روودەدات کاتێک کە دیاردەی ناسەربەخۆیی و پشتبەستن خەڵات دەکرێت (نەرێنی و گوێڕایەڵی)؟

وەڵام: خەڵاتکردنەکە خەڵاتکردنێکی کاتی دەبێت، چونکە لە کۆتاییدا بازاڕ خۆی رایدەماڵێت. واتە کەسێتی لەو جۆرە ناتوانێت ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی کەسی پشتبەستو ناتوانێت خزمەتی کڕیار بکات و لە وەڵامدانەوەی پێویستییەکانیاندا داهێنان ناکات لەسەر مەودایەکی درێژخایەن. بازاڕ ئەگەر روونکاریی و فیدباکی چاکی تێدابێت، نە خەڵکی پشتبەستو تەمەنیان درێژ دەبێت نە ئەو دەزگایانەش کە کەلتوری وا بڵاو دەکەنەوە. ئابوریی جیهانی ئەمڕۆ پێویستی بەو کلتورەیە کە داهێنەرو تواناساز بێت و زۆر بەخێرایی بجوڵێتەوە و بێتە دەست. بەتایبەت ئەگەر رکابەرەکەت رکابەرێکی جیهانی بو نەک ناوچەیی.

پرسیار: دروستکردنی تیمێکی تەواو چەند گرنگە؟

وەڵام: دروستکردنی تیم مەسەلەیەکی بنەڕەتییە، بەتایبەت لە پێشخستنی ئەو تیمە کامڵانەدا کە خاڵە بەهێزەکانی خەڵک تیایاندا دەبنە خاڵی بەرهەمهێن و خاڵی

بەهێزی هاوکارەکانی دیکە خاڵە لاوازەکانی ئەو کەسە ناهێڵن و هێزە یەکخەرەکانیش بریتی دەبن لە بەهاو تێڕوانینی هاوبەش. بەڵام با ئەمەشت پێ بڵێم کە دروستکردنی تیم پێویستی بە برێکی زۆر پێکهاتە و سیستمی گونجاوە. ئەگەر بە گوڵێك بڵێین بڕوێ، بەڵام گوڵێکی دیکە ئاو بدەین، گوڵەکەی یەکەم ناڕوێت. ئەگەر بڵێیت: با وەکو تیمێك کار بکەین، بەڵام خۆت سەربەخۆو ئاغایانە لێت خوڕی و بڕیاری یەکلایەنەی هەڵە بدەیت ناتوانیت تیمەکە دروست بکەیت. دروستکردنی تیم پرۆسەیەکی زۆر گرنگ و خوازراوە.، بە مەرجێك ئەو پرنسیپانەی تێدا بەرجەستە بکرێن کە لەناو پێکهاتە و سیستم و ڕێو شوێنەکانی دەزگاکەدا هەن، ئەگینا پرۆسەکە هەر لەئاستی قسەی گشتیدا دەمێنێتەوە. نابێتە کەلتورێکی ڕاستەقینە.

پرسیار: ئایا چۆن دەتوانین کەلتورێکی پتەوی یەکگرتوومان دەست بکەوێت ئەگەر دەزگاکە خۆی بەدەست کۆمەڵێك تێڕوانین و ئامانجی جیاجیاوە بناڵێنێت؟

وەڵام: ناڕەحەتی و ئازارێك بهێنەرە ئاراوە. مرۆڤ هەتا کامەران و دڵنیا بێت هیچی ئەوتۆ ناکات. چاوەڕێ مەکە تا بازاڕەکە ئەو ناڕەحەتی و ئازارە دروست دەکات، خۆت بەشێوازی دیکە دروستی بکە. بۆردی ئەنجامە هاوسەنگەکان دەتوانێت کاری وات بۆ بکات، بەتایبەت ئەگەر خەڵکەکەت کردە لێپرسراوی و بۆ خەڵات و پێشخستنەکان پشتت بەو بۆردە بەست.

# بەشی سیانزەیەم

## دەنگی تواناسازی – ئازادکردنی عیشق و بەهرە

"باشترین ڕێگا بۆئەوەی خەڵک وا لێ بکەیت سەرکەوتو بێت لە کارەکەیدا ئەوەیە کە لە هەمو هەڵوێست و کردارێکی ڕۆژانەتدا بیخەیتە سەر ئەو باوەڕەی کە تۆ بە هەمو هێزێکت پشتگیریی لێ دەکەیت."

- هارۆڵد نێس گرینین

سەرۆکی پێشوی ئای تی تی




شێوەی ١٣–١

| | |
|---|---|
| ئەفسانە | **شێوازی تێلاو گێزەر**<br>تیۆری جاك ئاس (بێئەقڵ) - باشترین ڕێگەیە بۆ هاندانی خەڵكی. (پارادیمی كۆن) |
| واقیع | شێوازی تێلاو گێزەر لە هانداندا بۆ ئاژەڵ باشە. بەڵام مرۆڤ توانای بڕیاردان و هەڵبژاردنی هەیە. تۆ دەتوانیت هێزی بازوی مرۆڤێك بكڕیت بەڵام ناتوانیت ئەقڵی و دڵی بكڕیت. دەتوانیت قاچی بكڕیت بەڵام ناتوانیت ڕۆحی بكڕیت. |

**شێوەی ١٣—٢**

یەكەم ئەڵتەرناتیڤی تواناسازی ئەوەیە هەوڵ بدەیت لەڕێی كۆنترۆڵكردنی خەڵكەوە ئەنجامەكان بەدەست بهێنیت.

ئەڵتەرناتیڤی دووەم ئەوەیە كە واز لە خەڵكەكە بهێنیت و هەقت نەبێت بەسەریانەوە. بە واتایەكی دیكە؛ بە قسە باسی تواناسازی بكەیت بەڵام بە كردەوە واز لە خەڵكەكە بهێنیت و بەرپرسیارێتیت بەرامبەریان فەرامۆش بكەیت.

ئەڵتەرناتیڤی سێیەم زەحمەتترە و لەهەمان كاتدا خۆشتریشە. ئەم ئەڵتەرناتیڤە كارێكی خودییە و لەڕێی چەند ڕێكەوتنێكی براوە — براوە وە ئاڕاستە دەكرێت بۆ گەیشتن بە چەند ئامانجێكی ڕوون و ئاشكرا كە هەموان بەرپرسیارن لە ئەنجامەكانی. پێشتر باسی ئەوەم كرد كە بە باوەڕی من زۆربەی دەزگاكانمان، بە خێزانەكانیشمانەوە، گیرۆدەی زیادەڕەویی بون لە كارگێڕی و لاوازی لە سەركردایەتیدا. جا لەبەرئەوەی ناكۆكیمان لەگەڵ مناڵەكانماندا بیرخستنەوەیەكی تاڵی ئەم هەقیقەتەو هەروەها هی ئەو یاخیبونەشە كە زۆرجار ڕودەدات، وە لەبەرئەوەی لەناو گەلانی دنیادا شێوەی خێزان مەسەلەیەكی هاوبەشە، من قسەی خۆم لەسەر كێشەكانی تواناسازی بە چیرۆكێكی ڕاستەقینەی هاوڕێیەكی خۆم دەست پێدەكەم كە خۆی و هاوسەرەكەی توانییان لە پەیوەندییان لەگەڵ مناڵەكانیاندا تەحەدایەكی گەورە تێك بشكێنن.

"ڕۆژێكیان هەستم كرد ژنەكەم زۆر بێزارو تورەیە. لەبەرئەوە لێم پرسی: چی بووە؟

وەڵامی دامەوە: زۆر نائومێدم، بەیانیان هەتا مناڵەكان دەنێرمە قوتابخانە زۆر هیلاك دەبم. خۆیان هیچ ناكەن، دەبێت هەمو شتێك من پێیان بڵێم و ئەگەر من نەبم

قوتابخانەکەش ناچن. من نەیم لەناو جێگاکەیان هەڵناسن، بەڕاستی نازانم چی بکەم؟

ئەم قسانەی ئەو وایان لیٚکردم سبەینیٚ بەیانی چاودێری بکەم بزانم چی رودەدات؟

سەعات شەش و پانزە خولەک ژنەکەم چووە ژووری منداڵەکان و بەهێواشی یەک یەک بێداری دەکردنەوە و پیٚی دەوتن: هەستە بەقوربان، کاتی بێداربونە، هەستە. سیٚ چوار جار چووە ژوورەکەیان هەتا بێدار بونەوە، پاش ئەوە دوشەکەی بۆ ئەو منداڵەیان کردەوە کە درەنگتری پیٚچو لە بێداربونەوەدا. لەماوەی دە خولەکەی داهاتوشدا ژنەکەی چەندین جاری دیکە سەری لە حەمامەکە دایەوەو هەمو جارێک لە دەرگاکەی دەدا و دەیوت: وەرە دەرەوە درەنگە، ئەویش وەڵامی دەدایەوە: وا دێمە دەرەوە. لەکۆتاییدا کچەکەمان دوشەکەی گرتەوە و دەستی کرد بە خۆ وشک کردنەوە، ئینجا گەڕایەوە ژوورەکەی و لەسەر زەوییەکە خۆی گرمۆڵە کردو بە خاولییەکە خۆی داپۆشی. پاش دە خولەک دایکی پیٚی وت: بەساقە دەبێت خۆت بگۆڕی، دەی

+ هیچم نییە لەبەری بکەم

- ئەمە لەبەر بکە

+ نا، حەزم لیٚی نییە ناشیرینە

- ئەی حەزت لە چی‌یە لەبەری بکەیت

+ پانتۆڵە جینزەکەم، بەڵام چڵکنە

بەم سیناریۆ سۆزدارییە تا هەمویان لەژێر پلیکانەکەدا ئامادە دەبن لە سەعات شەش و چل و پێنج خولەکدا، ژنەکەم بەردەوام بو لە بەساقە و بەقوربانیاندا کە خێرا ئەمە بکەن و ئەوە بکەن و ئەها ئوتومبیلەکەی قوتابخانە هاکا هات. لەکۆتاییشدا پاش ماچ و دەستلەملان لە دەرگاکەی ماڵەوە چونە دەرەوە. دایکیان بەتەواوی هیلاک بوبو، منیش تەنیا هەر بە بینینی ئەو دیمەنانە هەستم بە هیلاکی دەکرد. بیرم کردەوە، مرۆڤ ناهەقی نییە تورەو بێزاری دەربیرێت. ئەم منداڵانە وا دەزانن کە خۆیان هیچ کارێکیان لەدەست نایەت چونکە ئێمە هەمیشە لەلایانین و بیریان دەخەینەوە کە پێویستە چی بکەن و چی نەکەن. ئەو شێوە لە دەرگادانە بە دەرگای حەمامەکەدا رەمزێکە کە بیٚئەوەی مەبەستمان بێت فێرمان دەکردن هیچ بەرپرسیارێتیەک نەگرنە ئەستۆ. لەبەرئەوە ئێوارەیەکیان هەمو خێزانەکەم بانگهێشت کرد بۆ کۆبونەوە و پێشنیارێکی تازەم بۆ کردن" "تێبینیم کردووە ئێمە بەیانیان کاتێکی زۆر بەفیرۆ دەدەین". هەمو دەستیان کرد بە پێکەنین.

وتم: "کێ پێی خۆشە ئیش و کارەکانی بەیانیان ئاوا بەردەوام بن؟"

کەس دەستی بەرز نەکردەوە. لەبەرئەوە پێم وتن: "مەسەلەیەک هەیە دەمەوێت بەباشی بیری لێ بکەنەوە، مەسەلەکەش بریتییە لەوەی، کە ئێوە لە ناخی خۆتاندا توانای بڕیاردان و هەڵبـژاردنتان هەیـە، دەتـوانن بەرپرسـیارێتی هـەڵبگرن. پاشـان کۆمـەڵێک پرسیارم ئاڕاستە کردن. پرسیارم کرد: کێ دەتوانێت خۆی سەعاتەکە بخاتە سەر زەنگ و خۆیشی بێدار بێتەوە؟ هەمو کەوتنە تەماشا کردنم وەک ئەوەی بڵێن: بابە ئەوە دەڵێیت چی؟ وتم: ئا، بەڕاستمە، کێ دەتوانێت ئەوە بکات؟ هەمویان دەستیان بەرزکردەوە.

" کـێ زۆر چـاک دەزانێـت پێویسـتە چـەندێک لـە حەمامەکـەدا بمێنێتـەوە و خـۆی دوشەکە بگرێتەوە؟ هەمویان دەستیان بەرزکردەوە."

" کێ لە ئێوە دەتوانێت بچێتە ژوورەکەی خۆی و ئەو جلە هەڵببـژێرێت کە حەزی لێیەتی و ئینجا خۆی بیکاتە بەری خۆی؟ پرسیارەکە بێ مەعنا دیاربو چونکە هەمویان وا خۆیان نیشان دەدا کە دەتوانن.

"ئەی کێ لە ئێوە دەتوانێت لە شەوەوە مشوری جلەکانی بخوات بۆئەوەی ئەگەر پیس بون بیانخاتە جلشۆرەکەوە؟ کێ؟

"کێ لە ئێوە دەتوانێت سەر جێگاکەی رێک بخات و ژورەکەی پاک بکاتەوە بێئەوەی هیچ کەس داوای لێ بکات و بیری بخاتەوە؟" هەمویان دەستیان هەڵبڕی.

"کێ لە ئێوە دەتوانێت سەعات شەش و چل و پێنج خولەک ئامادەبێت بۆ خواردنی بەرچایی؟" هەمویان دەستیان بەرزکردەوە.

بـەم شـێوەیە بابەتـەکانمان یـەک یـەک بـاس کـردو هـەمو جـارێکیش رەزامەنـدییان نیشان دەدا "هێزو توانای ئەنجامدانی ئەو کارەم هەیە" ئینجا پێم وتن: زۆرباشە ئێستا ئەو شتانە هەمویان دەنوسینەوە. رێگەیـەک بۆ بـەیانیانمان دادەنـێین و لەسـەری رێک دەکەوین". هەرچییەکیان ویست نوسیمان و خشتەیەکی کارکردنمـان دانـا. کچەکەمان - کە لە هـەموان زیـاتر ئـەرکی زەحمـەت بـو – لـە هـەمویان بـەجۆش و خرۆشـتربو. ئـەو خشـتـەیەکی دووورودرێـژی نوسـی و بـە خولـەک کارەکـانی دیـاری کردبـو. لـە هەنـدێک مەسەلەدا ئێمە یارمەتیمان داو کارەکە تۆزێک ئامۆژگاریشی پێویست بـو. بۆمـان دیـاری کردن چۆن و لەکوێدا بەرپرسیارێتی بگرنە ئەستۆ و دەرەنجامەکانیشمان روون کردەوە. دەرەنجامـە باشـەکەی ئەوەیـە بـەیانیان زیـاتر هەسـت بەدڵخۆشـی دەکـەن، بـە تایبـەت

رایکیان. دەشمانزانی کە ئەگەر دایك دڵی خۆش بێت خێزانەکە هەمو دڵیان خۆش دەبێت. دەرئەنجامە ناخۆشەکەش ئەوەیە کە بۆ بێداربونی لەکاتی دیاریکراودا و ئەنجامدانی بەرپرسیارێتییەکان وا پێویست دەکەن تا ماوەی چەند رۆژێك زوتر بخەون. ئەمەش مەسەلەیەکی لۆجیکییە چونکە مرۆڤ ئەگەر شەو کەم بخەوێت بەیانیان بە ئاسانی بێدار نابێتەوە. منداڵەکان یەك یەك رێکەوتنەکەیان ئیمزا کردو یەکی تۆزێك بۆندرمەیان خوارد و چونە ناو جێگاوە. لە دڵی خۆماندا وتمان: "زۆرباشە، بزانین چی روودەدات". سبەینێ بەیانی سەعات شەش من و ژنەکەم لەسەر جێگاکە پاڵ کەوتبوین. گوێم لێ بو جەرەسی سەعاتەکە وەستێنرا، ئینجا تەماشامان کرد گڵۆپی ژورێك لە ژوری منداڵەکان داگیرسا. پێش ئەوەی بزانین کێ بو، کچە بچکۆلەکەمان – کە لە هەموان زیاتر ئەرکی قورستر بووە رایکردە حەمامەکە و دوشەکەی کردەوەو دەستی کرد بە خۆشۆردن. من و ژنەکەم بەم کارە سەرسام و دڵخۆش بوین. ئێمە وامان دانەنابو پانزە خولەك زوتر دەست پێبکات. لە پاش پانزە بیست خولەك هەمو ئەو کارانەی کرد کە پێشتر سەعات و نیوێکی پێدەچوو. تەنانەت فریای ئەوەش کەوت پیانۆ لێبدات. بەیانییەکی زۆر خۆش بو. منداڵەکانی دیکەش هەمان شتیان کرد. دواتر پاش ئەوەی کە لە ماڵ چونە دەرەوە، ژنەکەم وتی: "وا هەست دەکەم لە بەهەشتدام. بەڵام ئایا ئەمە بەردەوام دەبێت؟" ئێستا ئەوە ساڵێکە ناوان، هەرچەندە ئێستا هەمان جۆش و خرۆشی یەکەمین بەیانییان نییە، بەڵام لەکاتی دیاریکراودا هەڵدەسن و جاروبارێکی زۆر کەم نەبێت، خۆیان بە تەنیا هەمو ئیشەکانیان دەکەن. هەر کاتێکیش درەنگ بێداربینەوە، رۆژی دوایی بۆ ماوەی چەند شەوێك دەبێت زوتر بچنە ناو جێگاوە. ئێمە ئەوەشمان بۆ دەرکەوت کە بۆ هەڵسەنگاندنی کارەکان و نوێکردنەوەی پابەندبونمان باشتروایە چەند مانگ جارێك کۆببینەوە. بەراستی مەسەلەیەکی جوان بو کە منداڵەکانمان بینی هەستی ئەوەیان تێدا بەرجەستە بو کە "بەڵێ دەتوانم ئەو کارە بکەم، من خاوەنی هێزم، من بەرپرسیارم" ئەو هەستەی کە پێشتر دەمانویست بیریان نەخەینەوە. ئەم ئەزمونە واتایەکی کاریگەر بو، ژیانی بەیانیانی خێزانەکەمانی گۆڕی.

لەم نمونەیەدا دەبینین کە دایك و باوکەکە سەرەتا ویستویانە لەو گۆشەنیگایەوە هەڵسوکەوت بکەن کە دەڵێت (منداڵەکان پێویستە بگۆڕێن)، بەڵام وردە وردە بۆیان دەرکەوتووە خۆیان پێویستیان بە گۆڕانە. ئەوان پێشتر وا بیریان کردۆتەوە کە منداڵ

پێویستی بە بیرخستنەوەیە، پێویستە بە دەوریاندا بخولێیتەوە و چاودێرییان بکەیت و لە وەخت و ناوەختدا سەریان لێبدەیت. تۆش رەنگە هەر بەم شێوەیە رەفتارت لەگەڵ کەسێکدا کردبێت. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بیرکردنەوەی کارگێری کۆنترۆڵکردنی کلاسیکییە. بەڵام دواتر، دایك و باوکەکە بیریان لە توانا و بەهای منداڵەکانیان کردەوە، بەتایبەت تواناکانیان. دەیانزانی منداڵەکان چەندە بەنرخن لایان و بەبێ هیچ مەرجێك خۆشیان دەویستن، بەڵام هەندێك هەڵسوکەوتی هەڵەی منداڵەکان ئەمانی بە هەڵەدا بردو وایانزانی هەمو شتێکیان هەر وا هەڵەیەو توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکیان نییە. هەروەها کارێکیشیان نەکردبو منداڵەکان هەست بە توانای خۆیان بکەن. باوك و دایکەکە تەنیا ئەو کاتە منداڵەکانیان وا لێکرد هەست بە تواناکانی خۆیان بکەن کە هەندێك پرسیاری سادەیان لێکردن سەبارەت بەوەی ئایا ئارەزومەندن و دەتوانن کارە بنچینەییەکانی پەیوەست بە بێداربون و ئەرکەکانی خۆئامادەکردن بۆ قوتابخانە ئەنجام بدەن، منداڵەکانیش لەبەرئەوەی باوکیان خۆش دەویست، پەیوەندییەکە بەباشی سەری گرت. بەمجۆرە بەڵێنەکان دران و پارێزگاریشیان لێ کراو تواناکان ئازادکران و لێپرسراوێتییەکان گیرانە ئەستۆ و متمانەکە پتەوتر بو، هەروەها ئاشتی و ئارامی و رەحمەتیی دڵ باڵیان بەسەر ماڵەکەدا کێشا. ئەم نمونەیە نمونەیەکی کاریگەر و جوانی تواناسازییە.

هەرچەندە ئەمە کێشەیەکی سادەی خێزانییە بەڵام زۆر کەس روبەڕوی دەبێتەوە. هەندێك جار لە ناوەندەکاندا و تەنانەت لە خێزانیشدا رودەدات کەسەکە بڕوای بە توانای بەرامبەرەکەی هەیە، بەڵام نرخی بۆ دانانێت و بڕوای بە بەهاکانی نییە لەبەرئەوە هیچ هاودەردییەك و پشودرێژییەك و سوربونێکی لەگەڵدا نیشان نادات متمانەشی پێ نییە و قوربانیشی بۆ نادات. وای دەبینێت کە مەسەلەکە ئەوە ناهێنێت. ماوەیەك مەسەلەکە شی دەکاتەوە دەبینێت زۆر دەکەوێت لەسەری. لەڕاستیدا مەسەلەکە بەمجۆرەیە: مرۆڤ ئەگەر نرخی خۆی لەلانەبێت ناتوانێت بەردەوام ئەو هەستە لای بەرامبەرەکەی دروست بکات کە ئەوی لەلا بەنرخە. بەڵام تۆ ئەگەر رۆڵی پێشەنگی باش ببینیت لەرێی پابەندبوون بەو هەڵسوکەوتانەی شایستەی متمانەن و سەروەر رەفتاری مەبدەئین، دەتوانیت پەیوەندییەکانت لێوانلێو بکەیت لە متمانە، تەنانەت بێئەوەی باسی متمانەش بکەیت و دیاریکردنی رێبازیش دەبێتە مایەی دەستەبەربونی رێکوپێکی و سیستم تەنانەت بێئەوەی داوا لە خەڵکەکەش بکەیت. گونجاندنیش

تێڕوانین و تواناسازی پێکەوە بەرجەستە دەکات بۆ ئەوەی رابگەیەنێت. بەڵام تواناسازی بەرهەمی سیانەکەی دیکەیە. ئەنجامێکی سروشتی متمانە بەخۆبونە لەسەر هەردو ئاستی دامەزراوەیی و کەسێتی، بەجۆرێکی وا کە خەڵکەکە بتوانن تواناکانی خۆیان دەستنیشان و ئازاد بکەن. بە واتایەکی دیکە تواناسازی مرۆڤ وا لێدەکات لەخۆ کۆنترۆڵکردن و خۆ رێکخستن و خۆ بەڕێوەبردندا بگاتە ئەوپەڕی. ئەگەر پەیامی کەسەکە و پەیامی دەزگاکە هاوشێوەبون لەسەر ئاستی تیم و پرۆژە و ئەرك و هەروەها جۆری کاری ئەو کەسە بەشێوەیەك بوون کە پێویستییە بنچینەییەکانی بگونجێن لەگەڵ پێویستییە بنچینەییەکانی ئەو دەزگایەدا کە کاری تێدا دەکات، ئەوا هەمو عیشق و وزەکانی ئەو کەسە دەتەقنەوە. بە کورتییەکەی، دەنگی خۆی دەدۆزێتەوە. عیشق ئاگرە. ئەو ئازایەتی و جۆش و خرۆشەیە کە تۆ هەستی پێدەکەیت کاتێك ئیشێك ئەنجام دەدەیت خۆشت دەوێت و هەوڵ بۆ ئامانجێك دەدەیت بڕوات پێیەتی، ئامانجێك کە پێویستییە قوڵەکانت بەدی دەهێنن. رەگە لاتینییەکەی وشەی عیشق (enthusiasm) بە کوردی دەبێتە (ڕۆحی خودا لەناخی تۆدا). دیارە تواناسازییش هەمان کاری عیشق دەکات.

لە دەزگایەکدا کە کارمەندەکان جۆرە کارێك ئەنجام بدەن خۆشیان بوێت و بە شێوازێك جێبەجێی بکەن قوڵترین پێویستییەکانی خۆیان و پێویستییەکانی دەزگاکە دەستەبەر بکات، ئەوا هەمو دەنگەکان تێکەڵی یەکدی دەبن. هەردوو نوسەر (مارکۆس بۆکینگ هام) و (دۆناڵد نۆکلیفتۆی) لە کتێبە بەناوبانگەکەیاندا (ئێستا خاڵە بەهێزەکانی خۆت بدۆزەرەوە) باسی ئەو ئەنجامە دەکەن کە دەزگای گالۆپ بۆی دەرکەوتووە، "دەزگای مەزن تەنیا هەر بەوە رازی نابێت کە لەگەڵ ناکۆکی نێوان کارمەندەکانیدا هەڵبکات بەڵکو سود لەو ناکۆکییانەش دەبینێت" دەزگای گالۆپ، وەك کتێبەکە باسی دەکات، لەئەنجامی پرسیارێك کە ئاراستەی ١٩٨ هەزار کارمەندی کردووە لە ٣٦ کۆمپانیادا کۆمەڵێك زانیاری گرنگی دەست کەوتووە. پرسیارەکە دەڵێت: "ئایا لە کارەکەتدا بواری ئەوەت هەیە رۆژانە ئەو شتانە ئەنجام بدەیت کە تیایاندا باشیت؟" ئەنجامەکانیش پاش شرۆڤە کردن بەم جۆرەن؛ ئەو کارمەندانەی کە لە وەڵامەکەیاندا وتویانە "بەڵێ زۆر وایە" ئەگەری کارکردنیان لەو یەکەی کارکردنانەدا بووە کە وازهێنان تیایدا بەرێژەی (٥٠٪) کەمترە لەوەی خەڵکی دیکە لەو جۆرە یەکەی

کارکردنانەدا بن. هەروەها ئەگەری کارکردنیان لە یەکەی کارکردنی فرە بەرهەمدا بە ڕێژەی ٣٨٪ زیاتربووە لە ئەگەری کارکردنی خەڵکی دیکە لە هەمان یەکەدا. هەروەها ئەگەری کارکردنیان لەو جۆرە یەکەی کارکردنانەدا کە لە هەموان زیاتر مایەی ڕەزامەندی کڕیارەکانن، بە ڕێژەی ٤٤٪ زیاترە لە ئەگەری کارکردنی کارمەندانی دیکە. بە تێپەڕبونی کاتیش دەرکەوت بوونی ئەو جۆرە کارمەندانە لەو یەکەی کارانەدا دەبێتە هۆی زیادبونی بەرهەمی کۆمپانیاکە و مانەوەی کارمەندەکان لە کۆمپانیاکە و پابەند بونی کڕیاران پێوەی. بیر لە ژیانی تایبەتی خۆت بکەرەوە. حەزت لە کام جۆرە پیشەیەیە؟ چ شتێکت لە ناخەوە خۆش دەوێت و دەتبزوێنێت؟ چی ڕودەدات ئەگەر ئەو کارەی هەتە جۆش و خرۆشت ببزوێنێت. ئیشێك بێت لێپرسراوەکانت بکاتە خزمەتکارت. ئەرکەکەیان بریتی دەبێت لەوەی بە شێوەیەکی سیستماتیکی هاوکاری شەخسیت بکەن لە کارەکەتدا؟

چی ڕودەدات ئەگەر پێکهاتە و سیستمەکان پشتیوانی تۆ بن و سودت پێبگەیەنن و بە شێوەیەکیش داڕێژرابن هاوکاریت بکەن لە دیاریکردن و ئازادکردنی تواناکانتدا؟

چی ڕودەدات ئەگەر هەمو جارێك ستایشی هەوڵەکانت بکەن و خەڵاتت بدرێتێ؟

لەوەش گرنگتر چی ڕودەدات ئەگەر لەناخی خۆتدا زۆر ڕازی و کامەران بیت لەوەی بەشداریی کاریگەرت هەیە لە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی ئامانجێك کە هەست دەکەیت شایستەی ئەوەیە لەناخی دڵتەوە پابەندی بیت؟

## تواناسازی بۆ کرێکارانی زانیاری

ئێمە ئەمڕۆ لەسەردەمی کرێکارانی زانیاریدا دەژین، ئەو سەردەمەی کە سەرمایە هەرە گرنگەکە بریتییە لە هزر لە باڵاترین ئاستیدا. جاران گرێی بەرهەمهێنان وا دابەش دەکرا کە (٨٠٪)ی بۆ کەرەستەی خاو بێت و (٢٠٪)ی بۆ زانیاری. ئەمڕۆ (٧٠٪)ی بۆ زانیارییە و (٣٠٪)ی بۆ کەرەستەی خاوە. ستیوارت کرێتەر لە کتێبەکەیدا بە ناوی (چاخی کارگێڕی) دەڵێت: "لە سەردەمی زانیاریدا، بایەخی یەکەم بۆ کاری ئەقڵە. ئێستا هەمو کەس لەو ڕاستییە تێگەیشتووە کە دامەزراندن و برەو پێدان و پاراستنی کەسانی بەهرەدار مەسەلەیەکی بنەڕەتین لە کێبڕکێدا. پیتەر دراکەر Peter Drucker لە کتێبی (کارگێڕی لە پێناوی ئایندەدا، ئەوەدەکان و دوای ئەوە) نوسیوێتی:

" لە ئێستا بە دواوە، کلیلەکە زانیارییە.جیهان ئیتر بریتی نابێت لەو شوێنەی کە زۆر پێویستی بە وزە و کار و کەرستەی خاو هەیە، بەڵکو بریتی دەبێت لەو شوێنەی کە زۆر پێویستی بە زانیارییە."

گرنگترین مەسەلەی ئەمڕۆ مەسەلەی سەرکردایەتیکردنە. ئابوری ئەم سەردەمە لەسەر کاری زانستی راوەستاوە و کاری زانستییش بە گوزارشتێکی دیکە بریتییە لە خەڵك. بیرت نەچێت کە (٨٠٪)ی ئەو برە پارەیەی دەخرێتە سەر بەرهەم و خزمەتگوزارییەکان هی کاری زانستییە. واتە ئابوری کرێکارانی زانیارییە ئەو سامانەی کە جاران پارەو شمەکەکان دروستیان دەکرد، ئێستا مرۆڤ دروستی دەکات. تەنیا بیر لەوە بکەرەوە کە هەر لە دەزگاکەی خۆتدا لە رێی کرێ و قازانج و کارئاسانییەکانی دیکەوە چەندێك سەرمایەگوزاری کراوە لە کرێکارانی زانیاریدا و چەندیش خەرج کراوە لە دامەزراندن و مەشق پێکردنیاندا. کاری زانیارییە چۆنایەتییەکان هێندە گرنگە بۆ دەزگاکان کە دەتوانێت هەلێکی زێڕینیان بداتێ داهێنان لە نرخدا بکەن. ئەو سەرمایە گوزارییەی لە کرێکارانی زانیاریدا دەکرێت لە هیچ شتێکی دیکەی دەزگاکاندا ناکرێت. لەراستیدا هەموو سەرمایەگوزارییەکانی دیکە لە رێی کرێکارانی زانیارییەوە پێکەوە بەستراون. کرێکارانی زانیاری سەرچاوەی داهێنانن و فۆکەسکردن و بەهای سەرمایەگوزارییەکانی دیکەش بەرزدەکەنەوە و یەکیان دەخەن بۆئەوەی ئامانجەکانی دەزگاکە بەشێوەیەکی چاکتر بێنەدی. بەهای سەرمایەگوزارییەکانی دیکە تەنیا هەر بە سەرمایەی هزری و کۆمەڵایەتی بەرز دەبێتەوە. لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە، زۆر گرنگە وا تەماشای تواناسازی خەڵکی بکرێت (گونجاندنی دەنگەکان) کە بەرهەمی پێشەنگی باش، گونجاندن و دیاریکردنی رێبازە (رێنحرکردنە)، ئەگینا تواناسازییەکە هەر دەبێتە قسەو لە کردەوەدا جێبەجێ ناکرێت. واتە قسە و کردار هاوشێوەی یەکدی نابن، ئەو کاتە ئیتر دەزگاکە نە تێڕوانینی هاوبەشی تێدا دەبێت، نە دیسپلین و نە عیشق. دیارە تواناسازی مەسەلەیەکی نوێ نییە. لەراستیدا تواناسازی لە ساڵانی نەوەدەکاندا بوبووە گەرمترین باس و خواستی بواری کارگێڕیی، بەڵام ئەم بزوتنەوەی تواناسازییە رەخنە و تورەبونێکی زۆری بەرکەوت، هەم لە لایەن بەرێوەبەرەکانەوە و هەم لە لایەن کارمەندانی ئاستە جیاجیاکانیشەوە. بۆچی؟

لەبەرئەوەی تواناسازی بەرهەمی هەرسێ رۆڵەکەی دیکەیە نەك رەگی ئەوان. ئێمە لە چەند دام و دەزگایەکدا پرسیارمان لە (٣٥٠٠) بەرێوەبەر و کادیری هونەریی کرد.

پرسیارەکە دەڵێت: چی ڕێگرە لەبەردەم تواناسازیدا؟ (بڕوانە شێوەی (١٣ - ٢). تێبینی بکە بزانە مەسەلەی شایستەی متمانەبوون چ لەسەر ئاستی تاکە کەس و چ لەسەر ئاستی دەزگاکە چەند گرنگە بەلایانەوە (ڕەوشت و لێهاتویی).




شێوەی ١٣ — ٢

ئێستاش پاش ئەوەی لە هەر چوار ڕۆڵەکەی سەرکردایەتیکردن تێگەیشتین و زانیمان چ کاریگەرییەکیان هەیە لەسەر مرۆڤی کامڵ دەتوانین تێبگەین بۆچی خەڵك هەست بە شکست و نائومێدی دەکات ئەگەر هەوڵی تواناسازییان بۆ بدرێت، بێ ئەوەی یەکەمجار کاربکرێت بۆ دروستکردنی بناغەیەکی پتەو لە گونجاندن و دیاریکردنی ڕێباز و نمونەسازیی.

## گێژاوی بەڕێوەبەر – ئایا واز لە کۆنترۆڵکردن دەهێنم؟

چەند ساڵێك لەمەوبەر چاوم کەوت بە بەڕێوەبەری جێبەجێکاری کۆمپانیایەك کە تازە خەڵاتی (مالکۆلم بالدریج)ی وەرگرتبو هەقی ئەوەی کە بەرهەمەکەی زۆر باشە.

لێم پرسی وتم: چی وای کرد تۆ وەك بەڕێوەبەرێك ئەم ئاستە باشە بۆ دەزگاکەت پەدی بهێنیت؟

ئەختێك بیری کردەوە، ئینجا بەدەم زەردەخەنەوە وتی: "وازهێنان لە کۆنترۆڵکردن".

ئەگەر تواناسازی لەسەر بنەما پتەوەکانی پێشەنگیی باش (نمونەسازیی) و بپاریکردنی ئاڕاستەو گونجاندن نەبێت، بە دڵنیاییەوە تواناسازی نییە و دەبێتە داسەپاندنی بەرژەوەندییە کەسێتییەکان. بۆیەکلاییکردنەوەی دوودڵیی لە نێوان کۆنترۆڵکردن و ترسی ئەوەی دەسەڵاتت نەمێنێت باشترین کار گەڕانەوەیە بۆ چوار پاساکەی سەرکردایەتیکردن. بە دابینبونی بارودۆخ و مەرجەکانی تواناسازی بەشێوەیەکی راستەقینە، مرۆڤ کۆنترۆڵی لەدەست ناچێت، بەڵکو جۆری کۆنترۆڵەکە دەگۆڕێت بۆ خۆکۆنترۆڵکردن. خۆکۆنترۆڵکردن مانای ئەوە نییە کە بە بیانوی تواناسازییەوە خەڵکەکە بەرەڵڵا بکەیت و هیچ ئاگایەکت لێیان نەمێنێت، بەڵکو دەستەبەرکردنی تێگەیشتنێکی هاوبەشە لە ئامانجی کارەکە و هەروەها ئەو رێنماییانەیە کە پێشتر لەسەری رێك کەوتون و ئەو پێکهاتە و سیستەمانەن کە پشتیوانیی لە ئامانجەکە دەکەن. بە کورتییەکەی خۆکۆنترۆڵکردن ئەو کاتەیە کە هەمو کەسێك لە کارە کامڵەکەدا شوێنی خۆی وەکو کەسێکی کامڵ وەردەگرێت. ئەو کەسانەی کە شارەزاییان کەمە پێویستە چاودێریی و مەشقی گونجاویان بۆ دابین بکرێت تا دەگەنە ئەو ئاستەی کە شایستەی متمانەپێکردن بن بە پێبەخشینی ئازادییەکی زۆر. بوونی تۆمارێکی تایبەت بۆ کاری ناپاب متمانەی زیاتر دەبەخشێت بە کارمەندەکەو سەربەخۆی دەکات لە هەڵبژاردنی ئەو رێگەیەی کە بە گونجاوی دەزانێت بۆ جێبەجێکردنی کارەکەی. بەمجۆرە دەبینین خەڵکەکە تۆ بە بەرپرسیار دەزانن بەرامبەر ئەنجامەکان و لە چوارچێوەی رێنماییەکانیشدا ئازادییان دەبێت ئەنجامەکان بە شێوەیەك بهێننەدی کە بەهرە تایبەتەکانیان کاراتر بکات. من ئەمە ناو دەنێم سەربەخۆیی ئاڕاستەکراو، کە رۆڵی بەڕێوەبەرەکە لە کۆنترۆڵکەرەوە دەگۆڕێت بۆ توانا بەخش. ئەو توانا بەخشەی کە سەرچاوەی هاوکاری و پشتگیرییەو پەیامی کارەکە بە هاوبەشی لەگەڵ کارمەندەکاندا دادەنێت و کۆسپ و تەگەرەکانی بەردەمیان لادەدات. ئەمە گۆڕینێکی راستەقینەیە لە شێوازی بەڕێوەبردندا. ئێمە کاتێك باسی ئەو بەڕێوەبەرەمان کرد کە رۆڵی بزوێنەری روکاری وەرچەرخێن دەگێڕێت و پابەندی ئیرۆانین و دیسپلین و عیشق و ویژدانە، لەڕاستیدا باسی تواناسازیمان دەکرد. ئێستاش لە

ساتێکی گشتیتردا چاوێك دەگێڕین بەو ڕێگەیەدا کە یارمەتیمان دەدات فەلسەفەیەکی دامەزراوەیی و فەرمی بۆ تواناسازیی بخولقێنین. بێگومان هەموو کەس پێی خۆشە بگاتە ئەو بارودۆخە نمونەییەی کە تواناسازییە کەسێتی و تواناسازییە دامەزراوەییەکە هەردووکیان بێنەدی بۆئەوەی کارمەندەکە ناچارنەبێت پێچەوانەی ڕەوتی ڕوبارەکە دژی ئەو هێزانەی ناو دەزگاکە مەلە بکات کە تواناکانی خەلکی پەك دەخەن.

## کەرەستەی تواناسازی

## پرۆسەی ڕێکەوتنی براوە - براوە

بیر لە کۆی گشتی پرۆسەی براوە – براوە بکەرەوە وەك ڕێکەوتنێك لەنێوان دوو خۆبەخشدا کە بەشداری دەکەن لە پەیامی دەزگاکەدا؛ یەکێکیان خودی دەزگاکەیەو ئەوی دیکەش خەلکانی پەیوەندیدارن یاخود تیمەکەیە یاخود خەلکەکەی ناوێتی.

ماکس دی پری (Max De Pree) لە کتێبە جوانەکەیدا (سەرکردایەتیکردن هونەرە) ئاوا وەسفی ڕۆحی ئەو خۆبەخشانە دەکات کە پێکەوە کاردەکەن:

" باشترین خەلکی ناو دەزگاکان ئەو کەسانەن کە دەیانتوانی لە شوێنێکی دیکە کارێکی باشتر بدۆزنەوە، بەلام ئەم دەزگایەیان هەلبژاردووە هەرچەندە موچەو پۆستەکەشی کەمترە لە شوێنەکانی دیکە. مرۆڤی خۆبەخش پێویستی بە گرێبەست نیەە، پێویستی بە پابەندبونی ڕەوشتی هەیە. ئەو پەیوەندییانەی کە سەرچاوەکەیان پابەندبونی ڕەوشتییە دەبنە مایەی ئازادی، نەك ئیفلیجی. ئەم جۆرە پەیوەندیە لەسەر پابەندبونی هاوبەش دروست بووە، پابەندبوون بە بیرۆکەو بابەت و بەها و ئامانج و تێڕوانینی بەڕێوەبردنی کارەکە. لە پەیوەندی ئاوادا واتاکانی خۆشەویستی و گەرم و گوڕی و ڕۆحی مرۆڤەکان گرنگن. هەر پەیوەندییەك لەسەر پابەندبونی ڕەوشتی بیناگرابێت پێویستییە قوڵەکانی مرۆڤ تێر دەکات و کارەکەش دەکاتە کارێکی مایەی ڕەزامەندی و پڕ لە واتا. ڕێکەوتن بە شێوازی براوە – براوە خەسلەتێکی وەزیفی فەرمی نیەە و هەروەها گرێبەستێکی یاسایش نیەە؛ بەلکو گرێبەستێکی دەروونی، کۆمەلایەتی گراوەیە کە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پێشبینییەکان دەستنیشان دەکات. ئەم ڕێکەوتنە سەرەتا لەناو دڵ و مێشکدا دەنوسرێت پاشان دەخرێتە سەر کاغەز، ئەویش بە پاندانی مەرەکەب نا، بەلکو بە قەلەمی ڕەصاص بۆئەوەی بە ئاسانی بیکوژێنێتەوە

ئەگەر هەردو لایەنەکە وایان بەباشزانی. کاتێک کە بارودۆخەکە دەگۆڕێت، دەکرێت گفتوگۆ لەسەر تەواوی ڕێکەوتنەکە بکرێتەوە. گرنگ نییە تۆ زاراوەی براوە – براوە بەکاردەهێنیت یاخود پێی دەڵێیت ئەو ڕێکەوتنەی کە سود بە هەموان دەگەیەنێت. گرنگ بیرۆکەکەیە. بیرۆکەکەش بریتییە لە بوونی تێگەیشتن و پابەندبونێکی هاوبەش دەرهەق بە مەسەلە هەرە گرنگە هاوبەشەکان. ڕێکەوتنی براوە - براوە بە شێوەیەکی گشتی زیاتر بواری داهێنان و خۆ گونجاندن و نواندنی نەرم و نیانی تێدایە وەك لە ڕێکەوتنە فەرمییەکان کە بەشێوەیەکی سەرەکی جەخت لەسەر هەنگاوەکان و ڕێگاکان دەکەنەوە. لە ڕێکەوتنی براوەدا ئەوەی گرنگە بارودۆخی ئەندامانی تیمەکە و باروودۆخی سەرکردەکان و ئاستی پێگەیشتن و توانا و پاکییان و مەسەلەکانی دیکەی پەیوەست بە دەوروبەرەوەیە؛ وەك بوونی پێکهاتە و سیستەم و ڕێ و شوێنی گونجاو. هەر کاتێک ڕێکەوتنێکی لەو جۆرە بێتەدی، هێندە باش وەڵامی روون و ئاشکرای ئەو پرسیارە دەدرێتەوە کە ئایا مەسەلە گرنگەکانی من/ تۆ کامانەن. بەمەش بەرپرسیارێتییەکان دیاری دەکرێن و بە ئاشکراش گوزارشت لە پێشبینییەکانی یەکدی دەکرێت و لەسەر تابلۆی ئەنجامدانی هاوسەنگ بەرپرسیارێتییەکان بەرامبەر بەو پێشبینییانە دیاری دەکرێن و خەڵکەکەش ئازاد دەکرێن لەوەی چ ڕێگایەك دەگرنە بەر لە چوارچێوەی ڕێنماییەکاندا، بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان. واتا کورت و کرمانجی، ئەو خەڵکە دوای تواناسازییەکە خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوە دەبەن. لە بەشی چواردەهەمی ئەم کتێبەدا و لەژێر ناونیشانی (خاڵە دڵڕفێنەکە)دا زیاتر لەسەر ئەوە دەڕۆین کە چۆن بتوانین ئاستی وەرگرتنی بەرپرسیارێتی بەرجەستە بکەین.

## تواناسازی براوە – براوە: ڕۆیشتن لە سەردەمی پیشەسازییەوە بۆ سەردەمی کرێکارانی زانیاری

ئێستا بیهێنەرە بەرچاوی خۆت بزانە چی ڕوودەدات ئەگەر ئەو هەموو شتانەمان بیربچێتەوە کە دەربارەی مرۆڤی کامڵ فێریان بوین؟

چی ڕوودەدات ئەگەر ئەو کلپەیە نەبینین کە لەناخی دەزگاکان و تاکەکاندا دادەگیرسێن کاتێک دەنگی ناخی خۆیان دەدۆزنەوە و ئیلهام بە خەڵکی دیکەش دەبەخشن کە ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە؟

چی رودەدات ئەگەر هەر لەناو نەریتەکانی سەردەمی پیشەسازی کلاسیکیدا ماینەوە؟

ئایا درکت پێ کردووە چەند زەحمەتە لەرێی ئەم شێوازە کلاسیکییەی بەرێوەبەری بە زەبروزەنگەوە بگەیتە رێکەوتنی براوە – براوە؟

چەندێك هەوڵ بدەیت ناتوانیت بگەیتە بەرهەمی تواناسازیی. تواناسازیی سەرکەوتوو ئەو کاتە دێتەدی کە لە چوارچێوەی رێکەوتنی براوە – براوەدا پابەندی کارکردن بیت لەگەڵ تیمەکەدا. لەدەزگادا بەدیهێنانی سود بۆ هەموان واتا یەکانگیربونێکی ئاشکرا لەنێوان چوار پێویستییەکەی دەزگادا (تەندروستی دارایی، گەشەکردن و پێشکەوتن، پەیوەندی هاوکارانەی خوڵقێنەر لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکاندا، واتا بەشداری) و چوار پێویستییەکەی ئەوانەی کاری تێدا دەکەن (جەستەیی – ئابوری، ئەقڵی- ئەش و نما و گەشەکردن، کۆمەڵایەتی سۆزداری – پەیوەندییەکان، رۆحی – واتا/ و بەشداری). ئەگەر یەکێك رۆحی رێکەوتنەکەی پێشێل کرد و سەرباری هەمو هەوڵە دڵسۆزەکانیش بۆ نەهێشتنی ناکۆکیەکان ئەو هەر بەردەوام بو لەسەر ئەو پێشێلکارییە، ئەو کاتە باشتر وایە رێککەوتن نەکەین (بگەینە نارێکەوتن). واتا تۆ لەگەڵ لایەنەکەی دیکەدا رێك کەوتون لەسەر ئەوەی کە رێك نەکەون. ئەمەش بواری پێشکەشکردنی مەرج و نیشاندانی دیکە دەرەخسێنێت. نمونەیەکی زۆر سەرنجراکێشی ئەو نارێکەوتنە لەناو هێزە چەکدارەکاندا هەیە، پێی دەوترێت رەتکردنەوەی کەللەرەقانە. من ئەم پرنسیپە لە ئەفسەرەکانی هێزی دەریاییەوە فێربوم. کورتییەکەشی ئەوەیە کە ئەگەر تۆ هەڵەیەکی ترسناکت بینی و زانیت ئەو هەڵەیە ئەنجامی زۆر خراپی دەبێت بۆ سەر ئەرك و بەهاکانی دەزگاکەت، ئەوا پێویستە لە هەر پلە و پۆستێکدا بیت، بەرێزەوە نارەزایی خۆت دەربېرێت. پێویستە بە دەنگی بەرز نارەزایی خۆت لەو بڕیارە دەربېریت کە بە هەڵەی دەزانیت. ئەم شێوازە شتێکە لەناخەوە هەڵدەقوڵێت. پێویستە رێگە بە دەنگ و رووناکییەکەی ناخی خۆت بدەیت ئەوان رەفتارەکانت دیاری بکەن، نەك ئەوەی بکەویتە ژێر گوشاری هاورێکانت و لە رویاندا دابمێنیت. زۆر بە گرنگی دەزانم ئەوانەی کە خاوەنی پۆستی باڵان هانی ئەم پرنسیپە بدەن، پرنسیپی رەتکردنەوەی کەللەرەقانە، چونکە مافی ئەوە دەدات بە مرۆڤ کە نارەزایی دەربېرێت و بە رەش بڵێ رەش و بە سپی بڵێ سپی.

## تواناسازی و هەڵسەنگاندن

ئەگەر بە قووڵیی بیر لە مەسەلەکە بکەیتەوە و بڵێیت باشترین کەس کێیە بۆ هەڵسەنگاندنی من و چۆنێتی ئەنجامدانی ئەرکەکانم؟ خۆتیت. خۆت لە هەمو کەس باشتریت بۆ هەڵسەنگاندنی خۆت. دیارە هەتا ئێستاش لە زۆربەی دام و دەزگاکاندا هەڵسەنگاندنی کلاسیکی شتێکی باوە. لە هەڵسەنگاندنی کلاسیکیدا بەڕێوەبەرەکە چاوپێکەوتن لەگەڵ کارمەندەکەدا ئەنجام دەدات و شێوازی (ساندویچ) بەکاردەهێنێت. سەرەتا چەند قسەیەکی خۆش و ستایش، ئینجا خاڵە نەرێنییەکان، دواتریش قسەکانی بە ستایشکردن کۆتایی دێنێت. بەڵام کاتێك کە دەزگاکە کەلتوری متمانەی بەرزی تێدا بڵاوە و پڕە لەو سیستمانەی کە یارمەتی مرۆڤ دەدەن و کاتێك کە هەمو خەڵکەکە بەیەك رۆح مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، ئەوا خەڵکەکە زیاتر ئامادەیی ئەوەیان دەبێت خۆیان هەڵسەنگاندن بۆ خۆیان بکەن، بەتایبەت ئەگەر دەستیان بگات بە زانیارییەکانی فیدباکیی (٣٦٠) پلەیی. باشترین بەڵگەی ئەم قسەیە زانیارییەکانی فۆرمی حەوت خووەکە نیشانی دەدەن [بڕوانە شێوەی (١٣ - ٤) کە زیاتر لە نیو ملیۆن کەس بەشدارییان تێدا کردووە لە فیدباکی (٣٦٠) پلەییدا].




شێوەی ١٣ — ٤

وەك دەیبینیت لە زوربەی هەرە زۆری حاڵەتەکاندا خۆهەڵسەنگاندن دژوارترە لە هەڵسەنگاندنی کەسێکی دیکە. بەڕێوەبەر هەمیشە کەمترین زانیاری لایە لەسەر کارمەندەکان و زۆر لێیان دوورن چونکە ژێر دەستەکان بەدڵی ئەوان قسەدەکەن و ئەو قسانەیان بۆ دەکەن کە حەزیان لێیەتی و بێ ئاگا دەبن لە دۆخە راستەقینەکە و نازانن چی دەگوزەرێت. لە پلەبەندی زانیاریدا، ژێردەستەکان لە بەڕێوەبەرەکان زانیاری زیاتریان لایە و لەوانیش زیاتر هاوناستەکانیان زانیاری زیاتریان لایە. وەك لە وەرزی شەشەمدا باسمان کرد، کارمەند خۆی هەڵسەنگاندن بۆ خۆی دەکات و پاشان بەڕێوەبەرەکە بۆی زیاد دەکات یان لێی کەم دەکاتەوە.

کارێکی زۆر نەگونجاوە کە پاش ئەو هەموو تواناسازی و ئەو هەموو ئازادی پێبەخشینە لە هەڵبژاردنی ئامانجە هەرە گرنگەکاندا ئینجا بێین لەپڕ سەرۆکێك قوت بکەینەوە رۆڵی قازی و هەڵسەنگێنەر ببینێت. ئەوەی کە پێی دەوترێت سەرۆکی گەورە پێویستە سەرکردە بێ‌فیزە خزمەتکارەکە بێت کە لەگەڵ خەڵکەکەدا بڕوات و ئەو پرسیارانە بکات کە لەشێوەی (١٣ - ٥)دا نیشان دراون.

یەکەم، "ئیش و کار چۆن دەڕوات؟"

دیارە کرێکار زۆر لە هەر سەرۆکێك چاکتر دەزانێت ئیش و کار چۆن دەڕوات، بەتایبەت ئەگەر سیستمەکانی فیدباك بەباشی دامەزرابن، بەو فیدباکانەشەوە کە لە سەرۆك و لە هەمو خەڵکە پەیوەندیدارەکەوە دەردەچن و کاری ئەو کرێکارە دەورو تەنسیری هەیە لە سەریان. بەمجۆرە وەڵامی پرسیاری "ئیش و کار چۆن دەڕوات"لەلایەن خودی کەسەکەوە دەدرێتەوە بەپێی بۆردی ئەنجامدانی هاوسەنگ کە لەسەری رێك کەوتون و هەروەها بەپێی زانیارییەکانی لایەنە پەیوەندیدارەکان کە دەکەونە مەودای (٣٦٠) پلەکەوە.

پرسیاری دووەم "چی فێردەبیت؟"

کەسەکە رەنگە ئاگاداری ئەو بابەتانە بێت کە پەیوەندییان بە کارەکەی ئەمەوە هەیە، رەنگە ئاگاداریشیان نەبێت. بەڵام ئامانجی پرسیارەکە ئەوەیە کەسەکە هەست بە لێپرسراوێتی بکات.

پرسیاری سێیەم "ئامانجەکانت چین؟" یاخود "دەتەوێت بگەیتە چی؟"

پرسیارێکە پەیوەندی نێوان تێڕوانین و واقیع دیاری دەکات و بەشێوەیەکی

سروشتییش دەمانگەیەنێتە پرسیاری چوارەم، "چۆن یارمەتیت بدەم؟" ئەم پرسیارە زۆر بەئاشکرا پێت دەڵێت "من یارمەتیدەری تۆم و من توانات پێدەبەخشم کارەکان بکەیت. من خزمەتکاری تۆم". هەروەها رەنگە ئەو سەرکردە خزمەتکارە پەنا ببات بۆ ئەزموون و زانیارییەکانی خۆی بۆئەوەی یارمەتیت بدات ئامانجەکانت دیاری بکەیت. کلیلی ئەم جۆرە پەیوەندییە لە راستگۆییدایە. لەوەدایە کە شێوازی تێلا هندییەکەی قسەکردن بەکاربهێنیت. لەم پەیوەندییەدا گەمە و فروفێڵی سیاسی ناخوات. پەیوەندییەکان بۆ خۆپاراستن و بەرگریلەخۆکردن نین. نە ریاکاری هەیە و نە بۆ ئەوەشە بە دڵی بەرامبەرەکەت قسەبکەیت. دوا پرسیاریش کە دەڵێت "رات چییە لەسەر من وەك یاریدەدەرێکت؟" لەناوەرۆکدا روونکردنەوەی بەرپرسیارێتی هاوبەشە (بەرپرسیارێتی بەرامبەر یەکتری) بۆ خەڵکەکە بەشێوەیەکی کراوە و لەسەر بنەمای رێزو خۆشەویستی.

> **سەرکردەی خزمەتکار**
>
> (بەرپرسیارێتی بەرامبەر یەکتری)
>
> (١) ئیش و کار چۆن دەڕوات؟ (بۆردی ئەنجامدان، زانیاری)
>
> (٢) چی فێردەبیت؟
>
> (٣) ئامانجەکانت چین؟
>
> (٤) چۆن یارمەتیت بدەم؟
>
> (٥) رات چییە لەسەر من وەك یاریدەدەرێکت؟

شێوەی (١٣ - ٥)

هەندێك جار روبەڕوبونەوەی هەقیقەت کارێکی زەحمەتە، بەتایبەت کاتێك لەخەڵکییەوە دەیبیستین. بەڵام کاتێك خەڵکەکە وەکو دارو بەردی بێگیان تەماشا بکەین و بەشایستەی ئەوەیان نەزانین بڕیار بدەن، لە بەهایان کەم دەکەینەوە و بریندارییان دەکەین. ئەگەر بەبیانوی ئەوەی کە پیاوی چاکین خەڵکی بپارێزین ئەوا پرۆسەی پشتبەستن بە یەکتری دووبارە دەکەینەوە و ئەو کودەتا بێدەنگە

دەستپێدەکەین کە ڕێگەی دەستپێشخەری دەگرێت (چاوەڕێ بکە با خۆیان پێت بڵێن). ئەگەر لەناو تیمەکەماندا گیانی سەرکردەی خزمەتکار بڵاوبۆوە و ئەو گیانە لە پەیوەندی نێوان کارمەندان و بەڕێوەبەرەکەدا دەرکەوت، ئەوا سێیەمین شێوەی متمانە کە لە وانەی نۆیەمدا باسکرا بە تەواوی پەرەدەسێنێت. دیسانەوە دووپاتی دەکەمەوە، گرنگترین خاڵ لەم مەسەلەیەدا متمانەیە، ئەو متمانەیەی کە کەسێك یاخود تیمێك بەوپەڕی هۆشیارییەوە دەیبەخشێتە کەسێك. کە تۆ متمانەت بە من کرد، مانای وایە بڕوات پێمە کە دەتوانم شتێك بخەمەسەر بەهاکان. تۆ متمانە بە من دەبەخشیت و منیش ئەو متمانەیەت پێدەبەخشمەوە. وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، متمانە (trust) لە زمانی ئینگلیزیدا هەم کردارە و هەم ناوە، لەبەرئەوە شتێکی هاوبەشە لەنێوان خەڵکیدا و ئاڵوگۆڕی پێدەکرێت. ئەمەیە کرۆکی ئەو ڕێگەیەی کە مرۆڤ دەکات بە سەرکردەی بەڕێوەبەرەکەی خۆی. ئەو مرۆڤەی متمانە بە خەڵکی دەکات خۆیشی شایستەی متمانە پێکردنە. متمانە وەکو کردارێك گرنگییەکەی لەوەدایە کە متمانە پێکەرو متمانە پێکراو هەردوکیان شایستەی متمانە پێکردن بن. لەڕاستیدا چوارەمین ڕۆڵ کە بریتییە لە تواناسازی ئەوەیە چۆن متمانە بکەین بەکردار.

## مەسەلەی خۆڵڕێژەکان
## (گۆڕینی کرێکاری دەستی بۆ کرێکاری زانیاری)

ئەمەی خوارەوە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە دەربارەی مرۆڤی کامڵ لە کارێکی کامڵدا. چیرۆکەکە ئەگەری ئەوە نیشان دەدات کە ڕەنگە ڕوبدات لە ئیشێکدا، کە هەرچەند ئیشێکی شەرافەتمەندانەیە، بەڵام بەسروشتی خۆی کارێکی خزمەتگوزارانەیە و پێویستی بە شارەزایی نییە و کرێکەشی کەمە. بیرۆکەکە بریتییە لەوەی کە ئەگەر ئێمە بتوانین کەسی کامڵی ناو کاری کامڵمان لەئیشێکدا دەست بکەوێت کە بریتی بێت لە بەتاڵکردنەوەی بەرمیلەکانی خۆڵ و لە گسکدانی زەوی و پاککردنەوەی دیوار و کەل و پەل، مانای وایە دەتوانین لە هەمو ئیشێکی دیکەدا ئەو ئەنجامە بەدەست بهێنین.

جارێکیان ڕاهێنەرێکی بواری پێشخستنی کارگێڕی لە خولێکی ڕاهێناندا بۆ کۆمەڵێك چاودێر باسی ئەوەی بۆ دەکردن کە چۆن بتوانن عیشق و جۆش و خرۆش لە ناخی کرێکاراندا بجوڵێنن تا زیاتر و باشتر ئارەزوویان بچێتە سەر کارەکەیان. یەکێك لە

چاودێرەکان کە چاودێری کرێکارانی پاککردنەوە بوو (خۆڵڕێژەکان) دژی ئەم بیرۆکەیە وەستایەوە و وتی؛ ئەمە هەر قسەیە و بە هیچ شێوەیەك قابیلی جێبەجێکردن نییە بەسەر خۆڵڕێژەکاندا، لانی کەم بەسەر ئەو خۆڵڕێژانەی کە ئەم چاودێرییانە چاودێرەکانی دیکەش پشتگیرییان لەقسەکانی ئەم کردو بە زەحمەتیان زانی ئەم بیرۆکەیە بەسەر خۆڵڕێژەکاندا جیبەجێبکرێت، چونکە (بەقسەی ئەوان) زۆربەی خۆڵڕێژەکان خەڵکی نەخوێندەوار و ناڕۆشنبیرن و کرێکاری کاتیین و بۆیە ئەو ئیشە دەکەن چونکە ئیشی دیکەیان دەست ناکەوێت و هەمیشە خەریکی خۆدزینەوە و کات بەفیڕۆدانن و هەندێکیشیان شەوو ڕۆژ سەرخۆشن. ڕاهێنەرەکە هەستی کرد کە ئەو چاودێرە بەڕاستی باوەڕی بە قسەکانی خۆی هەیە و بە مەحاڵی دەزانێت تیۆرییەکەی ئەو لەسەر خۆڵڕێژەکان تاقی بکاتەوە، لەبەرئەوە وازی لە سەرکێشییەکە هێنا و راستەخۆ کەوتە باسی کێشەی خۆڵڕێژەکان. لەسەر تەختەکە سێ وشەی نوسی؛ نەخشە دابنێ، نەخشەکە جێبەجێ بکە، هەڵسەنگاندن ئەنجام بدە. کە ئەم سێ توخمە، توخمە بنەڕەتییەکانی برەوپێدانی هەمو کارێکن. ئینجا داوای لەو چاودێرە و لە چاودێرەکانی دیکە کرد لەبەر ڕۆشنایی ئەو سێ وشەیە ئەرك و چالاکی کرێکارەکان لە لیستێکدا دیاری بکەن.

هەندێك لایەنەکانی (پلاندانان) لەو کارەدا بریتی بوون لە؛ دانانی خشتەیەك بۆ پاککردنەوە و ئیدامە، هەڵبژاردن و کڕینی شتومەکی پاککردنەوە و پۆلیشکردن، دیاری کردنی شوێنی ئیشی هەر کرێکارێك. لەکاتی گفتوگۆکەدا، چاودێری خۆڵڕێژەکان وتی بە نیازیو کە ئامێرێکی نوێی پاککردنەوە بکڕێت. تێکڕای چالاکییەکانی بواری پلاندانان چاودێرەکە ئەنجامی دەدان.

لەژێر خانەی (نەخشەکە جێبەجێبکە)دا باسی کارە ئاساییەکانی خۆڵڕێژەکان دەکرا، گسکدان و سڕین و کۆکردنەوەی خاشاك و پۆلیشکردن. بەڵام بەشی (هەڵسەنگاندن) چەند چالاکییەکی دەگرتەوە، وەك وردبونەوەی ڕۆتینیی لەپاك و تەمیزی بیناکە، هەڵبژاردنی جۆرە جیاوازەکانی کەرەستەی پاککردنەوە و پۆلیشکردن بەپێی ئەزمون و شارەزایی، چاککردنی خشتەی کارکردن و چاودێریکردنی جێبەجێکردنی خشتەکە. سەرباری ئەمانەش چاودێرەکە دەبوایە پەیوەندی بکات بە فرۆشیارەکانەوە بۆ دیاریکردنی ئەو ئامێرو کەرەسە تازانەی کە دەیەوێت بیانکڕێت.

کاتێك لیستەکانیان ئامادەکرد، ڕاهێنەرەکە لێی پرسین: "خۆلڕێژەکان دەتوانن کام لەم چالاکییانە ئەنجام بدەن؟ بۆ نمونە ئەی چاودێری بەڕێز بۆچی دەبێت پاککەرەوەکە تۆ دیاری بکەیت؟ بۆچی بوار بە خۆلڕێژەکان نادەیت خۆیان ئەو کارە بکەن. پێویستە فرۆشیارەکان ئامێرو کەرەستەکانیان بۆ کرێکارەکان باس بکەن و ڕێگەیان پێبدرێت ئەوان باشترین ئامێر و کەرەستە هەڵبژێرن؟ بۆچی ڕێگە بە کرێکارەکان نادەیت خۆیان بە ویست و ئارەزوی خۆیان ئەو بەشە لەکارەکە هەڵبژێرن کە حەزی لێ دەکەن؟ دیارە مەسەلەکە گفتوگۆیەکی گەرمی لێکەوتەوە. دواتر و لەماوەی پێنج مانگی داهاتودا، چەند جارێك لە کۆبونەوەکاندا باسی کێشەی خۆلڕێژەکان کرا. لەو ماوەیەشدا چاودێرەکە ڕەفتاری خۆی گۆڕی و بەرپرسیارێتی بەخشی بە کرێکارەکان لە هەرسێ بوارەکەی پلانەدانان و جێبەجێکردن و هەڵسەنگاندندا. بەمەش کرێکارەکان وایان لێهات بەدڵ و بەگیان بەشداری لە پرۆسەکەدا بکەن. ئامێری نوێیان تاقیکردەوە و ڕای خۆیان لەسەر کڕینیان دەربڕی و چەندین جۆر پۆلیش و کەرەستەی پاککردنەوەیان تاقیکردەوە و چاودێری چۆنێتی جێبەجێکردنی خشتەکەیان دەستپێکرد و ئاستی سەرکەوتنی کارەکەیان لەناوچە جیاجیاکاندا تاقیکردەوە. بۆ نمونە: شوێنێك لە شوێنەکان هەمو ڕۆژێك پاك دەکرایەوە، بەڵام کە بەچاوی خۆیان شوێنەکەیان بینی، بڕیاردرا تەنیا لە کاتی پێویستدا پاك بکرێتەوە. کرێکارەکان بەشێوازی تایبەتی خۆیان بەرنامەکەیان خستە بواری جێبەجێکردنەوە و گوشاریشیان خستە سەر ئەو هاوکارانەیان کە پابەندی پێوەرەکان نەدەبون. وردە وردە کرێکارەکان بەرپرسیارێتی هەرسێ ئەرکەکەیان گرتە ئەستۆ و بە باشترین شێوە ئەقڵی خۆیان بەکارهێنا. هەرچوار پێویستییە جەستەیی و ڕۆحی و ئەقڵی و سۆزدارییەکانیشیان تێرکران. ئەنجامەکەش بۆ هەمو کەس مایەی سەرسوڕمان بو. هەم جۆری کارەکە رووی لە باشی کردو هەم کێشەکانیشیان کەم بونەوە. کەلتورێکیش لە ناویاندا بڵاوبۆوە کە هانی دەستپێشخەریی و هاوکاریی و کۆششی دەدا. کرێکارەکانیش ڕۆژ بەڕۆژ دڵخۆشتر دەبون بە کارەکەیان. بەکورتییەکەی کابرای چاودێر بو بە چاودێری کۆمەڵێك کرێکاری زۆر چالاك، بەچی؟ تەنیا بەوەی کە توانای بەخشی بە کەسێکی تەواو کارێکی تەواو ئەنجام بدات. واتە سەربەخۆیی ئاراستە کرد. نیتر کرێکارەکان پێویستیان بەوە نەما یەکێك چاودێرییان بکات و بەڕێوەیان ببات؛ چونکە گەیشتبونە ئاستێك خۆیان چاودێری خۆیان بکەن و

کاروبارەکانیان بەشێوەیەك بەڕێوە ببەن کە بگونجێت لەگەڵ پێوەرە تازەکانی خۆیانـدا. لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە چاودێرەکانی دیکەش نیازیان وایە هەمان پرنسیپ لە بـواری کارەکانی خۆیاندا جێبەجێبکەن پاش ئەوەی کە ئەنجامی کاری خۆڵڕێژەکانیان بینی.

## خزمەت و واتا

ئەگـەر بمانـەوێت لەسـەر نمونـەی مرۆڤـی کـامڵ بیرۆکـەی (نەخشـەکە بکێشـە، جێبەجێی بکە، هەڵیبسەنگێنە) جێبەجێبکەین ئەو نمونەیـەمان دەسـت دەکـەوێت کـە لە شێوەی (١٣ - ٦)دایە.

توخمی چوارەم (خزمەت بکە) بۆیە لە ناوەڕاستەکەیدا زیادکراوە تا بتوانێت گوزارشـت بکات لەوەی کە رۆح چەند پێویستی هەیە بە بەشداریکردن و بەوەی کە مانایەکی هـەبێت. چیرۆکەکەی پێشو سـەلماندی بۆمـان کـە تەنانـەت کرێکارانی پاککردنـەوەش (خۆڵڕێـژەکان) لەو مەسەلەیەدا هەستیان کرد کارەکەیان واتایەکی مەزنی تێدایە.




شێوەی ١٣- ٦

خۆڵڕێژەکان وایان لێهات شانازی بەوەوە بکەن کرێکاری پاککردنەوەن و ئـەمـەش لـە سەرتاسەری دەزگاکەدا ئاستی کارەکەی بەرزکردەوە. دەنگی تایبـەتی خۆیـان دۆزییـەوە.

جارێکی دیکە سەرنج بدە لەو تیرەی کە لە قەراغی دەرەوەی وێنەکەدایە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەمە بریتییە لە بازنەیەك و پرۆسەکەش پرۆسەیەکی بەردەوامە. شیاوی باسە هەموو جارێك پاش تەواوبونی پرۆسەی هەڵسەنگاندنەکە مرۆڤ نەخشەی تازەتر فێردەبێت بەسود وەرگرتن لە ئەنجامەکانی ئەو هەڵسەنگاندنە. بەم شێوەیە بازنەکە جار لەدوای جار خۆی دووپات دەکاتەوە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە؛ "باشە ئەگەر تواناسازییەکە خەڵك بگەیەنێتە ئەو ئاستە، کەواتە ئیتر چ پێویستییەکمان بە چاودێرە؟" وەڵامەکە ئاسانە کاری چاودێر ئەوەیە بارودۆخی تواناسازییەکە دەستەبەر بکات ئینجا لەسەر ڕێگەی خەڵك لابچێت و کۆسپ و تەگەرەیان لێ دوربخاتەوەو ئەگەر داوایان لێکرد یارمەتییان بدات. ئەمەیە سەرکردایەتیکردن بەگیانی سەرکردەی خزمەتکار. پێویستە ئەوەش بزانین کە لە هیچ کارێکدا مەبەستمان تێرکردنی فیز و خۆبەگەورەزانینی خۆمان نییە، بەڵکو جێبەجێکردنی مەسەلەکانە

| |
|---|
| ئەوانەی کە لێکۆڵینەوەی زیرەکیی جێبەجێکارییان لەسەر کراوە، تەنیا (٤٥٪)یان دەڵێن: وا هەست دەکەین بەشداریکردنەکانمان لەکاردا دداتی پێدا دەنرێت و ڕێزی لێ دەگیرێت. |

## چاوخشاندنەوە بە بڕیارەکاندا

چیرۆکی خۆلڕێژەکان ئەو ڕاستییەمان بیردەخاتەوە کە چۆنێتی ڕێزگرتنی چوار لایەنەکەی سروشتی مرۆڤ و بەشداریپێکردنی ئەو چوار ڕەهەندە لەکارەکەدا ڕاستەخۆ کاردەکاتە سەر ئەو ڕێگایەی کە ئەو کەسە هەڵیدەبژێرێت بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکە. هەروەها لەستونی چەپی شێوەکەی خوارەوەدا (١٣- ٧) کە هەر هەڵبژاردەیەك کاردانەوەیە بۆ پاڵنەرێکی قوڵتر، پاڵنەرەکانیش لە تورەییەوە دەگرێتەوە تاکو ترس و خەڵاتکردن و ئەرك و خۆشەویستی و واتا. ئەرك و خۆشەویستی و واتا ئەو سەرچاوە هەرە بەرزانەن کە پاڵنەر لەناخی مرۆڤدا دروست دەکەن، هەمیشەش دەبنە هۆی دەستەبەرکردنی مەزنترین و بەردەوامترین دەستکەوت. سەرکردە بەرزترین پاڵنەرەکانی مرۆڤ دەجوڵێنێت. بەڵام بەڕێوەبردنی مرۆڤ بەو چاوەوە کە دارو بەردی

بێگیانن وایان لێ دەکات دابەزنە نزمترین ئاستی غەریزەکانیان. بەداخەوە ئەم شێوە بەڕێوەبردنە هێشتا لەم ڕۆژگارەشدا شێوەیەکی باو و بەربڵاوە.




شێوەی ١٣ - ٧

جیرۆکی خۆڵڕێژەکان خاڵێکی دیکە ڕووندەکاتەوە کە زۆر گرنگە:
ئەوەی کە بڕیار دەدات کەسەکە کرێکاری زانیارییە یاخود نا، ئەسروشتی کارەکەیە و ئەبوارە ئابورییەکەشە، بەڵکو شێوازی بەڕێوەبردن و بیروباوەڕە سەرکردایەتییەکانە. ئەگەر بەو چاوەوە تەماشای خۆڵڕێژ ئەکرێت کە کرێکاری زانیارییە، واتە ئەگەر بەو چاوەوە تەماشای ئەکرێت کە لەبواری کارەکەی خۆیدا پسپۆڕە، ئەوا دەبێتە کرێکارێکی دەستی ئەك کرێکارێکی زانیاری

## فیلم: سروشتی سەرکردایەتی

ئەم کورتە فیلمەی کە ئێستا دەیبینیت زۆر لەو یەکەمین فیلمە دەچێت کە لەگەڵ خوێندنەوەی کتێبەکەدا بینیت. فیلمەکە وات لێ دەکات بیر لەو پرنسیپانە بکەیتەوە کە ئەم چوارچێوەی سەرکردایەتیکردنە گرتوونێتییە خۆو هانت دەدات خۆت ئەو

پرنسیپانە جێبەجێ بکەیت و بەپێی ئەوان هەڵسوکەوت بنوێنیت. سروشت ئەو تەختی شانۆیەیە کە لێوەی فێردەبین. لەو باوەڕەدام فیلمەکە وەك چۆن ئیلهامی بە من بەخشی بە ئێوەشی ببەخشێت. ئێستاش بابچینە قۆناغێکی دیکەوە و هەمو ئەو شتانە پێکەوە ببەستین بە مەبەستی روونکردنەوەی ئەو رێگایەی کە سەرکردایەتی‌یە چوار رۆڵییەکە ببێتە چوارچێوەیەك بۆ فۆکەسکردن و جێبەجێکردن.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: تۆ باسی تیمی کامڵ دەکەیت، بەڵام من تەنیا کاردەکەم بەبێ ئەوەی هیچ کارمەندێك و هیچ کەسێك راستەخۆ پەیوەندییان بە منەوە هەبێت. هەمو ئیشەکان خۆم دەیانکەم. چۆن بتوانم تیمێکی کامڵ دروست بکەم قەرەبوی خاڵە لاوازەکانمی پێبکەمەوە؟

وەڵام: هەتا ئەو کاتەی خەڵکی وات دەست دەکەوێت بتوانیت سەرپشکیان بکەیت بەجۆرێك کە خاڵە بەهێزەکانت بەرهەمیان هەبێت و خاڵە لاوازەکانیشت بەهۆی خاڵە بەهێزەکانیانەوە هیچ کاریگەرییەکیان نەبێت، هەتا ئەو کاتە پێویستە هێندە شارەزاو لێهاتوییت هەبێت خاڵە لاوازەکانت داپۆشن، یاخود پێویستە هانا بۆ راوێژی کەسانی پسپۆڕ ببەیت، یان هانا بۆ هاوردەکاران ببەیت قەرەبوی خاڵە لاوازەکانت بکەنەوە.

پرسیار: لە ژینگەیەکدا کە کارەکان بەباشی رێکخرابن، چۆن بتوانین تواناسازییەکی وا بۆ کارمەندەکان دەستەبەر بکەین کە بەشێوەیەکی بەردەوام رێنمایی و سیستم و سیاسەتی نوێ زیادبکرێن بۆ دەزگاکە؟

وەڵام: من یەکسەر دەچمە لای کارمەندەکان و لێیان دەپرسم: رای ئێوە چی‌یە؟ چ پێشنیارێکتان هەیە؟ تۆپەکە دەخەمە یاریگاکەی ئەوانەوە. مرۆڤ بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش نەرم و داهێنەرە. گرنگ ئەوە نی‌یە ژینگەکە ئازادی تەواویان دەداتێ یاخود نا، گرنگ کارەکەیە. ئەگەر کارەکە واتایەکی پێبەخشین ئەوا بەدڵنیاییەوە بوارێك هەر دەدۆزنەوە داهێنانی تیادا بکەن و خۆیان جڵەوی مەسەلەکان بگرنە دەست. پێویستە یاساکان و رێخستنەکان تەنیا هەر وەکو رێنمایی گشتی تەماشا بکرێن. من

ماوەیەك لە بریتانیا ژیاوم و زۆر چاكم لەبیرە كە چۆن كرێكارانی هێڵی ئاسن بێزارییان دەردەبڕی لە یاسا توند و رەقەكان. بڕیارياندا پیت بە پیتی یاساكە جێبەجێ بكەن. لەئەنجامدا بێسەروبەرییەكی گەورە دروست بو چونكە هیچ شەمەندەفەرێك لەكاتی دیاریكراوی خۆیدا نەدەگەیشت. هۆكارەكەش تەنیا ئەوەبو كە كرێكارەكان موو بە مووی یاساكانیان جێبەجێ دەكرد. پێشتر سەركەوتنەكەیان لەوەدابو كە داهێنان و دەستپێشخەرییان دەكردو توانا و سەرچاوەكانی خۆیان دەخستە خزمەتی كارەكەوە. بەڕێوەبەرەكان كە هەستیان بەمە كرد، گەڕانەوە سەر شێوازەكەی جاران و لەیاساكان زیاتر بایەخیان بە تاكەكان بەخشی و بەمەش كێشەكە چارەسەركرا. بەڕێوەبەری سەركەوتو ئەوەیە پرۆگرامی ئەزمونگەریی وا دابڕێژێت كە بە تێچونی كەمتر و بێئەوەی هیچكام لە یاسا بنەڕەتییەكان پێشێل بكات، ئەنجامی باشتر بەدەستبهێنێت. ئەمە سەركێشییەكی كەمی تێدایە، بەڵام شتی زۆر گەورەی لێوە فێردەبین. هەروەها پێویستە یاسا بنەڕەتییەكان لەو یاسا لاوەكییانە جیا بكەینەوە كە زادەی كەلتورن نەك هی بەرژەوەندییەكان. ماوەیەك من لە بواری پیشەسازییەكی ئەتۆمیدا كارم دەكرد كە زۆر بەوردی رێكخرا بو. لەوێدا هەستم كرد هاوكاری و پەیوەندی تەنانەت لەناو ركابەرەكانیشدا زۆر زۆر بەهێزن، چونكە هەمویان دەیانزانی كە دوو سێ رووداوی دیكەی جۆری (مایل ئایلاند) بەسن بۆئەوەی هەمو پیشەسازییەكە رابوەستێت. هەر رووداوێك یاخود هەر بارودۆخێك بهاتایەتە پێشەوە بۆنی مەترسی لێ بكرێت، دەستبەجێ پێكەوە دەهاتنە سەرخەت و لە هەمو روویەكەوە یارمەتی یەكتریان دەدا. تەنانەت بەڕێوەبەرە حكومییەكانیش نەیاندەتوانی رێنمایی باشتر لەو رێنماییانە دەربكەن كە كۆمپانیا ركابەرەكان خۆیان دایاننابون.

پرسیار: چۆن دەتوانین لێپرسینەوە بگونجێنین لەگەڵ شێوازی براوە-براوەدا؟ ئایا لێپرسینەوە و براوە-براوە دژی یەكترن؟

وەڵام: بێگومان نەخێر. گرنگ لێرەدا ئەوەیە چۆن هەمومان هەست بە بەرپرسیاری بكەین بەرامبەر ئەو ئامانجە خوازراوانەی كە هەمومان لەسەری هاوڕاین و رێككەوتوین. بۆردی ئەنجامدانی هاوسەنگ بەكاربهێنە بۆ دەرخستنی ئەنجامەكان و هەروەها بۆ نیشاندانی كۆسپە سروشتی و لۆجیكییەكانی كە لێپرسینەوە دروستی

دەکەن. بەبێ ئەم بۆردە مەسەلەکە دەشێوێت، براوە-دۆڕاو دەبێت بە دۆڕاو-براوە و ئەمەش لە مەودایەکی درێژدا دەبێتە دۆڕاو- دۆڕاو.

پرسیار: چۆن هەڵسوکەوت بکەین لەگەڵ کارمەندی یاخیدا کە بەرهەڵستی هەمو بڕیارێك دەکات و کارەکان بەشێوازی تایبەتی خۆی ئەنجام دەدات؟

وەڵام: زوربەی پێشکەوتنەکان، بەرهەمی خەڵکە یاخییەکانن. پێویستە جیاوازی دابنێین لە نێوان ئەو کەسانەی کە بەجۆرێکی جیاواز بیردەکەنەوە لەگەڵ ئەوانەی کە بەشێوەیەکی نوێ و داهێنەر بیردەکەنەوە. فێرببە خاڵە بەهێزەکانی هەرکەسێك بخەملێنیت و ڕێزیان لێبگریت، بەلام ئەگەر یاخیبونەکە گەیشتە پلەیەکی زیانبەخش و روخێنەر پێویستە سیستەمێکی چالاکی فیدباك دابمەزرێنێت زانیاری بدات بەو جۆرە کەسانە. وازیان لێ بهێنە با لە دەریای راوبۆچونی خەڵکانی دیکەدا نوغرۆ ببن و دڵی خۆیان بە هەست و سۆزی ئەو خەڵکە خۆش بکەن کە بەرامبەر ئەمان هەیانە. چاوەڕێ بکە بزانە لە ئەنجامدا چ بڕیارێك رادەگەیەنن و دەیانەوێت چی بکەن؟ ئەگەر کەسە یاخیبووەکە کەسێکی خوار بێت و دڵی هەر بەوە ئاو بخواتەوە کە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان پێشێل بکات و بەشدارییە داهێنەرانەکەی هیچ نرخێك ناخاتە سەر کارەکە، ئەوە پێویستە بیگۆڕیت بە کەسێکی دیکە. لێرەدا پێویستە بڵێین زۆرکەس هەن کە لەگەڵ خەڵکیدا ناگونجێن بەلام لادەر و خوار نین، ئەمانە دەتوانن رۆڵی زۆر گرنگ بگێڕن لەو کارانەدا کە پێویستیان بە سەربەخۆییە. گرنگترین خاڵ لێرەدا بریتییە لەوەی کە پێویستە کەلتورێك بگریتە خۆ کە لە چوارچێوەی یەك ئامانج و یەك بەهادا هانی فرەچەشنی بدات.

ئیمیل دۆرخیم دەڵێت: "ئەگەر نەریتەکان باش بن ئەوا پێویستمان بە یاسا نییە، خۆئەگەر خراپ بن ئەوا یاسا ناتوانێت بەزۆر چاکی بکاتەوە".

پرسیار: من زۆر حەزم لەوەیە جڵەوی کارەکان بگرمە دەست و مەسەلەی ئازادکردنی خەڵکی و تواناسازییش کە هەرچەندە لۆجیکین، بەلام لە ناخەوە ناڕەحەتم دەکەن.ئایا دەتوانم بگۆڕێم؟

وەڵام: بەدڵنیاییەوە دەتوانیت. مرۆڤ هەرچەندە دەکەوێتە ژێر کاریگەری سروشتی

خۆی و ئەو شێوازەی کە پێی پەروەردە کراوە، بەڵام بەرهەمی ئەو دو شتە نییە. مرۆڤ بەرهەمی بڕیار و هەڵبژاردنەکانی خۆیەتی. بەڵام پێویستە دەست بەوە بکەیت خۆت بگۆڕیت، بەچی؟ بەبەکارهێنانی ئەو بەهرە بێهاوتایانەی کە خاوەنیانیت. دەبێت بزانیت لەچیدا خاوەن بەهرەیت و ئەو شتە بەکاربهێنیت. توانای هەڵبژاردن و پرنسیپەکان و چوار زیرەکییەکەت.

پشودرێژیی و بەردەوامیی وا لە مرۆڤ دەکەن بەسەر ئەو ئارەزوی کۆنترۆڵکردنەدا زاڵ ببێت کە لەناخیدا هەیە. چەندێك متمانەت بە خەڵکەکە بەرزبێت لە دەوروبەر و ناوماڵ و بواری کاردا ئەوەندە زیاتر دەگەیتە ئەو باوەڕەی کە ڕاهێنانیان لەسەر پرنسیپەکانی پێشەنگی باش و قەناعەت پێکردن و خۆبەڕێوەبردنیان کاری ڕاست و بەسودن و دەبنە مایەی زیادبونی بەرهەم و سەرسوکیی. دواتریش فێردەبیت چۆن ئەم شێوەیەی دەسەڵاتی ڕەوشتی بگۆڕین بۆ شێوازێکی دامودەزگایی لەڕێی سیستەم و ڕێکو شوێنەکانەوە.

# بەشی چواردەهەم
# خوی هەشتەم و ناوچە دڵڕفێنەکە

"جیاوازی نێوان ئەوەی دەیکەین و ئەوەی دەتوانین بیکەین، زۆربەی کێشەکانی جیهانی پێ چارەسەر دەکرێت"

- مەهاتما گاندی

خوی هەشتەم (دەنگی خۆت بدۆزەرەوە و واش لە خەڵکی بکە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە). بیرۆکەیەکە کاتی هاتووە. دیارە (کاتی هاتووە)یش قسەیەکە لەڕستەیەکی بەناوبانگی (فیکتۆر هۆگۆ)وە وەرگیراوە کە دەڵێت "هیچ شتێك لەو بیرۆکەیە بەهێزتر نییە کە کاتی هاتبێت"




شێوەی ١٤ - ١

بایەخی خوی هەشتەم لەوەدایە کە روون و ئاشکرا پێمان دەڵێت مرۆڤی کامڵ چییە، دیارە مرۆڤیش کە توانی بگاتە ئەو ئاستە، بەئاسانی دەگاتە ئەو وزە بێکۆتاییانەی کە خەسڵەتێکی گرنگی کرێکارانی زانیارییە.

وەك لەرێگاکەی خوارەوەی شێوەی (١٤ - ١)دا روونکراوەتەوە، ئابورییەکەی کرێکاری دەستی لەسەردەمی پیشەسازیدا تەنیا بەشێکی کەسەکەی دەبینی. ئەم رێگایە لەدنیای ئەمرۆدا لە باشترین حاڵەتدا دەتوانێت تەنیا هەر ژیانێکی ئاسایی دەستەبەر بکات. رێگایەکە تواناکانی مرۆڤ کەلەپچە دەکات. ئەو دەزگایانەی کە سیستەمە هزرییەکەی سەردەمی پیشەسازی پەیرەو دەکەن، کارێك دەکەن کە خەڵکەکەی سەرەوە و خاوەنی پۆستە باڵاکان تێکڕای بڕیارە گرنگەکان بدەن و ئەوانەی خواریشەوە هیچ. ئای لەو زیانە گەورەیە!! من لێرەدا دیسان قسەکەی (جۆن گاردنەر)م بیردەکەوێتەوە کە دەڵێت: "زوربەی دەزگا نەخۆشەکان توشی جۆرە نابینایییەك بون خەوشەکانی خۆیان نابینن. دەزگا نەخۆشەکان بەدەست ئەوەوە ناناڵێنن کە ناتوانن کێشەکانیان چارەسەر بکەن، بەڵکو گیرۆدەی ئەوەن کە ناتوانن ئەو کێشانە ببینن". بەڕاستی وایە. خووی هەشتەم کەرەسەی بیرکردنەوە و شارەزایی وات پێدەبەخشێت کە بەردەوام بتوانیت لەخەڵکیدا بەدوای وزە شاردراوەکاندا بگەڕێیت. خوی هەشتەم جۆرە سەرکردایەتیکردنێکە کە هەستی ئەوە بە خەڵکەکە دەبەخشێت نرخ و توانای خۆیان ببینن؛ بۆ ئەمەش پێویستە گوێ لەخەڵکەکە بگریت. پێویستە بەشداریان بکەیت لە بڕیاردانـدا و هەمیشەش بەقسە و بەکردار هانیان بدەیت بەوەی کە چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتی ببینن. تێبینی بکە بزانە چۆن هەر رۆڵێك لەو چوار رۆڵە بەشێوەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ خەڵکەکە دڵنیا دەکاتەوە لەوەی کە ئەوان مرۆڤی تەواون و بە نرخ و بەرێزن و هانیان دەدات وزە شاردراوەکانیان ئازاد بکەن.

یەکەم، پێشەنگی (نمونەسازیی) (لەسەر ئاستی تاك و لەسەر ئاستی تیمەکە). لەڕاستیدا کە خۆت بکەیتە نمونەیەکی چاك خەڵکەکە وایان لێ دێت متمانەت پێبکەن. مرۆڤ ئەگەر بەپێی ئەو پرنسیپانە بژی کە لە خووی هەشتەمدا هەن متمانە دەگەشێنێتەوە، کە رەهەندێکی جوان و گرنگی ژیانە. متمانە بەرهەمی شایستەبونی متمانەیە. کە تۆ متمانە بە کەسێك دەکەیت، مانای وایە خۆت شایستەی متمانەیت. بەکورتییەکەی، پێشەنگیی باش دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی دەسەڵاتە رەوشتییەکە. (دەسەڵاتی رەوشتی)

دووەم، دیاریکردنی ڕێباز (ڕێ دەرکردن). دیاریکردنی ڕێباز ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی دروستبونی سیستم، بێئەوەی داوا لە خەڵکەکە بکەیت. خەڵکەکە ئەگەر بڕیارە ستراتیجییەکان دیاری بکەن و بەشداری بکەن لە دروستکردنیاندا، بەتایبەت لە ئامانج و بەها زۆر گرنگەکاندا، ئەوا بەدڵ پەیوەست دەبن بەو ئامانجانەوە و بەمەش پێگەی بەڕێوەبردن و هاندانەکە لە دەرەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەوە. واتە ناخی خەڵکەکە دەبێتە بەڕێوەبەر و پاڵنەر. دیاریکردنی ڕێباز ئەو دەسەڵاتە ڕەوشتییە دەستەبەر دەکات کە لە تێڕوانینەوە هەڵقوڵاوە.

سێیەم، گونجاندن. لەڕاستیدا گونجاندنی سیستم و ڕێو شوێن و پێکهاتەکان دەبێتە مایەی بەهێزبونی جەستە سیاسییەکە و هەروەها گیانی متمانە و تێڕوانین و گونجاندنیش پتەوتر دەکات. گونجاندن هۆکاری دەستەبەرکردنی دەسەڵاتە ڕەوشتییە دامودەزگاییەکەیە.

چوارەم، تواناسازی. ئەم ڕۆڵە بەرهەمی هەرسێ ڕۆڵەکەی دیکەیە. بەرهەمی نمونەسازیی باش و ڕێدەرکردن و گونجاندنە. تواناسازی وزە شاردراوەکان لەمرۆڤدا ئازاد دەکات بێئەوەی پێویستی بە هاندەری دەرەکی بێت. تواناسازی دەبێتە هۆی دەستەبەرکردنی دەسەڵاتە ڕەوشتییەکە کەلتورییەکە (ڕۆشنبیری)




شێوەی ١٤ — ٢

دیاره گرنگترین رۆڵ کە سەرکردە پێویستە بیبینێت ئەوەیە کە لە هەرسێ رۆڵەکەی دیکەدا پێشەنگێکی باش بێت. بە واتایەکی دیکە، دیاریکردنی رێبازەکە خۆی لەخۆیدا پێشەنگییەکی باشە لە ئازایەتی و بێفیزی و رێزگرتنی بەرامبەر بۆ بەشدارکردنی ئەوانی دیکە لە دیاریکردنی ئەرکە گرنگەکاندا. گونجاندن پێشەنگییەکی باشە لە دروستکردنی ئەو پێکهاتە و سیستەم و رێو شوێنانەی کە لەگەڵ بڕیارە ستراتیجییەکاندا دەگونجێن و لەسەر بنەمای ئەرکە سەرەکییەکان دارێژراون، بەشێوەیەکی وا کە دەزگاکە بەردەوام چاوی لەسەر بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە بێت کە بەلایەوە یەکەمن. تواناسازییش خۆی لە خۆیدا پێشەنگییەکی باشە لە باوەڕی بەهێز بەوەی کە بەرامبەرەکەی دەتوانێت بڕیار بدات و هەروەها باوەڕبونیش بە چوار پێکهێنەرەکەی سروشتیان لەرێی چییەوە؟ لەرێی ئەوەوە کە بواریان بدرێتێ بەشداری بکەن لە دروستکردنی پەیامی دەزگاکەدا.

## فۆکەسکردن و جێبەجێکردن

بەباوەڕی من ئەوەی تا ئێستا باسمان کردون دەتوانین لەدوو وشەدا کورتیان بکەینەوە: چاو لەسەردانان (فۆکەس کردن)و جێبەجێکردن. لەم دو وشەیەدا سادەییەکی گرنگ دەبینین کە لە جەمسەری ئەوسەری ئاڵۆزیدا شاردراوەتەوە. فۆکەسکردن پەیوەستە بە مەسەلە لەپێشەکان و جێبەجێکردنیش پەیوەستە بە بەدیهێنانی ئەو مەسەلانە لە واقیعدا. کتێبە بەناوبانگەکەی هەردوو نوسەر (رام چاران) و (لاری بوسیدی) لەژێر ناونیشانی (جێبەجێکردن: یاسای تەواوکردنی کارەکانە) کاری گەورەی کردە سەر من بۆ هەڵبژاردنی ئەم دوو وشەیە. نمونەسازیی و (رێدەرکردن) کە دوو رۆڵی سەرەکین لەرۆڵەکانی سەرکردایەتیکردندا دەتوانین لە (یەك) وشەدا کورتی بکەینەوە: فۆکەسکردن

سەبارەت بە گونجاندن و تواناسازییش کە دوو رۆڵەکەی دیکەی سەرکردایەتیکردنن دەتوانین لەیەك وشەدا کورتیان بکەینەوە: جێبەجێکردن. چۆن؟ بیری لێ بکەرەوە. دیاریکردنی رێباز لە ناوەرۆکدا کارێکی ستراتیجییە. پرۆسەی دیاریکردنی ئەو ئامانجانەن کە لەهەمویان لەپێشترن، هەروەها پرۆسەی دیاریکردنی ئەو بەهایانەشە کە رێنماییمان دەکەن لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەو پارێزگاریلێکردنیان. بەڵام بۆ ئەمەش

پێویستە ئێمە باش لە ئامانجەکە تێگەیشتبین و پابەندی بەدیهێنانیان بین. بۆ ئەم پابەندبونەش کە کرۆکی نمونەسازییە پێویستمان بە هاودەنگی و هاوکاری و متمانە و شایستەبوونی متمانە پێکردن هەیە. هەر کاتێك لەسەر ئاستی تاك و لەسەر ئاستی پەیوەندییەکان شایستەبوون بە متمانە دەستەبەر کرا، ئەو کاتە گیانی متمانەپێکردن گەشە دەکات. ئەندامانی تیمەکەش کاراتر هاوکاری یەکدی دەکەن. ئەم پێشەنگییە باشە لەسەر ئاستی تاك و لەسەر ئاستی پەیوەندییەکان بریتییە لە هاوکاریکردنی خولقێنەر و رێز و تێگەیشتنی دوولایەنە. (خووەکانی ٤،٥،٦) بە مەبەستی دارشتنی کۆمەڵە ئامانجێکی روون کە پابەند بین پێیانەوە (خوی دووەم: کە دەست پێکرد با ئامانجەکەت لە بیربێت). تاکەکان و پەیوەندییەکانیش ئەو کاتە دەبنە شتێکی شایستەی متمانە پێکردن کە ئەو خەڵکە بە شێوەیەك بژین هاوئاهەنگی هەبێت لەنێوان ئامانجەکان و بەهاکانیاندا. بەواتایەکی دیکە – فۆکەسکردن و جێبەجێکردن. ئەمەیە (خوی سێیەم): گرنگتر پێش گرنگە. ئەو قسەیەی کە دەڵێت (مەسەلە هەرە گرنگەکان لە پێشەوە) شێوازێکی دیکەیە بۆ گوزارشتکردن لە فۆکەسکردن و جێبەجێکردن.

> سەرکردایەتیکردن بەبێ توانای جێبەجێکردن مەسەلەیەکی ناتەواو و نەکارەیە. بەبێ ئەم توانای جێبەجێکردنە تێکڕای خەسڵەتەکانی دیکەی سەرکردایەتی بێهودە دەبن.
>
> هیچ دەزگایەک ناتوانێت پابەندی بەڵێنەکانی بێت و خۆی لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا بگونجێنێت، ئەگەر سەرکردەکانی لە هەموو ئاستەکاندا توانای جێبەجێکردنیان نەبێت. پێویستە پابەندبون بەشێک بێت لە ستراتیجی دەزگاکە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. لەڕاستیدا جێبەجێکردن ئەڵقە ونبووەکەی نێوان ئامانج و ئەنجامەکانە
>
> - رام چاران و لاری بوسیدی

دوو رۆڵەکەی دیکەی سەرکردایەتیکردنیش کە بریتین لە گونجاندن و تواناسازی، لەڕاستیدا هیچ نین جگە لە جێبەجێکردن. واتا داهێنانی پێکهاتە و سیستەم و رێڕەو

شوێنێ وا (گونجاندن) کە خەڵکەکان و تیمەکان بتوانن بە مەبەست ئامانجە ستراتیجییە گەورەکانی دەزگاکە (هێڵی بینین) یاخود ئیشە گرنگە لەپێشەکان (دیاریکردنی ڕێباز) بکەنە ئامانجی ڕۆژانە، واتا توانا بەخشین بە خەڵکەکە بۆ تەواو کردنی ئەرکەکان. لەڕاستیدا جێبەجێکردن و چاو لەسەردانان پێکەوە بەستراون. بە واتایەکی دیکە، خەڵکەکە ئەگەر لە ئامانجەکاندا بەشدار نەبن ناتوانن بەشێوەیەکی بەردەوام جێبەجێی بکەن. لەشێوەی کارکردنی چاخی پیشەسازیدا شێوازی (ڕێککەوتن) پەیڕەو دەکرێت کە فۆکەسکردن لەڕێی فەرمان و کۆنترۆڵکردنەوە دەستەبەر دەکرێت و ئەگەر مرۆڤ ئەم ستایڵی کارکردنە لەچاخی کرێکارانی زانیاریدا بەکاربهێنێت ئەوا ناتوانێت نمونەی (وەرچەرخان) پەیڕەو بکات. جێبەجێکردن تیایدا پەیوەستە بە تواناسازییەوە، چونکە ئەگەر خەڵکەکە بەشدار نەکەیت لە دانانی پەیامەکەدا، یاخود لانی کەم بۆیانی روون نەکەیتەوە، ئەوا ناتوانن ئەو پەیوەندییە سۆزدارییە بەدەست بهێنن بتوانن بایەخی تەواو بە مەسەلەکە بدەن. بەمەش جێبەجێکردنەکە روونادات. بە هەمان شێوەش، مرۆڤ ئەگەر شێوازەکانی کرێکاری زانیاری بەکاربهێنێت کە بریتین لە هاوبەشیکردن و تواناسازی بۆ بەدەستهێنانی فۆکەسێکی هاوبەش، بەڵام شێوازەکانی فەرماندەرکردن و جڵەوگرتنە دەستی هەمو شتەکان پەیڕەو بکەیت کە لە سیماکانی چاخی کرێکاری پیشەسازیین، بە مەبەستی جێبەجێکردن، ئەوا ناتوانیت فۆکەسکردنەکە بپارێزیت، چونکە خەڵکەکە ئەو کاتە بە خەوشێکی گەورەی دەزانن لە راستگۆیی و رەوشتی تۆدا. بەڵام بە پێچەوانەوە ئەگەر نمونەکانی کرێکاری زانیارییت بەکارهێنا، هەم لە مەسەلەی چاو ترساندندا (پێشەنگی باش و دیاریکردنی ڕێباز)و هەم لە جێبەجێکردنیشدا (گونجاندن و تواناسازی) مانای وایە تۆ لە دەزگاکەدا کەلتوری رەوشت و شایستەبونی متمانە بڵاودەکەیتەوە. بەمەش دەزگاکە نەك هەر دەنگی خۆی دەدۆزێتەوە بەڵکو ئەو دەنگە بەکاردەهێنێت لە خزمەتکردنی ئامانجەکان و هی سودمەندەکانیشدا.

## بۆشاییە گەورەکەی جێبەجێکردن

لەسەرەتای ئەم کتێبەدا ئاماژەم بە قسەیەکی باو کرد کە دەڵێت: "تۆ ئەگەر هەمو شتێکیش بزانیت بەڵام کردەوەی لەگەڵدا نەبێت وەك ئەوە وایە هیچ نەزانیت" ئەمە هەقیقەتێکی چەسپیوە. ئەو پرنسیپانەی کە خووی هەشتەم پێکدەهێنن تەنیا ئەو کاتە

نرخ و بەهایەکیان دەبێت کە لەرێی پەیڕەوکردن و جێبەجێکردنیانەوە ببنە بەشێك لە هەڵسوکەوت و رەفتاری رۆژانەمان، بە واتایەکی دیکە ببنە نەریت و خوو. جێبەجێکردن بابەتێکی هەستیار و ترسناکە کە لەزوربەی دەزگاکانی ئەمڕۆدا فەرامۆشکراوە.

من کێم؟
من هاوڕێ هەمیشەییەکەتم
رەنگە ببمە گەورەترین یاریدەدەرت، یاخود قورسترین باری شانت
دەتوانم بەرزت بکەمەوە بەرەو سەرکەوتن، یاخود راتبکێشم بەرەو شکست
هەمیشە وام لە خزمەتی تۆدا. دەتوانیت نیوەی کارو کردەوەکانت بە من بسپێریت
دڵنیابە زۆر چاك و خێرا ئەنجامیان دەدەم
هەلگردن لەگەڵ مندا کارێکی ئاسانە بەس بەو مەرجەی نازم نەدەیتێ
داواکارییەکەم ئەوەیە پێم بڵێیت چیت لێم دەوێت؟ کەمێك
سەبرت هەبێت، کە بۆت روونکردمەوە ئینجا
بزانە چۆن خۆم ئیشەکەت بۆ دەکەم
من کارەکەری هەمو ناودارەکانم، بەداخەوە کارەکەری هەمو شکستخواردوەکانیشم
ناودارەکان من ئاوا مەزنم کردن
شکستخواردووەکانیش تەنیا هەر من هۆکاری شکستخواردنیانم
من ئامێر نیم، بەڵام وەکوئامێر وردم لە کارەکەمدا
زیرەکیی مرۆڤیشم پێبەخشراوە
دەتوانیت بۆ کاری باش بەکارم بهێنیت هەروەها بۆ کاولکارییش
بەلای منەوە جیاوازییەکیان لەنێواندا نییە. ئەگەر بمبەیت و مەشقم پێ بکەیت و
راشکاوبیت لەگەڵمدا، هەمو دنیات بۆ دەهێنم و دەیخەمە بەردەستت
بەڵام ئەگەر شلوشێواو بیت، وێرانت دەکەم
**کەواتە من کێم ؟**
**من خووم**

- نووسەرەکەی نەزانراوە

واقیع مەسەلەیەکی دیکەیە. لەڕاستیدا زۆربەی سەرکردەکان پێیان باشە. ستراتیجێکی ئاساییان هەبێت و بە سەرکەوتویی جێبەجێی بکەن، نەك ستراتیجێکی نایابیان هەبێت، بەڵام نەتوانن جێبەجێی بکەن. ئەوانەی کە ئەرك جێبەجێ دەکەن هەمیشە داشیان سوارە. (لویس گێرستنەر) لەم بارەیەوە دەڵێت: "کۆمپانیا مەزنەکانی جیهان ئەوانەن کە رۆژ بەڕۆژ لە مەسەلەی جێبەجێکردندا پێشی رکابەرەکانیان دەدەنەوە، چ لە بازاڕدا و چ لە بەرهەمهێناندا و چ لە پرۆسەکانی ئەنبارکردندا و چ لە هەناردەکردندا. بە دەگمەن کۆمپانیایەك دەبینیت سەرگەرمی کارێك بێت پەیوەندی بە بەرژەوەندییەکانییەوە نەبێت لە ململانێکردن لەگەڵ رکابەرەکانیدا".

دیارە زۆر بابەت و مەسەلە هەن کار دەکەنە سەر جێبەجێکردن، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە ئێمە لە بواری زیرەکیی جێبەجێکاریدا بە ئەنجاممان گەیاند بۆی دەرخستین کە شەش بابەتی بنەڕەتی هەن جێبەجێکردن لە هەر دەزگایەکدا دەچەسپێنن. شەش مەسەلەکەش بریتین لە روونکاریی (شەفافیەت)، پابەندبوون، وەرگێڕانی ئامانجەکان بۆ کار و کردەوە، تواناسازی، هاوکاریی خوڵقێنەر، لێپرسینەوە. ئەمەش مانای وایە ناتەواویی لە جێبەجێکردندا دەرەنجامی ناتەواویی و کەم و کوڕییە لە یەکێك لەو شەش هۆکارەدا. ئەم ناتەواوییەمان ناو ناوە بۆشاییەکانی جێبەجێکردن.

- روونکاریی: کەموکوڕیی لە روونکاریدا ئەوەیە خەڵکەکە لایان ئاشکرا نەبێت تیمەکە یاخود دەزگاکەیان چ ئامانجێکی هەیە و کام مەسەلانەی بەلاوە گرنگە.
- پابەندبون: کەموکوڕیی لە پابەندبوندا ئەوەیە خەڵکەکە بڕوایان بە ئامانجەکە نەبێت.
- گۆڕینی ئامانجەکان بۆ کارو کردەوەی دیاریکراو: کەموکوڕیی لەم مەسەلەیەدا ئەوەیە خەڵکەکە وەك تاکە کەس نەزانن چۆن یارمەتی تیمەکە و دەزگاکە بدەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.
- تواناسازیی: کەموکوڕی لە تواناسازیدا واتا کەسەکە خاوەنی ئەو جۆرە سیستەم و ئازادی و پێکهاتە گونجاوانە نەبێت وای لێبکەن ئەرکەکانی بەباشی جێبەجێ بکات.
- هاوکاریی خوڵقێنەر: کەموکوڕی لەم بابەتەدا بریتییە لەوەی خەڵکەکە هاوکاریی یەکتری نەکەن و مامەڵەکردنیان لەگەڵ یەکتریدا خراپ بێت.
- لێپرسینەوە: کەموکوڕی لەم بڕگەیەدا بریتییە لەوەی خەڵکەکە بەشێوەیەکی رێکوپێك لە یەکتری نەپرسنەوە.

> زوربەی ئەو شتانەی کە ئەمڕۆ پێیان دەڵێن کارگێڕی بریتین لەو ڕێنماییانەی کە ئیشوکار لە خەڵکەکە زەحمەتتر دەکەن.
>
> - پیتەر دراکەر

ئەم خشتەیەی خوارەوە [ژمارە (٦)] بۆشاییەکانی جێبەجێکردن و هەر شەش هاندەرەکەش ڕووندەکاتەوە، هەروەها ئاماژەش بەوە دەکات کە لە شێوازی چاخی سەرمایەداریدا ئەو کەموکورتییانە چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و جیاوازییان چییە لەو چارەسەرانەی کە لە چاخی کرێکارانی زانیاریدا پەیڕەو دەکرێن و بریتین لە ناوەڕۆکی خووی هەشتەم

| بۆشاییەکانی جێبەجێکردن | شێوازی چاخی پیشەسازی | چارەسەری چاخی کرێکارانی زانیاری |
|---|---|---|
| ڕوونکاری | ئاگاداری (ڕاگەیاندن) | لەخۆگرتن و / یان بەشداریکردن |
| پابەندبون | قەناعەت پێکردن | مرۆڤی کامڵ لە کارێکی کامڵدا |
| گۆڕینی ئامانجەکان بۆ کاری دیاریکراو | ڕوونکردنەوەی وەزیفی (پێناسەی ئەرکەکان) | گونجاندنی ئامانجەکان لەگەڵ یەکتریدا بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجەکان |
| تواناسازی | گێزەر و تێلا (خەڵکەکە وەکو خەرجی تەماشا بکەین) | گونجاندن لەنێوان پێکهاتە و کەلتوردا |
| هاوکاریی خوڵقێنەر | (یارمەتی یەکتری بدەن) | پەیوەندی بە مەبەستی گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیفی سێیەمدا |
| لێپرسینەوە | تەکنیکی سەندویچ لە هەڵسەنگاندنی کارەکەدا (گوشار لەهەردوو لاوە) | لەیەکتری پرسینەوەی کراوە و بەردەوام، بۆردی ئەنجامدانی هاندراو |

خشتەی (٦)

١. ڕوونکاری (ڕۆشنی): شێوازی کارکردنی کرێکاری دەستی کە سیمایەکی چاخی سەرمایەدارییە بە سادەیی بریتییە لە ڕاگەیاندنی پەیامەکە و لە تێڕوانین و بەهاو ئامانجە لە پێشەکان. وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، ئەم بڕیارانە هەمیشە لەو

خەڵکانەوە دەردەچن کە لە پۆستە باڵاکاندان و هەر ئەوانیش پەیامی دەزگاکە دیاری دەکەن لەڕێی وۆرکشۆپەکانیانەوە و پاشان بە زمانێکی سادە و لەشێوەی چەند بڕیارێکی ستراتیجیدا بە کرێکارەکانی رادەگەیەنن و ئەم بڕیارانەش دەبنە رێسا و سەرچاوەی بڕیارەکانی دیکەی ناو دەزگاکە. بە تێپەڕبونی کات ئەو پەیامە هیچێکی وای لێ نامێنێتەوە و تەنیا بریتی دەبێت لە چەند زاراوەیەکی ناو پەیوەندییە گشتییەکان، چونکە ئەگەر هەر شتێك بەشداریکردنێکی راستەقینە لە ئامادەکردنیدا نەبێت، کەس بەڕاستی پابەندی جێبەجێکردن و لەخۆگرتنی نابێت. ئەم لەخۆگرتنە بریتییە لەرۆحی چاخی زانیاری. بیرت نەچێت لەخۆگرتن ئەو دەسەڵاتە رەوشتییە تایبەتەیە کە زادەی سەرسامبوون و دڵبەستەبونی سەرکردەکەیەو مەرج نییە هەمیشە زادەی بەشداریکردن بێت لە دروستکردنی بڕیارە ستراتیجییەکاندا.

٢. **پابەندبوون:** لە چاخی پیشەسازیدا پابەندبوون بە شتێکەوە لەو رێیەوە گوزارشتی لێدەکرێت کە هەمیشە ئەو شتە بڵێیتەوە. واتا بیری خەڵکەکەی بخەیتەوە و بەردەوام جەختی بکەیتە سەرو بۆیانی روون بکەیتەوە و هەوڵ بدەیت تێیان بگەیەنیت کە چەند گرنگ و پێویستە. بەڵام لێکۆڵینەوەکان سەلماندویانە کە لەناو پێنج کەسدا تەنیا (یەك) کەس بە باوەڕی تەواوەوە پابەندی ئامانجی تیمەکە و دەزگاکەی خۆیەتی. خووی هەشتەم لەچاخی زانیاریدا بەشێوازێك کاردەکات کە مرۆڤی کامڵ بخەیتە کارێکی کامڵەوە —جەستە، ئەقڵ، دڵ، رۆح— کرێیەکی دادپەروەرانەم بدەرێ، بەڕێز و خۆشەویستییەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکە، رێگەم بدە ئەقڵم بخەمە گەڕو داهێنانێکی وا لە کارەکەدا ئەنجام بدەم کە بەهایەکی زیاتر بخاتە سەرکارەکە و رێگەم بدە ئەرکەکەم بەگوێرەی پرنسیپەکانم ئەنجام بدەم. مەسەلەکە وەك ئەو تیۆرییە نییە کە ناومان لێنا تیۆرییەکەی جاك ئاس (Jakass)ی مەزن بۆ هاندانی مرۆڤ کە تیۆرییەکە دەڵێت تەنیا ئەوەت لەسەرشانە پارەی زیاتر بدەیت بە کرێکارەکان و ئیتر کێشەکان چارەسەر دەبن. لەڕاستیدا لێکۆڵینەوەکان دەریانخستووە کە بەکارهێنانی شێوازی کرێکارانی زانیاری وا لە کرێکارەکان دەکات مەسەلەی کرێ بخەنە پلەی چوارەمەوە. بیخەنە پاش متمانە و رێز و شانازییەوە. بۆچی؟ چونکە مرۆڤ ئەگەر لە ناخی خۆیدا دڵی بە کارەکەی خۆش بێت، ئەوا

هۆکارە دەرەکییەکان بایەخیان کەمتر دەبێت. بەڵام ئەگەر ئەو دڵخۆشییە نەبێت بە کارەکە، ئەوا پارە بایەخی زیاتر پەیدا دەکات. دەبێتە گرنگترین مەسەلە. بۆچی؟ چونکە پارە ئاسودەییان دەداتێ بێئەوەی هیچ هەستێکیان بەرامبەر کارەکە هەبێت. خوی هەشتەم کە جەخت لەسەر دروستکردنی مرۆڤی کامڵ دەکاتەوە دەتوانێت هاندەرەکەی ناخی مرۆڤ ئازاد بکات.

بەشێکی سەرەکیی گیروگرفتەکانی بەڕێوەبردنی کات لەو بۆشاییانەوە دروست دەبن کە لە (ڕۆشنی) و (پابەندبون)دا سەر هەڵدەدەن. هۆکارەکەش لەو مەسەلە سادەیەوە هاتووە کە چۆنێتی دیاریکردنی ئامانج و پەیام و بەهاکان هەمو بڕیارەکانی دیکە حوکم دەکات. لەبەرئەوە ئەگەر کەموکوڕیی لە روونکاری و لە پابەندبوندا هەبێت مرۆڤ سەری لێ تێك دەچێت و نازانێت چی گرنگە و چی گرنگ نییە. ئەنجامەکەش بەوە دەشکێتەوە کە مەسەلە هەنوکەییەکان شوێنی مەسەلە گرنگەکان بگرنەوە، واتە ئەو شتەی کە نزیك و گەرموگوڕ و هەنوکەییە دەبێتە مەسەلەیەکی گرنگ. لەبەرئەوە هەمو فێری ڕەمڵ لێدان و گەمەی سیاسی و ریاکردن دەبن بۆ خاوەن پۆستەکان، بەمەش لەچەند سەرێکەوە بێسەروبەریی لە سەرتاسەری دەزگاکەدا بڵاو دەبێتەوە. بۆیە دەتوانین بڵێین هەتا خەڵکەکە بەروونی لە پەیام و بەهاو تێڕوانینی دەزگاکە حاڵی نەبێت و پابەند نەبێت پێیانەوە (روونکاریی و پابەندبون) ئەوا هیچ ڕاهێنانێك لەسەر بەڕێوەبردنی کات سودی نابێت، جگە لە سودی کەم لەسەر ئاستی تاکە کەس. چارڵز هۆمڵ دەڵێت: "کاری گرنگ بە دەگمەن وا پێویست دەکات ئێستا یاخود ئەم هەفتەیە ئەنجامی بدەیت، بەڵام کاری هەنوکەیی پێویستی بەوەیە دەستوبرد جێبەجێی بکەیت. سروشتی کارە هەنوکەییەکان وایە کە بە خێرایی مرۆڤ رادەکێشن بە جۆرێك کە زۆر گرنگ دێنە بێش چاو و کەس نەتوانێت بەربەرەکانێیان بکات. ئەم جۆرە کارانە ئاوا تواناکانمان بەفیڕۆ دەدەن، بەڵام کە دواتر تەماشایان دەکەین تێدەگەین بایەخێکی ئەوتۆیان نەبووە و توشی زیانێکی گەورەیان کردوین چونکە کاری گرنگمان بۆ خستونەتە لاوە. لەم کاتەدا هەست دەکەین بوینەتە کۆیلەی مەسەلە هەنوکەییەکان".

٢. **گۆڕینی ئامانجەکان بۆ کاری دیاریکراو:** لە شێوازی چاخی پیشەسازیدا شتێك هەیە پێی دەوترێت پێناسەکردنی ئەرکەکان (التوصيف الوظيفي Job description)

کە هەر پیشە و پلەوپایەیەك ئەرك و ماف و سنورەکانی کارکردن و دەسەڵاتی دیاریکراوە. بەڵام لەچاخی کرێکارانی زانیاریدا تۆ پارەتی بەرامبەرەکەت دەدەیت گونجاندن بهێنێتە دی لەنێوان کارەکەی و دەنگی تایبەتی خۆیدا (بەهرە و عیشق) بە جۆرێکی وا کە هێڵێکی بینینی هەبێت لەنێوان کارەکەی خۆی و ئامانجە هەرە گرنگەکەی تیم و دەزگاکەیدا.

٤. **تواناسازی**: زەحمەتترین بۆشایی لەڕوی مامەڵەکردنەوە کەموکورتییەکانە لە بواری تواناسازیدا، چونکە پێویستی دەکات لەسەرت هەمو ئەو پێکهاتانە لا ببەیت کە بەباشی کارناکەن، هەروەها هەمو کۆسپ و تەگەرە ڕێکخراوەیی و کەلتورییەکانی کە لەم کتێبەدا باسمان کردن. لەڕاستیدا وەگەڕخستن و هەڵبژاردن و ڕاهێنان و پێشخستن و هاندان و زانیاری و پەیوەندیی بریتین لە کۆمەڵە پێکهاتە و سیستمێك کە هەم دەتوانن کۆسپ و تەگەرە دروست بکەن و هەم دەشتوانن ببنە ئاسانکار و یارمەتیدەر. لەڕاستیدا ئەم پێکهاتە و سیستمانە دەتوانن ئارامی بۆ مرۆڤ دابین بکەن و توانای پێشبینیکردنی لە ژیانی پیشەیدا پێببەخشن. ئەگەر تۆ بەشداریکردنێکی ڕاستەقینەت نەبێت لە دروستکردنی بڕیارە ستراتیجیەکەدا، بە تایبەت لە مەسەلەکانی پەیوەست بە بەها و ڕیزبەندییەکانی هێڵی تێڕوانینەوە، ئەوا نابیتە خاوەنی هاندەرێکی ناوەکی و متمانە و پەیوەندییەکی سۆزداریی وا کە بە شێوەیەکی قوڵ گونجاندن بەدیبهێنێت لە پێکهاتە و سیستمەکاندا. لە چاخی پیشەسازیدا مرۆڤ حسابی خەرجییەکانی بۆ دەکرێت، کەچی شتە بێگیانەکانی وەك کەرستە و تەکنەلۆجیا حسابی سەرمایەگوزارییان بۆ دەکرێت. تکایە بیری لێ بکەرەوە، مرۆڤ مەسرەفە و شتە بێ ڕۆحەکانیش سەرمایەگوزارین!! ئەمە نزمترین ئاستی زانیارییە. بەپێی هەشتەمین خوو لە چاخی کرێکارانی زانیاریدا خەڵکەکە بەشداری دەکەن لە داڕشتنی ئەو بۆردی ئەنجامدانەی کە تێکڕای ئەنجام و تواناکان بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش و کاریگەر و بینراوی وا دەردەخات کە ڕەنگدانەوەی واقیعەکە بێت و ئاستی گونجاندنی نێوان سیستم و پێکهاتەکان و توانای بەدیهێنانی ئەمانجەکان نیشان بدات.

٥. **هاوکاریی خوڵقێنەر**: چاخی پیشەسازیی باوەڕی بە سازش و ڕێکەوتن هەیە و لە باشترین حاڵەتیشدا (براوە - دۆڕاو) و لە خراپترین حاڵەتیشدا بە شێوازی (دۆڕاو - براوە) کاردەکات. بەڵام لە چاخی کرێکارانی زانیاریدا هاوکاریی خوڵقێنەر دەبێتە

مایەی خولقاندنی ئەڵتەرناتیڤی سێیەم. ئەم جۆرە پەیوەندییەی کە خەسڵەتی هەشتەمین خووە کارێك دەکات هەمو دەنگەکان یەك بگرن و بگونجێن لەگەڵ دەنگی دەزگاکەدا.

٦. **لێپرسینەوە:** هەڵسەنگاندن لەچاخی پیشەسازیدا بە شێوازی (تێلا و گێزەر)و (تەکنیکی سەندویچ) جێبەجێ دەکرێن، بەڵام لەچاخی کرێکارانی زانیاریدا ئەم شێوازانە دەگۆڕێن و دەبنە (لەیەکتر پرسینەوە)و (هاوبەشیکردنی کراوە) لە زانیارییەکاندا کە پەیوەستن بەو ئامانجە هەرە گرنگانەوە کە هەموان دەیزانن. مەسەلەکە وەك ئەو بۆردە وایە کە لە یاریگاکانی تۆپی پێ و تۆپی باسکەدا دانراون و زانیارییەکان بۆ هەمو کەس ئاشکرا دەکات کە تیمەکان یەکی چەند خاڵیان تۆمارکردووە و حاڵیان چۆنە.

## ناوچە دڵڕفێنەکە

پێم باشە مەسەلەکان پێکەوە ببەستین. لەسەرەتای ئەم کتێبەدا باسی ئەو بیرۆکەیەم کرد کە دەڵێت مرۆڤ لە ژیاندا یەکێك لەم دو ڕێگەیە هەڵدەبژێرێت، یان ڕێگەی ژیانێکی ئاسایی یاخود ڕێگەی مەزنی. هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە چۆن ڕێگەی ژیانی ئاسایی تواناکانی مرۆڤ کۆت و پێوەند دەکات، بەڵام ڕێگەی مەزنی ئەو توانایانە ئازاد دەکات. هەشتەمین خوو لەڕاستیدا ڕێگەیە بەرەو مەزنی. مەزنییش بریتییە لەوەی دەنگی تایبەتی خۆت بدۆزیتەوە و ئیلهامیش بە بەرامبەرەکەت ببەخشیت کە ئەویش دەنگی خۆی بدۆزێتەوە. ئێمە بە سێ جۆر مەزنیی ئاشنا بوین؛ مەزنی تاکەکەس (کەسێتی)و مەزنی سەرکردایەتی و مەزنی دەزگایی.

مەزنی تاکەکەس ئەو کاتە بەدی دێت کە مرۆڤ ئەو سێ دیارییە بدۆزێتەوە کە لەگەڵیدا لەدایك دەبن، دیارییەکانیش بریتین لە هەڵبژاردن (بڕیار) و پرنسیپەکان و چوار زیرەکییە مرۆییەکە. بەرەودان بەو دیاری و زیرەکییانە دەبێتە مایەی بنیادنانی کەسایەتییەکی مەزن کە ویژدان بەڕێوەی ببات و خاوەنی تێڕوانین و دیسپلین و عیشق بێت؛ واتە مرۆڤەکە هەم چاك بێت و هەم ئازا. هاندەرەکەی کەسایەتی لەو جۆرە ئەوە نییە کە تەنیا خزمەتێکی گەورە پێشکەشی مرۆڤایەتی دەکات، بەڵکو ئەوەیە کە بشکاتە مەبەستە تایبەتەکە و فۆکەسی تەواوی بخاتەسەر. من ئەمە ناو دەنێم مەزنیی

بنەڕەتیی، لەکاتێکدا کە مەزنی لاوەکی مەسەلەکانی بەهرە و ناوبانگ و دەوڵەمەندی و ڕواڵەت و ... تاد دەگرێتەوە.

مەزنیی سەرکردایەتی لەڕاستیدا ئەو کەسانە بەدی دەهێنن کە — بێگوێدانە پلە و پۆستیان — بڕیار دەدەن ببنە ئیلهامبەخشی بەرامبەرەکانیان بۆئەوەی ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە. ئەمیش بەچی دێتەدی؟ بە پەیڕەوکردنی چوار ڕۆڵەکەی سەرکردایەتیکردن.




شێوەی ١٤ — ٢

مەزنی دام و دەزگایی بەوە دێتەدی کە دەزگاکە ڕووبەڕووی دوا تەحەدا بوەستێت. مەبەستمان لەو تەحەدایەش پرۆسەی وەرگێڕانی کارەکە و چوار ڕۆڵەکەی سەرکردایەتیکردنە — بە پەیام و تێڕوانین و بەهاکانەوە — بۆ پرنسیپ یاخود بۆ میکانیزمی جێبەجێکردن لە دەزگاکەدا — ڕوونکاری، پابەندبوون، وەرگێڕانی ئامانجەکان

بۆ کردار، هاودەنگی، لێپرسینەوە – دیارە ئەو کەرەسانەی جێبەجێکردن نەگۆڕ و هەمیشەیی و جیهانیین. شێوەکەی لای خوارەوە هەرسێ جۆری مەزنییەکە دیاری دەکات. هەر دەزگایەك بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی خۆی پەیوەست بکات بەو سێ جۆری مەزنییەوە دەتوانێت ئەو شتە بەدی بهێنێت کە ناومان لێ ناوە ناوچە دڵڕفێنەکە. ناوچە دڵڕفێنەکە شوێنی یەکتربڕینی هەرسێ بازنەکەیە و هەر لێرەشدا هێزو تواناکان لە باشترین ئاستیاندا دەردەکەون. کە لەکاتی تێنس کردندا بە ناوچە دڵڕفێنەکەی ڕێکتەکە بکێشیت بە تۆپەکەدا، یاخود لەکاتی گۆڵف کردندا بە ناوچە دڵڕفێنەکەی داری گۆڵفەکە بکێشیت بە تۆپەکەدا، ئینجا دەزانیت جیاوازی چییە لەنێوان ئەم ناوچەیە و ناوچەکانی دیکەدا. هەستێکی هێندە خۆشت پێدەبەخشێت کە لە هەموو ناختدا دەنگ دەداتەوە. ئەم پەیوەندییە بە ناوەندەوە دەبێتە هۆی ئازادکردنی بڕێکی زۆری وزە بێئەوەی توانایەك سەرف بکەیت لە توانای ئاسایی زیاتر، کەچی تۆپەکە بەوپەڕی خێرایی دەردەپەڕێت و مەودایەك دەبڕێت زیاتر لەکاتی ئاسایی. ئەمە شێوازێکی دیکەی گوزارشتکردنە لەو وزەیەی کە دەردەچێت کاتێك کەس و تیم و دەزگاکان دەنگی تایبەتی خۆیان دەدۆزنەوە.

## چوار یاساکەی جێبەجێکردن ( DX4 )

چوار یاسامان هەیە کە ئەگەر هەمیشە کاریان پێبکەین دەتوانین ئەو بۆشاییانەی جێبەجێکردن پڕبکەینەوە و بەشێوەیەکی کاریگەر توانای تیم و دەزگاکان زیاد بکەین هەم لە جێبەجێکردنی گرنگترین ئامانج و هەم لە مەسەلەی چاو لەسەردانانیشدا. ئەو یاسایانە ناو دەنێین (چوار یاساکەی جێبەجێکردن). بێگومان دەیان هۆکاری دیکە هەن کاردەکەنە سەرجێبەجێکردن بەڵام لێکۆڵینەوەکانی ئێمە سەلماندویانە کە ئەم چوار یاسایە بریتین لە ٪٢٠ی ئەو چالاکییانەی کە ٪٨٠ی ئەنجامەکان دەستەبەر دەکەن و بایەخی هەمیشەییشیان هەیە لە جێبەجێکردنی ئەرکە هەرە گرنگەکاندا. لەمەولا تێبینی دەکەیت کە ئەو چوار یاسایە هەڵقوڵاوی بواری هەرسێ جۆری مەزنییەکەن و لەگەڵیشیاندا دەگونجێن. لەڕاستیدا ناوچە دڵڕفێنەکەیە (تەماشای ناوەندی شێوەکە بکە). ئەو خاڵی پەیوەندییەیە کە وزەکان ئازاد دەکات و کۆمەڵە ڕەفتارێکی پراکتیکی لەخۆ دەگرێت کە لە فۆکەسکردندا وەکو تیشکی لێزەر وان و وا لە تیم و دەزگاکە دەکات بەردەوام ئەنجامەکانیان دەست بکەوێت.

لە خوارەوە پوختەی (٤) یاساکەیە.

## یاسای یەکەم: چاو لەسەر ئامانجە هەرە گرنگەکان دابنێ.

لەدەزگاکاندا پرنسیپێکی بنەڕەتی هەیە کە پەیوەندی بە فۆکەسکردنەوە هەیە و زۆر کەس درکی پێنەکردووە. پرنسیپەکە دەڵێت: مرۆڤ وا دروست بووە کە لە یەك کاتدا دەتوانێت تەنیا چاو لەسەر یەك مەسەلە بەباشی دابنێت یاخود لەسەر چەند مەسەلەیەکی زۆر کەم. گریمان تۆ ٨٠٪ بوارت هەیە ئامانجێك بە نایابی بهێنیتە دی. ئەگەر ئامانجێکی دیکەی بخەیتەسەر ئەوا بەپێی لێکۆڵینەوەکان فرسەتی بەدیهێنانی هەردوو ئامانجەکە (بە شێوەیەکی نایاب) دادەبەزێت بۆ ٦٤٪. هەتا ئامانجی زیاتریشیان بخەیتەسەر ئەوا ئەگەری جێبەجێکردنیان بە نایابی کەمدەبێتەوە. ئەگەر بتەوێت لە یەك کاتدا پێنج ئامانج بە نایابی بهێنێتەدی ئەوا ئەگەرەکانی بەردەمت دادەبەزێت بۆ ٣٣٪. کەواتە زۆر گرنگە مرۆڤ تەنیا فۆکەس بخاتە سەر ژمارەیەکی کەمی ئامانجە گرنگەکان. زۆرجار ئامانجەکە خۆی هاوار دەکات کە لە ئامانجەکانی دیکە گرنگترە. پێویستە فێرببین چۆن (گرنگ) لە (ئەوپەڕی گرنگ) جیابکەینەوە. ئەو ئامانجەی کە ئەوپەڕی بایەخی هەیە کێشەی ترسناکی لێ دەکەوێتەوە. شکستهێنان لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەدا هەموو دەستکەوتەکانی دیکە پەك دەخات. بیر لە ئەرکی ئەو پیاوە بکەرەوە کە لە فرۆکەخانەکاندا نیشتنەوەی فرۆکەکان رێك دەخات لە هەر خولەکێکدا. رەنگە بە ئاسمانەوە سەدان فرۆکە هەبن و هەموشیان گرنگن، بە تایبەت ئەگەر تۆ سەرنشینی یەکێکیان بیت، بەڵام ئەرکەکەی ئەو ئەوەیە کە هەرجارەو یارمەتی نیشتنەوەی فرۆکەیەك بدات. پێویستە ئەو کارەش بێ هیچ کەموکوڕییەك ئەنجام بدات. دەزگاکانیش هەمان شتن. کەم دەزگا دەبینین توانای ئەوەی هەبێت بەباشی چاو لەسەر ئامانجە هەرە گرنگەکانی دابنێت. ئامانجی وا هەیە کە پێویستە تا ئێستا بنیشێتەوە. کەواتە چۆن بزانین کام ئامانجە ئەوپەڕی بایەخی هەیە و باشترین هاوکاریت دەکات بۆ جێبەجێکردنی پلانە ستراتیجییەکەت. زۆرجار ئامانجەکان روونن بەڵام هەندێك جاریش پێویستیان بە لێکدانەوەیە. بۆردی دیاریکردنی بایەخ ئامرازێکی بەنرخە لە نەخشەدانانی ستراتیجیدا، چونکە یارمەتیت دەدات ئامانجە هەرە گرنگەکانت دیاریبکەیت لەرێی نیشاندانیانەوە لەسەر ئەو بۆردانەی کە پێوەرە ئابوری و ستراتیجییەکانیان تێدایە و هەروەها پێوەری خەڵکە پەیوەندیدارەکانیش. بە

گوزارشتێکی دیکە ئەم ئامرازە دەتوانێت یارمەتیمان بدات لە هەڵسەنگاندنی تێکڕای ئامانجە پاڵێوراوەکاندا بۆ بەدیهێنانی گەورەترین سودی ئابوری و ستراتیجی بۆ دەزگاکە و گەورەترین سودیش بۆ خەڵکە پەیوەندیدارەکە. تۆش لەکاتی دیاریکردنی ئامانجەکانتدا دەتوانیت بۆردی دیاریکردنی بایەخ بەکاربهێنیت کە لە ناوەڕۆکدا بریتییە لە دیاریکردنی ڕێباز لە بواری کارکردندا.

| ڕێنماییەکان | بۆردی خەڵکە پەیوەندیدارەکان | بۆردی ستراتیجی | بۆردی ئابوری | |
|---|---|---|---|---|
| ١. لیستێك دروست بکە بۆ ئەو مەسەلانەی کە ڕەنگە دەزگاکەت بیانکات بە ئامانج.<br>٢. بۆ هەمو بۆردێك نمرەیەك دابنێ لە [ ١ ← ٤ ] بۆ<br>٥ کاریگەریی ئەرێنی بەرز<br>٠٠ هیچ کاریگەری نییە<br>١- کاریگەری ئەرێنی<br>٣. نمرەکان کۆبکەرەوە<br>٤. لەخۆت بپرسە (ئایا ڕوبەڕوی حەقیقەتە بە ئازارەکان بویتەوە؟)<br>٥. لەرێگە بەکارهێنانی کۆی گشتی نمرەکان و هەستی خۆت بەرامبەر ئامانجەکە، پێویستە ئامانجە هەرە گرنگەکان دیاریبکەیت. | نمرەکان لە (١-) تا (٤)<br>پێوەری پەیوەندیدارەکان<br>• پابەندبونی کڕیارەکان زیاددەکات.<br>• وزەو جۆش‌وخرۆشی کارمەندەکانمان زیاد دەکات.<br>• بە ئەرێنی کاردەکاتە سەر هاوردەکاران و فرۆشیاران و هاوبەشە سەرمایەگوزارەکان.<br>• پێوەری دیکە کە پەیوەندییان بە لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە هەیە. | لە پلەی [(١-) بۆ(٤) ]<br>پێوەرە ستراتیجییەکان:<br>• ڕاستەخۆ پشتگیری دەکات لەئامانجەکانی کۆمپانیا<br>• توانا بنەڕەتییەکانی کارمەندان بەهێز دەکات.<br>• هێزی دەزگاکە لە بازاڕدا بەهێز دەکات.<br>• دەستکەوتەکانی پێشبڕکێ زیاد دەکات.<br>• پێوەرە ستراتیجییەکانی دیکە<br>.. | لە پلەی (١-) بۆ پلەی (٤)<br>پێوەرە ئابورییەکان<br>• داهاتەکان زیاد دەکات<br>• خەرجییەکان کەم دەکاتەوە<br>• پارەی کاش زۆر دەکات<br>• قازانجەکان زیاد دەکات<br>• پێوەرە ئابورییەکانی دیکە<br>.. | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |

## بۆردی دیاریکردنی بایەخ

بۆردی خەڵکە پەیوەندیدارەکە. ئەو مەسەلە گرنگانە چین کە پێویستە ئەنجامیان بدەیت بۆئەوەی پێویستییەکانی خەڵکە پەیوەندیدارەکە دەستەبەر بکەیت؟ خاوەن پشک و کڕیار و کارمەند و هاوردەکار و سەرمایەگوزار و خەڵکی دیکەش پێکەوە هەموویان بەشداری دەکەن لە بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەدا. بیر بکەرەوە بزانە چ ڕێگایەك دەتوانێت ئامانجەکان بکاتە مایەی:

- زیادبونی پابەندبونی کڕیارەکان
- زیادبونی وزە و تاقەت و جۆش و خرۆشی کارمەندان
- کارکردنە سەر هاوردەکاران و فرۆشیاران و هاوبەشان و سەرمایەگوزاران بە شێوەیەکی باش.

**بۆردی ستراتیجی:** بیربکەرەوە بزانە چۆن ئەم ئامانجە گریمانەکراوانە کاردەکەنە سەر ستراتیجی دەزگاکە بەم خاڵانەی خوارێشەوە:

- پشتگیریکردنی ڕاستەوخۆی پەیام و ئامانجی دەزگاکە
- بەهێزکردنی توانا بنەڕەتییەکانی کارمەندان
- زیادکردنی هێزی دەزگاکە لە بازاڕدا
- زیادکردنی ئەو خاڵە بەهێزانەی کە لە کێبڕکێدا گرنگن

**لە خۆت بپرسە:** ئەو مەسەلەیە چییە کە جێبەجێکردنی دەبێتە بەدیهێنانی باشترین ئەنجام بۆ دەزگاکە؟

پێوەرە ئابورییەکە: لەڕاستیدا پێویستە گرنگترین ئامانجی دەزگاکە ڕاستەخۆ و ناڕاستەوخۆ سود بە هەمو ئابورییەکانی دەزگاکە بگەیەنێت. لە خۆت بپرسە بزانە لەناو هەمو ئامانجە گریمانە کراوەکاندا کام ئامانجەیان گەورەترین سودی ئابوری دەگەیەنێت بە دەزگاکە؟ تکایە ئەم مەسەلانەی خوارێشەوە ڕەچاو بکە:

- زیادکردنی داهاتەکان
- کەمکردنەوەی خەرجییەکان
- زیادکردنی پارەی کاش
- زیادکردنی قازانج

لەڕاستیدا لایەنە ئابورییەکان زۆر گرنگن، تەنانەت لەو دەزگایانەشدا کە بۆ قازانجکردن دانەمەزراون (ڕێکخراوە قازانجنەویستەکان)، چونکە هەمو دەزگایەک پێویستی بە پارەیە بۆئەوەی بە زیندوێتی بمێنێتەوە. نیشاندانی ئامانجەکان لەسەر بۆردی پەیوەندیدارەکان و بۆردی ئابوری و بۆردی ستراتیجی، وەڵامێکی روون و ئاشکرایە بۆ پرسیاری (بۆچی؟) کە لە پشت هەر ئامانجێک لە ئامانجەکانەوەیە.بە بۆچونی من پلانە ستراتیجییەکە بە تەمومژاویی دەمێنێتەوە ئەگەر نەکرێت بە دووسێ ئامانجی هەرە گرنگ (Widly Important Goods) (WIG). خەڵکە پەیوەندیدارەکان لە هەر ئاستێکدا بن پێویستە بەشدار بن لە دیاریکردنی ئەو ئامانجە گرنگانەدا بۆئەوەی زۆر بەباشی پابەند ببن پێوەی و هەروەها لەوەش تێبگەن کە هەر ئامانجێک چی لە پشتەوەیە. دیارە ئەگەر بمانەوێت ئامانجی ئایابمان دەست بکەوێت پێویستە جەخت بکەینە سەر ژمارەیەکی کەمی ئامانجە هەرە گرنگەکان. واتا ئەو ئامانجانە بخەینە لاوە کە تەنیا هەر گرنگن نەک زۆر زۆر گرنگ. جا لەبەرئەوەی مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا وا دروستبووە کە لەیەک کاتدا تەنیا یەک دوو کاری زۆر بەباشی بۆ بەڕێوە دەبرێت، یاخود لە باشترین حاڵەتدا ژمارەیەک کاری کەمی بەباشی بۆ ئەنجام دەدرێت، کەواتە پێویستە فێرببین چاو بخەینە سەر ژمارەیەک ئەرکی کەم.

مەسەلەکە وەک ڕێکخەری نیشتنەوەی فڕۆکەکان وایە. پێویستە فێرببین هەرجارەی یەک فڕۆکە بنیشێنینەوە. کەواتە کلیلەکە ئەمەیە: ئەنجامدانی ئەرکی کەم بەڵام بە ئایابی، لەبری ئەنجامدانی کاری زۆر و بە ئاسایی. بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایە پێویستە یەک دوو دانە لە ئامانجە هەرە گرنگەکانی تیمەکەت دیاری بکەیت و پێویستیشە بە شێوەیەک دایانبڕێژیت کە لەگەڵ ڕیزبەندییەکانی دەزگاکەدا بگونجێن.

## فیلم: نەک هەر گرنگە و بەس، بەڵکو ئەوپەڕی گرنگە

بۆ روونکردنەوەی بایەخی فۆکەس خستنەسەر مەسەلە گرنگەکان داوات لێ دەکەم ئەو کورتە فیلمە ببینی کە ناوی لێنراوە (نەک هەر گرنگە و بەس، بەڵکو زۆر گرنگە) فیلمەکە بریتییە لە کۆمەڵە چاوپێکەوتنێک کە ئێمە کردومانە لەگەڵ کرێکاری ڕاستەقینەدا نەک ئەکتەر. فیلمەکە بە ئاشکرا پێمان دەڵێت تا چ ئەندازەیەک زوربەی دەزگاکان گیرۆدەی نەبونی گونجاندن و تەمومژاویبوونی ئامانجەکانن. هەرچەند تا

رادمیەکیش مایەی پێکەنینە بەڵام ئاماژەیەکیشە بۆ گیروگرفتەکانی فۆکەسکردن و جێبەجێکردن کە زوربەی دەزگاکان پێوەی دەناڵێنن. تکایە (سی دی)یەکە بخەرە ناو ئامێری تایبەتی نمایشکردنەکەوە و ئەو فیلمە هەڵبژێرە. ئینجا بیر لە دەزگاکەت بکەرەوە و بزانە چەندێکی ئەو فیلمە وەکو حاڵی دەزگاکەی تۆ وایە.

## یاسای دووەم: داهێنانی بۆردی هاندەری ئەنجامدان.

بۆردی ئەنجامدان پارمەتیمان دەدات لە جێبەجێکردنی ئەو پرنسیپەدا کە دەڵێت، ئەگەر ئەنجامی یارییەکە حساب بێت خەڵکەکە بە جۆرێکی دیکە یاری دەکەن. ئایا تۆ هەرگیز کۆمەڵێك منداڵت بینیوە کە لەسەر شەقام یاری بکەن بێئەوەی حساب بۆ ئەنجامی یارییەکە بکەن؟ ئەگەر ئەنجامی یارییەکە حساب نەبێت، ئەوا کەس دڵی ناداتێ و هەریەکە بە ئارەزوی خۆی هەڵسوکەوت دەکات. بەڵام هەر لەگەڵ وترا ئەنجامی یارییەکە حسابە، شتەکە تەواو دەگۆڕێت. یاریکەرەکان زیاتر دڵ دەدەن بە یارییەکەیان و راوێژ بە یەکتری دەکەن و یارییەکە چاکتر دەبێت. بەمشێوەیە یاریزانەکان خێرا خۆیان لەگەڵ بارودۆخە نوێیەکەدا (تەحەدا نوێیەکەدا) دەگونجێنن و خێرایی و جۆش و خرۆشی یارییەکە بە شێوەیەکی دراماتیکی تاو دەسێنن.

هەمان شتیش لە بواری کاردا راستە. ئەگەر سەرکەوتن پێوەری روون و ئاشکرای نەبێت، خەڵکەکە بە تەواوی نازانن ئامانجەکە چییە. ئەگەر پێوەرمان نەبێت ئەوا هەر کەسەو بە چەشنێك لە ئامانجەکە تێدەگات. سەد کەست هەبێت سەد لێکدانەوەی جیاواز بۆ ئامانجەکە دەکەن. لە ئەنجامیشدا خەڵکەکە لە ئامانجەکە لادەدەن و خۆیان بەو کارانەوە خەریك دەکەن کە هەنوکەیین بەڵام گرنگ نین. واتە بەپێی سیستمێکی دیاریکراو نیش ناکەن و بەمەش ئارەزوی کارکردنیان کەم دەبێتەوە. بۆیە زۆر گرنگە تۆ بۆردێکی هاندەری ئەنجامدانت هەبێت کە ببینرێت و هەمو کەس دەستی پێی بگات و گوزارشت بکات لە ئامانجە گرنگەکان و لە پلانە ستراتیجییەکەت. زوربەی گروپەکانی کار نە پێوەری سەرکەوتنیان هەیە و نە خاوەنی رێگەیەکیشن ئاستی ئەو پێشکەوتنەیان نیشان بدات کە بە ئاراستەی ئامانجە گرنگەکانیان بە دەستی دەهێنن. بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لە بواری زیرەکی جێبەجێکاریدا XQ ئێمە کردمان، لە سێ کرێکار تەنیا (یەك) کرێکار بۆ دیاریکردنی ئاستی پێشکەوتن و سەرکەوتنی خۆی

لە بەدیهێنانی ئامانجە بنچینەییەکانیدا دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ پێوەری روون و ئاشکرا. لە کۆی دە کرێکاریش سێ کرێکار باوەڕیان وایە کە خەڵاتکردن و سزادانەکان پەیوەندییان بە شێوازی کاری کرێکارەکەوە هەیە لەکاتی هەوڵداندا بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دیاریکراوەکان. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت بزانە بۆردی ئەنجامدان چەند بەهێزە لە هانداندا. ئەو بۆردە وێنەی واقیعەکەت بە جۆرێک نیشان دەدات کە ناتوانیت بیخەیتە پشت گوێ. سەرکەوتنی ستراتیجی پشتی پێدەبەستێت. مرۆڤ ئەگەر نیشانەیەك نەبینێت کە ئامانجەکەی نیشان بدات، ئەوە پلانە ستراتیجییەکەی تەنیا بریتی دەبێت لە قسە و لە بیرۆکەی رووتوقوت. لەبەرئەوە پێویستە بۆردی هاندەری ئەنجامدان دروست بکەیت و بەردەوام تازەی بکەیتەوە. ئەمە لەڕاستیدا کۆکردنەوەی دوو شتە، دیاریکردنی ئاڕاستە و گونجاندن. کەی؟

لە قۆناغی کۆتایی کارەکەدا.

## چۆنێتی خوڵقاندنی بۆردی هاندەری ئەنجامدان؟

لەڕێی بەشداریکردن و هاوکاریی خوڵقێنەرەوە (پێشەنگ لە جێبەجێکردنی حەوت خووەکەدا) پێوەرە بنچینەییەکانی ئامانجی تیم و دەزگاکەت دیاری بکە و بە نموونەیەك گوزارشتی لێ بکە کە ببینرێت. پێویستە بۆردەکە بە وردی سێ مەسەلە دیاری بکات: لەکوێوە؟ بۆ کوێ؟ کەی؟

١. لیستێك دروست بکە بۆ گرنگترین ریزبەندییەکانت، یاخود بۆ ئامانجە هەرە گرنگەکانت، واتە ئەو ئامانجەی کە پێویستە تیمەکەت ئەنجامی بدەن.

٢. بۆردێکی ئەنجامدان بۆ هەریەك لەم توخمانەی خوارەوە بخوڵقێنە:

- ئەنجامەکەی ئێستا (ئێمە ئێستا لەکوێداین)
- ئەو ئەنجامەی کە دەبێت بەدەستی بهێنین (پێویستە بگەینە کوێ)
- دوا وادە بۆ تەواوکردنی ئامانجەکە (کەی)

دەکرێت بۆردەکە لە شێوەی ستونێکدا بێت، یان هێڵێك بێت، یاخود بازنەیەکی دابەشکراو، یان لە شێوەی هێڵکاری (گانت)دا (Gantt chart). هەروەها ئاساییشە وەکو تێرمۆمەترێك یاخود خێراپێوێك یاخود پێوەرێکی پلەبەندکراو وابێت. بۆت هەیە هەر شێوەیەك لەم شێوانە هەڵبژێریت، بەڵام گرنگ ئەوەیە دیار و دینامیکی بێت و

خەلکەکە دەستی پێی بکات. ئەوەیشت بیرنەچێت کە مادام ئامانج هەمیشە لەناو ئامرازدایە، کەواتە دەتوانیت لەناو بۆردەکەدا چەند پێوەرێك دابنێیت ئاماژەبن بۆ ئەو بەهایانەی کە لەسەر بنەمای پرنسیپەکان دڕێژراون.

٢. بۆردەکە هەڵبواسە و داوا لە کارمەندەکان بکە رۆژانە یاخود هەفتانە (بەپێی پێویست) تەماشای بکەن و پیایدا بچنەوە. وا بکە کۆبونەوەکان دەربارەی بۆردەکە بن. لەگەڵ خەلکەکەدا گفتوگۆی لەبارەوە بکە و هەر کێشەیەکت لەڕێی بۆردەکەوە بینی چارەسەری بکە. پێویستە هەمو ئەندامەکانی تیمەکە بتوانن ئەو بۆردە ببینن کە گۆڕانکارییەکان تیایدا خولەك بە خولەك یاخود رۆژ بە رۆژ یاخود هەفتانە نیشان دەدرێت. پێویستە هەمیشە گفتوگۆی لەبارەوە بکەن. نابێت هەرگیز فەرامۆشی بکەن. ئەم بۆردەی هاندەری ئەنجامدان کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر یارییە وەرزشییەکان، کتوپڕ وەرەکان دەگۆڕێت و خەلکەکە خێراتر کاردەکەن. گفتوگۆکان دەگۆڕێن و خێراتر خەلکەکە لەگەڵ مەسەلە تازەکاندا رادێن و وردتر و خێراتر دەگەنە ئامانجەکان




شێوەی ١٤ - ٥

## یاسای سێیەم: ئامانجە بریقەدارەکان بگۆڕە بۆ کاری دیاریکراو.

دەستنیشانکردنی ئامانج و ستراتیجێکی تازە، مەسەلەیەکە و گۆڕینی ئەو ئامانجە بۆ کار و چالاکی و هەڵسوکەوتی نوێ لە هەمو ئاستەکانی دەزگاکەدا – بە هێڵی یەکمیشەوە – مەسەلەیەکی دیکەیە. جیاوازییەکی گەورە هەیە لەنێوان ستراتیجی ڕاگەیەندراو و ستراتیجی راستەقینەدا. ستراتیجی راگەیەندراو ئەو ستراتیجەیە کە بۆ کارمەندەکانت ئاشکرا کردووە، بەڵام ستراتیجی ڕاستەقینە ئەوەیە کە کارمەندەکان ڕۆژانە دەیکەن. بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك لەوەو پێش بەدەستت نەهێناوە، پێویستە کارێك بکەیت کە لەوەو پێش نەتکردووە. ئەگەر سەرکردەکان ئامانجەکانیان زانی، ئیتر مانای وا نییە خەڵکەکەی ڕیزی یەکەم – شوێنی ڕاستەقینەی کارەکە – دەزانن پێویستە چی بکەن. ئامانجەکان نایەنەدی هەتا هەمو ئەندامانی تیمەکە بە ڕوونی نەزانن ئەرکی سەرشانیان چییە لە جێبەجێکردنی ئامانجەکەدا. پێویستە خەڵکەکەی ڕیزی پێشەوە کاریگەریی دروست بکەن لەسەر خەڵکەکەی دواوە کە کرێکاری داهێنەری سەردەمی زانیارییین. بیرت نەچێت سەرکردایەتی پۆست و پلە و پایە نییە. شتێکە کەسەکە خۆی هەڵیدەبژێرێت و بڕیاری لەسەر دەدات. واتە دەتوانرێت لە هەمو ئاست و شوێنێکدا پەیڕەو بکرێت. ئەوەش بزانە ئەگەر ڕێ و شوێنەکان بسەپێنرێت بەسەریاندا بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکە ئەوان بەرپرسیار نابن لە ئەنجامەکان، بەڵکو بەرپرسیارێتییەکە ڕووبەڕووی تۆ دەبێتەوە و ئەو کاتە ئیتر یاسا ڕەق و تەقەکان جێگەی داهێنان و هەست بە لێپرسینەوە و بڕیاری تاکەکەس دەگرنەوە. بۆ جێبەجێکردنی ئەم یاسایە پێویستە تیمەکەت داهێنەر بێت و هەڵسوکەوتی کاریگەرتر و ئاسانتر و نوێتر دیاری بکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، ئینجا دوای ئەوە پێویستە ئەو ڕێ و شوێنانە بکاتە ئەرکی ڕۆژانە و هەفتانە لەسەر هەمو ئاستەکانی دەزگاکە. ئەمەش لە ناوەڕۆکدا جێبەجێکردنی تواناسازییە لە بواری کاردا.

## یاسای چوارەم: وا بکە هەمو خەڵکەکە هەمیشە لێپرسینەوە لە یەکدی بکەن.

لە زوربەی تیمە چالاکەکاندا خەڵکەکە بەردەوام مانگانە یاخود هەفتانە و تەنانەت ڕۆژانەش کۆدەبنەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و چۆنێتی پشتیوانیکردنی یەکتری و چاوخشاندنەوە بە ئەرکەکاندا و هەروەها بۆ دڵنیابون لە ئەنجامی بۆردی

ئەنجامدانەکە. ئەگەر هەر ئەندامێکی تیمەکە کارێك نەکات کە هەمویان بەشێوەیەکی هەمیشەیی ببنە بەرپرسیار لە جێبەجێکردنی ئامانجەکانی تیمەکەدا ئەوا پرۆسەکە پێش لەدایك بونی لەبار دەچێت. (ڕۆدۆڵف گۆلیانی)ی سەرۆکی شارەوانی نیویۆرك چاکەیەکی زۆری بەسەر ئەو پێشکەوتنەوە هەیە کە شاری (نیویۆرك) بەخۆیەوە بینی. ئەم سەرۆکی شارەوانییە بەشێوەیەکی ڕێکخراو هەمو بەیانییەك لەگەڵ تیمەکەیدا کۆدەبۆوە. مەبەستەکەشی ئەوەبو ڕۆژانە هەمویان بەرپرسیار بکرێن لەو بەرەو پێشچونانەدا کە بەدی دەهێنرێن رووە و ئامانجە بنچینەییەکان. هەر کۆبونەوەیەك هەفتەی (یەك) جار کەمتر بێت و هەموان بەشداری تێدا نەکەن دەبێتە هۆی لەرێ لادانی تیمەکە و نەمانی بایەخپێدان. ئەو تیمەی کە لەناخی خۆیدا تواناسازیی هەبێت هەمیشە و بەردەوام چاوی لەسەر ئامانجەکانێتی لەرێی کۆبونەوەکانی لێپرسینەوەوە کە زوزو دووبارە دەبنەوە. ئەم کۆبونەوانە جیاوازن لە کۆبونەوە تەقلیدییەکانی دیکە کە هەمو شتێکی تێدا باس دەکرێت و خەڵکەکە خواخوایانە کۆبونەوەکە بە زویی کۆتایی بێت بۆئەوەی بڕۆن بە لای ئیشە راستەقینەکەی خۆیانەوە. کۆبونەوەکانی لێپرسینەوە سێ مەبەستی بنەڕەتییان هەیە کە بریتین لە:

- راپۆرتکردنی ئەو شتانەی مەبەستی تۆن
- دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤەکانی سێیەم
- ڕێگە خۆشکردن

راپــۆرتکردنی ئــەو شــتانەی مەبەســتی تــۆن: لــە بەشــی فریــاگوزاری هــەر نەخۆشخانەیەکدا تابلۆیەك دەبینیت نوسراوێکی لەسەرە بەم مەعنایە:" نـەخۆش لێرە بـەپێی ترسـناکیی نەخۆشـییەکەی چارەسـەر دەکرێـت نـەك بـەپێی ئـەوەی کـێ زو هاتبێـت"، تیمـە پزیشـکەکە پرۆسـەیەك ئـەنجام دەدات پـێی دەڵـێن لێ هەڵبـژاردن؛ بەجۆرێك کە نەخۆشییەکان و زەبرو روداوەکان بەپێی رادەی مەترسیداربونیان پۆلێن دەکرێن. لەبەرئـەوە ئەگـەر بـۆ نمونـە دەسـتت شکابو پێویسـتە چـاوەڕێ بکـەیت تـاکو پزیشکەکان لە چارەسەری ئەو نەخۆشە دەبنەوە کە رەنگـە لـە پـاش تـۆ هاتبێـت بـەڵام زەبر بە مێشکی گەیشتووە. لە راپۆرتی لێ هەڵبژاردنیشدا (التقریر الانتقائي) هەر کەسە خێـرا ژمارەیـەکی کـەمی بابەتـە گـرنگ و بنەڕەتییـەکان بـاس دەکـات و مەسـەلە کـەم بایەخەکانی دیکە هەڵدەگرێت بۆ کاتێکی دیکە. پێویستە تیمەکە چاو بخاتە سەر کێشە

گەورەکان و ئەنجامە بنەڕەتییەکان و بابەتە گرنگەکان. ئەمە مانای وانییە کە تەنیا مەسەلە هەنوکەییەکان گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت، بەڵکو مانای وایە کە تەنیا مەسەلە گرنگەکان گفتوگۆیان لەسەر دەکرێت تەنانەت ئەگەر هەندێکیشیان هەنوکەیی نەبون.

ئەم خشتەیەی خوارەوە جیاوازی نێوان کۆبونەوەی تەقلیدی و کۆبونەوەی لە ئەستۆگرتنی چالاکانەی بەرپرسیارێتی روون دەکاتەوە

| کۆبونەوە تەقلیدییەکان | کۆبونەوە چالاکەکانی پەیوەست بە لێپرسینەوە |
| --- | --- |
| "کۆبونەوە کوشندەکان" کە لە کاتێکدا خەڵکەکە بەتەمای چوونە دەرەوەن، خەڵکی دیکە ناچار دەکرێن قسە بکەن. | "ڕاپۆرتی لێ هەڵبژاردن" ڕاپۆرتکردنی خێرای مەسەلە کەم و گرنگەکان. |
| پێومرێك نییە بۆ پێشکەوتن. | گەڕانەوە بۆ بۆردی ئەنجامدان. |
| بەدواداچون نییە. | بەدواداچون هەیە. |
| تەنیا بەڕێوەبەر لە خەڵکەکە دەپرسێتەوە. | لەیەکتر پرسینەوە هەیە. |
| خەڵکەکە کێشەو شکستەکانیان دەشارنەوە. | خەڵکەکە کێشەو شکستەکانیان ئاشکرا دەکەن. |
| تەنیا جەخت لەسەر گیروگرفتەکان دەکرێتەوە. | ئاهەنگ بۆ سەرکەوتنەکان دەگێڕدرێت. |

خشتەی (٧)

## دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤەکانی سێیەم:

لە کۆبونەوەکانی لە ئەستۆگرتنی چالاکانەی بەرپرسیارێتیدا هەمیشە جەختکردنێکی گەورە هەیە لەسەر چۆنێتی دۆزینەوەی ڕێگا بۆ بەدیهێنانی ئامانجە بنەڕەتییەکان. پاساکە ئەوەیە کە ئێمە بۆئەوەی بتوانین ئامانجی تازەی وا بەدی بهێنین کە پێشتر بەدیمان نەهێناوە، پێویستە کارێك بکەین کە پێشتر نەمانکردبێت. ئەمەش مانای وایە پێویستە بەردەوام بەدوای ڕەفتاری چاکتر و نوێتردا بگەڕێین بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە. لەبەرئەوە پێویستە کاری وا بدۆزینەوە کە ببنە ئەڵتەرناتیڤە سێیەمینەکەی کە هەم لە ڕێگاکەی من باشترە و هەم لە ڕێگاکەی تۆ، بگرە بەرهەمی بیرکردنەوەی هاوبەشی هەردووکمانە. جارێکی دیکە وەبیرت دەهێنمەوە کە هاوکاریی

خولقێنەر دەرەنجامی ڕێزگرتنی جیاوازییەکانە؛ واتە جیاوازی و ناکۆکییە تایبەتەکان بخرێنە چوارچێوەی یەکێتی پەیام و بەها و تێڕوانین و ئامانجە هەرە گرنگەکان. دیارە لەم جۆرە کۆبونەوانەدا دەماغ سوتاندن زۆر رودەدات و کاتی گونجاو دەستەبەر دەکرێت بۆ دیالۆگی خولقێنەر.

ئەم خشتەیەی خوارەوە بەراوردکارییە لەنێوان کۆبونەوەی تەقلیدی و کۆبونەوەی چالاکی پەیوەست بە لێپرسینەوەوە

| کۆبونەوە تەقلیدییەکان | کۆبونەوە چالاکەکانی پەیوەست بە لێپرسینەوە (دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤی سێیەم) |
|---|---|
| هەموان قسە دەکەن و کەس چارەسەری پێ نییە | چارەسەری هاریکارییانەی کێشەکان |
| کاتەکەش و کەشوهەواکەش پارمەتیدەر نین بۆ دیالۆگی خولقێنەر. ڕێکەوتن و سازشەکان بە زۆر دەکرێن. | بیرۆکەی تازە دادەهێنرێت<br>١+١= ٣، ١٠، ١٠٠، زیاتریش |
| یەك کەس بلیمەتە | حیکمەتی کۆمەڵ |

خشتەی (٨)

## ڕێگە خۆشکردن:

بەشێکی زۆری سەرکردایەتی چالاك بریتییە لە لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێگا و گونجاندنی نێوان سیستەم و ئامانجەکان بە جۆرێك کە بەرامبەرەکەیشمان بتوانێت ئامانجەکانی خۆی بهێنێتە دی. ئەگەر ڕێکەوتنەکە وابێت کە هەمو لایەك سودی پێ بگات، بەڕێوەبەرەکە قایل دەبێت بە ڕێگە خۆشکردن و ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە تەنیا بەو دەکرێن بۆئەوەی کرێکارەکە بتوانێت ئەرکەکە تەواو بکات.

بێگومان ڕێگە خۆشکردن بۆ خەڵکی دیکە تەنیا ئەرکی بەڕێوەبەرەکە نییە، بەڵکو ئەرکی یەك بەیەکی ئەندامانی تیمەکەیە. لە کۆبونەوەی لە ئەستۆگرتنی چالاکانەی بەرپرسیارێتیدا گوێت لە خەڵکەکە دەبێت دەڵێن: "ڕێگە خۆشکردن چۆنە؟" "من سەرم لەم بابەتە دەرناچێت و پێویستم بە یارمەتی هەیە" "چۆن بتوانین بۆ تەواوکردنی ئەم مەسەلەیە یارمەتیت بدەین؟"

ئەم خشتەیەی خوارەوە بەراوردکارییە لەنێوان کۆبونـەوەی تەقلیـدی و کۆبونـەوەی لە ئەستۆگرتنی چالاکانەی بەرپرسیارێتی:

| کۆبونەوە تەقلیدییەکان | کۆبونـەوەکانی لـە ئەسـتۆگرتنی چـالاکانەی بەرپرسیارێتی (ڕێگە خۆشکردن) |
| --- | --- |
| گیرخـواردن چـونکە لەمپـەرەکان زۆرن و بەتەنیا ناتوانیت بەسەریاندا زاڵ ببیت (بە خۆت لانابرێت.) | نوکە قەڵەمێك بۆ مـن چەند سـەعات ئیشت لـە کۆڵ دەکاتەوە. |
| پێویستە خۆت مەسەلەکان چارسەر بکەیت. | ئێمە لە ڕوبەڕوبونەوەی مەسەلەکەدا پێکەوەین. |
| دەترسیت بڵێیت پێویستم بە یارمەتییە. | ددان بەوەدا دەنێیت کە پێویستت بە یارمەتییە و داواشی دەکەیت. |

خشتەی (٩)

ئەمەش بە کردەوە بریتییە لە گونجاندن لە بواری کاردا.

## گۆڕینی جێبەجێکردنەکە بۆ شێوەیەکی دەزگایی

وەك تێبینی دەکەین چوار پاساکە لەڕاستیدا بریتین لە ڕێگایەك بۆ گۆڕینی ئەو شتەی کە هەمیشە وەك هۆکارێکی بگۆڕ تەنیا ژمارەیەکی کەمی خەڵکە سەرکەوتووەکە پەیڕەوی دەکەن بۆ چەند پاسایەکی وا کە جێبەجێکردنیان هەم قابیلی فێرکردنە و هەم ئەنجامەکەش دەپێکێت و هەم ژمارەی ئەوانەش کە دەیکەن چەند بەرامبەر دەکات. ئێمە لەڕێی لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوەوە بۆمان دەرکەوتووە کە جێبەجێکردنی ئەو چوار پاسایە دەبێتە زیادکردنی توانای تیم و یەکە و دەزگاکان لە بەدیهێنانی ئامانجە گرنگەکانیاندا؛ ئەو کاتە ئیتر جێبەجێکردن بریتی دەبێت لە کارێکی دەزگایی و لەوە دەردەچێت کە مەسەلەیەك بێت بەخت و ڕێکەوت حوکمی بکەن، یاخود بکەوێتە ژێر کۆنتڕۆڵی چەند سەرکردەیەکی کەمەوە. کلیلی وەرگێڕانی کەلتوری جێبەجێکردن بۆ شێوەیەکی دەزگایی لەڕاستیدا بریتییە لە پێوەرێکی ڕێکخراو بۆ ئەم جێبەجێکردنە.

## زیرەکیی جێبەجێکاری (XQ)

دەزگاکان بە گشتی پێویستییان بە ڕێگەیەکی دیکەیە بۆ پێوانەکردنی توانای فۆکەس و جێبەجێکردنیان. ئێمە ئەم ڕێگەیەمان ناوناوە زیرەکیی جێبەجێکاری (XQ)، کە هەڵسەنگاندنی بۆشایی جێبەجێکردنە. واتە ئەو بۆشاییەی کە لە نێوان ئامانجەکان و ئەنجامدانیاندایە. پلەی ئەم زیرەکییە جێبەجێکارییە ئاماژەیەکە چۆنێتی بەڕێوەچونی کارەکە لە ئایندەدا پێشبینی دەکات، هەروەها توانای دەزگاکەش دیاری دەکات لە جێبەجێکردنی ئامانجە هەرە گرنگەکانیدا. ئیتر پێویست ناکات چاوەڕوانی ئەو ئامازانە ببین کە ئاستی کارکردنی تۆیان لە رابردودا دیاری کردووە بۆئەوەی پێت بڵێن کە سەرکەوتو بویت یان نا. ٢٧ پرسیارمان هەڵبژاردووە کە زۆر بە وردی داڕێژراون و دەتوانیت لە ماوەی چارەکە سەعاتێکدا وەڵامیان بدەیتەوە. وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئاراستەی چۆنێتی کارکردنەکەت لە ئایندەدا پێشبینی دەکات. ئایا چی لەوە باشترە هەر سێ مانگ جارێک یاخود هەر شەش مانگ جارێک سەرانسەری دەزگاکە بخەیتە ژێر تاقیکردنەوەی ئەم زیرەکییە جێبەجێکارییە بۆئەوەی وێنەیەکی روونی دەزگاکەت چنگ بکەوێت لە بواری جێبەجێکردن و فۆکەس کردندا؟! ئەمە هێزێکی گەورە بە دەزگاکە دەبەخشێت و دەتوانرێت تاقیکردنەوەکە هەم بە شێوەی فەرمی بکرێت و هەم بە شێوەیەکی نافەرمییش. لەڕاستیدا کلتوری دەزگاکە چەند پێگەیشتوبێت، ئەوەندەش ماوەی نێوان ئەم دو ڕێگا فەرمی و نافەرمییە کەم دەبێتەوە لە کۆکردنەوەی زانیاریدا. پاش ئەوە و بە پشت بەستن بە ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەی زیرەکی جێبەجێکاری دەتوانین کلتورێکی پتەو لە دەزگاکەدا دابمەزرێنین کە یارمەتیمان بدات گونجاندن بەدیبهێنین لە نێوان ئامانجی بەش و پێکهاتە جیاجیاکانی دەزگاکە بە جۆرێک کە بەردەوام جەخت بکرێتە سەر ریزبەندییە ستراتیجییەکانی دەزگاکە و جێبەجێکردنیان. بەمەش نمونەی چاخی کرێکاری زانیاری دەگوێزینەوە بۆ چاخی حیکمەت.

هیوادارم ئیتر وردە وردە درکت بەوە کردبێت کە چۆن خوی هەشتەم (دەنگی خۆت بدۆزەرەوە و واش لە بەرامبەرەکەت بکە ئەویش دەنگی خۆی بدۆزێتەوە) ڕێگەیەکی دیکەیە بۆ دەربڕینی ئەم قسەیەی خوارەوە:

"کرێکاری زانیاری بە توانا بەکاربهێنە، نمونەی مرۆڤی کامڵ. حەوت خووەکە جێبەجێبکە (مەزنیی کەسێتی) و چوار ڕۆڵەکەی سەرکردایەتیکردن (مەزنیی

سەرکردایەتی)و شەش پرنسیپەکەی جێبەجێکردن (مەزنیی دام و دەزگایی) لەسەر ئەم نمونەیە" ئێستاش دەڕۆینە لوتکەی هەشتەمین خوو: چۆن دەنگی خۆمان حەکیمانە بەکاربهێنین لە خزمەتکردنی خەڵکیدا.

## پرسیار و وەڵام

پرسیار: جیاوازی چییە لە نێوان پێنج توخمە پێکهێنەرەکەی ئەو ڕێکەوتنەی کە سود بە هەموان دەگەیەنێت و تۆ بە شێوەیەکی تەقلیدی فێری خەڵکەکەت کردون لەگەڵ چوار یاساکەی جێبەجێکردندا؟

وەڵام: لەسەر ئاستی پرنسیپە بنەڕەتییەکان هیچ جیاوازییەك نییە. جیاوازی تەنیا لە زاراوەکاندایە (ئەو ڕێگەیەی کە وشەکانی پێ پێناسە دەکەین و بەکاری دەهێنین) و هەروەها لەو سیاقەشدایە کە چوار یاساکەی جێبەجێکردنی تێدا دادەنرێت. ڕێگەم بدە مەسەلەکەت بە درێژی بۆ روون بکەمەوە. پێنج توخمە پێکهێنەرەکەی ئەو ڕێکەوتنەی کە سودی گشتی دەستەبەر دەکەن بریتین لە:

١. ئامانجە چاوەڕوانکراوەکان
٢. ڕێنماییەکان
٣. سەرچاوەکان
٤. لێپرسینەوە
٥. سەرەنجامەکان

ئامانجە چاوەڕوانکراوەکان و ڕێنماییەکان لە یەکەم یاسا و دووەم یاسای جێبەجێکردندان؛ دیاریکردنی ئامانجە هەرە گرنگەکان و بۆردی هاندەری ئەنجامدان. وەك پێشتر لەم کتێبەدا باسمان کرد، کەس ناتوانێت ئامانجەکان لە ئامرازەکان جیابکاتەوە. لەبەرئەوە بەدیهێنانی ئەنجامە چاوەڕوانکراوەکان و تەواوکردنی ئامانجە هەرە گرنگەکان تێکەڵی یەکتر دەبن کاتێك کە کارەکان بە ڕێگەیەك ئەنجام بدەیت ڕەچاوی پرنسیپەکان بکەن.

توخمی سێیەم لەو ڕێکەوتنەی کە قازانجی هەموان دەستەبەر دەکات — سەرچاوەکان — خۆی لە سێیەمین یاسای جێبەجێکردندا دەبینێتەوە (گۆڕینی ئامانجە

بریقەدارەکان بۆ کاری دیاریکراو).

هەردوو توخمی چوارەم و پێنجەمیش لەو ڕێکەوتنەی کە سودی هەموان دەستەبەر دەکات – لێپرسینەوە و سەرەنجامەکان – لە یاسای ژمارە چواردا خۆیان حەشارداوە، (لێپرسینەوە لە یەکتری بە شێوەیەکی هەمیشەیی). جا لەبەرئەوەی پێشهاتەکان ئەنجامێکی سروشتی لێپرسینەوەن، کەواتە ئەمانیش دەکەونە ناو یاسای چوارەمەوە.

خەسڵەتە مەزنەکەی ڕێگەی (چوار یاساکەی جێبەجێکردن) لە جێبەجێکردن و توانسازی تیمەکەدا ئەوەیە کە ئەم ڕێگەیە دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەی بۆشاییەکانی جێبەجێکردنە. ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆمان ڕووندەکاتەوە کە چۆن چاخی پیشەسازی ئەم بۆشاییانەی بەرهەم هێناوە و چۆنیش چاخی کرێکاری زانیاری دایاندەخات.

# بەشی پانزەهەم

## چۆن دەنگی خۆمان حەکیمانە لە خزمەتی خەڵکیدا بەکاربهێنین

"من چیتر گەنجێکی چالاک و سەرحاڵ نیم. کاتی خۆم بە تێڕامان و نوێژکردنەوە دەگوزەرێنم و لە جۆلانەیەکدا دادەنیشم و دەرمان دەخۆم و گوێ لە مۆسیقای هێمن دەگرم و بیر لەم گەردونە دەکەمەوە.

بەڵام ئەم چالاکییە هیچ تەحەدایەکی تێدا نییە و بەشداریکردن نییە لە هیچ شتێکدا. ئاواتەخوازم هەڵبستمە سەرپێ و کارێک بکەم. ئاواتەخوازم هەمو رۆژێک کێشەیەکم بێتە رێ و ئامانجێک بەدی بهێنم. ئاواتەخوازم هەمو سەعاتەکانی بێداریم بەکاربهێنم لە هاندانی خەڵکی و پیرۆزبایکردن لەوانەی ئەرکە قورسەکانیان خستۆتە سەر شانیان. ئاواتەخوازم هەمو کاتی خۆم تەرخان بکەم بۆ پتەوکردنی باوەڕ لەناخی خەڵکیدا. بینینی مرۆڤە چاکەکان وەک ئەدرینالین دەڕژێتە دەمارەکانمەوە، بینینی بریسکەی خۆشەویستی لە چاویاندا وزەم پێدەبەخشێت"

- گۆردن بی هنگلی، تەمەن: نەوەدو دو ساڵ

نوستم و لە خەونمدا ژیانم بینی زۆر بەتام بو بێدار بوم و
بینیم ژیان لە خزمەتکردنی خەڵکیدایە کارم کرد و سەرنجم داو تێفکریم
بۆم دەرکەوت چێژی ژیان خزمەتکردنی خەڵکییە

- رابیندرانتث تاگور

" بە بڕوای من سود گەیاندن بە خەڵکی، ئەو ئەرکە هاوبەشەیە کە هەمو مرۆڤایەتی کۆدەکاتەوە، ئاگرە پاکژکەرەوەکەی قوربانیدانیش رۆحە چەپەڵەکەی خۆپەرستی لەناخی مرۆڤ پاک دەکاتەوە و رۆحە مەزنەکەی مرۆڤایەتی ئازاد دەکات"

- جۆن دی. رۆکلەر، جی ئارِ

سەرەتا کە خوێندکار بووم ئازادیم تەنیا هەر بۆ خۆم دەویست، ئەو ئازادییە کاتی و تێپەڕەی کە بتوانم لە ماڵ بچمە دەرێ و چیم پێخۆش بێت ئەوە بخوێنمەوە و کوێم پێخۆش بێت بۆی بچم. دواتر لە قۆناغی لاوێتیدا کە لە ایۆهانسبۆرگ بووم هەوڵی ئەوەم دەدا کە ئازادییە بنچینەییە شەرافەتمەندانەکەم بە دەست بهێنم لەوەی تواناکانی خۆم ئازاد بکەم و بژێوی خۆم دابین بکەم و هاوسەرگیریی بکەم و خێزان پێکەوە بنێم" ئازادییم لەوەدا دەبینی کە نەبمە دیلی جۆرە ژیانێک یاساکان کۆت و پێوەندی بکەن. دواتر وردە وردە بۆم دەرکەوت کە تەنیا هەر من بێ ئازادی نیم بەڵکو خوشک و براکانیشم ئازاد نەبون. لەو کاتەوە ئیتر تینوێتیم بۆ ئازادییەکانی خۆم بوو بەتینوێتییەکی مەزنتر بۆ بەدیهێنانی ئازادی بۆ گەلەکەم.

ئارەزووی بەدیهێنانی ئازادی بۆ گەلەکەم کە ئابڕومەندانە و بەڕێز بژی، رۆحی کرد بە بەر ژیانمدا و گۆڕیمی. لە گەنجێکی ترسنۆکەوە کردمی بە گەنجێکی ئازا، لە پارێزەرێکی بەرگریکارەوە لە یاسا گۆڕیمی بۆ تاوانکار، لە پیاوێکەوە کە خێزانەکەی خۆش دەوێت کردمی بە کابرایەکی دەربەدەری بێ ماڵ و لانە. لەڕاستیدا من لە هیچ کەسێک سەر راستتر و قوربانیدەرتر نیم، بەڵام بە ئەزمون بۆم دەرکەوتووە کە مادام گەلەکەم دیل و ژێر دەستەیە ناتوانم هیچ چێژێک ببینم لەو ئازادییە کەمەی کە پێم بەخشراوە.

- نیلسۆن ماندێلا

پاڵنەرەکەی ناخی مرۆڤ کە هانماندەدات (١) بە دوای دەنگی خۆماندا بگەڕێین و (٢) وا لە خەڵکەکەش بکەین ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە لە یەك ئامانجی مەزنەوە هەڵدەقوڵێت، کە بریتییە لە خزمەتکردنی پێویستییە مرۆڤایەتییەکان. و باشترین ئامرازیشە بۆ بەدیهێنانی هەردوو مەسەلەکە؛ چونکە بەبێ جێبەجێکردنی پێویستییە مرۆڤایەتییەکان ناتوانین بازنەکەی ئازادیمان لە هەڵبژاردن و بڕیارداندا فراوانتر بکەین و گەشەی پێبدەین. گەشەکردنی تایبەتی خۆمان بە خزمەتکردنی دەوروبەرەکەمان چالاکتر و خێراتر دەبێت. پەیوەندییەکانیشمان لەگەڵ یەکتریدا چاکتر و قوڵتر دەبن

کاتێك کە هەوڵ دەدەین خزمەتی خێزانەکەی خۆمان یاخود خێزانێکی دیکە و دەزگا و کۆمەڵگاکەمان و یاخود هەر پێویستییەکی دیکەی مرۆڤایەتی بکەین.

دەزگاکان بۆ خزمەتکردنی پێویستیـیـە مرۆییەکان دروست دەکرێن و هیچیتر. (ڕۆبەرت گرینلیف) لە ژێر ناونیشانی (دەزگا وەکو خزمەتکارێك) بابەتێکی جوانی نوسیوە کە چەمکی خزمەتکردنی بەسەر دەزگادا جێبەجێکردووە.

> خزمەتکردن کرێیەکە دەیدەین هەقی ئەوەی لەم دنیایەدا دەژین
>
> - ناثان ئێلدن تانەر

(ویلیس هارمۆن)ی یەکێك لە دامەزرێنەرانی ئەکادیمیای کاری جیهانیی لەم بارەیەوە دەڵێت: "دەزگاکانی کار بونەتە بەهێزترین دەزگای سەر رووی زەوی. دەزگای دەسەڵاتدار لە هەر کۆمەڵگایەکدا پێویستە بەرگەی خزمەتکردنی هەمو کۆمەڵگا بگرێت. دیارە پێشتر دەزگاکانی کار ئەم ئەرکەیان روبەڕوو نەکراوەتەوە، بەڵکو رۆڵێکی تازەیە کە هێشتا بەباشی قبوڵ نەکراوە و روون نەکراوەتەوە. لە سەرەتادا و دەردی (ئادەم سمیث) وتەنی وا چاوەڕوان دەکرا ئەو نیشانەی کە یەکەکانی کار " بۆ وەڵامدانەوەی هێزەکانی بازاڕ ئەنجامی دەدەن بە ڕێنمایی دەستە نهێنییەکان" بە شێوەیەك لە شێوەکان ئەنجامگەلی چاکیان دەبێت، بەڵام لە دە ساڵی کۆتایی سەدەی بیستەمدا دەرکەوت ئەو دەستە نهێنییە دەلەرزێت. واتە کارەکان پەیوەست بون بە کۆمەڵێك داتا و بەهای بنچینەییەوە کە ئیتر ئەما بون. لەبەرئەوە ئەرکێکی تازە کەوتە ئەستۆی دەزگاکانی کارەوە کە لە هەمو مێژوی سەرمایەداریدا ئەرکی وای نەخرابووە ئەستۆ، ئەویش وەرگرتنی بەرپرسیارێتی هەمو کۆمەڵگایە. بۆیە پێویستە هەمو بڕیارێك کە دەدرێت و هەمو هەنگاوێك کە دەنرێت لە گۆشە نیگای ئەم بەرپرسیارێتییەوە تەماشای بکرێت.

## سەردەمی حیکمەت

پێم وایە هەزارەی سێیەم دەبێت بە سەردەمی حیکمەت؟

لەرێی ئەو بارودۆخەوە کە کوێرەوەری بۆ مرۆڤ دەهێنێت یاخود لەرێی هێزی ویژدانەوە یاخود لەرێی هەردووکیان پێکەوە. بیر لە هەر پێنج سەردەمەکەی

شارستانی بکەرەوە. لە سەردەمی راو و کۆکردنەوەی خۆراکدا تەکنیك بریتی بو لە تیروکەوان. لە سەردەمی کشتوکاڵدا بو بە کەرەستە و ئامێرەکانی کێڵگە، لە سەردەمی پیشەسازیدا بو بە کارگە و لە سەردەمی کرێکارانی زانست و زانیاریدا تەکنیکەکە بو بە مرۆڤ و لە سەردەمی حیکمەتیشدا بریتییە لەو قیبلە نمایەی کە نیشاندەری توانای ئێمەیە لە هەڵبژاردنی ئاراستە و ئامانجەکانماندا و هەروەها ئاستی گوێڕایەڵبونیشمان نیشان دەدات بۆ پرنسیپ و یاسا سروشتییەکان (باکوری موگناتیسی) کە نەگۆڕ و جیهانی و هەمیشەیین.

وەك پێشتر باسمان کرد، لەگەڵ گۆڕینی ژێرخانی هەر سەردەمێك لەو سەردەمانەی پێشودا دەستبەرداری ٩٠٪ی هێزی کار بوین. پێم وایە هەمان مەسەلە ئێستاش رووددەدات کە لە سەردەمی پیشەسازییەوە دەچینە سەردەمی کرێکارانی زانست و زانیارییەوە. پێویستییە تازەکانی کارە تازەکان یاخود خەڵکەکە بێکار دەکات یان ناچاریان دەکات کارەکانیان بگۆڕن. باوەڕم وایە لە ماوەی چەند ساڵێکی دیکەدا ٢٠٪ی دیکەی خەڵکەکە بێکار دەبن.

ئەم سەردەمی زانیارییە بەخێرایی دەبێتە سەردەمی کرێکارانی زانیاری بە جۆرێکی وا کە پێویستە بەردەوام سەرمایەگوزاری بکەین لە پەروەردە و فێرکردندا بۆئەوەی لەم گۆڕانکارییە جێنەمێنین. زوربەی سەرمایەگوزارییەکە لە قوتابخانەکاندا رودەدات. بەڵام ئەوانەی کە ئاگایان لە بارودۆخەکەیە و دیسپلینیان هەیە، بەشێوەیەکی مەنهەجی بەردەوام دەبن لەسەر خوێندن تا دەبنە خاوەنی شارەزایی و زانستیی وا کە بتوانن هەقیقەتەکانی سەردەمی نوێ پێشبینی بکەن و لەگەڵیدا بگونجێن. هیوادارم ئەمە ببێتە مایەی گواستنەوەمان بۆ سەردەمی حیکمەت کە تیایدا زانست و زانیارییەکان دەبێتنرێن بە ئامانج و پرنسیپەکان.

## حیکمەت لە کوێدایە؟

ئێمە دەزانین کە زانست و زانیاری هیچیان حیکمەت نین.

چەند ساڵێك لەمەوبەر کە لە زانکۆ وانەبێژ بوم و لە هەمان کاتدا خۆم بۆ دکتۆرا ئامادە دەکرد چومە لای مامۆستایەك کە هاوڕێشم بو، پێم وت: "دەمەوێت تێزی دکتۆراکەم لەسەر هاندان و سەرکردایەتیکردن بێت و ئەمەش زیاتر مەسەلەیەکی

فەلسەفییە وەك لەوەی پشت بە ئەزموون ببەستێت" پێی وتم، ستیڤن، تۆ هێندە زانیاریت پێ نییە بزانیت ئەو پرسیارە راستانە چین کە پێویستە بیانکەیت" بە واتایەکی دیکە، پێی وتم زانیارییەکەم لە ئاستێکی دیاریکراودایە و پێویست بو فراوانتر بم تا بتوانم دەرمەقەتی ئەو پرسیارانە بێم کە پێویستە بیانکەم. ئەمە وەکو شۆکێك وابو بۆ من چونکە من بە ئەقڵ و بەدڵ (بە گیان و دڵ) حەزم دەکرد لە رەهەندە فەلسەفییەکەوە بچم بۆ بابەتەکە، نەك لەو رەهەندە زانستییەوەی کە دواجار گرتمەبەر بۆ باسکردنی مەسەلەکە. وام دەزانی ئەو تۆزە راهێنانە فەلسەفەییەی کە ساڵانی پێش تەواوکردنی زانکۆ بینیبوم لەگەڵ ئەو زانیارییانەی دوای دەرچون فێریان بوم بەشی ئەوە دەکەن تێزی دکتۆراکەم فەلسەفی بێت. ئێستا دەزانم مامۆستاکەم چەند لەسەر حەق بو. ئەزمونێکی ناخۆش بو.

ئەم وانەیەی خۆ بەزل نەزانینە دایکی زوربەی ئەو وانە و تێروانینانە بو کە ساڵانی دواتر فێریان بوم. لەکۆتاییدا فێربوم کە مرۆڤ هەتا زۆرتر بزانێت، زیاتر ئەو راستییەی بۆ دەردەکەوێت کە زۆر شت نازانێت.

شێوەی (١٥ - ١) ئەم هەقیقەتەت نیشان دەدات. بازنەکە هێمایە بۆ ئەو شتانەی کە دەیانزانیت، دەرەوەی بازنەکەش ئەو شتانەن کە نایانزانیت




شێوەی ١٥ — ١




شێوەی ١٥ — ٢

کە زانیارییەکەت زیاد دەکات، نەزانینەکەت چی بەسەردێت؟ دیارە زیاد دەکات، یان لانی کەم درک کردنت بەو نەزانییە زیاد دەکات (بڕوانە شێوەی ١٥ - ١) لەبەرئەوە هەتا زۆرتر بزانیت زیاتر درک بەوە دەکەیت کە زۆر شت نازانیت. ئەی کەواتە چی روودەدات ئەگەر هەوڵ بدەیت خزمەتی ئامانجگەلێك بکەیت گەورەتربن لە زانیارییەکانت یاخود گەورەتربن لە ناوچەی حەسانەوە تایبەتەکەی خۆت؟ ئەوە بێفیزییەکی راستەقینەت تێدا دروست دەکات و ئەو ئارەزووەش لەناختدا دەچەسپێنێت کە داوای یارمەتی لەخەڵکی بکەیت. یارمەتی لە هاوبەشەکەت یاخود لە تیمەکەت. کارکردن لەگەڵ خەڵکیدا بە سەرکەوتویی وا دەکەن توانا و زانیارییەکانت بەرهەمیان هەبێت و دەبێتە مایەی خولقاندنی تیمی کامڵ، واتە ئەو تیمەی کە ئەندامەکانی دیکە بایی ئەوەندە توانا و زانیاریان هەیە قەرەبوی نەزانی و لاوازی هەر ئەندامێك بدەنەوە. تیمی کامڵ پێویستە ئاوا بێت. تێگەیشتن لەم مەسەلەیە وامان لێدەکات زیاتر پابەندی فێربونی بەردەوام بین، بەتایبەت لە مەسەلەی گرنگ و ترسناکی وەك گەشەپێدانی خۆیی و سەرکردایەتیکردن و پەیوەندییەکان. من پێم وایە مرۆڤ ئەو کاتە دەبێتە خاوەنی حیکمەت کە زانست و زانیارییەکانی ئاوێتە بکات لەگەڵ ئامانج و پرنسیپە بە نرخەکاندا.

دەتوانین بە جۆرێکی دیکە گوزارشت لەمە بکەین و بڵێین حیکمەت کچی سەرڕاستییە؛ زادەی ئەوەیە لەگەڵ پرنسیپەکاندا راستگۆبین. سەرکردایەتیش زادەی بێفیزی و ئازایەتییە. لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین بێفیزی باوکی هەمو خەسڵەتە

پاشەکانە؛ چونکە تۆ کە بێفیز بیت مانای وایە ددانت بەوەدا ناوە کە کۆمەڵێك پرنسیپ و یاسای سروشتی هەن ئەم گەردونە بەڕێوە دەبەن.

> دەتوانین بڵێین بە گەشەکردنی حیکمەت زانیاری کەم دەبێتەوە" چونکە دەتوانرێت وردەکارییەکان لە پرنسیپەکاندا هەڵبهێنجرێن. لەژیاندا وردەکارییە گرنگەکانی زانیاری بەپێی پیشەکە هەڵدەبژێردرێت، بەڵام ئەنجامی کۆتایی حیکمەت ئەوەیە بەکارهێنانی چالاکانەی ئەو پرنسیپانەی کە بە ئاشکرا تێیان گەیشتوین ببێتە نەریت.
>
> - ئەلفرێد نۆرث وایتهێد

ئەمان بەرپرسیارن لە بەڕێوەبردنی ئەم گەردونەدا نەك ئێمە. لەخۆبایبون پێمان دەڵێت کە ئەوە ئێمەین ئەم گەردونە بەڕێوە دەبەین، بەڵام بێفیزی فێرمان دەکات پرنسیپەکان تێبگەین و بەپێی ئەوان بژین. چونکە لەکۆتاییدا هەر ئەوانن سەرئەنجامی کردەوەکانمان کۆنتڕۆڵ دەکەن. ئەگەر بێفیزی باوك بێت، ئەوا ئازایەتی دایکی حیکمەتە چونکە ئەگەر بەڕاستی بمانەوێت بەپێی پرنسیپەکان بژین و لەحاڵەتێکدا پرنسیپەکان پێچەوانەی نەریت و عورف و بەها کۆمەڵایەتییەکان بن ئەوا پێویستمان بە ئازایەتییەکی لە رادەبەدەرە.

> ئازایەتی مانای وانییە ترس ئامادە نییە، بەڵکو قەناعەتکردنە بەوەی کە شتێکی دیکە هەیە لە ترس گرنگترە
>
> - ئامبۆرس رێدموون

بۆردەکەی خوارەوە هەرسێ نەوەکە بە شێوەیەکی بینراو ڕووندەکاتەوە و هەمو خەسڵەتە دژ بەیەکەکانی هەرسێ نەوەکەش نیشان دەدات (بڕوانە شێوەی ١٥ - ٢). تێبینی دەکەیت سەر راستی (بێخەوشیی) دوو منداڵی هەیە، حیکمەت و بەرچاوتێری. مرۆڤ لەرێی فێربون و گوێڕایەڵبونی ویژدانییەوە حیکمەتی چنگ دەکەوێت، بەڵام

بەرچاوتێری زادەی ئەو راستییەیە کە سەرڕاستی وا لە مرۆڤ دەکات لەناخی خۆیدا هەست بە ئاسایش بکات. تۆ ئەگەر گوێ نەدەیتە حوکمی خەڵکی و بەراوردکارییەکانیان ئەوا سەرکەوتنیان لەناخەوە دڵخۆشت دەکات.

بەڵام ئەوانەی کە هەر خەریکی بەراوردکاریین لەڕوی سۆزدارییەوە ناتەواون و هەرگیز دڵخۆش نابن بەسەرکەوتنی خەڵکی دیکە. حیکمەت و بەرچاوتێری ئەو پارادیمانە بەرهەم دەهێنن کە لە کتێبەکەدا باس کراوی، واتە ئەو پارادیمانەی وا لە مرۆڤ دەکات باوەڕی بەخەڵکی هەبێت و ددان بنێت بە توانا و بەهاکانیاندا و بیر لەوە بکاتەوە چۆن ئەو تواناپانە ئازاد بکات نەك کۆنترۆڵیان بکات.




شێوەی ١٥ - ٢

ئەم کۆکردنەوەیەی حیکمەت و بەرچاوتێریی لەراستیدا تواناکانی خەڵکییە لە هەڵبژاردن و بڕیارداندا، هەروەها ڕێزگرتنی ئەوشە کە پاڵنەر لای مرۆڤ پاڵنەرێکی ناوخۆییە. لەبەرئەوە هەر کەسێك دانا و بەرچاوتێربو هەوڵ نادات خەڵکی بەڕێوە ببات و کۆنترۆڵیان بکات یاخود هانیان بدات. ئەم سەرکردانە دەبنە ئیلهامبەخشی خەڵك بەوەی کە لەجیاتی ئەوەی داوایان لێبکرێت، خۆیان کارەکە ئەنجام بدەن. سەرکردەکان حوکمی شتەکان (بێگیانەکان) دەکەن بەڵام رابەرایەتی مرۆڤ دەکەن (تواناسازی). بیر لەوە ناکەنەوە بەرامبەرەکە ئەهێڵن و پەراوێزی بخەن، بەڵکو وا بیردەکەنەوە چۆن لەگەڵ ئەودا بۆ ئەڵتەرناتیفی سێیەم بگەڕێن، کە ڕێگەیەکی مامناوەندی بەرزترە. ئەم سەرکردانە لەناخەوە لێوانلێون لە سوپاس و ڕێز و پێزانینی خەڵکی. وا تەماشای ژیان دەکەن کە سەرچاوەگەلێکی لەبن نەهاتووە، بەتایبەت سەرچاوە مرۆییەکان کە پەیوەستن بە گەشەکردن و هەلی بەردەوامەوە.

## دەسەڵاتی ڕەوشتی و سەرکردایەتیکردن بۆ خزمەتگوزاری

"هیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت ئەوپەڕی توانای خۆم بەکارهێناوە چونکە هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە شتێکی بە نرخت پێمابێت بەکارت نەهێنا بێت."

- داگ هامر شۆڵد

دانایی (حیکمەت) بریتییە لە بەکارهێنانی سودبەخشانەی زانیاری. دانایی بریتییە لەو زانست و زانیارییانە کە دەهێنێنرێن بە ئامانج و پرنسیپە باڵاکان. حیکمەت فێرمان دەکات ڕێزی هەمو کەسێکمان لابێت و جیاوازییەکانیان قبوڵ بکەین. حیکمەت فێرمان دەکات ئەو پرنسیپە ڕەوشتییە رابەرمان بێت کە دەڵێت: خزمەتکردنی خەڵك لەپێش بەرژەوەندییەکانی خۆمانەوەیە. دەسەڵاتی ڕەوشتی بریتییە لە مەزنییە بنەڕەتییەکە (خاڵە بەهێزەکانی کەسێتی) بەڵام دەسەڵاتی فەرمی، مەزنییە لاوەکییەکەیە (پۆست و بەهرە و دەوڵەمەندی و ناوبانگ).

خاڵە سەرنجڕاکێشەکەی دەسەڵاتی ڕەوشتی بریتییە لەو دژبەیەکییەی (پارادۆکس) کە تیایدایە. لە قاموسدا دەسەڵات بریتییە لە فرمان و هێزو حوکمکردن و کۆنترۆڵ و توانا و .. تاد. بەڵام پێچەوانەی دەسەڵات بریتیین لە نەرمونیانی و لاوازی و کۆیلەێتی و ملکەچی. دەسەڵاتی ڕەوشتی ئەوەیە کە بتوانیت لە ڕێگای پەیڕەوکردنی

پرنسیپەکانەوە کاریگەریت هەبێت. دەسەڵاتی فەرمی لەڕێی خزمەتکردنی خەڵکی و بەشداریکردن لە کۆمەڵگادا دێتەدی.

من ناو بەناو کە سەیری رابردوی خۆم دەکەم بەوە توشی شۆک دەبم کە ئەو مەسەلەو بابەتانەی کاتی خۆی بەلامەوە گرنگ و سەرنجڕاکێش بون ئێستاکە زۆر هیچ‌وپوچ و بێ نرخن. بۆ نمونە هەمو جۆرەکانی سەرکەوتن، بەوەی کە چۆن ببمە کەسێکی بەناوبانگ و بە پەنجە ئاماژەم بۆ بکەن و هەروەها مەسەلە چێژبەخشە رواڵەتییەکانی وەکو دەستکەوتنی پارە و ژن و گەشتوگوزار و هەمو ئەو شتانەی کە لەخۆباییبونی مرۆڤ تێردەکەن. ئەمڕۆ کە بە بیرەوەرییەکاندا دەگەڕێمەوە دواوە دەبینم هەمو ئەو مەسەلانەی کە کاتی خۆی هەستی گەورەبونیان پێدەبەخشیم لەڕاستیدا (تراویلکە) سەراب بون یاخود دەردی پاسکاڵ دەڵێت لستنەوەی زەوی بون.

- مالکۆلم مەگریج

هێز و باڵادەستبوونی رەوشت لە بێ‌فیزییەوە هەڵدەقوڵێت؛ ئەو بێ‌فیزییەی کە مەزنترین مرۆڤ دەکات بە خزمەتکاری هەموان. دەسەڵاتی رەوشتی یاخود مەزنییە سەرەتاییەکە بە قوربانیدان دێتەدی. لەم بارەیەوە رۆبێرت گەی. گرین کە دامەزرێنەری هاوچەرخی بزوتنەوەی سەرکردایەتیکردنە بە خزمەتگوزاری، دەڵێت: "ئێستا خەریکە پرنسیپێکی تازەی رەوشتیی سەرهەڵدەدات، کە بریتییە لەوەی تەنیا یەک دەسەڵات شایستەی گوێڕایەڵبونە ئەویش ئەو دەسەڵاتەیە کە مرۆڤ بە حوسن و رەزای خۆی قبوڵی بێت و بگونجێت لەگەڵ ئەو خزمەتگوزارییە روون و ئاشکرایەی کە سەرکردەکە پێشکەشی دەکات. ئەوانەی کە ئەم پرنسیپە پەیڕەو دەکەن هەرگیز دەسەڵاتی باوی ناو دەزگاکانی ئەمڕۆیان قبوڵ نییە، بەڵام زۆر بە ئازادی ئەو کەسانەیان قبوڵە کە وەک سەرکردە هەڵبژێردراون و بە کردەوە سەلماندویانە کە خزمەتگوزاری خەڵکین و شایستەی متمانە پێکردنن. دەتوانین بڵێین لە ئایندەدا ئەم پرنسیپە هێندە بڵاودەبێتەوە کە تەنیا ئەو جۆرە دەزگایانە بەزیندویی دەمێننەوە کە سەرکردە خزمەتکارەکان بەڕێوەیان دەبەن."

من بە ئەزموونی تایبەتی خۆم بۆم دەركەوتووە ئەوانەی لە دەزگا مەزنەكاندا پۆستی باڵایان هەیە سەركردەی خزمەتكارن. لە هەموان زیاتر بێفیزترن و رێزی خەڵكیان لایە، لە هەموان زیاتر كراوەن و ئامادەی فێربوونن، لە هەموان زیاتر رێزی بەرامبەر دەگرن و چاودێری دەكەن. وەكو پێشتر لەم بەشەدا باسم كرد (جیم كۆلینس Jim Collins) كە یەكێكە لە نوسەرەكانی كتێبی (چۆن دەزگایەك دروست دەكەیت بمێنێتەوە)و دانەری كتێبی (لەباشەوە بۆ مەزن) ماوەی پێنج ساڵ خەریكی لێكۆڵینەوەیەك بو لەسەر ئەم پرسیارە: "چی دەتوانێت دەزگایەكی باش بكات بە دەزگایەكی مەزن؟" ئەو ئەنجامە قوڵەی كە كۆلینس بەدەستی هێنا تێروانینی ئێمەی دەربارەی سەركردایەتی گۆڕی. ئەو بەم شێوەیە باسی (ئاستی پێنجەمی سەركردایەتیكردن) دەكات: بەڕێوەبەرە جێبەجێكارە هەرە بەهێزەكان، ئەوانەی كە توانیویانە گۆڕانكاری گەورە بەدی بهێنن لەو دەزگایانەدا كە بەڕێوەیان دەبەن، خاوەنی تێكەڵەیەكی سەیرن لە بێفیزی و پیشەییبوون لە كارگێڕیدا. هەم ترسنۆكن و هەم شەڕەنگێز، هەم شەرمنن و هەم رووهەڵماڵراو. كەسانی نایابن. ئەو راستییەی كە كەس ناتوانێت نكوڵی لێبكات ئەوەیە كە هیچ دەزگایەكی چاك نابێت بە دەزگایەكی مەزن ئەگەر بەڕێوەبەرەكەی سەركردەیەك نەبێت لە ئاستی پێنجەمدا.




شێوەی ١٥ - ٤

تۆ ئەگەر کەسێك بیت خاوەن دەسەڵاتی فەرمی و پۆستێکی باڵا (مەزنیی دووەم) (لاوەکی) بەڵام تەنیا لەوپەڕی ناچاریدا هێز و دەسەڵاتەکەت بەکاربهێنیت ئەوا دەسەڵاتە رەوشتییەکەت بەهێزتر و فراوانتر دەبێت چونکە هەمو کەس تێدەگەن کە تۆ خۆپەرستییت کۆنترۆڵ کردووە و بەسەر ناخی خۆتدا زاڵ بویت و لەبری پەنابردنە بەر هێزی پلەوپایەکەت، لۆجیك و میهرەبانیی و هاوسۆزی و قەناعەتپێکردن و متمانە بەکاردەهێنیت. نوسەری بەناوبانگ جیم کۆلینس لە کتێبەکەیدا (سەرکردایەتیکردن لەپشت دیوارەکانەوە) ئەم پرنسیپەی خستۆتە چوارچێوەیەکی فراوانتری دەزگاوە و دەڵێت:

یەکەم: کەسانی جێبەجێکار پێویستە بەپێی ئامانج و بەها سەرەکییەکانی دەزگاکە ناوخۆی دەزگاکە و دەرەوەی دەزگاکە پێناسە بکەن. ئەم پێناسەکردنە نابێت بەپێی سنورە تەقلیدییەکان بێت.

دووەم: کەسانی جێبەجێکار پێویستە میکانیزمی پەیوەندی و پابەندبونەکان لەسەر بنەمای ئازادیی بڕیاردان و ئارەزووەکان دابڕێژن نەك بە زۆر و تۆپزی.

سێیەم: کەسانی جێبەجێکار پێویستە ئەو راستییە بزانن کە سەرکردایەتیکردنی راستەقینە پەیوەندییەکی پێچەوانەی هەیە لەگەڵ بەکارهێنانی هێزدا.

چوارەم: کەسانی جێبەجێکار پێویستە ئەم راستییەیان قبوڵ بێت: جێبەجێکردنی ئەو مەسەلانەی سەرەوە دیوارە تەقلیدییەکان دەڕوخێنن و دەورو تەنسیری ئەم جۆرە سەرکردایەتیکردنەش بەردەوام فراوانتر دەبێت.

هەندێك جار لەکاتی ئاژاوە و بێسەروبەریدا مانەوەی دەزگاکە پەیوەست دەبێت بەوەی کە دەسەڵاتە فەرمییەکە دەستی پۆڵاینی خۆی بەکاربهێنێت بۆ گێڕانەوەی مەسەلەکان بۆ سەر ڕێگا راستەکە و دابینکردنی سەقامگیری و بەدەستهێنانی تێڕوانینێکی نوێ. بەهەرحاڵ ئەگەر مرۆڤ زوو دەسەڵاتە فەرمییەکە بەکاربهێنێت بە دڵنیاییەوە دەسەڵاتە رەوشتییەکەی لاواز دەبێت. بیرت نەچێت تۆ ئەگەر هێز لە پۆستەکەتەوە وەربگریت، ئەوا لەسێ رەهەندی جۆراوجۆردا لاوازیی دروست دەکەیت: یەکەم لەناخی خۆتدا، چونکە گەشە نادەیت بە دەسەڵاتە رەوشتییەکەت، دووەم لەناو خەڵکیدا، چونکە وایان لێدەکەیت پشت بە دەسەڵاتە رەسمییەکەی تۆ ببەستن و لە هەمو شتێکدا چاویان لە دەستی تۆ بێت، سێیەمینیش لە پەیوەندی نێوان خۆت و ئەوانەی کە رێبەرایەتییان دەکەیت چونکە لەم حاڵەتەدا هیچ شتێکی کراوەی راست لە نێوانتاندا دروست نابێت.

زامنترین ڕێگا بۆ دەرخستنی هێزی کەسایەتی خەڵکانی
دیکە بەوە دەکرێت کە هێزیان پێ ببەخشیت نەک
لە تەنگ و چەڵەمەدا دایان بنێیت.
- ئەبراهام لینکۆڵن

بە شێوەیەکی گشتی دەبینیت ئەو کەسانەی کە خاوەنی دەسەڵاتی بەرزی ڕەوشتیین لە کۆتاییشدا دەسەڵاتە فەرمییەکەیان پێ دەبەخشرێت بۆ نمونە ماندێلا کە بە دامەزرێنەری ئەفریقای باشوری نوێ بەڵام مەرج نییە هەمو جارێك ڕێی ببەخشرێت، بۆ نمونە گاندی باوکی هندستانی نوێ.

هەروەها دەشبینیت کە لە زوربەی زۆری ڕوداوەکاندا ئەگەر خاوەن دەسەڵاتە فەرمییەکە بەپێی پرنسیپەکان دەسەڵاتەکانی بەکارهێنا ئەوا کاریگەرییەکانی بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش زیاتر دەبن. بۆ نمونە جۆرج واشنتۆنی دامەزرێنەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئایا بۆچی دەسەڵاتە ڕەوشتییەکە بە شێوەیەکی کاریگەر دەورو تەئسیری دەسەڵاتە فەرمییەکە زیاد دەکات؟ دیارە ئەو کەسانەی کە پشت بە خەڵکی دیکە دەبەستن زۆر دەکەونە ژێر کاریگەری سەرکردەکەوە لە مەسەلەی پشودرێژی و میهرەبانی و پیاوچاکی و قەناعەتپێکردندا. ئەم هێزە کاریگەرەی کەسایەتی، ویژدانی بەرامبەرەکە بێدار دەکاتەوە و وای لێدەکات لە ڕوی سۆزدارییەوە هاوتا بێت لەگەڵ سەرکردەکەو ئەو مەسەلە و پرنسیپانەی کە لە پێناویاندا کاردەکات. ئیتر ئەگەر هێز و دەسەڵاتە فەرمییەکەی کە زادەی پلەوپایەن بەکاربهێنرێن ئەوا خەڵکەکە بەدڵ دوای سەرکردەکە دەکەون نەك لەترسا، ئەمەش شێوەیەکی دیکەیە لە شێوەکانی ئەڵتەرناتیڤی سێیەم.

ئەمەیە کلیلی ڕاستەقینەی باوکایەتی کە ڕەنگە یەکێك بێت لەو بەرپرسیارێتییە ڕەوشتییە هەرە گەورانەی کە (دەنگی خۆمان) پێمان دەسپێرێت؛ واتە کۆکردنەوەی بێوەرە بەرزەکان و دیسپلینی هەمیشەیی و بەها بەهێزەکان، لەگەڵ خۆشەویستی بێ قەیدو شەرت و میهرەبانیی قوڵ و ڕوخۆشییەکی زۆر. لەبەرئەوە مەزنترین واتای باوکایەتی و کلیلی دروستکردنی خێزانێکی چاك لەوەدایە کە چۆن ئێمە مامەڵە لەگەڵ

ئەو کەسانەدا بکەین کە پەیوەندیمان لەگەڵیاندا بە گەورەترین تاقیکردنەوەی ژیانمان ئەژمار دەکرێت. هەروەها لەکاتی بارودۆخە ئابورییە زەحمەتەکاندا، شتێکی سروشتی دەبێت کە خەڵکەکە ئارەزو بکەن بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی چاخی پیشەسازی کە بریتییە لە حوکم و فەرماندەرکردن، چونکە خەڵك لە ئاسایشی ئابوری خۆی دەترسێت و لەبەرئەوەی کاتێك کە ئەو شێوازە پەیڕەو دەکەن هەست بە ئاسایشی زیاتر دەکەن. هەروەها پێیان خۆش دەبێت زیاتر پشت بە بەرامبەرەکانیان ببەستن و زیاتر گوێڕایەڵی ئەو نمونەیە دەبن کە هەموی لەسەر فرمان و کۆنترۆڵکردن راوەستاوە. بەڵام پێویستە بزانین کە رێك هەر لەم کاتانەدایە نمونەکەی کرێکاری زانیاری هێز و کاریگەریی مەزنی دەبێت، چونکە لە ساتە وەختە سەختەکاندا پێویستە زۆر ببەخشین و کەم وەربگرین. ئەم پرنسیپەش، پرنسیپی بەخشینی زۆر و وەرگرتنی کەم، پەیوەستە بە ئازادکردنی وشە شاردراوەکانی خەڵکەکە لەسەرتاسەی دەزگاکەدا.




شێوەی ١٥ - ٥

ئەمە ئامانجەکەمان بۆ دەستەبەردەکات نەك ئەوەی جارێکی دیکە بکەوینە داوە کۆنەکەی سەردەمی پیشەسازییەوە کە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە بڕیارە گرنگەکان تەنیا

خاوەن پلە و پۆستە باڵاکان رایان بگەیەنن و باقی خەڵکەکەی دیکە هەر جێبەجێکار بن و بە چاوی نامێرەوە تەماشا بکرێن. ئەم شێوازە بە دڵنیاییەوە لە ساتە وەختە زەحمەتەکاندا شکست دەهێنێت. بە کورتییەکەی، پێمان وابێت کە ئێمە دەتوانین لە ساتە وەختە زەحمەتەکاندا بگەڕێینەوە بۆ شێوازی گێزەرو تێلاکە بۆ هاندانی خەڵکی چونکە گوایە ئەم شێوازە سودی لێدەکەوێتەوە، چونکە هەرچەندە ئەم شێوازە رەنگە بتوانێت رزگارت بکات بەڵام هەرگیز باشترین ئەنجامت بۆ دەستەبەر ناکات.

تێبینی جیاوازی بکە لەنێوان سەرکردایەتیکردن وەکو پلەو پۆست (دەسەڵاتی فەرمی) لەگەڵ سەرکردایەتیدا وەکو هەڵبژاردنێکی خۆت (دەسەڵاتی رەوشتی).

| سەرکردایەتیکردن | |
|---|---|
| وەك هەڵبژاردن (دەسەڵاتی رەوشتی) | وەك پلەوپایە (دەسەڵاتی فەرمی) |
| راستی، هێز دروست دەکات | هێزت هەبێت هەمیشت بە دەستەوەیە |
| سەرراستی پابەندبونە | پابەندبون لە سەرو سەرراستییەوەیە |
| رەتکردنەوەی کەللەرەقانە (بە رەش بڵێ رەش) | بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی دەتەوێت بەدڵی خەڵکەکە رەفتار بکە. |
| (هەڵە) بریتییە لەوەی کاری هەڵە بکەیت | (هەڵە) ئەوەیە هەڵەکەت ئاشکرا ببێت |
| رەوشت و هاوسۆزی و لۆجیك | خاوەن پلەوپۆستە باڵاکان باوەڕیان بەم خەسڵەتانە نییە |
| ببەرە پێشەنگێکی باش نەك رەخنەگر | خاوەن پلەو پۆستە باڵاکان ئەم پرنسیپە جێبەجێ ناکەن |
| بایەخدانی زیاتر بە ناوەرۆك نەك بە روخسار | روخسار هەمو شتێکە |
| بپرسە، پێشنیار بکە | "کەس پێی نەوتوم" |
| "نیازم وایە بیکەم" | "ئەوەی پێت وتم کردم و سەری نەگرت ئیتر خەتای من چییە" |
| هەیە و زۆریشە | بەش ناکات |

خشتەی (١٠)

ئێستاش با چەند نمونەیەکی پراکتیکی وەربگرین بزانین کە چۆن هەندێك کۆمەڵگا و کەسایەتی (دەنگی خۆیان) حەکیمانە بەکارهێناوە بۆ خزمەتکردنی پێویستییە

مرۆڤایەتییەکان. هەندێك لەوانە خاوەنی دەسەڵاتی فەرمیین و هەندێکی دیکەشیان تەنیا خاوەنی دەسەڵاتی رەوشتین و هەندێکی دیکەشیان خاوەنی هەردوو جۆرەکەی دەسەڵاتن (فەرمی و رەوشتی) لەوانە سەرکردەیەکی مەزنی سەربازی و ژمارەیەك سەرکردە و سەرۆکی جیهان.

## پۆلیس لە کۆمەڵگادا

لەسەرتاسەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا و هەروەها لە وڵاتانی دیکەشدا، زۆر کۆمەڵگا توانیویەتی لەرێی (کۆمەڵگای مەدەنییەوە – ئەڵتەناتیفی سێیەم) تاوان بە رێژەی ٪٦٠ کەم بکاتەوە.

ئەڵتەرناتیفی یەکەم ئەوەیە پۆلیس خەڵکەکە ناچار بکات بە زۆر یاسا جێبەجێ بکەن

ئەڵتەرناتیفی دووەم ئەوەیە پێوەرەکان دابەزێنیت و لەگەڵ بارودۆخەکەدا خۆت بگونجێنیت (واتە لەگەڵ لاوازییەکەی پێکهاتە رەوشتییەکەی کۆمەڵگادا).

ئەڵتەرناتیفی سێیەم بەکارهێنانی دەسەڵاتی رەوشتییە لە هاندانی هاوڵاتییان و تواناسازییاندا (کۆمەڵگای مەدەنی) بۆئەوەی رۆڵی کاریگەر ببینن لە خۆپاراستن لە تاوان و هەروەها لە دۆزینەوەی تاوانکاراندا، کێ ئەم رۆڵە سەرکردایەتییە دەبینێت؟ ئەفسەری پۆلیس لێرەدا سەرکردەیە.

ئەگەر بەبێ هیچ دوو دڵییەك ئەفسەرەکان خەڵکی باش نەبن (وەك چۆن بەڕێوەبەری پۆلیسی کەرتی لۆس ئەنجلس باسی پێوەرە بەرزەکانی خۆیان دەکات لە هەڵبژاردنی کارمەندەکاندا) ئیتر خەڵکەکە چ مەجبورن (مەبەست لە خەڵکەکە دراوسێکان و مامۆستایان و هاوڵاتیانی ئاسایی و دایکان و باوکانە) هاوکاریی پۆلیس بکەن لە ناسینەوەی تاوانکاران و روبەڕوبونەوەی تاواندا؟

خەڵکەکە ئەگەر پۆلیسی خۆش نەوێت و متمانەی پێیان نەبێت تۆ ناتوانیت نەریت و نسوڵی کۆمەڵایەتی وا لە کۆمەڵگاکەتدا دروست بکەیت کە هاوڵاتیان پێشێلکردنی یاسایان پێ قبوڵ نەکرێت. (ئیمیل دۆرخیم)ی زانای مەزنی بواری کۆمەڵناسی لەمبارەیەوە تێڕوانینێکی بلیمەتانەی هەیە: "لە کۆمەڵگادا ئەگەر نەریت و نسوڵەکان تەواو بن، پێویستت بە یاسا نابێت، خۆ ئەگەر کۆمەڵگا نەریت و نسوڵی ناتەواو بو ناتوانیت بە زۆر خەڵکەکە ناچار بکەیت پابەندی یاساکان بن". هاوڕێیەکم هەیە لە

بواری بەرجەستەكردنی یاسادا راهێنەرە و گوێگرەكانیش زوربەیان سەركردە فەرمییەكانن (بەڕێوەبەر و ئەفسەرانی پۆلیس و سوپا). پرسیارەكەی ئەمەیە: "ئەو سەركردە راستەقینانە كێن كە لەناو كۆمەڵگادا ئاسایش دەپارێزن؟"

وەڵامەكە ئاشكرایە. سەركردە راستەقینەكان ئەو ئەفسەرانەی پۆلیسن كە لە گۆڕەپانەكەدان. ئەو كەسانەن كە پێویستە لەسەریان متمانەی خێزانەكان مسۆگەر بكەن و پەیوەندییان لەگەڵدا دابمەزرێنن و بەشدارییان لەگەڵدا بكەن بۆ قەدەغەكردنی تاوان و لێدانی ئاژیری وریاكردنەوە كە زۆرجار روبەڕوی مەترسییان دەكاتەوە. بەتایبەت كە لە شوێنێكدا دەژین پڕە لە شەقاوە و لە باندەكانی فرۆشتن و بەكارهێنانی مادە هۆشبەرەكان و مەڵبەندی روداوە توندوتیژەكانە. لەم جۆرە بارودۆخانەدا دەسەڵاتە فەرمییەكە هیچی پێناكرێت. نەك هەرئەوە، بەڵكو لەوانەیە ناكامێكی نەرێنی دروست بكات و دابەشبونی كۆمەڵگاكە زیاتر بكات. تەنیا دەسەڵاتە رەوشتییەكە دەتوانێت نەریتی خۆپاراستن لە تاوان و هەواڵ لێدان دروست بكات. ئەمە لە چیرۆكی ئەو شوانە دەچێت كە مەڕەكان دەناسێت و دەیناسن و هێندە بایەخیان پێ دەدات كە ئامادەیە لە پێناویاندا قوربانی بە گیانی خۆی بدات، لەبەرئەوە هەمیشە لەپێش مەڕەكانەوە دەڕوات و مەڕەكان بە دوایەوەن. بەڵام ئەو شوانەی كە بە كرێ گرتووە و هەر بە قسە مەڕەكانی خۆشدەوێت نەك بە كردەوە، ئەوا ئەگەر دەنگی گورگێكی گوێ لێ ببێت خێرا بەجێیان دەهێڵێت و هەمیشە لە دوای مەڕەكانەوە دەڕوات و ناچارە گۆچانەكەی بخاتەكار بۆیان.

> ئەركی بنەڕەتی پۆلیس رێگرتنە لە ئاژاوە و تاوان. پۆلیس بریتی‌یە لە خەڵك و خەڵكیش بریتی‌یە لە پۆلیس. هەردوكیشیان یەك ئەركی هاوبەشیان لەسەر شانە، سەلامەتی كۆمەڵگا
>
> - سێر رۆبرت بیل
>
> دامەزرێنەری پۆلیسی هاوچەرخ

سەركردە فەرمییەكان بەڕێوەبەری راستەقینەن و ئەگەر زۆر باشیش بن رەنگە ببنە سەركردە خزمەتكارەكان. سەركردەی فەرمی دەتوانێت تەكنەلۆجیا بەكاربهێنێت

بۆ دیاریکردنی کێشەکان کە سەرکردە راستەقینەکان (ئەفسەرانی گۆڕەپانەکە) مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. ئای لەو تێگەیشتنە هەڵەیە ئەگەر وا بزانین سەرکردایەتی بە پلەو پۆستە! ئەم نمونە تازەیە بەو چاوە تەماشای ئەفسەرانی پۆلیسی خاوەنی دەسەڵاتی رەوشتی دەکات وەك ئەوەی سەرکردە راستەقینەکان ئەوان بن و باقی خەڵکەکەی دیکەی پۆستە باڵاکان بەڕێوەبەری سیستەمەکانی هاوکاری بن و سەرکردەی خزمەتکاری ئەوانەی خوارەوە بن. ئایا ئەمە گۆڕانکاری نییە لە پارادیم و گۆشەنیگا؟ بەتایبەت لە کاری پۆلیسدا کە بوارێکی هەرەمییەو یەکپارچە فەرمان و حوکمکردن و لێخوڕینە؟ ئەگەر بەباشی بیر لە مەسەلەکە بکەینەوە دەبینین کە ئەم نمونەیە لەسەر پۆلیس نیشانەی ئەوەیە کە دەتوانین مەسەلەکە لە هەمو بوارەکانی دیکەی چالاکییەکانی مرۆڤدا جێبەجێ بکەین، کەسانی ریزی پێشەوە و ئەوانەی کە راستەخۆ کارەکەیان پێسپێردراوە پێویستە دەورو تەنسیریان لەسەر بەرامبەرەکانیان هەبێت، چونکە هەر ئەمانن دەتوانن بە کردەوە رۆڵی سەرکردە راستەقینەکان ببینن لەڕێی دروستکردنی متمانە و فێربونی رێو شوێنی چارەسەرکردنی کێشەکان بە شێوەیەکی داهێنەرانە

## جوشوا لۆرانس چامبرلەین

لە هەمو مێژوی سەربازییدا چیرۆکێك نییە ئیلهام بەخشتربێت لە چیرۆکی (جوشوا لۆرانس چامبرلەین) پاڵەوانی جەنگی ناوخۆ و سەرکردەی هەڵمەتی خۆبەخشەکانی ویلایەتی (مەین). ئەو کاتەی کە ئەبراهام لینکۆڵن داوای لە هاولاتیان کرد لە سوپای فیدراڵیدا ببنە سەربازی خۆبەخش، چامبرلەین – کە مامۆستای کۆلێژی بۆدوین - بو مۆڵەتی پێدرا بۆئەوەی ببێتە یەکێك لەو سەربازە خۆبەخشانە. ئەو لەبەرئەوەی خاوەنی کەسایەتییەکی بەهێز و کاریگەر بو، هەوڵەکەی قبوڵ کرا و وەك سەربازێکی خۆبەخش وەرگیرا. ئەو هەرچەندە شتێکی کەمی لە کاروباری سەربازی دەزانی بەڵام بەخێرایی بەرزبۆوە. یەکێك لە هۆکارەکان ئەوە بو لە شەڕی (گێتس بێرگ)دا لە (لیتڵ راوندتۆپ) ئازایەتییەکی زۆری نواند و ناوبانگی پەیداکرد. فەرمانەکانی ئەم بۆ هێزەکانی بەرەی دەستە چەپی سوپای فیدراڵی ئەوە بو کە لەجێی خۆیان نەجوڵێن و رێگە نەدەن هێزە جودایخوازەکان ئەو بەرەیە تێك بشکێنن. لەگەڵ سەربازەکانیدا بەرگری کرد هەتا دوا فیشەك و ئامادە نەبو خۆی بدات بەدەستەوە.

فەرمانی بە سەربازەکانی کرد حەربەکانیان بکەن بە تفەنگەکانیانەوە و هێرش ببەن بۆ سەر دوژمن. چامبرلەین ئاوا باسی روداوەکە دەکات: "لەو قەیرانە گەورەیەدا فەرمانم کرد حەربەکان ببەستن. ئەو قسەیە بەس بو. وەك تۆپەڵە ئاگرێك رامدەکرد و ریز بە ریزی سەربازەکانم بەسەرکردەوە و هاوارم لێدەکردن کە پێکەوە هێرش بەرن بەرەو لای ئەو دوژمنەی کە ٢٠ مەتر لێمانەوە دوربون. هێرشەکەمان ئەوانیان ترساند. زوربەی ئەوانەی لە ریزی پێشەوە بون چەکەکانیان فرێداو خۆیان دا بە دەستەوە. یەك لە سەربازەکانی دوژمن بە دەستێك تەقەی لێدەکردم و بە دەستەکەی دیکەشی کە شمشێرێکی هەڵگرتبو هێرشی بۆ دەهێنام. زۆر بەخێرایی توانیمان دوژمن لە چەپ و راستەوە گەمارۆ بدەین و بەمەش ریزەکانی دواوە بەدەم تەقەوە پاشەکشێیان کرد. گەلێکمان لێ بەدیل گرتن و دۆڵەکە و هەمو ناوچەکەمان لێ پاك کردنەوە.

زۆرکەس لەو باوەڕەدایە کە ئەم سەرکەوتن و نەبەزدەی (لیتڵ راونتۆپ) پارسەنگی هێزی هەڵگەڕاندەوە لە شەڕەکەی (غێتس بێرگ)و هەمو شەڕی ناوخۆدا. (چامبرلەین) شەرەفی ئەوەی پێ بەخشرا چەکەکانی یەکەی یەکەمی هێزە جودایخوازەکان وەربگرێت کە لە (ئابوماتۆکس)دا خۆی دا بە دەستەوە. لەکۆتایی جەنگەکەدا پلەکەی بەرزکرایەوە و کرا بە سەرکردەی گشتی، دواتریش مەدالیای شەرەفی لە ئەنجومەنی کۆنگرێسی ئەمریکا وەرگرت وەك رێز و پێزانینێك لەو رۆڵە گەورەیەی کە لە (لیتڵ راونتۆپ)دا گێڕابوی. چەند ساڵێك پاش ئەوە هاورێ و هاوکارەکانی ئەو سەردەمی جەنگە، ئەسپێکی رەسەن و ئایابیان بە دیاری پێبەخشی، چامبرلەین دیارییەکەی قبوڵ کرد و بەوپەری سادەییەوە وتی: هەمو خزمەت و قوربانیدانێکم لەو دیارییە زیاتر ناهێنن کە (ئاسودەبونی ویژدان)ەو مرۆڤ لەکاتی بە ئەنجامگەیاندنی ئەرکەکەیدا هەستی پێدەکات.

## سەرۆك کیم دەی - جینگ

لە کۆشکی (شین)لە سیئۆل پایتەختی کۆریای باشور شانسی ئەوەم هەبو مەشق بکەم بە سەرۆکی پێشوی کۆریای باشور و ژمارەیەك لە راوێژکارەکانی. کاتێك کە خولی راهێنانەکە خەریك بو کۆتایی دەهات، سەرۆك (کیم) لێی پرسیم وتی: " دکتۆر کۆڤی، ئایا تۆ بەراستی باوەڕت بەو بابەتانە هەیە کە پێمانی دەڵێیتەوە؟ پرسیارەکەم بەلاوە سەیر بو. ماوەیەك بێدەنگ بوم و پاشان وەڵامم دایەوە: " بەڵێ باوەڕم پێیانە" لێی

پرسیم " چۆن دەزانیت باوەڕت پێیانە" وەڵامم دایەوە: " هەوڵم داوە هەمیشە بە گوێرەی ئەو پرنسیپانە بژیم، ڕەنگە جار بەجارێك لێیان لابدەم، بەڵام یەکسەر دەگەڕێمەوە سەریان. باوەڕم پێیانە و بە ئیلهامبەخشی خۆمیان دەزانم. هەمیشە دەگەڕێمەوە سەریان". وەڵامی دامەوە: " هەر ئەوەندە بەس نییە". وتم: " ئەی چی؟" لێی پرسیم: " ئایا تۆ ئامادەیت لە پێناویاندا بمریت؟" وتم: " وا هەست دەکەم مەسەلەیەك هەیە و دەتەوێت بۆمی باس بکەیت" لەڕاستیشدا هەر وا بوو. بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە کە چیرۆکی ساڵانێکی دوورودرێژ لە سزادان و دوورخستنەوە و زیندانیکردن و هەوڵی تیرۆرکردنی بو کە تەنانەت فەردەیەك بەردیان پێوە بەستووە و فڕێیانداوەتە دەریای (چین) و دواتر کۆپتەرێکی ئەمریکی ڕزگاری کردووە. باسی ئەو گوشارانەی بۆ کردم کە خرابونە سەری بۆئەوەی لەگەڵ ڕژێمە سەربازییەکەی باکوردا هاوکاری بکات. تەنانەت پێیان وتبو ئەگەر هاوکاریمان بکەیت دەتکەینە سەرۆك، بەڵام ئەم هەمو شتانەی ڕەتکردەوە چونکە دەیزانی دەبێتە داردەستی دیکتاتۆریی. هەڕەشەیان لێکرد وتیان ئەگەر هاوکاریمان نەکەیت دەتکوژین، وتی: " بمکوژن، چونکە ئەگەر بمکوژن یەك جار دەمرم، بەڵام ئەگەر هاوکاریتان بکەم ڕۆژی سەدان جار دەمرم".

> "ئێستا درک بەوە دەکەم کە هەمو پیاوێک قوربانی بە ژیانی خۆی دەدات لە پێناوی ئەو شتەدا کە بڕوای پێیەتی، هەمو ژنێکیش قوربانی دەدات بە ژیانی خۆی دەدات لە پێناوی شتێکدا کە بڕوای پێیەتی. مرۆڤی واش هەیە کە بڕوای بە هیچ نییە یاخود بڕوای بە شتی زۆر هەیە. ئەمانە لە پێناوی هیچدا یاخود لە پێناوی شتێکی زۆر بێ نرخدا ژیانی خۆیان دەکەنە قوربانی.
>
> - جوان ئۆڤ ئارک

باسی ئەوەی بۆ کردم کە خێزانەکەی چەند باوەڕیان پێی هەبووە و چۆن لەو ژیانە کارەساتبار و پڕ لە ڕووداوەدا پشتگیریان کردووە. باسی ئەوەشی بۆ کردم کە چۆن وەك کەسێکی کریستیان (مەسیحی) باوەڕ لەدڵیدا هەبووە و چەند باوەڕێکی

ڤۆلی بەوە هەبووە كە دیموكراسی هێزی مەزن و مرۆڤی مەزن دروست دەكات. پێی وتم باوەڕی قوڵم بە مرۆڤ و تواناكانی مرۆڤ و بە مافی رادەربڕین هەیە. پاشان كتێبێكی زۆر تایبەتی پێشكەش كردم كە ئەو نامانەی تێدا بو كاتی خۆی لە زیندانەوە نوسیبونی بۆ دۆستەكانی و باسی باوەڕی پۆلاینی خۆی بۆ دەكردن بەو رێبازەی كە هەڵیبژاردبو.

## دەسەڵاتی رەوشتی وەك پێكهاتەیەكی تەواو

جارێكیان من لەگەڵ سەرۆكی دەوڵەتێكی جیهانی سێدا كارم دەكرد كە وڵاتەكەی گیرۆدەی گەندەڵی و جەنگ و شۆڕش و توندوتیژی بوبو. ئەم سەرۆكە تازەیە پیاوێكی زۆر ئازابو. هەمیشە جەختی لەسەر بایەخی یاسا و دەستور دەكردەوە. زۆر ئازایانەش رای خۆی دەردەبڕی كە ئامادە نییە لەگەڵ تیرۆریستان و رێخراوە تیرۆریستییەكاندا گفتوگۆ بكات. میللەتەكەش رۆژبەڕۆژ زیاتریان خۆشدەویست و متمانەیان پێدەكرد. لێم پرسی وتم: دەتەوێت چ شوێن دەستێك جێبهێڵیت ئەم كارو چالاكییانەت ببنە شتێكی دامودەزگایی. لە قسەكانیدا دیار بو كە بە قەناعەتی ئەو تەنیا هەر دەسەڵاتی رەوشتی كەسێتی بەس نییە، بەڵكو ئەو دەسەڵاتە رەوشتییە پێویستە كە لەسەر تێڕوانین و دەسەڵاتی رەوشتیی دامودەزگایی دامەزرابێت. بە جۆرێكی وا كە میللەتەكەی هەمان تێڕوانینی ئەم دەربارەی ئاشتی و گەشەكردن بگرێتەخۆ. ئەو باوەڕی وابو كە ئاشتی لەرێی یاساوە دەستەبەر دەكرێت و گەشەكردنیش پێویستە لەرێی هاوكاریی دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی سێیەمەوە بێتەدی، ئینجا كۆمەڵگەی مەدەنی وردە وردە دەسەڵاتە كەلتورییە رەوشتییەكەی پێش دەخات چونكە ئەوەی كە لە كۆمەڵگادا یاسا دەپارێزێت و هانی خۆپاراستن دەدات و وا لە خەڵكەكە دەكات خۆیان رۆڵی پۆلیس ببینن ئسوڵ و نەریتەكانە. بە كورتییەكەی ئەم سەرۆكە تازەیە زۆر بەچاكی لە رۆڵی هەشتەمین خوو حاڵی بوبو، دەشیزانی دەسەڵاتی رەوشتی چ پێگەیەكی گرنگی هەیە لەوەی كە مرۆڤ دەنگی خۆی بدۆزێتەوە.

دیارە دەسەڵاتە رەوشتییە كەلتورییەكە هەمیشە زۆر بە هێواشی گەشەدەكات. ئەمە لە هەمو شوێنێكدا وایە، تەنانەت لە ویلایەتە یەكگرتووەكانیشدا. بە هەرحاڵ، گرنگە بزانیت كە هەرچوار جۆرەكەی دەسەڵاتی رەوشتی پێكەوە كۆمەڵەیەكی تەواو (كامل)

دروست دەکەن و هەر چواریشیان پێکەوە بەستراون و بەبێ یەکتری نایانکرێت. دانایی ئەومیە بتوانین ئەو تاڵەدەزووە باریکە ببینین کە ئەم بەشانە پێکەوە دەبەستێتەوە؛

## فیلم: گاندی

دەمەوێت دیمەنێکی دڵڕفێنی فیلمی (گاندی) ببینیت. لەم فیلمەدا کە لەسەر سی دی کتێبەکەیە مرۆڤێکی لاواز و سەر بڵند دەبینێت. مرۆڤێك کە لە پێناوی خۆپەروەردەکردندا لەسەر ئازایەتی و سەر راستی و دیسپلین و بێفیزی و بەرچاوروونیی، هەمو ئەو بەخشش و دیارییانەی بەکارهێناوە کە لەگەڵ لەدایکبونیدا هەیبون. مرۆڤێك دەبینیت کە هەمو زیرەکییەکانی خستە ژێر کۆنترۆڵی ویژدانییەوە، خستیە خزمەت زیرەکییە رۆحییەکەیەوە. مرۆڤێك دەبینیت کە سەرەتا دەبوایە شەڕی پەیوەندی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بباتەوە پێش ئەوەی ببێتە خاوەنی ئازادی و توانا و دەسەڵاتی رەوشتی بۆئەوەی ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتییە تورەکانی هندستان بەرزبکاتەوە بۆ ئەو ئاستەی بەدوای ئەڵتەرناتیفی سێیەمدا بگەڕێن تا ئەو ئاستە کە ئامادەبون قوربانی بدەن بە ژیانی خۆیان لە پێناوی مەسەلەیەکدا کە باوەڕیان پێیەتی. مرۆڤێك دەبینیت کە بایەخی ژیانی خۆی لە پەیڕەوکردنی ئەو حیکمەتە یۆنانییەدا دۆزییەوە کە دەڵێت (خۆت بناسە، خۆت کۆنترۆڵ بکە، خۆت ببەخشە).

گاندی هەرچەندە مرۆڤێکی کامڵ نەبو بەڵام نمونەی مرۆڤێکە کە لەرێی تێڕوانین و دیسپلین و عیشق و گوێڕایەڵیکردنی ویژدانەوە توانی ببێتە خاوەنی دەسەڵاتێکی رەوشتیی مەزن و بەهۆی ئەمەوە دنیا گۆڕانێکی چاکی بە خۆیەوە بینی. هندستان کە (یەك) ملیار و قسور مرۆڤی تێدا دەژی و دووەمین وڵاتی دنیایە لەرووی ژمارەی دانیشتوانەوە، ئەمڕۆ لە سایەی گاندییەوە بۆتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و دیموکراسی. ئایا مایەی سەرسوڕمان نییە کە ئەم پیاوە نە لەرێی هەڵبژاردنەوە هات و نە هیچ دەسەڵاتێکی فەرمیشی هەبو؟ گاندی خۆی دەڵێت؛ هەر مرۆڤێکی ئاسایی ئەو تواناو وزانە بەکاربهێنێت کە لەگەڵیدا لەدایك دەبن دەتوانێت هەمان دەستکەوتەکانی گاندی بەدەست بهێنێت. لەکاتی بینینی ئەم فیلمەدا کە خەڵاتی ئەکادیمی باشترین فیلمی جیهانی بینی، تکایە سەرنج لە جیاوازی وردی وشەکان و لە دەربڕینەکانی روخسار بدە و دەستپێشخەری و هەڵچونەکان شرۆڤە بکە و چۆنێتی گۆڕین و گەشەکردنی نسوڵ و

نەریت و تێڕوانین و بەها و ئامانجەکان ببینە. ئەو ڤیدیۆیە شایستەی ئەوەیە لەگەڵ هاوڕێ و هاوکارەکانتدا بیبینیت. کاتێکی خۆش.

## دیارییە زگماکییەکان و حیکمەت و میراتی کەلتوریمان

ئەو تاڵەدەزووەی کە (دۆزینەوەی دەنگی خۆت و ئیلهامبەخشین بە خەڵکی بۆئەوەی دەنگی خۆیان بدۆزنەوە) پێکەوە دەبەستێت ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە ئێمە هەرچەندە لە رۆژی لەدایکبونمانەوە کۆمەڵێك دیاری مەزنمان لەگەڵدا لەدایك دەبن، بەڵام میراتیە کەلتورییەکەمان – ئەوەی کە بۆ مرۆڤ وەکو بەرنامە وایە بۆ کۆمپیوتەر – رێگە نادات بەچاکی سود لەو دیارییانە وەربگرین. واتە وەك چۆن کۆمپیوتەر بەبێ پرۆگرامی خۆی کارناکات، بەو شێوەیەش مرۆڤ و دادگا و کۆمەڵگاکان ئەگەر لە بیروباوەڕ و ئسوڵ و نەریتە کەلتورییەکانیان دابڕێن ناتوانن ئیش بکەن. ئەڵڵاهومە مەگەر کەسەکە (محەممەد یونس) بێت (بڕوانە بەشی یەکەمی کتێبەکە) کە ویژدانی خۆی پێشەنگی عیشق و دیسپلین و تێڕوانینەکانی بو بۆ خەڵکی، تا لە ئەنجامدا بەرنامە کۆنەکە نەك هەر لە مێشکی خەڵکەکەدا گۆڕان، بەڵکو ئەو بیرۆکە رەق وتەق و کەلەپچە ئاساییانەشدا گۆڕان کە خێزان و دەزگا و کۆمەڵگاکان بەڕێوە دەبەن. ئەمە نمونەیەکی جوانی سەرکەوتنە بەسەر کەللەرەقی و بڕیاری پێش وەختدا. دەتوانین ببینین کە چۆن بێ‌فێزی و ئازایی بونە باوکی سەر راستییەکەی ئەو پیاوە و لەسەرراستیشەوە دانایی و بەرچاوتێری لەناخیدا لەدایك بون. تۆش دەتوانیت هەمان کار ئەنجام بدەیت. دەتوانیت وا بکەیت کە پرۆسەی دۆزینەوەی دەنگی خۆت و ئیلهامبەخشین بە خەڵکیش کە دەنگی خۆیان بدۆزنەوە ببێتە خویەکی رەسەن لەناخی خۆتدا، ئەویش لەرێی زانیاری و شێواز و شارەزاییەوە. تەنیا هەر گوێ لە ویژدانت بگرە، گوێ لە سەرچاوەی حیکمەتی ناو ناخی خۆت بگرە و ببینە چۆن بەرچاو روونیەکی وات تێدا دروست دەبێت کە بتوانیت میراتییە کەلتورییەکە و ئەو شتەش تێبپەڕێنیت کە باسمان کرد بە جۆرێکی وا کە بگەیتە ئاستە جیاجیاکانی پێویستییە مرۆڤایەتییەکان کە لەمەولا باسیان دەکەین. هەر پێویستییەك لەو پێویستییانە بە تێرامانێکی دیاریکراو گوزارشت لە خۆی دەکات لەسەر ئاستی تاکەکەس. ئایا تۆش لەو باوەڕەدا نیت کە مرۆڤ بەدوای ئیسراحەت و پەیوەندیبەستنی باشدا دەگەڕێت لەگەڵ خەڵکیدا؟ بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئایا هەر ئەو مرۆڤە حەزناکات شێوازی ژیانی خۆی و

نەریتەکان بپارێزێت و نەیانگۆڕێت؟ ویژدانە پاراوەکەت بە حیکمەت جیت پێدەڵێت؟

ئایا لەو باوەڕەدا نیت کە مرۆڤ بە شێوەیەك لە شێوەکان پێویستی بەوەیە سەرکەوتنێکی تایبەت بەدەست بهێنێت لەڕێی قوربانیدان بە شتێکی خۆشەویستی خۆی لە پێناوی ئامانجێکی گرنگتر و بەرزتردا، لە پێناوی شتێکدا کە بە راستی دەزانێت؟ یا ئەم تێڕامانە لەسەر ئاستی پەیوەندییەکانیش لەسەر بنەمای متمانە دانەمەزرێن؟

ئایا تۆش وای نابینیت کە زوربەی خەڵکەکە خۆیان بەلاوە گرنگترە لە کەسانی دیکە (ئارەزووەکانم، پێویستییەکانم، مافەکانم)؟ حیکمەت لێرەدا چییە؟

ئایا بەو ئاڕاستەیەدا نامانبات کە جەخت بخەینە سەر پرنسیپەکانی دروستکردنی متمانە و قوربانیدان بە (من) لە پێناوی (ئێمە)دا؟

با ئێستاش تەماشای ئەو دوو تێڕامانەی خوارەوە بکەین لەسەر ئاستی دەزگاکە، ئایا هەمو کەس لەو باوەڕەدا نییە کە بەڕێوەبەرایەتی دەزگاکە زۆری دەوێت لە بەرامبەر کەمدا؛ واتە بەرهەمی زۆر لە بەرامبەر تێچونی کەمدا؛ کارمەندەکانیش موچەی زۆریان دەوێت لە بەرامبەر کات و خۆماندوکردنی کەمدا؟

ئایا ئەمە دیاردەیەکی بەربڵاو نییە؟

ئایا حیکمەت لێرەدا چیمان بەسەردا دەسەپێنێت؟

چی دەڵێیت دەربارەی پەیامە هاوبەشەکە؟ واتە دامەزراندنی رێکەوتن لەسەر دۆزینەوەی ئەڵتەرناتیڤی سێیەم و ئەو بیرکردنەوەیەی کە سود بۆ هەموان بەدی دەهێنێت (براوە — براوە) ئەویش لەڕێی قوربانیدان بە ئارەزوی دەسەڵات. بەم شێوەیەش بەڕێوەبەرایەتی و کارمەندەکان پێکەوە یەك ئاواز لێدەدەن کە توانا شاراوەکانی مرۆڤ ئازاد دەکات و لە بەرامبەر ئەو بڕە کەمەی کە دەستی دەکەوێت بڕێکی زۆر دەبەخشێت.

ئێستا با تێڕامانێکی دیکە وەربگرین کە لە زوربەی دەزگاکاندا مەسەلەیەکی زۆر بەربڵاوە. بە وردی بیر لەم پرسیارە بکەرەوە و بزانە ئەوەی کە جۆری کارەکە دیاری دەکات یاسا ئابورییەکانی بازاڕ نییە؟

بەڵام بیر لەم پرسیارەی دیکەیش بکەرەوە؟

ئایا ئەوەی کە حوکمی دەزگاکان دەکات یاسا کلتورییەکانی کار نییە؟

بە واتایەکی دیکە ئێمە دوو کۆمەڵە یاسای جیاوازمان هەیە کە پێکەوە کار دەکەن؛ یاسا ئابورییەکان و یاسا کلتورییەکان. حیکمەت لێرەدا چییە؟

چی دەبێت ئەگەر بازاڕ ببەینە لای کلتوری شوێنی کارەکە بە جۆرێکی وا کە هەمو کەسێك و هەمو تیمێك بتوانێت زانیاری دەست بکەوێت لەڕێی فیدباکی هاوکارەکانییەوە و هەروەها لەڕێی بۆردی هاوسەنگی ئەنجامدانەوە؟

ئایا ئەم زانیارییانە ئەگەر ئاوێتە بکرێن لەگەڵ هاندەرە ناوەکی و دەرەکییەکاندا ئەو هەستە خۆڕسکە سروشتییە لە کارمەندەکاندا ناجوڵێنێت کە پاڵیان پێوە دەنێت تەواو دڵ بدەنە مەسەلەی دابینکردنی پێویستییەکانی مرۆڤ لە بازاڕدا و پێویستییە مرۆڤایەتییەکانی هەمو خەڵکە پەیوەندیدارەکان؟

دەتوانیت ئەم پڕکردنەوە حەکیمانەیە بەسەر کۆمەڵگاشدا جێبەجێ بکەیت لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ تێڕامانە بنەڕەتییەکەیدا. ئایا تۆش لەو باوەڕەدا نیت کە بەها کۆمەڵایەتییە باڵادەستەکان کۆمەڵگا دەجوڵێنن؟

ئایا لە هەمان کاتیشدا لەو باوەڕەدا نیت هەمو جوڵەیەکی پێچەوانەی پرنسیپ و یاسا سروشتییەکان باجی خۆی هەیە؟

ئەی چی روودەدات ئەگەر هاوئاهەنگی دروست ببێت لەنێوان عورف و بەها و یاساکاندا لە لایەکەوە و پرنسیپەکان لە لایەکی دیکەوە؟ ئەویش لەڕێی قوربانیدان بە سودی تایبەت لە پێناوی سودی گشتیدا.

ئایا ئێستا تێگەیشتیت کە حیکمەت، بە چەمکە گشتییەکەی، خزمەتی پێویستییە مرۆڤایەتییەکان دەکات و هەمو تێڕامانەکانی پێشو چارەسەر دەکات؟

ئایا بۆت دەرکەوتووە کە بۆچی قوربانیدان مەسەلەیەکی زۆر گرنگە؟

قوربانیدان بریتییە لەوەی دەستبەرداری مەسەلەیەکی باش ببیت لەپێناوی مەسەلەیەکی باشتردا، واتا ئەگەر تۆ بەڕاستی تێڕوانینێکی بەهێزت هەبێت بۆ دەستبەرکردنی مەسەلەیەکی دیاریکراو ئەوا تۆ بەو کارە ناڵێیت قوربانیدان تەنانەت ئەگەر خەڵکەکە هەموویان وایان پێوت. ئەم جۆرە لە قوربانیدانە راستگۆیە پوختەی دەسەڵاتی رەوشتییە.

## چارەسەرکردنی کێشەکان لەڕێی نمونەی مەبدەئییەوە

پێشتر لەم کتێبەدا باسی ئەوەمان کرد کە ئەگەر پارادایمەکەی مرۆڤ تەواو پارادایمێکی راست بێت ئەوا ئەو کەسە توانایەکی دەگمەنی دەبێت لە لێکدانەوە و

چارەسەرکردن و تەنانەت پێشبینیکردنی زۆربەی گیروگرفتەکانی ناو دەزگاکەیدا. من ئەم قسەیە بە مەبەست دەکەم و دەزانم دەڵێم چی. من پێم وایە کە نموونەی مرۆڤی کامڵ هەروەها پرۆسە سادەکەی گەشەپێدان دیوە سادەکەی ئاڵۆزی پێك دەهێنن. من بە درێژایی ساڵانێکی زۆر پرسیارم لە سەدان هەزار کەس کردووە لە سەرتاسەری جیهاندا و داوام لێ کردون گەورەترین تەحەدای تایبەتی خۆیان دیاری بکەن؛ ئەو تەحەدایەی کە شەوان خەویان دەزڕێنێت و ئینجا داوام لێکردون کە گەورەترین کێشەی پیشەیی و دەزگایی دیاری بکەن کە هاتونەتە ڕێگایان. ئەم خشتەیەی خوارەوە کورتەی وەڵامە هەرە باوەکانن – تکایە تێبینی بکە بزانە ئەم کورتەیە چەند لەو ئازار و تەحەدایانە دەچێت کە لە پێشەکی ئەم کتێبەدا باسم کردن:

| تەحەدا پیشەییەکان/ دەزگاییەکان | تەحەدا کەسێتییەکان |
|---|---|
| ١. زۆری ئیش، کەمی کات، بێ توانایی لە بەدەستهێنانی ئامانجەکاندا. | ١. دارایی |
| ٢. کات و سەرچاوەکان بەش ناکەن | ٢. هاوسەنگیی ژیان، کەمی کات |
| ٣. کێشە داراییەکان | ٣. تەندروستی |
| ٤. کەمی متمانە | ٤. پەیوەندییەکان – هاوسەر، منداڵ، هاوڕێ |
| ٥. یەکخستنی تواناکان | ٥. پەروەردەکردنی منداڵەکان |
| ٦. گۆڕان و گومان | ٦. گومان لەخۆکردن |
| ٧. پێڕاگەیشتن بە پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان | ٧. گومان، گۆڕان |
| ٨. سەر لێ شێوان – چێژ وەرنەگرتن لە کارەکە | ٨. نە شارەزایی، کەمی زانیاری |
| ٩. چێژی کارەکە – چێژ وەرنەگرتن لە کارەکە | ٩. هەست نەکردن بە مانای ژیان |
| ١٠. سەرۆك و کارگێڕی باڵا سەرڕاست نین. | ١٠. هەست نەکردن بە ئارامی |

خشتەی (١١)

دیسانەوە من دڵنیام کە تۆ دەتوانیت هەرکام لەم تەحەدا تایبەت و دەزگاییانە چارەسەر بکەیت لە چوارچێوەی ئەو پرنسیپانەی کە لەم کتێبەدا باس کراون و لە هەرسێ جۆری مەزنایەتییەکەدا هەن. زۆر بە ئاسانی دەتوانیت یەکێك لەو تەحەدایانە وەربگریت کە ڕووبەڕوت دەبنەوە و ئینجا بیربکەرەوە بزانە تۆ چیت پێ دەکرێت لەڕێی

تێڕوانین و دیسپلین و عیشق و ویژدان و حەوت خووەکە لەسەر ئاستی تاکەکەسی، هەروەها لەڕێی پێشەنگی باش و دیاریکردنی ڕێباز و گونجاندن و تواناسازی وەکو سەرکردەیەک، هەروەها لەڕێی روونکاریی و پابەندبون و گۆڕینی ئامانجە باق‌وبریقەدارەکان بۆ کاری دیاریکراو و هاوکاری و تواناسازی و لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی لە سیاقی پەیامەکە و لە تێڕوانین و بەهاکاندا لەسەر ئاستی دەزگاکە. وەك چۆن چوار رەهەندەکەی دەسەڵاتی رەوشتی پەیوەندییەکی توندوتۆڵی وایان پێکەوە هەیە کە کردبونی بە یەك یەکەی کاریگەر، ئاواش نمونەکانی مەزنایەتی بە هەمو پێکهاتە جیاوازەکانییەوە یەك سیستمی یەکگرتو کۆیان دەکاتەوە کە دەتوانێت پارەمتیدەرت بێت لە روبەروبونەوەی تەحەداکاندا. جارێکی دیکە بروانە نمونەی جێبەجێکردن و فۆکەس کردنی پشت بەستو بە پرنسیپەکان لەم شێوەیەی خوارەوەدا (شێوەی ١٥-٦).




شێوەی ١٥ — ٦

هەروەها مەشقێکی پراکتیکی باشیش دەبێت ئەگەر جارێکی دیکە بگەڕێیتەوە بۆ بابەتەکەی (ماکس و ماکس) و بیرکردنەوە بە شێوازی رووکاری بزوێنەری گۆڕین. پاشکۆی ژمارە حەوت (ماکس و ماکس پاش گۆڕانکاری) نیشانمان دەدات کە چۆن ماکس و مستەر هارۆڵد دەتوانن لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا ئەو هاوێنانە بەکاربهێنن کە پێک هاتوون لە چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتیکردن، بەمەش هەم دەتوانن ستایلی کارکردنیان بگۆڕن و هەم قورسترین تەحەداکانیش چارەسەر دەکەن.

ئێستا دەمەوێت بە شێوەیەکی گەورەتر بڕوانیت لەو هێزی لێکدانەوەیەی کە نمونەی مرۆڤی کامڵ هەڵی گرتووە (جەستە و ئەقڵ و دڵ و رۆح). ئەم نمونەیە مامەڵە دەکات لەگەڵ هەرچوار زیرەکییەکەدا؛ زیرەکی ئەقڵی، زیرەکی سۆزداری، زیرەکی جەستەیی، زیرەکی رۆحی. نمونەی مرۆڤی کامڵ هەر چوار هاندەر و پێویستییە بنچینەییەکانی ئەم ژیانە بەرجەستە دەکات؛ پێویستی ژیان، پێویستی خۆشەویستی، پێویستی فێربوون، پێویستی بەجێهێشتنی شوێن دەست. هەروەها بەرجەستەکەری چوار خەسڵەتەکەی سەرکردایەتیکردنیشە؛ تێڕوانین، دیسپلین، عیشق، کە ویژدان بەڕێوەیان دەبات. لە دواجاریشدا ئەم نمونەیە بەرجەستەکەری هەرچوار خەسڵەتەکەیە لەسەرئاستی دەزگاکان بە خێزانیشەوە ئەویش لە رێگەی هەرچوار رۆڵەکەی پێشەنگی باش‌و دیاریکردنی رێباز و گونجاندن و تواناسازی (بڕوانە شێوەی ١٥-٧).

- دۆزینەوەی دەنگی خۆت لەراستیدا چەمکێکە لە چەمکەکانی هاوکاریکردن و ئەو مانایە دەبەخشێت کە (گشت) گەورەترە لە (کۆی بەشەکان). بە جۆرێکی وا کە ئەگەر رێزی هەرچوار پارچە پێکهێنەرەکەی سروشتی خۆتت گرت و گەشەت پێدان و تەواوت کردن و هاوسەنگیت لەنێوانیاندا دروست کرد، ئەوکاتە ئیتر هەست بە هەمو وزە شاراوەکانی ناخی خۆت دەکەیت و بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە خۆت رازی دەبیت.

دڵت بکەرەوە. رێڕەوی مرۆڤی کامڵ پەیڕەو بکە، جەستە و دڵ و ئەقڵ و رۆح. ئینجا هەست بە بەهێزی ئەم دەربڕینە بکە.

دڵت بکەرەوە (لەروی جەستەوە) واتە خوێنبەرەکانت پاك رابگرە بە پارێزکردن و راهێنانی وەرزشی گونجاو بۆ ئەوەی دڵت بەهێز و سەلامەت بێت.

دڵت بکەرەوە (لەروی سۆزەوە) واتە خەڵك بەشدار بکە لە چارەسەرکردنی کێشەدا و بە قوڵی گوێبگرە تا تێیان دەگەیت.

| | جوار زیرەکییەکە | جوار خەسڵەتەکە | جوار رۆڵەکە | |
|---|---|---|---|---|
| رۆح (پێویستی بۆ بەجێهێشتنی شوێن دەست) | زیرەکی رۆحی | ویژدان | تواناسازیی باش | جێبەجێکردن |
| ئەقڵ (پێویستی فێربوون) | زیرەکی ئەقڵی | دیسپلین | نمونەسازیی | |
| جەستە (پێویستی ژیان) | زیرەکی جەستەیی | دیسپلین | نمونەسازیی | فۆکەسکردن |
| دڵ (پێویستی خۆشەویستی) | زیرەکی سۆزداریی | عیشق | گونجاندن | |

شێوەی ١٥ — ٧

دڵت بکەرەوە (بە رۆح) واتە ژیانت وا لێ بکە کە حیکمەت و دەنگی ویژدانت بەرێوەی ببەن، ئەو ویژدانەی کە پاڵت پێوە دەنێت ئەوکاتە خۆت بدۆزیتەوە کە لە خزمەتکردنی خەڵکی دیکەدا لەناو چوبیت.

ئەو جوار زیرەکییەت لەگەڵ یەکتریدا کۆبکەرەوە و بە گیانی وینستۆن چەرچڵەوە برۆ بۆ سەرکار کە دەڵێت: "هەمو مرۆڤێك لە ژیانیدا هەلێکی دێتە رێ کە کارێکی زۆر تایبەتی وا جێبەجێ بکات لەگەڵ بەهرەکانیدا بگونجێت و لە خەڵکی دیکەی جیاباکاتەوە. ئای لەو کارەساتەی کە کاتێك دەرفەتەکە هەڵدەکەوێت تۆ ئامادە و شایستەی ئەو ئیشە نەبیت کە رەنگە سەرنجراکێشترین ئیش بێت لە ژیانتدا".

## ئەنجامگیریی

لەم کتێبەدا هەوڵم داوە بە شێوەیەکی سەرەکی (یەك) تێگەیشتنی بنەڕەتی روون بکەمەوە کە دەڵێت: مرۆڤ بریتییە لە مرۆڤێکی کامڵ (جەستەو ئەقڵ و دڵ و رۆح). کاتێك من دەست دەکەم بە پرۆسەی وەرگرتنی خووی هەشتەم، کە پێك هاتووە لە

دۆزینــەوەی دەنگــی خــۆم و فراوانکردنــی بازنــەی دەوروتەنســیر، ئــەویش لــەڕێی ئیلهامبەخشین بە خەڵکی، کە ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە، ئەوا من بەو پرۆسەیە ئــازادیی خــۆم و تواناکــانی بڕیــاردانم زیــاتر دەکــەم، بــە جــۆرێکی وا کــە پێویســتییــە مرۆڤایەتییەکان بهێنمە دی و زاڵ ببم بەسەر زۆربــەی ئــەو تەحەدایانــەی کــە ڕووبــەڕوم دەبنــەوە. فێــری ئــەو ڕاســتییەش دەبم کــە ســەرکردایەتیکردن لــە کۆتاییــدا بڕیــار و هەڵبژاردنــە نــەک پلەوپایــە. فێــری ئــەوەش دەبم کــە ســەرکردایەتیکردن وەک هونــەری تواناســازی دەتوانێــت بــە شــێوەیەکی فــراوان لــە دەزگــا و کۆمەڵگاکانــدا بڵاوببێتــەوە. ئەوەشم بــۆ یــەکلایی دەبێتــەوە کە شتە بــێ گیانــەکان کــۆنترۆڵ دەکــرێن، بــەڵام مــرۆڤ ڕێبەرایــەتی دەکرێــت. ســەبارەت بــە پــارادیمی مــرۆڤ ئێمــە ئێســتا دەزانــین کــە هــەمو مرۆڤێك بەنرخە و خاوەنی هێزە و توانایــەکی یــەکجار زۆری هەیــە. هــەروەها ئــەوەش دەزانین کە ڕێگەی چەند بەرابەرکردنی ئەم توانایانە بڕەودانە بەو بەهرەو دیارییانەی لەگەڵماندا لەدایك دەبن. وەك چۆن لە بەهاردا گوڵ دەپشکوێت و تواناکامــان لــەو چوار بوارەدا ئازاد دەبن (جەســتە و ئــەقڵ و دڵ و ڕۆح) بەمــەش دەگەینــە ژیــانێکی بــەهێز و کامڵ و هاوســەنگ. بە پێچەوانەشەوە فەرامۆشکردنی ئەم بەهرە و دیارییانە ڕێك وەکو ئەو ماسولکەیە دەپوکێتەوە و لەناو دەچێت کە بەکاری ناهێنین. هەروەها فێری ئەوەش بوین کە کەلتورەکەی دەوربــەرمان ئێمــەی لەســەر ژیــانێکی ئاســایی پرۆگــرام کــردووە، لەسەر ئەوە پرۆگرامی کردوین کە کەمترین سەرمایەگوزاری بکەین لــە وزەو تواناکانــدا. هەر بابەتێك لە مرۆڤی (کــامڵ) کــەمتر بێــت شــتێکی بــێ گیانــەو شــتە بــێ گیانــەکانیش پێویستە کۆنترۆڵ بکرێن و بەڕێوە ببرێن.

ئــەم شــێوازی پرۆگرامکردنــەی چــاخی پیشەســازی کــە لــە کــۆنترۆلکردن و فەرمانپێکردن پێك هاتووە وا لە خەڵکەکە دەکات بگەنــە ئــەو بــاوەڕەی کــە گــەورەترین سەرچاوەی سامان، سەرمایە و ئامێرەکانــە نــەك مــرۆڤ. هــەروەها ئــەوەش فێربــوین کــە توانای ئەوەمان هەیە سەرلەنوێ خۆمان پرۆگرام بکەینەوە و ئــەم توانایــەش ئیلهامەمان پێ دەبەخشێت تواناسازی ببەخشین بــەو کەســانەی توانــای هەڵبــژاردن و بڕیاردانیــان هەیە و ئەو شتە بێ گیانەش بەڕێوە ببەین کە توانــای ئــەوەیان نــییــە. دیــارە پرۆســەی پێشخســتن ئەگــەر مرۆڤــی کــامڵ ڕەچــاو بکــات وەڵامــی دو پرســیار دەداتــەوە (چۆن؟) و (کەی؟) فێری ئەوەشمان دەکات کــە چــۆن یەکــەمجار بەســەر خۆمانــدا زاڵ ببــین لــەڕێی

قوربانیدان بەو شتەی کە ئێستا دەمانەوێت بۆ ئەو شتەی کە دواتر دەمانەوێت. جێبەجێکردنی ئەم پرۆسەیە بە تێپەڕبونی کات سەرنجڕاکێشتر دەبێت چونکە وامان لێ دەکات زیاتر هێز و وزەمان بەکاربهێنین. ئێمە پێشتر پرنسیپەکانمان بە (فیبلەما) چواند کە هەمیشە رودەکاتە باکور. پەیڕەوکردنیشیان وردە وردە دەسەڵاتە رەوشتیەکەمان بەهێزتر دەکات و زیاتر دەبینە جێگەی متمانەی خەڵکی و ئێمەش ئەگەر بەراستی رێزی ئەو خەڵکە بگرین و تواناو بەهاکانیان بەهەند وەربگرین و بواری بەشداریکردنمان بۆ رەخسا، دەتوانین لەگەڵیاندا تێڕوانینێکی هاوبەش دابڕێژین.

بەدەستهێنانی دەسەڵاتی فەرمی و پلەوپایە (مەزنایەتی دووەم) لەڕێی دەسەڵاتی رەوشتییەوە (مەزنایەتی یەکەم) دەتوانێت بواری ئەوەت پێ ببەخشێت پرنسیپەکان بکەیتە کارێکی دەزگایی وا کە بەردەوام رۆح و جەستە پاراو بکەن و جۆرە سەربەستیی وا بەدەست بهێنیت کە بیرت لێ نەکردۆتەوە و ئەوپەڕی توانا پەیدا بکەیت بۆ فراوانکردن و قوڵکردنەوەی وزەو تواناکانت. بە کورتییەکەی، ئەم جۆرە سەرکردایەتیکردنەی کە ئیلهام دەبەخشێتە لایەنگران تەنیا لەوەوە دەستەبەر دەبێت کە خزمەتکردن بخەیتە سەرو خۆتەوە. هەمو دەزگاکان، بەگشتی و تایبەتەوە، فێری ئەوە دەبن کە مانەوەیان بەندە بە بەدیهێنانی پێویستییە مرۆڤایەتیەکانەوە. جارێکی دیکە دەیڵێمەوە خزمەتکردن لەسەرو خۆمانەوە. ئەمەیە (DNA)یە راستەقینەکەی هۆکاری سەرکەوتن. لێرەدا پرسیارەکە ئەوە نییە چیم دەست دەکەوێت "بەڵکو ئەوەیە" دەتوانم چی پێشکەش بکەم؟"

> بەشوێن خوادا گەڕام و نەمبینی، بەشوێن رۆحی خۆمدا گەڕام بەڵام لە دەستم رای دەکرد، بەشوێن براکەمدا گەڕام کە پێویستییەکەی بۆ جێبەجێ بکەم، هەرسێکیانم پێکەوە دۆزییەوە -خودا و رۆحم و تۆ-
>
> - نەزانراوە

## چەند وشەیەکی کۆتایی

ئەی خوێنەری بەڕێز من باوەڕم هەیە بە تواناو بەهاکانت. هیوادارم پرنسیپەکانی ناو ئەم کتێبە توانیبێتیان روون و ئاشکرا بگەنە لات بۆ ئەوەی درك بە تواناو بەهاکانی

خۆت بکەیت. ئەمە وات لێ دەکات دەنگی خۆت بدۆزیتەوەو ژیانێکی پڕ لە مەزنایەتی ببەیتە سەر لەڕێی ئیلهامبەخشین بە خەڵکیی کە ئەوانیش وەك تاك و دەزگا و کۆمەڵگا دەنگی خۆیان بدۆزنەوە.

تۆ ئەگەر لە دژوارترین بارودۆخیشدا بیت دەتوانیت بارودۆخەکە بکەیتە بانگەوازێك بۆ ئەو وەڵامەی کە بە گونجاوی دەزانیت بۆ خۆت. ئەوکاتە ئیتر ژیان بانگهێشتت دەکات بۆ خزمەتکردنی کەسانی دەوروبەرت کە دەزانیت پێویستییەکانیان چی و چین. ئێمە ئەگەر وا بکەین. دەنگی راستەقینەی خۆمان لە ژیاندا دەدۆزینەوە. (هارۆنی کیلینبێرك) نوسەری ژیاننامەی (فیکتۆر) و (ئیلی فرانکل). (کە ژیان بانگمان دەکات) زۆر بە جوانی ئەم مەسەلەی روون کردۆتەوە لە ژیانی (فرانکل)دا:

"سەبارەت بە فرانکل، چونکە رۆحانییەت لە ناوەڕۆکدا باڵابونی خودی مرۆڤە، لەبەرئەوە ئازادی دێنێت بۆ مرۆڤ. بەڵام ئەم جۆرە سەربەستییە، سەربەستییە (بۆ) نەك سەربەستی بێت (لە). ئێمەی مرۆڤ بەپێی سروشتە بایۆلۆجییەکەمان ئازادنین. واتە نە پاڵنەرە غەریزییەکان و نە خەسڵەتە بۆماوەییەکان و نە ئەو ئەرك و ناتەواوییانەی کە لە مێشك و جەستەماندان، هیچیان رێمان پێ نادەن تەواو سەربەست و ئازاد بین. هەروەها کاریگەرییەکانی ژینگە و گەشەسەندن و کۆمەڵگاش ناهێڵن ببینە خاوەنی ئازادی و سەربەخۆیی. بەڵام خۆشبەختانە لەوەدا ئازادین کە رووبەرووی ئەو هۆکارانە بوەستینەوە و تەنانەت دژیشیان هەڵوێست وەربگرین. ئێمە سەربەستین لەوەی چیمان بوێت ئەنجامی بدەین و ئازادیشین لە هەڵبژاردنی جۆری کاردانەوەمان بەرامبەر بە رووداوەکانی دەستی قەدەر و لە دیاریکردنی ئەو کەس و بابەتانەی کە ژیانی خۆمانیان بۆ تەرخان دەکەین.

ئەم ئازادیە پابەندبونێکمان دەخاتە سەرشان. هەرکەسێك لە ئێمە بەرپرسیاری شتێکە بەرامبەر کەسێك. هەڵسوکەوتکردنمان لەم ژیانەدا بە بەرپرسیارێتییەوە مانایەك دەبەخشێت بە ژیانمان. ئەوی نەتوانێت ئەو واتایە بدۆزێتەوە ئەوا ژیانی تەنیا بریتی دەبێت لە هەوڵ و تەقەلای بەدەستهێنانی چێژی کەسێتی (فرۆید) یاخود هەوڵ و تەقەلا و سەرکەوتنی دارایی و کۆمەڵایەتی (ئەدلەر). مرۆڤ کاتێك کە ئازادیە رۆحییەکەی دەخاتە کار و بەرپرسیارێتی دەخاتە ئەستۆ، ئەم سودانەی پێ دەگات: ویژدانی بێدار و رازیبون لە خۆی و سەریشی رەحەت دەبێت. بەڵام ئەم سودانە بە

شێوەیەکی سروشتی لەگەڵ ئەنجامەکاندا دێن، نەک خۆیان ئەنجامە سەرەکییەکان بن. هەوڵدانی راستەوخۆ بۆ بەدیهێنانی هەرکام لەو سودانە وا دەکات بەدەستهێنانی کارێکی زۆر زەحمەت و تەنانەت مەحاڵیش بێت. هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی سەرێکی رەحەت مرۆڤ توشی شڵەژان و نیگەرانی دەکات. هەروەها هەوڵدانیش بۆ بەدەستهێنانی ویژدانێکی بێدار رەنگە ببێتە هۆی ریاکاری و هەست کردن بە تاوان. مرۆڤ ئەگەر ئامانجە سەرەکییەکەی ژیانی بکاتە ئەوەی چۆن تەندروستی خۆی بپارێزێت ئەوا توشی ئەو حاڵەتە دەبێت کە پێی دەڵێن زەندەقچون لە نەخۆشیی. بەلای فرانکلەوە ئەم سودانە بریتی نین لە کۆمەڵە ئامانجێک کە مرۆڤ لە پێناوی خۆی و بەرژەوەندییەکانیدا هەوڵیان بۆ بدات، بەڵکو بە شێوەیەکی سروشتی روودەکەنە ئەو کەسانەی کە لەپێناوی مەسەلەیەکی مەزنتردا دەژین".

قسەکانی جەنەراڵ (لۆرانس چامبلرەین)تان بیر دەخەمەوە کە دەڵێت:

ئەو ئیلهامەی کە مەسەلەیەکی پیرۆز دەیبەخشێت، زۆربەی پێویستیەکانی مرۆڤ دەستەبەر دەکات و وا لە کەسەکە دەکات ئەو شتانە بەئەنجام بگەیەنێت کە پێشتر نەیدەتوانی. بە تەنیاش نەیدەتوانی. تۆ کە هەست دەکەیت بەشێکیت لە شتێک و پابەندی ئەوییت. ئەوا بەشێك لە سنورەکانی خۆت تێدەپەڕێنیت. مرۆڤ کاتێک هەستی کرد بەشێکە لە مەسەلەیەك کە شوێن و کات تێدەپەڕێنێت دەگاتە ئاستێکی بێسنوری رۆحی و کەسایەتییەکی سەرکەوتوی تێدا دروست دەبێت.

یەکێك لەو کەسایەتیانەی کە زۆرترین کاریگەریی هەبوە لەسەرم، (ستیفن ئێل ریچارد)ی باپیرمە. رێز و خۆشەویستی و دڵبەستەییم بۆی سنوریان نییە. ئەوانەی کە ئاسیویانە بە یەکێك لە حەکیمەکانی لەقەڵەم دەدەن. من خۆم زۆر بە قەرزارباری ئەو دەزانم دەرهەق بەودروشمەی کە سەبارەت بە ژیان فێری کردم: "ژیان پەیامە نەك بیشە، ئامانجی هەمو ئەو شتانەش کە دەیانزانین و فێریان دەبین بریتییە لەوەی کە لەم سەرزەمینەدا بە باشترین شێوە (نوێنەرایەتی خودا بکەین و بە ناوی ئەو و بۆ بەدیهێنانی ویستەکانی ئەو) پەیامەکەمان بەئەنجام بگەیەنین.

## پرسیار و وەڵام

پرسـیار: بۆچـی قوربانیـدان بـە مەسـەلەیەکی بنـەڕەتی لەقەڵـەم دەدرێـت بـۆ بەدیهێنانی دەسەڵاتی رەوشتی؟

وەڵام: قوربانیـدان بریتییـە لـەوەی واز لـە شـتێکی چـاك بهێـنین لـەپێناوی شـتێکی چاکتردا. دەتوانین نـاوی بنـێین بەهەواداچـون (التسامی). مـرۆڤ ئەگـەر خـاوەنی جـۆرە تێڕوانینێـك بێـت سـنورەکانی خـۆی تێبپـەڕێنێت و فۆکـەس بخاتـە سـەر مەسـەلە و پرۆژەیەکی گرنگ کە بە دڵ حەزی لێ بێت، ئەوا بـە ئاسـانی دەشـتوانێت خزمـەتکردنی خـەڵکی بخاتـە سـەرو بەرژەوەندییـەکانی خۆیـەوە. دیـارە ئەوکەسـە مەسـەلەکە بەقوربانیدان لەقەڵەم نادات، بەڵام چاودێرە دەرەکییەکە حسابی قوربانیـدانی بـۆ دەکات چـونکە دەسـتبەرداری شـتێکی باشـی ئێسـتا بـووە. بەختـەوەری و کامـەرانی وەك ئەنجامێکی زیادەی ئەو گردەوەیەی کە ئـەوەی ئێستا دەمانـەوێت دەیخەینـە ژێردەسـتی ئەوەی لە کۆتاییدا دەمانەوێت. قوربانیدان ئاسانترین کارە بۆ کەسێك لەروی سۆزداری و رۆحییەوە پەیوەست بێت بە مەسەلەیەکەوە یاخود بە خزمەتکردنی خەڵکییەوە یاخود بە بانگەوازێکی ناخی خۆیەوە. دانانی خزمەتکردنی خەڵك لە سەرو بەرژەوەندییەکانی خۆتـەوە ئـەو بناغـە رەوشـتییەیە کـە تێکـڕای ئایینـە مەزنـەکان و هـەمو فەلسـەفە و دەروونزانییەکانی لەسەر بنیات نراوە کە بە درێژایی مێژوو ئەمرو پایەدارن. ئـەلبێرت شـوێندەر دەڵێـت نـازانم قـەدەر چـی بـۆ شـاردونەتەوە، بـەڵام دەزانم بەختـەوەری راستەقینەتان ئەو کەسەیە کە رێگەی خزمەتکردنی خەڵکەکەی دۆزیوەتەوە.

پرسیار: جاران باس هەر باسی ئەوەبو چۆن وا بکەین بەرهەمەکان چاك بـن، دواتـر مەسەلەی تواناسازیی هاتە پێشەوە و ئێستاش باسی داهێنـان دەکرێـت. بـەرای تـۆ لـە ئایندەدا جەخت لەسەر چ بابەتێك دەکرێت؟

وەڵام: مـن پـێم وایـە جـەخت لەسـەر دانـایی (حیکمـەت) دەکرێـت. متمانـە تـەنیا ئەوکاتـە دروست دەبێت کـە قـوڵایی دڵ و رۆحـی مـرۆڤ و کـە پەیوەنـدی و کـەلتورە باوەکانی ناو دەزگاکە کۆمەڵێك پرنسیپیان تیادا چەسپبێت. ئەگەر یاسا رەقوتەقـەکان شوێن بـە بۆچوون و حوکمـە کەسـێتییەکان لێـژ بکـەن ئیـتر ناتوانێت کەش‌وهەوایـەك

برەخسێنێت دەستپێشخەری و داهێنانی تێدا بخەملێت و لەبری ئەوە کەلتوری ریاکاریی لە دەزگاکەدا باڵادەست دەبێت. بەبێ متمانەی بەرز و پێکهاتە و رێوشوێنی گونجاوی پشت بەستو بە بەرچاوتێریی ناتوانین چاکی بەرهەم و ئەنجام دەستەبەر بکەین. بە بڕوای من چاخی حیکمەت لەدوای چاخی زانیاری دێت و تیایدا گەوهەری سەرکردایەتیکردن بریتی دەبێت لەوەی کە سەرکردە خزمەتکار بێت.

پرسیار: ئەوەم زۆر بەدڵە کە لە دەزگاکاندا پرنسیپەکان باڵادەست بن. ئایا دەتوانین ئەم چەمکە بگوێزینەوە بۆ ناو کۆمەڵگا؟

وەڵام: بە دڵنیاییەوە دەتوانین. بۆ سەرکەوتنی ئەم گواستنەوەیە پێویستە. بە ئەندازەی ژمارەی پێویست ئەو کەسانەمان هەبێت کە لە بوارەکانی پەروەردە و کار و حکومەت و بوارەکانی دیکەشدا خاوەنی دەسەڵاتە سروشتی و فەرمییەکە بن. هەروەها پێویستیشمان بە ژمارەیەکی گونجاو هەیە لەو کەسانەی کە دەسەڵاتی فەرمییان نییە، بەڵام خاوەنی دەسەڵاتێکی زۆری رەوشتیین و بایەخێکی زۆر بەم مەسەلەیە دەدەن. چونکە سود وەرگرتن لێیان بۆ ئەوەی بەشداری بکەن لە فێرکردن و راهێنانی دەزگا و خێزانەکانی ناو کۆمەڵگا لەسەر حەوت خووەکە و چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتیکردن ئەنجامێکی سەرنجراکێشمان دەداتێ. ئێمە ئەمەمان تاقیکردۆتەوە لە بەشێکی زۆری کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکانی دنیادا.

# هەندێك لەو پرسیارانەی كە زۆر دووبارە دەبنەوە

**پرسیاری (١):** من پێم وایە مەحاڵە بتوانم خووەكانم بگۆڕم. ئایا گۆڕینی خووەكان كارێكە كردەنی؟ یاخود من لە خەڵكەكە جیاوازم؟

**وەڵام:** نەخێر، تۆ تەنیا نیت. ڕێگەم بدە با مەسەلەكەت بۆ روون بكەمەوە. رەنگە لەبیرت بێت، یاخود بە فیلم بینیبێت كە چۆن گەشتی ئەپۆلۆ (١١) بۆ سەرمانگ ئەنجام درا. ئەوانەی رووداوەكەیان بینی تەواو سەرسام بون. باوەڕمان بە چاوی خۆمان نەدەكرد كە چەند پیاوێكمان بینی بەسەر مانگدا دەرۆیشتن. ئایا بە بڕوای تۆ چ بەشێكی ئەو گەشتە زۆربەی هەرە زۆری وزەكەی بردووە؟ ئایا لە بڕینی چارەكە ملیۆن میلێك بەرەو مانگ؟ یان لەكاتی گەڕانەوەدا بۆ زەوی؟ یاخود لە خولانەوەدا بە دەوری مانگدا؟ ئایا لە جیابونەوەی ئەو كەشتییەدا بەكارهێنرا كە لەسەر مانگ نیشتەوە یاخود لە بەگگرتنەوەیدا لەگەڵ كەشتییە دایكانەدا؟ ئایا لە پرۆسەی فڕینی كەشتیەكەدا بەكارهێنرا كە كاتێك لە مانگەوە بەرەو زەوی بەڕێ كەوت؟

وەڵامی هەمو ئەو پرسیارانە نەخێرە. زۆربەی هەرە زۆری وزەكە لە پرۆسەی فڕینەوە لەسەر زەوییەوە بەكارهێنرا. بەجێهێشتنی زەوی بەشی هەرە زۆری وزەكەی برد. ئەو وزەیەی كە بەكارهێنرا لە خولەكانی یەكەمی فڕینەكەدا -میلە سەرەتاییەكانی گەشتەكە- زۆر زیاتر بو لەو وزەیەی كە بەكارهێنرا لە باقی گەشتەكەدا كە چەندین رۆژی خایاند و كەشتیەكە تیایدا چارەكە ملیۆنێك میللی بڕی. هێزی ڕاكێشانی زەوی لەم چەند میلە كەمەی یەكەمدا ئێجگار زۆرە. كارەكە پێویستی بە هێزێكی پاڵنانی ناوخۆی هێندە مەزن هەبو كە بتوانێت زاڵ ببێت بەسەر هێزی كێشی زەوی و هەروەها بەسەر هێزی بەرهەڵستكاری بەرگی زەوپۆشدا (زەوی پۆش) بۆ گەیشتن بە خولگەی زەوی. ئیتر كە لەو هێزەی كێشی زەوی دەربازی بو، قۆناغەكانی دیكە هێندە ئاسان بون كە دەتوانین بڵێین پێویستیان بە وزەیەكی ئەوتۆ نەبو. كاتێك كە پرسیاریان لە كەشتیوانێكی ئەو گەشتە كرد و وتیان كەشتیەكەی كە لەسەر مانگ نیشتەوە پێویستی بە بڕی چەند وزە هەبو بۆ ئەوەی لە كەشتییە دایكانەكە جیاببێتەوە، لە وەڵامدا وتی: كەمتر لە هەناسی منداڵێكی ساوا.

ئەم گەشتە بۆ مانگ روونکردنەوەیەکی باشمان دەداتێ تا بزانین ئێمەی مرۆڤ چەندێك وزەمان پێویستە بۆ ئەوەی واز لە خووە کۆنەکانمان بهێنین و خووی تازە فێرببین. دەتوانین هێزی کێشی زەوی بەو خووانە بچوێنن کە لە ناخماندا چەسپبون و هەروەها بەو ئارەزوانەی ناخی خۆمان کە پرۆگرام کراوین لەسەریان لەلایەن ژینگە و باوان و هۆکارە بۆماوەییەکان و مەسەلە کاریگەرەکانی دیکەوە. دەتوانین فورسیی بەرگی هەوا بەراورد بکەین بەو کەلتورە دەزگایی و کۆمەڵایەتییانەی کە ئێمە بەشێکین لێیان. ئەمانە دوو هێزی مەزنن و پێویستە وزەیەکی ناوخۆیی بەهێزترت هەبێت تا بتوانیت بفڕیت. بەڵام هەر کە فڕینەکە تەواو بو سەرسام دەبیت بەو ئازادییەی کە بەدەستی دەهێنیت. لەکاتی فڕیندا کەشتیوانەکان خاوەنی بڕێکی کەمی توانا و ئازادیی بون. هەمو ئەرکەکەیان تەنیا جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە بو کە پێیان سپێردرابو. بەڵام هەر کە لە کێشی زەوی و لە بەرگی هەوا رزگاریان بو، بڕێکی یەکجار زۆری ئازادییان بەدەست هێنا و بونە خاوەنی زۆر بڕیار و ئەڵتەرناتیف و رێگەچارە. کەواتە گرنگ سەرەتایە. سەرەتای رێکردن بەو رێگەیەدا کە دەتگەیەنێتە ئەوەی دەنگی خۆت بدۆزیتەوە و ئیلهامیش ببەخشیت بە خەڵکی دیکە تا ئەوانیش دەنگی خۆیان بدۆزنەوە. کە ئەمەت کرد ئیتر توانای بەکارهێنانی ئەم خووە تازەیە لە ناختدا گەشە دەکات و دەگۆڕێت، لە دنیایەکدا کە پڕە لە ئاڵۆزی و هەڵوتەحەدا.

**پرسیاری (٢):** ئەو بابەتانەی کە تۆ بە دەرس دەیانڵێیتەوە زۆر سەرسامیان کردوم بەڵام هەمیشە لە خۆم دەپرسم دەڵێم تۆ بڵێیت بتوانم بە راستی جێبەجێیان بکەم؟

**وەڵام:** ئەمە پرسیارێکی زۆر راستگۆیانەیە. بەڵام من پێشنیارت بۆ دەکەم کە پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە دوو پرسیاری دیکە لە خۆت بپرسە:

پرسیاری یەکەم: ئایا پێویستە ئەم کارە بکەم؟ ئەمە پرسیارێکە پەیوەستە بە (بەها)وە.

پرسیاری دووەم: ئایا دەمەوێت ئەوکارە بکەم؟ کە پرسیارێکە پەیوەستە بە هاندانەوە و پەیوەندی بە مێشکی تۆ و بەو دەنگە تایبەتەوە هەیە کە لە خەڵك جیات دەکاتەوە.

ئەگەر وەڵامی هەردوو پرسیارەکە (بەڵێ) بو، تەماشای پرسیاری ئەوە بکە کە ئایا

دەتوانیت ئەم کارە بکەیت؟ واتە ئایا شیاوی کارەکەیت. ئەمەش پەیوەندی بەوەوە هەیە تا چەند زانیاری و مەشقت وەرگرتووە لەسەر کارەکە. تکایە ئەو سێ برِیارە تێکەڵی یەکتری مەکە.

ئەم پرسیارەی کە پەیوەستە بە راهێنانی تۆوە هەوڵ مەدە بە مەشق وەڵامی بدەیتەوە و ئەوەش کە پەیوەستە بە (هاندانەوە) نابێت وەڵامێکی بدەیتەوە پەیوەندی هەبێت بە نرخ و بەهاوە. یاخود پرسیاری شیاوێتی نابێت وەڵامەکەی پەیوەست بێت بە هاندانەوە.

بە روونی و بە وردی بیر لەو سێ پرسیارە بکەرەوە: ئایا دەتوانم بیکەم؟ ئایا دەمەوێت بیکەم؟ ئایا پێویستە بیکەم؟ پرسیارەکان بە جیاوازی بهێڵەرەوە بۆ ئەوەی بتوانیت باشترین خاڵی دەستپێکردن دیاری بکەیت.

**پرسیاری (٣): بۆچی لەم سەردەمەدا مەسەلەی سەرکردایەتیکردن هێندە گرنگ بووە؟**

**وەڵام:** ئابوورییە تازەکەی ئەم سەردەمە بە شێوەیەکی بنچینەیی پشتی بە کاری زانیاری بەستووە. ئەمەش مانای وایە کە سامان چیتر بریتی نییە لە (کاڵا) و پارە، بەڵکو بریتییە لە مرۆڤ واتە بریتییە لە سەرمایە ئەقڵی و کۆمەڵایەتییەکە. لەراستیدا باشترین سەرمایەگوزاریکردن ئەوەیە لە کرێکارانی زانیاریدا سەرمایەگوزاری بکەیت. دەوروتەنسیری کاری زانیاری لەسەر زیادکردنی سامان بە شێوازێکی ماتماتیکی و هێڵکاری نییە، بەڵکو بە شێوەی (توان)ە، واتە (٢ X ٤) نییە بەڵکو ٤ توان دووە. هێزە ململانێکارەکانی کە ئەمڕۆ لە بازاڕدان کارێکیان کردووە کە شێوازی چاخی پیشەسازی باوی نەمێنێت. ئەو شێوازەش کە پشت بەستووە بە کۆنتڕۆڵکردن و جڵەوگرتنە دەستی هەمو کارەکان و تەماشاکردنی خەڵکەکە وەك ئەوەی ئەرك و خەرجی بن. ئێستا هەمولایەك رۆژ بەرۆژ درك زیاتر بەو راستییە دەکەین کە رەهەندە مرۆییەکە، بە تایبەت لەسەر ئاستی متمانە، رەگ و ریشە سەرەکییەکەی تێکڕای کێشەکانە. ئێستا ئەرکە زەحمەتەکە ئەوەیە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکەین. ئەمە راستییەکە کە هەمومان ئەمڕۆ یان سبەی پێویستە هەستی پێ بکەین.

لەبەر ئەمەیە دەوترێت سەرکردایەتیکردن بەرزترین هونەرە، هونەری تواناسازییە.

**پرسیاری (٤):** بەلای منەوە تێکڕای ئەو چەمکانە ئایدیالین و دوورن لە واقیع. کە تەماشای بارودۆخەکەی ئێستا دەکەم گومانم لا دروست دەبێت کە بتوانین ئەم چەمکانە جێبەجێ بکەین. ئایا تۆش وای نابینیت؟

**وەلام:** بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە وەلامی پرسیارێکی قوڵ بدەینەوە کە: ئایا هیچ بۆشاییەك هەیە لەنێوان کارلێك و کاردانەوەدا؟ بە دەربڕینێکی دیکە، ئایا سەرەڕای بارودۆخەکەی دەوروبەرمان ئێمە توانای هەڵبژاردنمان هەیە و هیچ بڕیارێك بەدەست ئێمەیە؟ ئەگەر توانیت بە (بەڵێ) وەلامی ئەم پرسیارە بدەیتەوە بۆت روون دەبێتەوە کە ئایدیالی خۆی لەخۆیدا واقیعیبوونە. تێکڕای داهێنانە گرنگەکانی کە ئێستا ژیانمان لەسەریان راوەستاوە، پێش دۆزینەوە و دروستکردن و داهێنانیان (ئایدیالی) بون. لە سەرەتادا واقیعی نەبون. کە دەشڵێین رەوشتیی مانای وایە ئێمە باسی راست و هەڵە دەکەین. تۆ لە ناخی خۆتدا دەزانیت جیاوازی هەیە لەنێوان راست و هەڵەدا و دەشزانیت ئەگەر شتە راستەکە هەڵبژێریت ئەنجامگەلێکی جیاوازت دەست دەکەوێت لەوەی کە شتە هەڵەکە هەڵبژێریت. لەبەر ئەوە دەڵێم بەڵێ راستە، چەمکەکان هەم ئایدیالین و هەم رەوشتیشن و لەهەمان کاتیشدا واقیعین.

**پرسیاری (٥):** مەبەستت لەم قسەیە چییە کە دەڵێیت دەسەلاتە رەوشتییە کەلتورییەکە پێشکەوتوترین شێوەیە لە شێوەکانی دەسەلاتی رەوشتی؟

**وەلام:** بۆ وەلامی ئەم پرسیارە راگەیاندنی سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە نمونە وەربگرە.

بیرۆکەکانی ناو ئەو راگەیاندنە دەسەلاتێکی رەوشتییە کە تێڕوانین (دید) دروستی کردوون. دەستور هەوڵی داوە ئەم بەهایانە بکاتە کارێکی دامودەزگایی مەبەستیش لە بەهاکان ئەم نمونانەن: "پیاوان هەمو یەکسان خەلق کراون" خواوەند چەند مافێکی دیاریکراوی پێبەخشیون کە نابێت لێیان زەوت بکرێت. وەك مافی ژیان و ئازادی و هەوڵی بەدەستهێنانی کامەرانی. دەستورەکە هاوئاهەنگ بو لەگەڵ کۆی سیستمی تێڕوانین و بەهاکانی کە لە راگەیاندنی سەربەخۆیدا باسیان کرابو. راگەیاندنەکە دەڵێت (هەمو پیاوان) چونکە ئەوکاتە ژنان هێشتا مافی هەڵبژاردنیان بەدەست

نەهێنابو بەڵکو چەند (دەیە)یەك پاش ئەوە بەدەستیان هێنا. هەروەها زۆربەی دامەزرێنەرەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان خۆیان کۆیلەیان هەبو. راگەیاندنی ئازادکردنی کۆیلەکان هەشتا ساڵ دواتر هات و هەتا ئێستاش لە کۆمەڵگای ئەمریکایدا پاشماوەکانی رەگەزپەرستی هەستیان پێ دەکرێت.

هەمیشە دەسەڵاتە رەوشتییە کەلتورییەکە هێواشتر لە دەسەڵاتە رەوشتییە رێکخراوە بینراوەکە گەشە دەکات کە لەسەر کاری دەزگایی و تیۆروانین دروست بووە، بەڵام لە کۆتایدا دەبێتە کلیلی پێشخستنی کۆمەڵگایەك کە گرنگترین خەسڵەتی بریتیی بێت لە پێکەوە گونجان. لێرەدا کلیلەکە حکومەت نییە کە نوێنەری هێز و یاسایە، هەروەها ئەو خەڵك و دەزگا تایبەتانەش نین کە نوێنەری ئازادیین. بەڵکو کلیلەکە ئەو کەس و گروپانەن کە پێکەوە واتاو بەها هاوبەشکان لەخۆ دەگرن، ئەو واتاو بەهایانەی کە بە دڵ و مێشك پابەندن پێیانەوە. خۆبەخشیی نواندن لەم ئاستەدا ئەو کۆمەڵگا مەدەنییە دادەمەزرێنێت کە لەنێوان یاسا و ئازادیدا ئەڵتەرناتیڤی سێیەم دروست دەکات. ئەم چەمکە بەردی بناغەی بیرکردنەوەی (ئادەم سمیث)ی نوسەری کتێبی (سامانی نەتەوەکانە). پێش نوسینی ئەم کتێبە بە ماوەیەکی زۆر، (ئادەم سمیث) کتێبێکی دیکەی نوسیبو لەژێر ناونیشانی (تیۆری بیرۆکە رەوشتییەکان). ئەم کتێبە بووە بنچینەی کتێبەکانی ئایندەی ئەو، بە کتێبی (سامانی نەتەوەکان)یشەوە و لەسەر ئەو بیرۆکەیە دارێژراوە کە مرۆڤدۆستی و نیازچاکی بناغەی ئەو سیستمە ئابوورییەن کە ئازادیی بازاڕ و سیستمی سیاسی دیموکراسی دەیهێننە ئاراوە. ئادەم سمیث باوەڕی وایە دورکەوتنەوەی تاکەکانی کۆمەڵ لەو خەسڵەتە چاکانە بە روخاندنی بازاڕی ئازاد و سیستمی دیموکراسی دەشکێتەوە.

**پرسیاری (٦):** تۆ دەڵێیت یەکێك لە کێشە بنەڕەتییەکان ئەوەیە ئێمە لەسەردەمی کرێکارانی زانیاریدایین کەچی کەرستەو نمونە و پێوەرەکانی سەردەمی پیشەسازی تێدا بەکاردەهێنین. ئایا ئێمە هێشتا هەر نەوەیەکی پیشەسازین؟ تەماشا بکە، لە هەمو شوێنێك پیشەسازی دەبینیت.

**وەڵام:** ئەم قسەیە راستە، بەڵام سروشتی هەمو کارە خاوەن زێدەباییەکەی ئێستا کە لە پیشەسازییە جۆربەجۆرەکاندا ئەنجام دەدرێن لە سایەی کرێکارانی زانیارییەوەیە

نەك لە سایەی كرێكارانی دەستییەوە. كەواتە ئێمە ئێستا باسی ئەوە ناكەین واز لە پیشەسازی بهێنین، بەڵكو ئێمە ئێستا باسی بەكارهێنانی پارادیمێكی جیاواز دەكەین دەربارەی سەركردایەتیكردن لەناو ئەو پیشەسازییانەدا. ئەوی راستی بێت دەتوانین ئەم پارادیمە تەنانەت لە بواری كشتوكاڵیشدا بەكاربهێنین. وەك دەزانین ئێستا كشتوكاڵ لە دەرەوەی شارەكاندا، لە هەمو شوێنێك هەیە و رۆژبەرۆژیش بەهاكەی زیاتر دەبێت لە سایەی خاڵە بەهێزەكانی سەردەمی پیشەسازی و سەردەمی زانیارییەكانەوە. كەواتە ئێمە زیاتر لەوەی باسی چوارچێوەیەكی ماددی بكەین، باسی چوارچێوەیەكی ئەقڵی دەكەین.

**پرسیاری (٧):** كەلتورە سەركوتكەرەكان چییان لێ دەكەوێتەوە؟

**وەڵام:** خۆت بیر لە مەسەلەكە بكەرەوە. ئەگەر سەركردایەتی خۆسەپێن و سەركوتكەرت هەبێت هەمو ئەوانەی ژێردەستی خۆی كۆنترۆڵ بكات، ئایا ئەو خەڵكە چۆن هەڵسوكەوت دەكەن؟ زۆربەیان بە شێوەیەكی نەرێنی و لە ناچارییەوە گوێڕایەڵی دەبن. خۆیان هیچ دەستپێشخەرییەك نانوێنن و چاوەڕێ دەكەن ئەو فەرمانیان پێبكات چی بكەن و ئینجا ئەوانیش فەرمانەكە جێبەجێ بكەن. رەفتاری لەمجۆرە، ئەو بیروبۆچونە لای سەركردەكە دەچەسپێنێت كە پێویستە لەسەر ئەم شێوازەی فەرمان و حوكمكردنە بەردەوام بێت و بەمەش پاساو بۆ ئەوانەی خوارەوە دروست دەبێت كە نەرێنی بن و بۆ هەمو شتێك چاویان لە سەركردەكەیان بێت. بە واتایەكی دیكە هەردوولایەنەكە بەو رەفتارەی خۆیان قایل دەبن. ئەم شێوازە دەبێتە پەكخستنی تواناو زیرەكییەكانی خەڵك و لە نرخ و بەهایان كەم دەكاتەوە و دەیانكاتە كۆمەڵێك كەرسەو ئامێری وا كە كۆنترۆڵ بكرێن و بەڕێوەببرێن. بە كورتییەكەی بازنەیەك دروست دەبێت لەوەی ئەم ببێتە ملكەچ و دەستەمۆخۆری ئەوی دیكەو لە ئاكامدا كەلتورێك دێتە ئاراوە لێوانلێو لە ریای سیاسی؛ بە جۆرێكی وا كە ئیشی ئاقڵانە و راست بریتی دەبێت لە گوێڕایەڵی و شوێنكەوتن و گەورەترین هەڵەش ئەوە دەبێت كە كڕنوش نەبەیت و لە فەرمانەكان دەربچیت.

ئەم میكانیزمە رێكەوتنێكی پەكخەر و دەستوپێگیری لێ دەكەوێتەوە. رێكەوتنێكی وا كە خەڵكەكە كاتێك وتیان (بەڵێ) مەبەستیان نەخێر بێت. ئەمە دەبێتە مایەی رەتكردنەوەی هەمو ململانێیەكی تەندروست و كەڵەكەبونی تورەیی و بێزاری و كەمبونەوەی متمانە و خراپی ئەنجام و نزمبونەوەی ئاستی بەرهەمی لێ دەكەوێتەوە و

گۆڕانکارییەکی قوڵ لە شێوازی پارادایمدا ڕووبدات. لەم بارەدا ئەو پارادایمە نوێیە ڕێگا خۆش دەکات بۆ دروستبوونی کۆمەڵێک دامەزراوە کە هاوکاربن بۆ کەلتوری دامەزراوەیی جێگیربووی کۆمەڵگە و ئەمە بە شێوەیەکی گشتی ڕووبەڕووی ئەو ڕێگرییانە دەبێتەوە کە هەمیشە دەیانەوێت بەرەنگاری ئەم گۆڕانە بوەستنەوە، بۆیە لەناو ئەم پرۆسەیەشدا بە زۆری ملمڵانێیەک دەبێت زۆرەملێ و بە ڕقو کینەوە. ئەم هەستە سەرکوتکراوانە هەرگیز نامرن، بەڵکو وەکو ژیلەمۆی ژێرخۆڵەمێش دەمێننەوە بۆ ئەوەی دواتر بەشێوازی خراپتر و ناشیرینتر خۆیان دەربخەنەوە. ئەوکاتە ئیتر سەرکردە ملهوڕەکان بەرپرسیارێتی ئەنجامەکانیان دەکەوێتە ئەستۆ و بۆ چارسەری دۆخەکە فۆکەس دەخەنە سەر لێهاتویی لە شێواز و ڕێوشوێنەکاندا و لە ئەنجامدا جێی حوکمدانی کەسێتی دەگرنەوە. ئەمانە ئیترا سەرکردایەتی وەکو پۆست و پلەوپایە بەرجەستە دەکەن نەک وەکو هەڵبژاردەیەک. ئەم بیروبۆچون و تێڕوانینە دەبێتە ئەریتێکی کەلتوری و وردە وردە قسەکەی (لۆرد ئاکتن) دێتە دی کە دەڵێت: "دەسەڵات گەندەڵکارییە و دەسەڵاتی ڕەها گەندەڵکاریی ڕەهایە". بەم شێوەیە هەموان دەبنە خزمەتکار و ئیتر لەپێناوی ڕازیکردنی سەرۆکدا واز لە سەرڕاستیی خۆیان دەهێنن. کێشەکە لەوەدایە کە لە ئابوری نوێدا ئەوجۆرە دەزگایانەی کە کەلتوری ملکەچی و دەستەمندەخۆری تیایاندا بڵاوە ناتوانن بمێننەوە مەگەر لەڕێی فەرامۆشکردنی بازاڕ و هاریکاری درۆزنانەی دارایی و سەرکوتکردن و تۆقاندنەوە، یاخود ئەوەی کە ڕکابەرەکەش هەمان کەلتوری سەقەتی هەبێت. تاقە کەسێک کە بتوانێت ئەم بازنەیە بشکێنێت، کەسێکە بزانێت سەرکردایەتیکردن هەڵبژاردنە (بڕیارە)، نەک پلەوپایە. کەسێک ڕۆڵی بزوێنەری چارۆکەی گۆڕین ببینێت و بازنەی دەوروتەنسیرەکانی فراوان بکات و سیاسەتە واقیعییەکەی بازاڕی ملمڵانێ تێبگات و واز لە خۆڕازیکردن بهێنێت، سەرکردایەتیکردنی ناوا ئەو جۆرە دەسەڵاتە ڕەوشتییە بەرجەستە دەکات کە بەرهەمی ژیانێکە پرنسیپەکان پەیڕەو دەکات و لە زۆربەی زۆری هەڵوێست و ڕووداوەکاندا بە شێوەیەک لە شێوەکان ئامادەی قوربانیدانە. لە ئابورییەکەی بازاڕی ئازاددا ئەم دەسەڵاتە ڕەوشتییە سەردەکەوێت چونکە دەسەڵاتێکی واقیعییە و بە کەمترین هەوڵ زۆرترین دەستکەوتی دەبێت؟

**پرسیاری (٨):** چۆن دەتوانرێت هەمو ئەم چەمکانە لە ئابورییەکدا جێبەجێ بکەین کە پیشەسازییەکەی لە پاشەکشێدا بێت.

**وەڵام:** دیارە لەم جۆرە بارودۆخەدا چەمکەکان باشتر جێبەجێ دەکرێن چونکە سەرچاوە هەرە مەزنەکەی ڕێگەچارەکان بریتی دەبێت لە توانای داهێنەرانەی ئەوانەی کە دەتوانن لەکاتی تەنگانەدا ئەڵتەرناتیڤی سێیەم بدۆزنەوە.

بەهەرحاڵ مرۆڤ هەمیشە حەزی لێیە بگەڕێتەوە بۆ شێوازەکەی سەدەی پیشەسازی کە بریتییە لە فەرمان و سەرکوتکردن، بەلام ناتوانێت ماوەیەکی دوورودرێژ بەرگە بگرێت. لەراستیدا کاتی قەیرانەکان و بۆماوەی کەم کەم، کە ئامانجەکە بریتی بێت لە رزگاربون، رەنگە شێوازە سەرکوتکەرەکە سودێکی هەبێت. واتە وەك (ئایزنهاوەر) جارێك وتی: (تۆ ناتوانیت باسی دیموکراسی بۆ زەلامێك بکەیت لە سەنگەردا بێت و دوژمن تەقەی لێ بکات). بەلام لە کۆتاییدا تۆ هەر پێویستت بەوە دەبێت هەموان بەراستی بەشداربن لە کارەکەدا، بەتایبەت ئەگەر بتەوێت گۆڕانکاری گرنگ و هەمیشەیی بەدەست بهێنیت. ئەمە پێویستی بە سەرکردایەتییەك هەیە پەیوەست بێت بەو دەسەڵاتە رەوشتییەوە کە بتوانیت پشتی پێببەستیت.

**پرسیاری (٩)**: چۆن دەتوانین حەوت خووەکە ببەستینەوە بە چوار رۆڵەکەی سەرکردایەتیکردنەوە؟ چونکە ئێمە پارەیەکی زۆر و کاتێکی زۆرترمان سەرف کرد لە مەسەلەی خۆ راهێناندا لەسەر حەوت خووەکە.

**وەڵام**: بیرت نەچێت، حەوت خووەکە پەیوەستن بە پرنسیپەکانەوە. لەراستیدا حەوت خووەکە ئەو پرنسیپە تایبەتانەن کە پێناسەکەی تۆ دیاری دەکەن. چوار رۆڵەکەش بریتین لەو ئەرکانەی پێویستە تۆ ئەنجامیان بدەیت بۆ ئەوەی رۆڵی سەرکردایەتیکردن لە دەزگاکەدا بهێنیتە دی. تۆ ئەگەر حەوت خووەکە بخەیتە ناو سیاقی چوار رۆڵەکەوە، ئەوا مەسەلەی پێشەنگیی باش (نمونەسازیی) بەرجەستە دەبێت. ئەمەش وا لە حەوت خووەکە دەکات ببنە خاوەنی بایەخێکی ستراتیجی چونکە دەبنە ئەو پێشەنگە چاکەی کە تۆ پێویستە بەرجەستەی بکەیت لەکاتی بینینی هەرسێ رۆڵەکەی دیکەدا. ئەو پرنسیپانەی کە حەوت خووەکە پەیوەستن پێیانەوە، لەو بیرە قوڵە دەچێت کە ناوی هەمو بیرە کورتەکانی دیکە دابین دەکات. بیرە کورتەکانی دیکە مەبەستمان لە تواناسازی و داهێنان و چاککردنی چۆنایەتی و دروستکردنی تیم و .. تاد.

**پرسیاری (١٠)**: ئابڕوچونەکانی کە لە کۆمپانیاکاندا روودەدەن زۆرجار وا دەکەن هەموان بەشداربن لە تاوانەکەدا. ئەمەش وامان لێ دەکەن زۆر بە توندی جەخت بخەینە سەر رەوشت. ئایا چۆن دەتوانین خەڵکی بەرەوشت پێبگەیەنین و کەلتورێك بهێنینە ئاراوە لەسەر رەوشت دامەزرابێت بۆ ئەوەی خۆمان لەم جۆرە گیروگرفتانە بەدوور بگرین؟

وەڵام: من شانسی ئەوەم پێدرا لە نزیکەوە مامەڵە بکەم لەگەڵ ناسەوارەکانی ئەو کارەساتانەدا کە لە کۆمپانیاکانی (پەری مایل نایلاند) و (رودنی کینگ) و (نیکسۆن فاڵدز)دا رویان داو بۆم دەرکەوت کە تێکڕای ئەو کارەساتانە نیشانەی کتوپڕی دیاردەیەکی کەلتوریی قوڵ بون و لە راستیشدا لوتکەی ئەو شاخە سەهۆڵەیان پێک دەهێنا کە لە کۆمەڵە کەسێك دروست بوبو کاری خراپ دەکەن و داخراون بە روی خەڵکیدا و گوێ نادەنە مەسەلە خراپەکان هەتا دەستگیر دەکرێن و ئینجا هۆکانی راگەیاندن باسیان دەکات. وابزانم ئەمە وانەیەکی بەنرخە بۆ هەمو دەزگاکان. چاوبخشێنەرەوە بەو مەسەلانەدا کە بەلای بەهاکان و تێڕوانینەکانی تۆوە لە هەموان گرنگترن. وردبەرەوە لە رێوشوێن و هەڵسوکەوت و پێکهاتە جۆراوجۆرەکانت بزانە تا چەند ئەمانە رەنگدانەوەی تێڕوانین و بەهاکانتن. پێویستە هەمو فیدباکێك رەنگدانەوەی بیروبۆچونە راستگۆکان بێت کە لە راوێژکاران و کڕیار و هاوردەکاران و تێکڕای کەس و لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە دەردەچن. تۆ نابێت ناکۆکییەکان بەو شێوازە چارەسەر بکەیت کە بونەتە هۆی سەرهەڵدانیان.

هەرگیز نابێت سەرڕاستی بکەین بە قوربانی لایەنگرێتی و پابەندبوون. لەراستیدا پێویستە سەرڕاستی خۆی لە خۆیدا پابەندوون و لایەنگری بێت. پێویستە داوا لە پزیشکەکەت بکەیت راستییەکەت پێ بڵێت تەنانەت ئەگەر حەزیش نەکەیت ئەو راستییەت گوێ لێ بێت. تۆ ئەوەت لێ دەوێت هەم لە پیشەکەیدا و هەم لەگەڵ تۆدا راستگۆبێت. دەزگاکەی تۆیش هەمان بابەتە. وا تەماشای خۆت بکە کە خاوەنی پیشەیەکیت بەرزترین لایەنگری و پابەندبوون بەلایەوە پابەندبون و لایەنگریکردنی پرنسیپە پیشەیی و رەوشتییەکانە نەك هی دەزگاکە. ئەمە پاکترین رێگایە بۆ بەدیهێنانی لایەنگریکردن لە دەزگاکەتدا. باشترین رێگا بۆ چەسپاندنی راستگۆیی و سەرراستی لە دەزگادا ئەوە نییە کە سەر راستی بکەیتە بڕگەیەکی ناو ئەو لیستەی کە پێویستە بەدی بهێنرێت بەڵکو بەوە دێتە دی کە خەڵکەکە وا لێ بکەیت بەرپرسیار بن بەرامبەر بەو ئەنجامانەی کە بۆردی ئەو بەدیهێنانە تەریبە ئەپێویت کە ئاستێکی بەرزی سەر راستی داوا دەکات. بەم شێوەیە تۆ حوکم بەسەر ئەوەدا نادەیت کێ سەر راستەو کێ سەر راست نییە بەڵکو ئەو بەرپرسیارێتییەی دەخەیتە ئەستۆ کە پێویستی بە گەشەکردنی سەر راستی هەیە.

**پرسیاری (١١):** پاش بچوککردنەوەی قەبارەی دەزگاکە چۆن کەلتورێکی ئەرێنی دەپارێزیت کە متمانەیەکی بەرزی تێدابێت؟

**وەڵام:** ئایا دەزانیت کۆمپانیاکان بۆچی پاش بچوککردنەوەیان خێرا کەلتورەکانیان پاشەکشێ دەکەن؟ لەبەر ئەوەی پرنسیپەکان پەیرەو ناکرێن و خەڵکەکەش بەشدار ناکرێن لە بڕیارداندا و لە رووداوەکان ئاگادار ناکرێن و بەمەش وایان لێ دێت ئەزانن کەی وەکو پێڵاو فڕێ دەدرێن. ئەوان لەو پێوەرانە تێناگەن کە بناغەی بڕیارەکانن. رەنگە شارەزاییەکی ئابوریشیان نەبێت لە باروودۆخی دەزگاکە و ئاستی ئابوری و پیشەسازییەکانیدا. من بەش بە حاڵی خۆم زۆر دەزگام بینیوە کە باروودۆخی زۆر سەخت و دژواریان هاتۆتە رێ و پێویستی کردووە بڕیاری ناخۆش بدەن بەڵام لەرێگەی گەڕانەوەوە بۆ پرنسیپەکان توانیویانە باروودۆخەکە تێبپەڕێنن. لەرێگەی روونکاریی و پەیوەندیی کراوەو بەشداریکردنی راستەقینەی واتادارو پەیوەستبوون بە سیستمێکی نەگۆڕی بەهاو پرنسیپەوە، کارمەندەکان توانیویانە بەرگەی دەرئەنجامە خراپەکانی بڕیارە قورسەکان بگرن و بەمەش کۆمەڵگا بەگشتی ئاسودە بووە. دیارە مەبەست لە کارمەندەکان ئەوانەن کە خۆیان و خێزانەکانیان لەو باروودۆخە سەختەی دەزگاکەدا توشی زیان بون.

**پرسیاری (١٢):** رای تۆ سەبارەت بەو خولی راهێنان و بەو کەسە شارەزایانە چییە کە خولی تایبەتمان بۆ دەکەنەوە و ماوەی چەند رۆژێك سودمان پێ دەگەیەنن و وەرەمان بەرزدەکەنەوە؟ من وای دەبینم کە تەنیا بۆ چەند رۆژێکە و دواتر بیر دەچنەوە.

**وەڵام:** زانیاری ئەگەر کارو پراکتیکی لەگەڵدا نەبێت وەکو ئەوە وایە هیچ نەزانیت. رەنگە بەشێوەیەکی کاتیی بکەویتە ژێر کاریگەرییەکانی زانیاری و شارەزایی نوێوە. بەڵام ئەگەر بە کردەوە جێبەجێیان نەکەیت، لەراستیدا وەك ئەوە وایە فێریان نەبوبیت. پێویستە پێکهاتەو سیستمەکان لە ژینگەکەی دەوروبەرت هانت بدەن لە پراکتیزەکردنی ئەو شارەزایی و زانیارییانەدا، ئەگینا ناتوانیت پراکتیزەیان بکەیت و لەئەنجامیشدا فێریان نابیت.

بەمەش تێکرای ئەو شارەزایی و زانیاریانە لە دەزگاکەدا روبەروی گاڵتەپێکردن دەبنەوەو هەمو هەوڵەکانی گۆڕانکاری و هەمو قسە سەوز و سورەکان وەکو پەشمەکیان

ڵ دێت. تامەکەی لەناو دەمتدا ماوەی چرکەیەک چێژت پێدەبەخشێت و پاش ئەوە هیچ ئاسەوارێکی نامێنێت. کلیلەکە لێرەدا ئەوەیە ئەو بابەتەی کە فێری بویت فێری دەوروبەرەکەتی بکە و لەگەڵیاندا گفتوگۆی لەسەربکەو هەوڵ بدە بیکەیتە کارێکی دامودەزگایی. ئەویش بەوەی پرنسیپە بنەڕەتییەکان بکەیتە بەشێک لە کاری رۆژانەو بەشێک لەو رێوشوێنانەی کە دەبنە بناغەی پاداشتکردنی کارمەندان. بەم شێوەیە خولەکانی راهێنان لەوە تێدەپەڕێت کە تەنیا هەر شتێکی رواڵەتی و نمایشکاریی بن، بەڵکو کاریگەرییەکی راستەقینە دروست دەکەن.

**پرسیاری (١٣): ئەگەر ئەم رێگەیە شکستی هێنا؟ چی؟**

**وەڵام:** دیارە ئەگەر خەڵکەکە جێبەجێی نەکەن بە دڵنیاییەوە شکست دەهێنێت. کەس داری سیحراوی پێ نییە. مەسەلەکە پێویستی بەوە هەیە بە قوڵی پەیڕەو بکرێت و بەردەوامی و پشودرێژیشی لەگەڵدا بنوێنرێت، بەتایبەت لە دروستکردنی گۆڕانکارییەکاندا یاخود لەو کاتانەدا کە لە سیستەمێکی کارکردنی دیاریکراوەوە دەگوازێتەوە بۆ سیستەمێکی دیکە. لەم مەسەلەیەوە بونی کەرەسەو ئامرازی یاریدەدەر گرنگن، بەڵام مەرجە بنەڕەتییەکە ئەوەیە کە خەڵکەکە پابەندی کارەکە بن.

**پرسیاری (١٤): باشترین رێگا کامەیە بۆ دەستکردن بە گۆڕانکارییەکان؟**

**وەڵام:** شۆفێر ئەگەر قاچی لەسەر ئیستۆپەکە بێت، ئایا باشترین رێگا چییە ئوتومبیلەکە لێ بخورێت بۆ پێشەوە؟ ئایا ئەوەیە پێ بنێیت بە بەنزیندا یاخود قاچ لەسەر ئیستۆپ هەڵبگرێت؟ وەڵامەکە ئاشکرایە کە پێویستە قاچ لەسەر ئیستۆپ هەڵبگرێت. بەهەمان شێوەش، لە کەلتوری دەزگاکاندا هێزمان هەیە پاڵنەرەو هێزیشمان هەیە راگرو پەکخەرە. هێزە پاڵنەرەکان هەمیشە ئەو هەقیقەتە ئابوری و لۆجیکییانەن کە وەکو ئەوە وان پێ بنێیت بە بەنزیندا. هێزە راگر و پەکخەرەکانیش هەمیشە کەلتوری و عاتیفین و وەکو ئیستۆپی ئوتومبێل وان.

گەڕان بەدوای ئەڵتەرناتیفی سێیەم و هەروەها پێکەوەبونی هاریکارییانە دەتوانن هێزە پەکخەرەکان بکەنە هێزی پاڵنەر. بەم شێوەیە تۆ نەک هەر پێشکەوتنێکی گەورە بەدەست دەهێنیت، بەڵکو پێشکەوتنەکە دەکەیتە بەشێک لە کەلتورەکە و لەرێی

پابەندبوون و بەشداریکردنەوە بەردەوام پارێزگاریی لێ دەکەیت. تیۆرییەکەی (کێرک لۆرانس) سەبارەت بە بواری هێز لەم وەڵامەدا بەهەند وەرگیراوە.

**پرسیاری (١٥):** ئایا ئەم چەمکانە تازەن؟ چونکە من دەمێکە دەیانبیستم و وا هەست دەکەم بە درێژایی مێژوو هەن؟

**وەڵام:** وایە. ئەوی راستی بێت، بۆ ئەوەی گۆشەنیگاکەی تۆ باشتر روون بکەمەوە، ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا تواناکانی مرۆڤی ئازادکرد ئەو دەستورەیە کە پشتی بە بنەماکان و بە بازاڕی ئازاد بەستووە.

ئەمە خەسڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانە، کە رێژەی دانیشتوانەکەی ٤,٥٪ی دانیشتوانی جیهانە، کەچی ٣٢٪ی شمەکی هەمو جیهان بەرهەم دەهێنێت. پابەندبوون بەو شۆڕش و بنەمایانەوە ئەنجامگەلی سەرسوڕهێنەری دەبێت. بیرت نەچێت پرنسیپەکان جیهانی و هەمیشەیین. زۆرجار ئەوانەی کە دەتوانن بە باشترین شێوە پرنسیپە گرنگەکان فێر ببن و وەری بگرن جوتیارەکانن، چونکە جوتیار زۆر نزیکە لە سروشت یاخود لە یاسا سروشتییەکانەوە. جوتیار زۆرچاك دەزانێت کە ناکرێ کێڵگەکە سیخناخ بکرێ لە زەرعاتی زۆر، کەچی هەندێك کەس لەوە تێناگەن و دێن قوتابخانەو دەزگا رێکخراوەکان سیخناخ دەکەن لە بیرۆکەو خەڵکی جیاجیا. وەرزشکارە ئایابەکانیش نمونەیەکی جوانی دیکەن. لە وەرزشدا بواری فەرمبالغ نییە. ئەگەر دەتەوێت ببیتە رکابەر پێویستە باجەکە بدەیت. بەڵام بەداخەوە ئەوەی کە لۆجیکییە و دەیزانیت کەمجار بە کردەوە پەیڕەوی دەکەیت. لەبەرئەوە دیاریکردن و تازەکردنەوەی پابەندبون و پارێزگاریکردن لە رەوشت و سەرڕاستی و پشتبەستن بە پرنسیپەکان پێویستن.

# پاشکۆی یەکەم

## برەودان بە ٤ زیرەکییەکە/ تواناکان – ڕێنمایەکی پراکتیکی

### برەودان بە زیرەکی فیزیکی ( جەستەیی ) PQ

یەکەمجار با لە جەستەوە دەست پێبکەین، لە زیرەکی فیزیکییەوە (PQ) چونکە جەستە خۆی کەرەسەی مێشك و دڵ و ڕۆحە. ئێمە ئەگەر بتوانین جەستە بخەینە ژێر ڕکێفی ڕوحەوە – واتە حەز و ئارەزووەکانمان بخەینە ژێر ڕکێفی ویژدانەوە – دەبینە گەورەی خۆمان. ئەو مرۆڤەی کە ژیانی هەر بریتی بێت لە هەوڵی تێرکردنی حەزو ئارەزووەکانی، نەك هی ویژدانی، ناتوانێت خۆی بۆ هیچ شتێك یەکلایی بکاتەوە. مەودای نێوان کارلێکەر و کاردانەوەکانی تەسك دەبێتەوە – ئازادیی تاکەکەسی لەدەست دەدات کەچی هەر وا دەزانێت ئازادە. جەستە خزمەتکارێکی باشە، بەڵام ئاغایەکی خراپە.

> توێژینەوەکان ئێستا بە ئاشکرا پێمان دەڵێن کە بێتوانایی لەخۆبەڕێوەبردندا بەشێوەیەکی کاریگەر، دەبێتە هۆکاری زووپیربوون و لاوازبوونی زەین و تەنانەت ڕێگرتن لەوەی کە دەستمان بگات بە زیرەکییەکانی ناخماندا. پێچەوانەکەیشی ڕاستە: زیادبونی یەکپارچەیی ناوخۆ دەبێتە هۆکاری زیادبونی تواناکان لە هەمو سیستمە فیسۆلۆجییەکاندا و داهێنان و ڕاهاتن و نەرمیی زیاتر دەستەبەر دەکات
>
> - دۆك چیلدەر – و برۆسکرایەر

پەندە یۆنانییە بەناوبانگەکە سەبارەت بەوەی مرۆڤ ببێتە گەورەی خۆی – خۆت بناسە، خۆت کۆنترۆڵ بکەو خۆت ببەخشە – ڕیزبەندیکردنێکی زۆر جوانە من پێم وایە سێ ڕێگەی سەرەکی هەن بۆ برەودان بە زیرەکیی جەستەیمان. یەکەم، خۆراکی

باش، دووەم وەرزشی هاوسەنگ و بەردەوام، سێیەم، ئیسراحەتی باش، حەوانەوە، چارەسەرکردنی گوشارەکان و بیرکردنەوە لە خۆپاراستن (ئەقڵیەتی خۆپاراستن).

لە جیهانە شارستانییەکەدا زوربەی زۆری خەڵکەکە ئەم سێ ڕێگەیە تێگەیشتون و قبوڵیانە. ڕێگاکان کۆمەڵە مەسەلەیەکن کە هەمو کەس دەیانزانێت. بەڵام مەرج نییە ئەو شتەی کە هەمو کەس دەیزانێت هەمو کەس پەیڕەوی بکات. خەڵکێکی زۆر کەم هەرسێ ڕێگاکە پەیڕەو دەکەن.

| PQ بردودان بە سێ پێکهێنەرە سەرەکییەکەی زیرەکی جەستەیی (فیزیکی) PQ |
| --- |
| خۆراکی چاك |
| وەرزشی هاوسەنگی بەردەوام |
| ئیسراحەتی گونجاو، حەوانەوە، چارسەرکردنی گوشارەکان و بیرکردنەوە بە ئەقڵیەتی خۆپاراستن. |

شێوەی ١١—١

جیم لۆیهر Jim Loehr و تۆنی شوارتز Tony Schwartz لە کتێبەکەیاندا (هێزی بەشداریکردنی تەواو The Power of full Engagement) جەخت لەوە دەکەنەوە کە کلیلی سەرکەوتنی گەورە و خۆنوێکردنەوە بریتی نییە لە بەڕێوەبردنی کات، بەڵکو بریتییە لە چاك بەڕێوەبردنی وزە. دیارە ئەم دوو نوسەرە بەدڵنیاییەوە مەسەلەی بەڕێوەبردنی کاتیان لەلا گرنگە، بەڵام باوەڕیان وایە کە بەرزترین شێوازی بەڕێوەبردنی کاتەکانت ئەوەیە چۆن وزەو تواناکانت بەڕێوە دەبەیت. ئەوان بە سەرنجدان لە سروشت و لەو یاسا سروشتییانەی کە حوکمی هەمو مرۆڤایەتی دەکەن، جەخت لە بایەخی ڕێزگرتنی ئەو خولە دەکەنەوە کە دەکەوێتە نێوان چالاکی/ ئەنجامدان و حەوانەوە/ نوێکردنەوەوە. ئەم دوو نوسەرە، کەسەکە هەمو پێکەوە (وەك یەك یەکە) وەردەگرن: جەستە و ئەقڵ و دڵ و ڕۆح. جەخت دەکەنە سەر بایەخی خووەکان (کە ئەمان پێیان دەڵێن سرووتەکان) بۆ زیادکردنی وزەو تواناکانی ئەنجامدانمان.

# خۆراکی چاك

زوربەمان دەزانین پێویستە چی بخۆین و چی نەخۆین. کلیلەکە هاوسەنگییە. من بە ئاشکرا ددانی پێدا دەنێم کە خۆراکشناسێکی پسپۆڕ نیم، بەڵام وەکو زوربەمان، هێندە رۆشنبیرییم هەیە کە بزانم جەستەو سیستمەکانی جەستەمان، بە سیستمی بەرگریشەوە ئەوکاتە زۆر بەهێز دەبن کە زیاتر دانەوێڵە و سەوزە و میوە و پرۆتینی کەمچەوری دەخۆین. گۆشت (باشتر وایە زۆر نەخۆین) ئەگەر خواردمان گۆشتی ناسك بخۆین. توێژینەوەکان هەروەها زیاتر و زیاتر سودەکانی ماسیخواردن نیشان دەدەن. ئەو خواردنانەی کە رێژەیەکی زۆر شەکر و چەوریی تێریان تێدایە (بە زۆرێك لە خواردنەوە خێراکان و شیرینی و خۆراکی ئامادەکراودا) پێویستە زۆر بە کەمی بخورێن یاخود هەر نەخورێن. بەڵام دیسان بیرتان نەچێت کە کلیلەکە هاوسەنگی و میانەڕەوییە لە خواردندا .. فێرببە زۆرخۆریی نەکەیت. بە واتایەکی دیکە بزانە کەی دەست لە خواردن هەڵبگریت – هەر کە هەستت کرد تێربویت و پێش ئەوەی زۆرخواردن ناڕەحەتت بکات. دوا خاڵیش ئەوەیە ئاو زۆر بخۆیتەوە – رۆژی ٦ تا ١٠ پەرداخ. ئەمە چالاکییەکانی جەستە ئاسان دەکات و رۆڵێکی دیاری دەبێت لەو چالاکییانەدا کە ئەنجامیان دەدەیت بۆ راگرتنی کێشێکی تەندروست و جەستەیەکی لەبار لە رێگەی پارێز و وەرزشکردنی رێکخراوەوە.

من هەروەها گەیشتومەتە ئەوەی باوەڕبهێنم بە سود و حیکمەتی رۆژوگرتنی ناوبەناو، کە بەمەستی ئیسراحەت بەخشین و پاککردنەوەی کۆئەندامی هەرست ژەمێك یان چەند ژەمێك لە ماوەیەکی دیاریکراودا نەخۆیت. من لە ئەزمونی تایبەتی خۆمەوە بۆم دەرکەوتووە کە سودە سەرەکییەکەی رۆژوگرتن جەستەیی نییە، بەڵکو زیاتر ئەقڵی و رۆحییە. پرنسیپی رۆژوگرتن لە زوربەی زۆری ئایینە سەرەکییەکانی جیهاندا جەختی لەسەرکراوەتەوە وەکو رێگایەك بۆ زیاتر خۆکۆنترۆڵکردن و دەستڕۆیشتن بەسەر حەزو ئارەزووەکاندا. هەروەها زیاتر بۆمان روون دەبێتەوە کە ئێمەی مرۆڤ چەندێك پشتبەستوین.

من بڕوای تەواوم بەو راستییە هەیە کە ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بە باشی کۆنترۆڵی ئەوسی خۆی بکات، زیاتر دەتوانێت کۆنترۆڵی حەزەکانی بکات و زیاتر توانای پاڵاوتنی ئارەزووەکانی لەلا دروست دەبێت. بەراستی هەست بە بێفیزیی دەکات و بەرچاورووونتر لە جاران مەسەلە گرنگەکانی ژیانی خۆی دەناسێتەوە.

من خۆم ئەزموونم لەگەڵ ئەنجامە خراپەکانی زۆرخۆریی و زیادەڕەویکردن لە پارێز و خواردنی شتی پیس و بێکەڵکدا هەیە.

من زۆرترین جار ئەوکاتانە خۆم پێڕاناگیرێت کە سەفەر دەکەم و بە هیلاکی دەگەمە ژووری ئوتێلەکە و داوای خواردەمەنی دەکەم. بۆم دەرکەوتووە هەرکاتێك نازبدەم بە خۆم و بێ ئەقڵیی بنوێنم لە خواردندا، کاردەکاتە سەر ئەقڵ و رۆحم و تەنانەت خەوەکەیشم تێك دەدات. (ڤینس لۆمباردی Vince Lombardi) کە بە راهێنەرە ئەفسانەییەکە ناسراوە هەمیشە دەیگوت "هیلاکیی هەمو کەسێك ترسنۆك دەکات". ئەم قسەیە زۆرچاك بەسەر مندا جێبەجێ دەبێت؛ چونکە هەرکاتێك بە تەواویی هیلاك ببم، حەزدەکەم بخزێمە ناو قۆزاخەکەی خۆمەوە و ئەمەش ماوەی یەك دوو رۆژ کاردەکاتە سەر ئەقڵ و رۆحم. تۆ ئەگەر جەستەت بخەیتە ژێر رکێفی ئەقڵ و رۆحتەوە، ئارامی و پێزانینێکی زۆرت لەو دیسپلین و خۆکۆنترۆڵکردنەوە دەست دەکەوێت. ئەوی راستیی بێت من خۆم کاتێك هەست بە ئازاری برسێتی دەکەم کە بەڕاستی پەیوەندی نییە بە برسێتییەکی راستەقینەوە بەڵکو زیاتر خوویەکە لە ئاکامی کەمبوونەوەی شەکر لە جەستەمدا دەردەکەوێت، بە خۆم دەڵێم: "خۆشترین تام ئەو تامەیە کە مرۆڤی لاواز دەیچێژێت" هەروەها دیمەنی ئەوەش دێتە بەرچاوم کە ئەو ئازارە پەلاماری چەورییە ئەنبارکراوەکان دەدات و دەیانخوات. ئێمە ئەگەر تام بخەینە ژێر رکێفی خۆراکخواردنەوە، وردە وردە خانەکانی تامکردن لەناو جەستەماندا فێردەکەین وەڵامی ملیاردها خانە بدەنەوە کە بۆ خۆراکی چاك هاواریانە.

بەڵام لەراستیدا ئەمانە هەموویان مەسەلەیەکی شەخسین و هەرکەسە پێویستە خۆی بڕیار بدات چ خۆراکێك باشە بۆی. من باوەڕم وایە هەمو کەسێك دەتوانێت سوودە زۆرو زەوەندەکانی سەرکەوتنی تایبەت بەسەر جەستەدا ئەزموون بکات. ئەم سەرکەوتنە کاریش دەکاتە سەر سەرکەوتنی گشتیمان لە پەیوەندییەکانماندا لەگەڵ خەڵکیدا و هەروەها خۆ ئاراستەکردنیشمان بۆ ئەوەی لە ژیاندا خزمەتی خەڵکی بکەین و بەشداریمان هەبێت.

## وەرزشی هاوسەنگ و گونجاو

وەرزشی رێكوپێك – هی کۆئەندامی دڵ و بۆرییەکانی خوێن، هێز و نەرمی لەش – کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لەسەر زیادکردنی چۆنایەتی ژیان و درێژکردنی تەمەن. دیسانەوە دەیڵێمەوە، کلیلەکە بریتییە لە هاوسەنگی. کۆمەڵگاکەمان هەتا دێت

زیاترو زیاتر لەسەر شێوە ژیانی ناچالاك و دانیشتنی زۆر رادێت. بەڵام گەلێك رێگا هەن بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت وەرزشی رێكوپێك بكات. سەرەتا بە وەرزشی كەمی وا دەست پێبكە كە بتوانیت بەرگەی بگریت. رۆژانە شتێك بكە، یان لانی كەم حەفتەی ٣ – ٥ جار. شتێك هەڵببژێرە كە چێژی لێ ببینیت و لەگەڵ بارودۆخ و پێویستییە تایبەتەكانتدا بگونجێت. راوێژ بە پزیشكەكەت بكە. ئەو وەرزشەی دەیكەیت با جۆراوجۆر بێت تا بتوانیت بەشە جیاجیاكانی جەستەت بەهێز بكەیت و كارێك نەكەیت لەیەك شتدا خۆت بفەوتێنیت و بێزاربیت. زۆركەس حەزیان لە پیاسەیە پیاسەی توندو خێرا ئەگەر بتوانن. خەڵكی دیكە حەزیان لە راكردن و مەلە و پاسیكلسواری و باخدارییە. زۆركەس سود لە ئامێرەكانی جومناستیك وەردەگرن، ئەوانەی كە دروستكراون بۆ ئەوەی مەشقێكی جەستەیی/ كۆئەندامی دڵ و بۆرییەكانی خوێنت بۆ دەستەبەر بكەن، بۆ نمونە ئامێری ترێدمیڵ treadmill و پاسكیلی وەستاو سەركەوتن بەسەر پلیكانەدا و ئامێری هێلكەیی و سەوڵ لێدان .. تاد.

یاری ئاسن و راهێنانەكانی دیكەی بەهێزكردن گەلێك سود بە مرۆڤ دەگەیەنن لە هەمو تەمەنێكدا. سودەكان بریتین لە زیادكردنی هێز و توانای جەستە، چاككردنی رەوت و خاوكردنەوە و راگرتنی خراپبونی ئێسك و زیادكردنی توانای لەش لە سوتاندنی كالۆریدا.

من خۆم ناتوانم باسی ئەو هەمو سودانەتان بۆ بكەم كە بەش بەحاڵی خۆم بەدەستم هێناون لەئاكامی ئەنجامدانی وەرزشی هاوسەنگ و گونجاوەوە. بەلای منەوە سودە هەرە مەزنەكەی وەرزش جەستی نییە بەڵكو ئەقڵی و رۆحییە، هەرچەندە توێژینەوە بەهێزەكان زۆر كاریان تێكردوم كە دەیسەلمێنن وەرزشكردنی رێكوپێك سود بە جەستە دەگەیەنن. بەردی بناغەی بەرنامەی وەرزشكردنی من هەمیشە راهێنانی سویدی بوو. كە بەكارهێنانی ماسولكە گەورەكانی لاق بۆ بەهێزكردنی دڵ و كۆئەندامی سوڕی خوێن بۆ ئەوەی بتوانیت بە كاریگەرترین شێوە ئۆكسجین بەكاربهێنیت.

راهێنانە سویدییە پەسەندكراوەكەی من راكردنە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەژنۆكانم خەساركردن لە گەلێك چالاكیی وەرزشیدا، ئێستا پێویستم بەوەیە پاسكیلی وەستاو بەكاربهێنم. بەڵام من ئەوەم بۆدەركەوت كە ئەگەر لەسەر پاسكیلەكەش بم دەتوانم شتی دیكەش بكەم. دەتوانم بە مۆبایل قسە بكەم و نیشوكارەكان رابپەڕێنم هەرچەندە هەناسەبڕكێشم بێت. دەتوانم تەماشای بەرنامە پەروەردەیی و سەرگەرمییەكانی

تەلەفزیۆنیش بکەم. دەتوانم گفتوگۆی جددی لەگەڵ هاوسەرەکەم و منداڵەکانم و هاوڕێکانیشمدا بکەم کە ئەوانیش وەکو من لەوکاتەدا خەریکی وەرزش دەبن. هانی یەکتری دەدەین یاخود باسی شتە بەکەڵکەکان بۆ یەکتری دەکەین.

من هەروەها بڕوای تەواوم بە بایەخی بەهێزکردن و نەرمکردنی ماسولکەکان هەیە. جارێکیان لە مەشقی یاری ئاسندا دانیشتبوم کە ڕاهێنەرەکە بەدی کردم و پێی وتم تا چەند دەتوانم کێشەکە بەرزبکەمەوە و ئینجا لەوەش زیاتر ڕایبگرم. کە لێم پرسی بۆچی؟ وتی گەورەترین سود لەو کۆتاییەی وەرزشەکەدایە کە تاڵە ماسولکەکە لەتوانایدا نامێنێت و دەپچڕێت (ئازار) و لە ماوەی (٤٨) کاتژمێردا نوێ دەبێتەوە و بەهێزتر دەبێت. ئەمە وانەیەکی زۆر گرنگ بو بۆ من. چونکە دەمویست هەر کە هەستم بە ئازار و ماندوێتی کرد واز بهێنم. بەڵام ڕاهێنەرەکە لەسەر سەرم وەستاو وتی: "هەرکاتێك نەتتوانی چیتر ئاسنەکە ڕابگریت من لێتی وەردەگرم." ئەمە لێکچواندنێکی مەزنە بۆ سێ ڕەهەندەکەی دیکەی ژیانیش. هەتا بەرەو کۆتایی بەرگەگرتن بڕۆین، توانای ئەنجامدانمان زیاتر دەبێت. (ئیمیرسۆن Emerson) مەسەلەکە بەم شێوەیە دادەڕێژێت: "کە دەبینین ئەو کارەی سورین لەسەر ئەنجامدانی، ئاسانتر دەبێت، مانای وانیە سروشتی کارەکە گۆڕدراوە، بەڵکو توانای ئێمە بۆ ئەنجامدانەکە زیادی کردووە."

بەرنامە وەرزشییەکەی من ئەوەیە لە هەفتەیەکدا ٥ – ٦ ڕۆژ مەشقی سویدی بکەم. سێ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا بۆ بەهێزکردنی ماسولکەکان و چەند ڕۆژێکیش بۆ هەندێك وەرزشی یۆگا و نەرمکردنی ماسولکەکان. هەروەها سودیشم لە پیلاتیس pilates وەرگرتووە بۆ بەهێزکردنی ناخم. پێویستە هەرکەسێك بارودۆخی تایبەتی خۆی لێك بداتەوە تا بزانێت باشترین وەرزش بۆ ئەو لەم قۆناغەدا چییە؟ بەڵام دیسان دەیڵێمەوە کە تەواو بڕوام وایە وەرزشکردن ئاستی متمانە بەخۆبونمان و خۆکۆنترۆڵکردنمان بەرز دەکاتەوە، کە کامڵبوونی ژیانمان خێراتر دەکات و ماوەی نێوان کارلێکەر و کاردانەوەمان فراوان دەکات.

من کە لە زانکۆ کۆرسی شەش مانگییم دەگوتەوە، هانی خوێندکارەکانم دەدا ئەو ئامانجانەی خۆیان دیاری بکەن کە دەیانەوێت لەو شەش مانگەدا بەدەستیان بهێنن. زوربەی زۆری خوێندکارەکان مەسەلەی هەڵبژاردنی خواردنی گونجاو و وەرزشی ڕێکوپێکیان دەکردە یەکێك لە ئامانجەکانیان. من ئەمە لەگەڵ خوێندکارەکاندا ناو دەنێم "ڕێکەوتنی براوە – براوە" و هەر کە دەسەلمێندرا ئیتر خوێندکارەکە خۆی بە لێپرسراو

و بەرپرسیاری ئامانجەکە دەزانێت. هەروەها دەبوایە تێڕوانینی خۆیان و ئەو پەندو وانانەمان بۆ باس بکەن کە لەو ئەزموونانەوە بەدەستیان هێناون و لە روانگەی ئامانجە هەڵبژێردراوەکانیانەوە خۆیان هەڵبسەنگێنن. جا لەبەر ئەوەی ئەم هەڵسەنگاندنە بوە بەشێکی گرنگی ئەو نمرەیەی کە لە کۆرسەکەدا بەدەستی دەهێنن، خوێندکارەکان هەم بونە خاوەنی پاڵنەری دەرەکی و هەم پاڵنەری ناوخۆییش. هەندێك خوێندکار نەیاندەویست مامەڵە لەگەڵ لایەنە فیزیکییەکەدا بکەن. کە ئەوە کارێکی باش بو. هەندێك ئامانج دیاری دەکەن و دەبنە بەرپرسیاری، کە پێیان وابو پێویستە تەواویان بکەن..

باوەڕناکەیت ئەوان چ بەرهەمێکیان دەست کەوت کە زاڵ بون بەسەر خووی خراپی خواردنی خراپ و شیرینداو ئەوانەی کە لانی کەم هەفتەی سێجار و هەرجارەی نیوکاتژمێر وەرزشیان دەکرد. چاندنی ئەم خووە تازانە و هەڵکێشانی خووە کۆنەکان ئەنجامگەلێکی هێندە بەهێزی لێ کەوتەوە کە کاری کردە سەر هەمو پەیوەندییەکانیان. کاری کردە سەر وزەو خوێندنیان و وای لێ کردن زیاتر هەست بەوە بکەن کە خۆیان گەورەی خۆیانن. لەکۆتایی شەش مانگەکەدا، ئەوانەی کە ئامانجە جەستەییەکانیان هەڵنەبژاردبو خۆزگەیان دەخواست ئەو ئامانجەیان هەڵبژاردیە چونکە بیستیان ئەو خوێندکارانەی کە ئامانجی خۆ کۆنترۆڵکردنیان هەڵبژاردووە و بەدەستیان هێناوە، لە خوێندنیشدا نمرەی چاکیان هێناوە.

بۆ چرکەساتێك بیر لەمە بکەرەوە، هەمو هەفتەیەك بریتییە لە ١٦٨ کاتژمێر. بەڵام ئەگەر تۆ لەو ١٦٨ کاتژمێرە تەنیا ٢ – ٣ کاتژمێر تەرخان بکەیت بۆ تیژکردنەوەی مشارەکەت لەرێی وەرزشکردنی هاوسەنگ و رێکوپێکەوە، دڵنیابە هەست بە کاریگەری باشی ئەو ٢ – ٣ کاتژمێرە دەکەیت لەسەر ماباقی کاتەکە. تەنانەت کاردەکاتە سەر قوڵایی و جۆری خەوەکەیشت. بەجۆرێکی وا کە وردە وردە هێز و کاریگەریی یەکجار زۆری ئەم جۆرە خۆ کۆنترۆڵکردنەت بۆ دەردەکەوێت لەسەر رەهەندە جیاجیاکانی ژیانت.

## ئیسراحەتی گونجاو، حەوانەوە، چارەسەرکردنی گوشار و بیرکردنەوە بە ئەقڵییەتی خۆپاراستن

کاری سەرکردەو پێشەنگی گەورەی بواری گوشار، دکتۆر هانس سایلی Dr. Hans Selye پێمان دەڵێت کە دووجۆر گوشار هەیە؛ نیگەرانی distress و گوشاری ئاسایی eustress. نیگەرانی (دڵەڕاوکێ) لەوەوە دروست دەبێت کە رقت لە کارەکەت بێت و

نارەزایی دەربېریت بەرامبەر بە گوشارەکانی ژیان و هەست بکەیت کە تۆ قوربانیت. بەلام گوشاری ئاسایی eustress دەرەنجامی ئەو گوشارەیە کە ئێستا تۆ چێت و دەتەوێت بگەیتە کوێ – واتە ئەو ئامانج و پرۆژە و هۆکارە ماقولانەی کە بەڕاستی دەمانگۆڕن و بەهەرەو جۆش‌وخرۆشمان دەجولێنن. بە کورتییەکەی، وامان لێ دەکەن دەنگی خۆمان بدۆزینەوە. لە توێژینەوەیەکی پراکتیکیی چاکدا، دکتۆر سایلی روونی کردەوە کە چۆن گوشاری ئاسایی باوەش بۆ سیستمی بەرگری دەکاتەوە و تەمەن و چێژوەرگرتن لە ژیان زیاد دەکات. بەکورتییەکەی، پێویستە خۆمان لە گوشار دوورنەخەینەوە ئەگەر جۆرە باشەکەی بو – گوشاری ئاسایی؛ چونکە گوشارێکە بەهێزمان دەکات و تواناکانمان فراوان دەکات. بێگومان پێویستە هاوسەنگ و ئارام بکرێت لەرێی حەوانەوە و ئیسراحەتی گونجاوەوە، یاخود لەرێی ئەوەی کە پێی دەوترێت "چارەسەرکردنی گوشاریی" یاخود راستتر "چارەسەرکردنی گوشاری ئاسایی". سایلی پێمان دەلێت کە ژن بەشێوەیەکی گشتی ٧ سال زیاتر لە پیاود دەژی و هۆکارەکەشی فسیۆلۆجی نییە، بەلکو دەرونی/ رۆحییە. "ئیشی ژن هەرگیز تەواو نابێت".

لە بوارە پیشەییەکاندا، ئەو قسەیە بەشێوەیەکی بەربلاو لەلای زۆرینەی خەلك چەسپیوە کە دوولەسەر سێی هەمو نەخۆشییەکان دەرەنجامی ئەو جۆرە ژیانەیە کە مرۆڤەکە خۆی هەلیبژاردووە. هەلبژاردنەکان پەیوەستن بە جۆری خۆراك و بە جگەرەکێشان و ئیسراحەتنەکردنی تەواو و نەحەوانەوە و هەولدان بۆ ئەوەی مۆمەکە لە هەردوو سەرەوە دابگیرسێنیت و گەلێك دەستدرێژیکردنی دیکە بۆسەر جەستە. هەندێك کەس نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان دەگێڕنەوە بۆ هۆکارە جێنتیکییەکان (بۆماوەییەکان) بەلام وەك پێشتر باسمان کرد، هەمیشە ماوەیەك هەیە لەنێوان کارلێکەر و کاردانەوەدا و کاتێك مرۆڤ ئاگاداری ئەو ماوەیە بێت و هەروەها ئاگاداری تواناکانی خۆی بێت بۆ بڕیاردان لە روانگەی پرنسیپەکانەوە، ئەوا مەرج نییە سەدی سەد نەخۆشییەکەی تێدا دەربکەوێت تەنیا لەبەر هۆکارە بۆماوەییەکە. تەنانەت دەتوانرێت زوربەی شێرپەنجەکانیش چارەسەر بکرێن ئەگەر لە قۆناغەکانی یەکەم و دووەمدا دەستنیشان کران بەرلەوەی ببنە پەلاماردەر؛

زانستی پزیشکی هاوچەرخی خۆرئاوا بەشێوەیەکی بنەڕەتی جەخت لەسەر چارەسەرکردن دەکاتەوە نەك لەسەر خۆپاراستن و چارەسەریش بەشێوەیەکی گشتی

دوو جۆرە، دەرمان و نەشتەرگەریی. من پێم باشە پارادیمی پزیشکیی فراوانتر ببێت. قوڵتر ببێت و زیاتر یەکتر تەواو بکەن، بەتایبەتی لەگەڵ چارسەرە ئەڵتەرناتیفەکانی دیکەی کە بەگردەوە دەرکەوتووە کاریگەرن.

پێم وایە زۆر گرنگە مرۆڤ زوو زوو خۆی چێك بکات، لانی کەم ساڵی جارێك، بۆ ئەوەی ئەگەر نیشانەیەك یاخود ئەگەری نەخۆشییەك هەبو زوو دەستنیشان بکرێت و بریاری چاکتری لەبارەوە بدرێت. من خودی خۆم هەم پزیشکێکی چارسەرکارم هەیە، هەم پزیشکێکی خۆپاراستن و زۆر رێز لە هەردوکیان دەگرم. بۆم دەرکەوتووە کە بنەڕەتیترین پرنسیپ ئەوەیە خۆمان بەرپرسیارێتی تەندروستیی خۆمان بگرینەئەستۆ.

پێویستە پرسیار بکەین، زۆر بەشداری بکەین، بخوێنینەوە، لە بۆچونێك زیاتر وەربگرین و بەدوای شێوازەکانی دیکەی چارسەری ئەڵتەرناتیفدا بگەرێین، نەك بێین بەرپرسیارێتی تەندروستی و باشیمان بخەینە ئەستۆی کەسێکی دیکەو پیشەیەکی دیکە.

## فەرامۆشکردنی جەستەو تەندروستی

تەنیا هەر بیر لەوە بکەرەوە بزانە ئەگەر مرۆڤ جەستەی خۆی فەرامۆش بکات، سێ رەهەندەکەی دیکە چییان لێ دێت. ئەمە نەك هەر جەستەمان نەخۆش دەخات بەڵکو کاردەکاتە سەر ئەقڵیشمان، سەر توانای بیرکردنەوە و داهێنان و خۆڕاگری و ئازایەتی و توانای فێربون و پتەویی زەین و زیرەکیمان. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر وەرزش بکەین و بە چاکی بحەوێینەوە و خۆراکی گونجاو بخۆین ئەوا توانا ئەقڵییەکانمان دەپارێزین لە بواری خۆڕاگری و فۆکەسکردن و هەروەها خولیای فێربونیشدا.

فەرامۆشکردنی جەستە چ کارێك دەکاتە سەر زیرەکییە سۆزدارییەکەمان، سەر دڵمان کاتێك کە دەبینە دیلی ئەوس و ئارەزووەکانمان؟

پشودرێژی و خۆشەویستی تێگەیشتن و هاوسۆزی و توانای گوێگرتن و بەزەیی دەبوکێنەوەو دەبنە کۆمەڵێك وشەی بریقەدار و هیچی دیکە، چونکە هێزێك و گیانێك نییە ئاراستەیان بکات.

من خۆم بە ئەزمونی خۆم بۆم دەرکەوتووە هەرکاتێك بەڵێنێك بەخۆم بدەم سەبارەت بە پارێز و وەرزشکردن (یان هەر شتێکی دیکە) و بەڵێنەکە نەبەمەسەر، ئەوا هەست و هاوسۆزییم بەرامبەر هەست و پێویستییەکانی خەڵکانی دیکە کەم دەبنەوە.

زیاتر کەمچیکڵدانە و تورە دەبم بەرامبەر بە خۆم و هەست بە ناڕاستگۆیی و ناتەواویی خۆم دەکەم و هەتا نەگەڕێمەوە و سەرلەنوێ بەڵێن بەخۆم نەدەمەوە و بەڵێنەکە جێبەجێ نەکەم خۆمم بیرناچێتەوە و ناتوانم راستگۆیانە هاوسۆز بم لەگەڵ خەڵکیدا.

> ئەوکەسەی کە پاش پێنج خولەک وروژاندن (ئیغراکردن) تەسلیم دەبێت، نازانێت ئەگەر خۆی رابگرتایە، سەعاتێکی دیکە چی رووی دەدا. لەبەرئەمەیە مرۆڤی خراپ، بەجۆرێک لە جۆرەکان وا زیاوە کە هەمیشە تەسلیم ببێت.
>
> - سی. ئێس. لویس

ئەی رۆح و ئارامیی مێشك چیان بەسەردێت؟ فەرامۆشکردنی جەستە کاردەکاتە سەر ئارەزووی خزمەتکردن و بەشداریکردن و سەر ویستی قوربانیدان و ئەوەی کە خۆمان بخەینە ژێر کۆنترۆڵی هێزە باڵا چاکەکانەوە و هەروەها هۆشمان لای خۆمان نامێنێت و بە هەمو وروژاندنێك دەستخەڕۆ دەبین. هەتا خەوش و ناتەواوییەکان زیاتر ببن، مرۆڤ زیاتر دەچێتەوە ناو قاوغەکەی خۆی و زیاتر خۆپەرست دەبێت. من خۆم بە ئەزمون بۆم دەرکەوتووە هەرکاتێك بڕیار بدەم بە گوێرەی پرنسیپەکان و ویژدان بژیم دەستبەجێ ئارەزووی خزمەتکردن و بەشداریکردنم بەشێوە ماقوڵەکان بۆ دەگەڕێتەوە.

مەسەلەی ئەوەی مرۆڤ گەورەی جەستەی خۆی بێت و بەرەوی پێبدات، مەسەلەیەکی بنەڕەتییە. هەروەها شتێکی زۆر واقیع و دیاریکراویشە. مرۆڤ دەتوانێت دەستبەجێ شتێکی لەبارەوە بکات. رێگەی راستەوخۆی زیاتری هەیە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە و دەتوانێت کۆنترۆڵی بکات. تۆ ئەگەر ئارەزووە جەستەییەکانت کۆنترۆڵ کردو زیرەکییە جەستەییەکەت بەهێزتر کرد، وردە وردە دەبینیت ماوەی نێوان کارلێکەر و کاردانەوەکە فراوانتر دەبێت، لەگەڵ هەمو ئەنجامە ئەرێنییە لابەلاکانی ئەقڵی و سۆزداریی رۆحی. ئاگام لێیە زۆرکەس باسی ئەوە دەکەن کە ناوبەناو لە هێڵەکە لادەدەن. بەڵام ئەگەر دڵسۆزانە گوێ لە فیدباکی جەستە و ئەقڵ و دڵ و رۆحیان بگرن و گۆڕانکاریی پێویست ئەنجام بدەن، دەتوانن بگەڕێنەوە سەر هێڵەکە. مەسەلەکە رێك

وەکو گەشتی فڕۆکە وایە. زوربەی فڕۆکەکان لە زوربەی کاتدا لەدەرەوەی هێڵە دیاریکراوەکەدا دەبن، بەڵام چونکە فڕۆکەوانەکە بەردەوام فیدباك و زانیاری پێدەگات لە ئامێری جیاجیاوە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر هێڵە دیاریکراوەکەی فڕین، ئەوا زۆربەی گەشتە ئاسمانییەکان دەگەنە شوێنی دیاریکراوی پلانی فڕینەکە.

ویژدانی مرۆڤ ئەگەر کەسەکە گوێی لێ بگرێت، مرۆڤ ئاڕاستە دەکات لە گشت ئەم سێ ناوچەیەدا. هەتا زیاتریش پەیڕەوی ویژدان بکات، بەهێزتر دەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت زیاتر و زیاتر پێشکەش بکات و ببەخشێت. خواردنی حەکیمانە و وەرزشکردن و ئیسراحەت و حەوانەوە تواناکانی قوڵتر دەکەن و سیستمی بەرگری جەستەیان بەهێزتر دەکەن و توانای خۆدروستکردنەوەیان زیاتر دەکەن؛ لە هەموان گرنگتریش، ئەو سێ زیرەکییە ئازاد دەکەین کە لە ئەقڵ و دڵ و رۆحماندان.

## برەودان بە زیرەکیی ئەقڵی IQ

بۆ پێشخستنی زیرەکی ئەقڵی IQ، یاخود توانا ئەقڵییەکە، من سێ رێگا پێشنیار دەکەم. یەکەمین رێگا. خوێندن و خۆرۆشنبیرکردنی سیستماتیك و دیسپلینکراو، بەوەشەوە کە بابەتی دەرەوەی بوارەکەی خۆت بخوێنیتەوە. دووەم؛ کەلتوری خۆناسین بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت راشکاوانە ئەگەرەکان دابنێت و لەدەرەوەی سنوقەکە و دەرەوەی ناوچەی ئیسراحەت بیربکاتەوە. سێیەمین، فێربوون لەرێی فێرکردن و ئەنجامدانەوە




| |
|---|
| خوێندن و رۆشنبیربوونی بەردەوام و سیستماتیك و دیسپلینکراو |
| کەلتوری خۆناسین (ئەگەرەکان بە ئاشکرا دابنێت). |
| فێربوون لەرێی فێرکردن و ئەنجامدانەوە. |

شێوەی ٢ — ١١

## خوێندن و ڕۆشنبیربوونی بەردەوام و سیستیماتیک و دیسپلینکراو

ئەو کەسانەی کە پابەندن بە فێربوونی بەردەوام و گەشەکردن و پێشکەوتنەوە ئەو کەسانەن کە توانای گۆڕان و ڕاهاتن و گونجانیان هەیە لەگەڵ ڕاستییەکانی ژیاندا و لە بنەڕەتدا توانای بەرهەمهێنانیان هەیە لەهەر بوارێکی ژیاندا بێت. تاقە ئاسایشی ڕاستەقینەی ئابوری ئێمە لەوەدایە کە بتوانین پێویستییەکامی مرۆڤ دابین بکەین. لەبەرئەوە، هەتا بارودۆخەکان خراپتر ببن، پێویستییەکانی مرۆڤ ئاشکراتر دەبن. ئاسایشی ئێمە نە لە ڕێکخراوەکانماندایە نە لە پیشەو کارەکانماندا. تەکنەلۆجیا وێرانکەرەکان زۆر بە ئاسانی دەتوانن وابکەن پیشەکان و ڕێکخراوەکان هیچ پەیوەنییەکیان بە ئارامی و ئاسایشی ئێمەوە نەبێت. بەڵام ئەگەر کەسەکە خاوەنی ئەقڵێکی بەهێزی چالاکی گەشەسەندوی فێرخواز بێت دەتوانێت هەمیشە لەسەر قاچی خۆی ڕابوەستێت. ئەو چەمکەی کە گوایە زیرەکی ئەقڵی (IQ) کالایەکی نەگۆڕە دەمێکە بەدرۆ خراوەتەوە .. مێشک هەتا زیاتر بەکاربهێنرێت، بەهێزتر دەبێت و هەتا زیاتر گوێڕایەڵی ویژدان بێت داناتر دەبێت.

من باوەڕێکی بەهێزم بەوەیە کە پێویستە تەلەفزیۆن لە ژیانماندا بخەینە کەنارەوە و بگەڕێینەوە بۆ خوێندنەوە .. خوێندنەوەی فراوان و قوڵ و لەدەرەوەی ناوچەی ئیسراحەت و لەدەرەوەی بواری پیشەییماندا. بۆ نمونە من لەناو گۆڤارەکانی دیکەدا، پێم خۆشە (ئیکۆنۆمیست The Economist) و (سایکۆلۆجی تودەی Psychology Today) و (هارڤارد بزنس ریڤیو Harvard Business Review) و (فۆرچن Fortune) و (بزنس ویک Business week) بخوێنمەوە. هاوسەرەکەم بەردەوام هانم دەدات لە بوارەکانی بایۆگرافی و بیرەوەرییەکان و خەیاڵدا زیاتر بخوێنمەوە کە ئەوانە بوارە پەسەندکراوەکانی ئەون. پێم وایە ئەمە ئامۆژگارییەکی حەکیمانەیە. من هەروەها زۆر کتێبم پێدەگات بەمەبەستی ئەوەی ڕای خۆمیان لەسەر دەرببڕم و فێربوم چەمکی کتێبەکە بخوێنمەوە لەرێک سەرنجدان لە خشتەی ناوەڕۆکەکە و تێگەیشتن لە ستایلی نوسەرەکە بۆ ئەوەی بزانم بیرۆکە سەرەکییەکان لەکوێ گوزارشتیان لێ کراوە یاخود کورت کراونەتەوە. بەم شێوەیە دەتوانم لە چەند ڕۆژێکدا پوختەی زۆر کتێب تێبگەم.

ڕێگەی زۆر سودمەندو سەرنجڕاکێشی دیکەی فێربوون ئەوەیە کە ئەو کتێبەی دەیخوێنیتەوە یان ئەو بابەتەی گوێت لێ دەبێت دابەشی بکەیت بەسەر چوار پانتاییدا: یەکەم. مەبەستەکە، دووەم: خاڵی سەرەکی، سێیەم: ڕاستگۆیی، واتە بەڵگەکانی و

چوارەم: جێبەجێکردن — واتە نمونە و بەسەرهاتەکان. من بۆم دەرکەوتووە کە ئەگەر مێشک رابهێنیت لەکاتی خوێندنەوە و گوێگرتندا بەمجۆرە بیربکاتەوە ئەوا زۆر بە باشی بابەتەکە وەردەگریت و تێی دەگەیت — تا ئەو رادەیەی کە بتوانیت خۆت بابەتەکە بڵێیتەوە (وەك ئەوەی پێشتر چەندین جار خوێندبێتتەوە).

دیارە پێویستە هەرکەسە خۆی بڕیار بدات باشترین رێگەی خۆرۆشنبیرکردنی بەردەوام چۆنە. لە جیهانی ئەمرۆدا کە جیهانی کرێکاری زانیارییە ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی چارەنوسسازە. مرۆڤ پێویستە بە وردی سەرنج بدات و وریابێت بزانێت کاتی خۆی لەکوێدا بەسەردەبات و چەند کاتی خۆی بەفیرۆ دەدات و ئینجا دیسپلینی بۆ دابنێت. خوێندنەوە سودی زۆر دەگەیەنێت. زوربەی خەڵکەکە بەبیانوی ئەوەی کە زۆر سەرقاڵن، دەڵێن کاتمان نیە بخوێنینەوە. تەنانەت کاتیشیان نییە بۆ منداڵەکانیان.

بەڵام زۆر ئاشکرایە کە مرۆڤ نیوەی کاتی خۆی بەو بابەتانەوە بەفیرۆ دەدات کە گرنگ نین، هەرچەندە کتوپڕن. بەڵام ئەگەر مرۆڤ زیاتر دیسپلینکراو بێت سەبارەت بە بایەخدان بەو مەسەلانەی کە بەراستی گرنگن، زیاتر دەتوانێت بە (بەڵێ) وەڵامی ئەو بابەتانە بداتەوە کە لە دڵیدا کڵپەیان سەندووە و زۆر ئاسان دەبێت بە زەردەخەنە و خۆشییەوە بە بۆ هەمو شتە لابەلا بێ بایەخەکانی کە سەدی سەد دێن، بڵێت نەخێر.

## چاندنی گیانی خۆناسین (ئەگەرەکان بەئاشکرا دابنێیت)

خۆناسین هەرچوار زیرەکییەکە دەگرێتەوە و بەهرەیەکە تەنیا هەر مرۆڤ هەیەتی. ئەمە لە بنەڕەتدا ناوێکی دیکەی ماوەکەی نێوان کارلێکەر و کاردانەوەیە — ئەو ماوەیەی کە دەتوانیت بوەستیت و بڕیارێك بدەیت یان رێگایەك هەڵبژێریت.

چاندنی گیانی خۆناسین بەوەی هەوڵ بدەین تێبگەین و بەئاشکرا ئەگەرەکان و تیۆری و پارادیمەکان دەربڕین، بە دڵنیاییەوە یەکێکە لە چالاکییە هەرە باڵاکان کە دەتوانین بەشداریی تێدا بکەین. ئێمە لەبەر ئەوە هەمیشە ئەگەرەکان دادەنێین کە هەمیشە ئاشکران (بەخۆمان نازانین کە دەریان دەبڕین). بەئاشکرا کردنیان دەتوانین قەڵەمبازی چۆنایەتی بدەین. فێردەبین لەدەرەوەی سندوقەکە بیربکەینەوە.

رێگەم بدە با ئەزمونێکتان وەکو روونکردنەوە پێشکەش بکەم پێی دەوترێت مەشقی (٩) خاڵەکە. ئەگەر یەکەمین جاریشت نییە لەگەڵیدا هەر پێم باشە ئەمجارەش

خۆتی لەگەڵدا خەریك بكەیت بۆئەوەی زیاتر بۆت روون ببێتەوە كە ئاشكراكردنی ئەگەرەكان و بیركردنەوە لە دەرەوەی سندوق چەند گرنگن. بۆ ئەوەی قەڵەمەكەت بەرزبكەیتەوە چوار هێڵی راستی وا بكێشە كە بەناو هەر (٩) خاڵەكەدا بڕۆن و بەیەكیشەوە بەسترابن (تەماشای وێنەی أ١-٣ بكە)



أ١-٣

كارێكی زەحمەتە؟ ئەگەر زەحمەتە دووبارە هەوڵ بدەرەوە، بەڵام ئەمجارە لەدەرەوەی سندوقەكە بیربكەرەوە. رەنگە وا تێگەیشتبیت كە پێویستە هێڵەكانت لەناو سندوقەكەدا بین و تێی نەپەڕێنن [لەمەوە دەستەواژەی: (بیركردنەوە لەدەرەوەی سندوقەكە) هاتووە]. سەرنج لە خۆت بدە بزانە ئێستا چی دەكەیت. بیر لە بیركردنەوەكەی خۆت دەكەیتەوە. جگە لە مرۆڤ هیچ گیانلەبەرێكی دیكە ناتوانێت ئەمە بكات. لەبەرئەمەیە كە هیچ ئاژەڵێك ناتوانێت خۆی دروست بكاتەوە. من و تۆ دەتوانین؟ بۆچی؟ چونكە دەتوانیت خەمڵاندنەكانمان تاقی بكەینەوە. ئێستا دووبارە هەوڵ بدەرەوە.

بابزانین چی روودەدات ئەگەر مرۆڤ لەدەرەوەی سندوقەكە بیری كردەوە. ئێستا یەكەمین هێڵ بەجۆرێك بكێشە كە بچێتە دەرەوەی سندوقەكە. (سەرنج بدە لە وێنەی أ١-٤). پاشان هێڵەكانی دووەم و سێیەم و چوارەم بكێشە (سەرنج بدە لە وێنەی أ١-٥)



وێنەی أ١-٤



وێنەی أ١-٥

زۆرچاكە. ئێستا مەتەڵێكی دیكەت دەدەمێ. یەك هێڵی راست بكێشە كە بەناو هەر نۆ خاڵەكەدا تێبپەڕێت. ئێستا مێشكی خۆت تاقی بكەرەوە. خەملاندنەكەی تۆ چییە؟ یەك هێڵی راست بەناو نۆ خاڵەكەدا. بۆت نییە خاڵەكان رێك بخەیتەوە. پێویستە هێڵەكە هەر نۆ خاڵەكە ببڕێت. بیر لەچی دەكەیتەوە؟

پانی هێڵەكە (وێنەی ٦-١١)



بۆ پەروەردەكردنی گیانی خۆناسین، رێگەم بدە چەند رێگەیەكی دیكەت بۆ پێشنیار بكەم. (كۆلین Colleen)ی كچم رەنگە حەفتا گۆڤاری تایبەت بە خۆی هەبێت كە هەر خۆی نوسیونی و هەر بۆ بەرچاوی خۆێن. ئەم جۆرە نوسینە وای لێ كردووە بتوانێت ببێتە چاودێرێكی بەشداریكردنەكانی خۆی لە ژیاندا و هەروەها بتوانێت لە روانگەی ئەو سەرنج و تێبینییانەوە بڕیار بدات. توانای ئەوەی لەخۆیدا دروست كردووە كە لە روانگەی سەرنجەكانی ئەو چركەساتەوە خۆی سەرلەنوێ دروست بكاتەوە.

ئاگام لێیە توانیویێتی گەلێك بڕیاری گرنگ بدات لەرێی گوێڕایەڵیكردنی ویژدان یاخود زیرەكییە رۆحییەكە و بەوەی كە هەردوو زیرەكییە ئەقڵی IQ و سۆزدارییەكە EQ بخاتە ژێر ركێفی ئەو زیرەكییە رۆحییە و پاشان هاوئاهەنگكردنی هەرسێكیان لەگەڵ یەكتریدا.

دیارە دیسپلینی نوسینی بیروبۆچوونەكان مرۆڤ وەڕس دەكات، بەڵام كارێكە مرۆڤەكەی بێ بەهێز دەبێت و مەسەلەكانی لەلا روون دەبێت. هەر شكستێك مرۆڤ لێیەوە فێرببێت دەبێتە سەركەوتن. لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین لەراستیدا هیچ شتێك شكست نییە بەڵكو ئەزمونەو لێوەی فێردەبین و بە باشی لە ژیاندا سودی لێ دەبینین.

رێگەیەكی بەهێزی دیكەی بڕەودان بەخۆناسین و هەروەها خەڵك ناسینیش و ئاشكراكردنی ئەگەرو بۆچونەكان ئەوەیە داوای زانیاری و فیدباك لە خەڵكی بكەیت. ئێمە

هەمومان خاڵی نابینامان هەیە. هەندێکیان بەڕاستی تواناکانمان پەك دەخەن. بەڵام ئەگەر ئەم خووە بە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە خۆماندا پەروەردە بکەین – داوای فیدباك لە خەڵك – ئەو کەسانەی کە بەلامانەوە گرنگن و لەکارو ژیاندا نزیکن لێمانەوە. دەستبەجێ دەتوانین رەوتی گەشەکردن و پێشکەوتنمان خێراتر بکەین. وەکو ئەوە وایە مرۆڤ لەبری ئەوەی کێبڕکێ لەگەڵ کێبڕکێکارە ناوچەیی و هەرێمیەکاندا بکات، توێژینەوەی بازرگانی ئەنجام بدات و بازرگانە سەرکەوتووە جیهانیەکان بکات بە پێوەر. ئەم شێوازی کارکردنە زانیاریمان دەداتێ دەربارەی خاڵە نابیناکان کە بەلای خەڵکی دیکەشەوە نابینان.

زۆرکەس، بەخۆشیمەوە، پێمان وایە نوێژ و پاڕانەوە و نزا و گوێگرتن لە دەقە پیرۆزەکان رێگەیەکن بۆ هەستکردن بە ناراستەی ویژدان و بەوەی کە ژیان وەکو پەیامێك ببینین. وەکو دەرفەتێك بۆ چاودێریکردن و بەشداریکردن لێی بنواڕین. نوێژکردن (و دوعا و پاڕانەوە) هێزو ئازایەتی ئەوەت پێدەبەخشن بگەڕێیتەوە دواوە و ددان بە هەڵەکاندا بنێیت لای خەڵکی و داوای لێبوردن بکەیت و سەرلەنوێ پابەندیی بنوێنیت و بگەڕێیتەوە سەر هێڵەکە.

## فێربوون لەرێی فێرکردن و ئەنجامدانەوە

جارێکی دیکە تەماشای بەشی (٣) بکە. هەمو کەس پێت دەڵێت باشترین رێگە بۆ فێربوونت ئەوەیە بابەتەکە فێری کەسێکی دیکە بکەو هەروەها پێت دەڵێت ئەگەر زانیارییەکە موعایەشە بکەیت (بە کردەوە لە ژیاندا جێبەجێی بکەیت) دەچێتە ناختەوە. زانینی شتێك و ئەنجامنەدانی ئەو شتە، لەراستیدا وەکو ئەوە وایە نەیزانیت. فێربوونی شتێك و ئەنجامنەدانی ئەو شتە فێرنەبونێتی. واتە تێگەیشتن لە شتێك بەڵام جێبەجێنەکردنی ئەو شتە لەراستیدا تێنەگەیشتنێتی. تەنیا لە ئەنجامدان و جێبەجێکردندایە کە زانیاری و تێگەیشتن دەچنە ناخەوە.

## فەرامۆشکردنی گەشەدان بە ئەقڵ

ئێمە لە جیهانێکدا دەژین کە ئاڵۆزییەکەی و خێراییە دیجیتاڵییەکەی بەردەوام لە هەڵکشاندان. بازاڕ و تەکنەلۆجیا بەجیهانی دەبن. جۆرێکی نوێی تیرۆریزم کە پاشەڕۆژێکی ترسناکی بۆ جیهان هەڵگرتووە – ترسی لە زوربەی دڵەکاندا دروست

کردووه. هەمو کۆمەڵگاکان توشی سەرلێشوان هاتون لە مەسەلەی بەهاکاندا. یەکەمجارە خێزان روبەروی گوشار و دڵەراوکێی ناوا ببێتەوە. تاقە ئامێریشمان بۆ روبەروبونەوەی ئەم تەحەدایانە تەنیا هەر ئەقڵە، هەر ئەو هێزی بیرکردنەوەیە. کە ئەو ئامێرە فەرامۆش دەکرێت، خودی جەستەش دەناڵێنێت. ئەو قسەیە زۆر راستە کە دەڵێت "ئەگەر پێت وایە فێرکردن زۆری تێدەچێت، نەزانین تاقی بکەرەوە". ئەرکە رەوشتییەکەی ژیان ئەوەیە کە یان دەبێت بمرین یان گەشە بکەین. (نیوەی — تەمەن)ی زوربەی پیشەگان تەنیا چەند ساڵێکی کەمە. ئەگەر بەرپرسیارێتی گەشەپێدانی ئەقڵمان بخەینە ئەستۆی ئەو دەزگاو رێکخراوانەی کە کاریان تێدا دەکەین، زیاتر و زیاتر پەیوەست و پشتبەستو دەبین و لەروی پیشەییەوە بەسەر دەچین. هەڵوێستی لەوجۆرە قەبارەی دەستکەوتەکانمان کەم دەکاتەوە و رەنگە کارو پیشەکانیشمان لەدەست بدەین. جەستە خێراتر پەکی دەکەوێت و زووتر دەمرێت.

ئەی کاریگەرییەکەی چییە لەسەر دڵ؟ فەرامۆشکردنی ئەقڵ و گەشەی بەردەوامی چ کارێك دەکاتە سەر پەیوەندییەکانمان؟ زیاتر و زیاتر دەکەوینە ژێر حوکمی نەزانی و لایەنبازی، بەچی؟ بەوەی لاسایی شێوازە نمونەییەکان دەکەینەوە و نیشانە لەسەر بابەتەکان دادەنێین. هەروەها دەبێتە هۆکاری دروستبونی بیرکردنەوەی موحافیزکارانە و تەنانەت ئەرجسییەت و خۆبەمەزنزانین. هەمو تێروانینمان بۆ ژیان دەبێتە تێروانینێکی تەسك و کورتبین و خۆپەرست.

وازهێنان لە فێربوون کاریگەرییش لەسەر رۆح دروست دەکات، یەکەمجار ویژدان سڕدەکات، پاشان خاوخلیچك دەبێت و دواجار بێدەنگ دەکرێت، چونکە بەردەوام داوامان لێ دەکات فێرببین و گەشە بکەین. وازهێنان لە فێربوون دەبێتە هۆی ئەوەی تێروانینمان بۆ ژیان و ئارەزوی هەوڵدانی دۆزینەوەی دەنگی خۆمانمان تێدا نەمێنێت، کە ئەمانە هەردوکیان سەرچاوەی سەرەکیی عیشقن لە ژیاندا. ئەدەبیاتی حیکمەت و دانایی لەلامان دەبێتە بابەتێکی بێزارکەر و ئیلهامنەبەخش و تەنانەت بێکەڵکیش.

## گەشەپێدانی زیرەکی سۆزداریی EQ

مەسەلە سەرنجڕاکێشەکە ئەوەیە کە تۆ بە وردی ئەدەبیاتی زیرەکی سۆزداریی دەخوێنیتەوە دوو مەسەلەت بۆ ساغ دەبێتەوە. یەکەمیان ئەوەیە کە زیرەکی سۆزداریی

زیاتر لە کاریگەریی درێژخایەندا گرنگە و دووەمیشیان ئەوەیە کە ئەم جۆرە زیرەکییە دەتوانرێت گەشەی پێبدرێت. بەڵام سەیرەکە لەوەدایە ئەو کتێب و نوسراوانە زانیاری کەمیان تێدایە سەبارەت بەوەی کە چۆن دەتوانرێت گەشەی پێبدرێت.

پێنج پێکهێنەرە زۆر قبولکراوەکەی زیرەکیی سۆزداریی بریتین لە یەکەم: خۆناسین، واتە توانای ئەوەی کەسەکە بیر لە ژیانی خۆی بکاتەوەو ئەو زانیاریانە فراوان بکات کە لەسەرخۆی دەیانزانێت و بەکاریان بهێنێت بۆ گەشەکردنی خۆی و بۆ زاڵبوون بەسەر/ یاخود قەرەبوکردنەوەی لاوازییەکان. دووەم پێکهێنەر بریتییە لە پاڵنەری کەسێتی، کە سەروکاری لەگەڵ ئەو بابەت و شتانەدا هەیە کە بەڕاستی کەسەکە هان دەدەن و دەیوروژێنن – تێڕوانین و بەهاو ئامانج و هیواو حەزو ئارەزووە هەرە لەپێشەکان. سێیەمین پێکهێنەر: خۆڕێکخستن، یاخود توانای خۆبەڕێوەبردن بەمەبەستی بەدیهێنانی تێڕوانین و بەهاکانی خۆت، چوارەمین پێکهێنەر بریتییە لە هاوسۆزیی و ناسینی بەرامبەرەکەت، واتا توانای ئەوەی بزانیت بەرامبەرەکەت شتەکان چۆن دەبینێت و هەستی چییە بەرامبەریان. پێنجەمین پێکهێنەریش شارەزایی لە پەیوەندیکردندا، کە پەیوەستە بەوەی خەڵکی دیکە چۆن ناکۆکییەکان چارەسەردەکەن و کێشەکان یەکلایی دەکەنەوە و ڕێگەچارەی خوڵقێنەر دروست دەکەن و بە باشترین شێوە کارلێک دەکەن بۆ بەرجەستەکردنی مەبەستە هاوبەشەکان.




| |
|---|
| خۆناسین |
| پاڵنەری کەسێتی (تایبەت) |
| خۆڕێکخستن |
| هاوسۆزیی |
| شارەزاییە کۆمەڵایەتییەکان |

شێوەی ١١ – ٧

من بڕوای تەواوم هێناوە بەوەی کە چاکترین و سیستیماتیکترین ڕێگە بۆ گەشەدان بەو پێنج ڕەهەندەی زیرەکی سۆزدارییە، لە ڕێگەی ٧ خووەکەی کەسانی هەرە کاریگەرەوەیە. من، وەك لە بەشی هەشتەمدا ئاماژەم پێدا، ناتوانم خووەکان لێرەدا بە دوورودرێژی باس بکەم – وەك ئەوەی لە کتێبەکەدا هەن. بەڵام لەخوارەوە چارتێك دەبینیت (خشتەیەك) کە پرنسیپ و گەوهەری یەك بەیەکی خووەکانی ئەو ٧ خووە نیشان دەدات. هەروەها دەشتوانیت چاوبخشێنیتەوە بە کورتە پوختکراوەکەی ٧ خووەکە لە بەشی هەشتەمدا

| ئەو پرنسیپانەی کە لە ٧ خووەکەدا بەرجەستە بون | |
|---|---|
| خوو | پرنسیپ |
| ١) دەستپێشخەر بە | بەرپرسیارێتی/ دەستپێشخەریی |
| ٢) کە دەستت پێکرد کۆتاییەکەت لەبەرچاو بێت | تێڕوانین/ بەهاکان |
| ٣) شتە یەکەمەکان لە پێشەوە دابنێ | بێخەوشیی/ جێبەجێکردن |
| ٤) بە ئەقڵییەتی براوە – براوە بیربکەرەوە | ڕێزگرتن لە یەکتریی/ فازانج |
| ٥) یەکەمجار هەوڵ بدە تێبگەیت ئینجا تێت بگەن. | لێکتێگەیشتن |
| ٦) یەکتر تەواوکردن | هاوکاریی خوڵقێنەر |
| ٧) مشارەکە تیژبکەرەوە | خۆنوێکردنەوە |

شێوەی أ١ – ٨

## خۆناسین

ناسینی خود، واتە ئاگاداربوون لە ئازادییمان و لە توانای بڕیاردانمان، لەڕاستیدا کرۆکی خووی – دەستپێشخەربە –یە. بە واتایەکی دیکە تۆ ئاگاداریت لەوەی کە ماوەیەك هەیە لەنێوان کارلێکەر و کاردانەوەدا، ئاگاداریت لە خەسڵەتە بۆماوەییەکانت، لە میراتە بایۆلۆجییەکەت، لە پەروەردەبونت و هەروەها لە هێزە ژینگەییەکانی

دەورووبەرت؛ بە پێچەوانەی ئاژەڵەوە، تۆ دەتوانیت لە روانگەی ئەم شتانەوە بڕیاری حەکیمانە بدەیت — هەست دەکەیت تۆ خۆت هێزی خوڵقێنەری ژیانی خۆتیت یاخود دەتوانیت ببیتە ئەو هێزە. ئەمە بنەڕەتیترین بڕیارتە.

| گەشەدان بە پێنج پێکهێنەرەکەی زیرەکی سۆزداریی لەرێی ٧ خوودکەوە | |
|---|---|
| خۆناسین | ١) دەستپێشخەر بە |
| پاڵنەری کەسێتی (تایبەت) | ٢) کە دەستت پێکرد<br>کۆتاییەکەت لەبەرچاو بێت |
| خۆڕێکخستن | ٣) شتە یەکەمەکان یەکەمجار دابنێ<br>٧) چەقۆکە تیژبکەرەوە |
| هاوسۆزیی | ٥) یەکەمجار هەوڵبدە تێبگەیت<br>ئینجا تێت بگەن |
| شارەزاییە کۆمەڵایەتییەکان | ٤) بە ئەقڵییەتی براوە — براوە بیربکەرەوە<br>٥) یەکەمجار هەوڵبدە تێبگەیت ئینجا تێت بگەن<br>٦) هاوکاریکردنی خوڵقێنەر |

شێوەی ١ا — ٩

## پاڵنەری کەسێتی

پاڵنەری کەسێتی بناغەی ئەو هەڵبژاردن و بڕیارانەیە — واتە بڕیار دەدەیت مەسەلە هەرە لەپێشەکان و ئامانج و بەهاکان چین؛ ئەمەش لە بنەڕەتدا ناوەڕۆکی خووی ژمارە (٢)ەکە دەستت پێکرد کۆتاییەکەت لەخەیاڵدا بێت. بڕیاری ئاراستەکردنی ژیانت بڕیاری سەرەتاییە.

## خۆڕێکخستن

خۆڕێکخستن ڕێگەیەکی دیکەی دەربڕینی (شتە یەکەمەکان یەکەمجار دابنێ)یە – خووی ژمارە (٣) و هەروەها دەربڕینی مشارەکە تیژبکەرەوە – خووی ژمارە (٧). واتە مرۆڤ هەر کە بڕیاری دا بابەتە لەپێشەکان لای ئەو بریتین لەچی، ئینجا بۆیان دەژی؛ ئەمە خۆی بێ‌خەوشییە، خووی ئەوەی جڵەوی خۆت بگریت و ئەوکارە ئەنجام بدەیت کە مەبەستتە، خووی ئەوەی لەگەڵ بەهاکانی خۆتدا بژیت.

## هاوسۆزیی

هاوسۆزیی نیوەی یەکەمی خووی ژمارە پێنجە – یەکەمجار هەوڵبدە تێبگەیت. پاشان هەوڵبدە تێت بگەن. فێربوونی ئەوەیە کە ژیاننامەی خۆت تێبپەڕێنیت و بگەیتە ناو دڵ و مێشکی بەرامبەرەکەت. ئەوەیە کە لەرووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر هەستیار و ئاگاداری دۆخەکە ببیت پێش ئەوەی هەوڵبدەیت تێت بگەن و کار لە خەڵکی بکەیت و هیچ بڕیار و حوکمێك بدەیت.

## شارەزایی لە پەیوەندیکردنە کۆمەڵایەتییەکاندا

کۆکردنەوەی خووەکانی ٤ و ٥ و ٦ بریتییە لە شارەزاییەکانی پەیوەندیکردنە کۆمەڵایەتییەکان. بیرکردنەوەیە لە بەرژەوەندی هاوبەش و ڕێزی هاوبەش (ڕێزلەیەکتر بگرین) (خووی ٤ – بیرکردنەوە بە ئەقڵییەتی براوە – براوە). خەبات دەکەیت لەپێناوی لەیەکتر تێگەیشتندا (خووی ٥ – یەکەمجار هەوڵبدە تێبگەیت، ئینجا هەوڵبدە تێت بگەن) بە مەبەستی بەدیهێنانی هاوکاریی خوڵقێنەر (خووی ٦ – یەکترتەواوکردن). دیسانەوە دەڵێمەوە کە ئەمە تەنیا کورتکراوەی پەیوەندییەکانی نێوان ٧ خووەکە و گشەدانە بەم پێنج ڕەهەندەی زیرەکیی سۆزداریی، بەڵام باشە خوێندنەوەیەکی ڕاست و هەوڵی جێبەجێکردنی ٧ خووەکە بدەیت لە کتێبی (٧ خووەکەی کەسانی هەرەکاریگەردا) .. ئەمە هیچ ڕیکلامکردن نییە بۆ کتێبەکەی خۆم، بەڵکو باوەڕکردنە بە پرنسیپە جیهانی و هەمیشەیی و بەڵگەنەویستەکانی ناو کتێبەکە – ئەو پرنسیپانەی کە ناتوانم لافی خاوەندارێتییان لێ بدەم چونکە موڵکی هەموو مرۆڤایەتین و لە هەموو نەتەوە و کۆمەڵگا و ئاینێکدا هەن کە بەرگەیان گرتووە و گەشەیان کردووە.

## فەرامۆشکردنی زیرەکیی سۆزداریی

(دۆك چیلدەر Doc childer) و (بروس کرایەر Bruce Cryer) کە دوو نوسەرن بەم شێوەیە باسی کاریگەریی فەرامۆشکردنی دەنگە زیرەکەکەی دڵ دەکەن لەسەر جەستە." کاتێك کە نائومێدی و نیگەرانی و پەشێوەییەکانی ناخی مرۆڤ دەکەونە کار، توانای زیرەکیی کەم دەبێتەوە. ئەم بارودۆخە سۆزدارییانە دەبنە هۆی ناهەماهەنگی لە دەرهاویشتە کارەبایی و ئیقاعییەکانی دڵدا و توانا نیورۆلۆجییەکان کەم دەبنەوە. ئەمە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بۆچی خەڵکە زیرەکەکەش جاروبار گێلانە رەفتار دەکەن. مرۆڤ ئەگەر هاوناهەنگبوونیی ناخی خۆی بکاتە ئەرکێکی هەرە لەپێشی رۆژانە، دەتوانێت کات و وزە بپارێزێت و کەمتر بەفیڕۆیان بدات." ئەو دوو نوسەرە دەڵێن "ئێمە کاتێك بە پێچەوانەی ویژدان و بەها قوڵەکانمانەوە رەفتار بکەین کۆئەندامی بەرگریمان لاواز دەبێت، ئەو کۆئەندامەی کە ئەگەر هەست بە خۆشەویستی و بایەخپێدان بکەین و دەریانبڕین زۆر بە چاکی گەشە دەکات. رێکخراوی هارتماث The Heartmath organization بەشێوەیەکی زانستیی ئەم پەیوەندییەی ئاشکرا کردووە، هەم لەسەر ئاستی تاکەکەسی و هەم لەسەر ئاستی رێکخراوەییش کە هارتماث وەکو ڤایرۆسێکی سۆزداریی ئاماژەی پێدەدات کە رۆح و رەوشت و زیندوێتی رێکخراوەکە لاواز دەکات. سەبارەت بە پەیوەندییەکە لەسەر ئاستی تاکەکەسی لێت دەپرسم ئایا تۆ هەرگیز نەخۆش نەکەوتویت کە بیستبێتت ئەو پێشنیارە سەرەکییەی ماوەی چەند مانگێك کارت لەسەر کردبو رەتکراوەتەوە، یاخود هەرگیز لەپاش دەمەقاڵە و حانەپەشەیەکی گەورە ناساغ نەبویت؟".

ئێمە ئەگەر مەسەلەی بەرەودان بە زیرەکییە سۆزدارییەکەمان فەرامۆش بکەین بەوەی کە نەتوانین لەرێی خۆدیسپلینکردنەوە سەرکەوتنی تایبەت و کەسێتی بەدەست بهێنین کە دەبنە هۆی بەدەستهێنانی سەرکەوتنی گشتی، ئەوا روبەروی زەبری سۆزداریی و گوشار و هەستە نەرێنی و وێرانکەرەکانی وەکو توڕەیی و تەماع و ئێرەیی و هەستکردنێکی نالۆجیکی بە تاوان و گوناهکردن دەبینەوە. کاتێك کە پەیوەندییەکی گەوهەریی گوشاری دەچێتە سەر، تێك دەشکێن یاخود بەشێل دەکرێن، کاردەکاتە سەر جەستەو سیستمی بەرگری لاواز دەکات. ئەوکەسە هەست بە ژانەسەر و جۆرەها نەخۆشی دەرونجەستەیی دەکات. زۆرجار لەروی ئەقڵییەوە توشی خەمۆکی و بێ

حەواسی و پەرێشانی دەبێت و توانای ئەوە لەدەست دەدات بەشێوەیەکی ئەبستراك و بە وردی و شیتالکارییانە و داهێنەرانە بیربکاتەوە. رۆحیشی توشی بێزاریی و دڵساردی دەبێت؛ ئەو کەسە زۆرجار هەست بە بێچارەیی و نائومێدیی دەکات و پێی وادەبێت ئەو قوربانییەکی بێ هیوای ناروداۆخەکەیە و هەندێك جار هێندە بێ هیوا دەبێت کە دەست دەداتە خۆکوژیی. لەبەرئەوە زۆر گرنگە ئێمە بەردەوام پەیوەندییەکانمان لەگەڵ خۆمان و لەگەڵ خەڵکیدا پەرە پێبدەین.

## گەشەدان بە زیرەکیی‌یە رۆحییەکە SQ

کۆتایی فێرکردن ئەوەیە خەڵکەکە ببینێت هەم لەروی لێهاتوویەوە و هەم لەروی ویژدانیشەوە گەیشتبنە ئەوپەڕی.
چونکە خوڵقاندنی توانا و لێهاتویی ئەگەر خوڵقاندنی ئاراستەیەکی هاوجوتیی لەگەڵدا نەبێت رێبەرایەتی بەکارهێنانی ئەو توانایە بکات مانای وایە ئەو پەروەردە و فێرکردنە پەروەردە و فێرکردنێکی خراپە.
جگە لەوەش لێهاتویی ئەگەر ویژدانی لەگەڵدا نەبێت سەرەنجام لەناو دەچێت.
- جۆن سلوان دیکی

بۆ گەشەپێدانی زیرەکیی‌یە رۆحییەکە من سێ رێگا پێشنیار دەکەم:
یەکەم، بێخەوشیی – ئەوەی کە راستگۆبیت لەگەڵ ویژدان و باوەڕو بەها هەرە بەرزەکانتدا و پەیوەندیت بە هێزە رەهاکەوە هەبێت The infinite. دووەم، مانا (مەبەست) – ئەوەی کە بەرامبەر خەڵك و هۆکارەکان هەست بە بەشداری بکەیت و سێیەمین رێگا، بریتییە لە دەنگ – واتە گونجاندنی ئەرکەکە لەگەڵ بەهرەو نیعمەتە تایبەتەکانت و هەستکردنمان بە بانگەوازەکە.

| زیرەکی رۆحی گەشەپێدانی سێ پێکهێنەرەکەی زیرەکی رۆحی SQ |
| --- |
| بێخەوشیی<br>(راستگۆبوون لەگەڵ ویژدان و بەها باڵاکاندا) |
| واتا (مەبەست)<br>هەست بە بەشداریکردن بەرامبەر خەڵك و هۆکارەکان |
| دەنگ (گونجاندنی ئەرکەکە لەگەڵ نیعمەت و بانگەوازە بێهاوتاکاندا |

شێوەی ١١ — ١٠

## بێخەوشیی – بەڵێندان و جێبەجێکردنی

باشترین رێگە بۆ گەشەپێدانی بێخەوشی ئەوەیە بە بەڵێنی بچوك دەست پێبکەیت و بیبەیتە سەر. بەڵێنێکی وا بدە کە بە رواڵەت زۆر بچوك و بێبایەخ بێت بەلای خەڵکییەوە بەڵام لای خۆت هەوڵێکی راستەقینە بێت – بۆ نمونە ماوەی دە خولەك وەرزش بکەیت یان شیرینی نەخۆیت، یاخود رۆژانە سەعاتێك کەمتر تەماشای تەلەفزیۆن بکەیت و لەبری ئەوە کتێبێك بخوێنیتەوە، یاخود نامەیەکی سوپاسگوزاری بۆ کەسێك بنوسیت، یان سوپاس بۆ کەسێك دەرببڕیت یاخود رۆژانە نوێژبکەیت، یان داوای لێبوردن بکەیت، یاخود رۆژانە ماوەی دە خولەك تەرخان بکەیت بۆ خوێندنەوەی دەقی ئاینی. مەسەلەکە ئەوەیە کە تۆ کاتێك بەڵێنێك دەدەیت و دەیبەیتە سەر، ئەوا توانای راگەیاندن و بەڵێنی گەورەترت تێدا زیاد دەبێت. بەردەوامبونت لەسەر ئەم کارە وا دەکات بەزوویی هەستکردنت بە شانازیی بەهێزتر بێت لە تاقەت و مەزاجت. بەمە برەو دەدەیت بە بێخەوشی خۆت کە بۆت دەبێتە سەرچاوەیەکی گەورەی هێز. ئەمە لەراستیدا هەڵکردنی ئاگرێکی بچکۆلەیە تا لەناوەوە دەبێتە ئاگرێکی گەورە.

## بێخەوشیی – پەروەردەکردن و پەیڕەوکردنی ویژدانت

ڕەنگە بەهێزترین ڕێگا بۆ گەشەپێدانی زیرەکیی ڕۆحی ئەوەبێت کە ویژدانت پەروەردە بکەیت و شوێنی بکەویت. مادام دی ستەیل Madam de stale بەم شێوەیە باسی دەکات: "دەنگی ویژدان هێندە ناسکە کە دەتوانرێت بەئاسانی خامۆش بکرێت، بەڵام هێندەش ڕوون و ئاشکرایە کە مەحاڵە بە هەڵە لێی تێبگەیت. "تۆ کاتێك کە ئەدەبیاتی حیکمەتی کەلتورەکەی خۆت دەخوێنیتەوە یاخود کە لە ژیاننامەی ئەو کەسانە ورد دەبیتەوە کە ئیلهامیان پێبەخشیویت و پێیان سەرسامیت، هەست دەکەیت کە دەنگی ویژدان ئاڕاستە و ڕێنماییت دەکات؛ ئەو دەنگە دەنگێکی نەرم و ئارامە. ئەو قسەیەی (سی. ئێس لویس)یش بەڕاستی دێتە دی کە دەڵێت: "هەتا زیاتر گوێڕایەڵی ویژدانت بیت، ویژدانت زیاترت داوا لێ دەکات". ویژدان تەنیا هەر داواکارییەکانی تۆ زیاتر ناکات، بەڵکو لێهاتویی و زیرەکی و بەشدارییەکانیشت زیاتر دەکات. تۆ کاتێك داناپانە بەهرەکانت بەکاردەهێنیت، دڵنیابە دوو بەرامبەری جارانیان لێ دێت.

## دۆزینەوەی واتا و دەنگی خۆت

بێگومان ئەم بابەتە ئامانجی سەرەکی کتێبەکەیە و دەچێتە هەمو شتەکانی دیکەوە. بەڵام ڕێگەیەکی سادە بۆ ئەوەی مرۆڤ دەنگی خۆی بدۆزێتەوە، وەك پێشتر باسکرا، ئەوەیە پرسیاری سادە لەخۆی بکات کە بارودۆخی ژیانم ئێستا داوای چیم لێ دەکات؛ لەم ئەرك و بەرپرسیارێتی و ئۆباڵانەی ئێستامدا هەنگاوی حەکیمانە کامەیە هەڵیبنێم؟ ئێمە ئەگەر ڕاستگۆیانە وەڵامی پرسیارەکانی ویژدانمان بدەینەوە، ماوەکە گەورەتر دەبێت لەنێوان کارلێکەر و کاردانەوەدا و دەنگی ویژدانت بەرزتر دەبێتەوە.

> مەبەستم لە ژیان ئەوەیە ئارەزووەکان و پشووەکانم یەک بخەم
> وەک چۆن هەردوو چاوم یەک بینایی دروست دەکەن
> تەنیا ئەگەر پێویستی و خۆشی ببن بە یەک و کارکردن هێندەی
> یاریکردن خۆش بێت ئینجا کارەکە بەراستی ئەنجام دەدرێت و
> دڵی ئاسمان و خاتری ئایندە خۆش دەکات
> - ڕۆبرت فرۆسن

ڕێگەیەکی دیکەی زۆر گرنگ بۆ دۆزینەوەی دەنگ و بانگەوازەکەی ناخی خۆمان ئەوەیە کە کارو پیشەیەك هەڵدەبژێریت یاخود دەتەوێت خۆت تەرخان بکەیت بۆ مەسەلەیەك، لەبیرت بێت پرسیاری بنەڕەتی وابکە لەڕاستیدا پرسیاری چوار زیرەکییەکە بن – جەستە و ئەقڵ و دڵ و ڕۆح.

حەزدەکەم کام کارە ئەنجام بدەم کە زۆر باشم تیایدا؟ ئایا پێویستە بیکەم؟ ئایا ئەو کارە من دەژێنێت؟ ئایا دەتوانم فێرببم چاکتر ببم تیایدا؟ ئایا ئامادەم باجی ئەو فێربوونە بدەم؟ لە کتێبە کاریگەرەکەیدا (لە باشەوە بۆ مەزن) جیم کۆلینس Jim Collins هانی خەڵکی و هەروەها هانی ڕێکخراوەکانیش دەدات بپرسێ بڵێت ئەو بابەتە چییە کە دەتوانم لە هەمو کەس باشتربم تیایدا؟ من لانی کەم یەك وەڵامی ڕاستی ئەم پرسیارە دەزانم کە بەسەر هەمووماندا جێبەجێ دەبێت کە خاوەنی منداڵین. ئێمە ئەگەر بڕیار بدەین دەتوانین باشترین کەس بین لە جیهاندا لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی خۆماندا. کەس هێندەی تۆ منداڵەکانی تۆی مەبەست نییە.

> سەد ساڵی دیکە ئەوە گرنگ نابێت من ئوتومبیلێکی چۆنم لێ خوڕیوە یاخود لە خانویەکی چۆندا ژیاوم و چەندێک پارەم هەبووە لە بانکدا و چ جۆرە جلوبەرگێکم پۆشیوە. بەڵام ڕەنگە جیهان کەمێک چاکتر بێت چونکە لە ژیانی منداڵێکدا گرنگ بووم.
>
> - نەزانراوە

## پەراوێزخستن و فەرامۆشکردن و پێشێلکردنی زیرەکی‌یە ڕۆحییەکەمان

ئایا جەستە چی بەسەردێت کاتێك کە ویژدان و بێخەوشییمان پێشێل دەکرێن؟ زۆرجار ئەو کاریگەرییە لە ڕوخسار و چاوی خەڵکەکەدا دەبینیت کە جەستەیان فەرامۆش دەکەن و گوێی پێنادەن. زۆرجار دەبینیت خەریکە دەفەوتێن یان بە تەواوی فەوتاون. مێشکیان پڕە لە پاساوی جۆراوجۆر، کە لەڕاستیدا بریتین لە درۆی ئەقڵانی. هەست بە تاوانباربوونی خۆیان دەکەن، کە ئەمە هەستێکی زۆر تەندروستە کاتێك کە دەستدرێژییەکی گەورە هەیە بۆسەر ویژدان و بێخەوشیی. ئاسایش و ئارامیان نکیە و

لـە حوکمدانــدا کـۆڵن. زانکـۆی کالیفۆرنیـا لـە بێرکیلـی Berkeley هەنــدێك لـە توێژینەوەکـەی خۆیـان لـە دەنگوباسێکدا کـورت کـردەوە بـە ناونیشـانی "باشـبوون بـە ئەنجامدانی کاری باش".

ئەی دڵ چی بەسـەردێت؟ هـەر ئـەو خەڵکەی کە باسـان کـرد توانـای کۆنترۆڵکردنی هەستو سۆزیش لەدەست دەدەن و ناتوانن لە خەڵکانی دیکە تێبگەن و هاوسۆزیی لەگەڵ هیچکەسێکدا دەربڕن. بەزەیی و خۆشەویستییان بۆ خەڵك بە رادەیەکی بەرچاو دادەبەزێت.

> مرۆڤ هەتا باش بێت زیاتر و ئاشکراتر لەو خراپەیە تێدەگات کە هێشتا لە ناخیدا ماوەتەوە. بەڵام ئەگەر ئەو کەسە خراپتر بێت، کەمترو کەمتر لە خراپییەکەی خۆی تێدەگات. ئەوکەسەی کە بەشێوەیەکی مامناوەندیی خراپە بەخۆی دەزانێت کە زۆرباش نییە، بەڵام ئەوکەسەی کە زۆرخراپە پێی وایە زۆرچاکە و هیچ عەیبێکی نییە. ئەمە راستییەکە هەمو کەس دەیزانێت. تۆ کاتێک لە نوستن تێدەگەیت کە بێدار بیت، نەک نوستبین. هەڵەکانی بیرکاریی ئەوکاتە هەست پێدەکەین کە مێشکت بە باشی کاربکات؛ کاتێک کە هەڵەکان دەکەیت نازانیت. هەڵە دەکەیت و ناتوانیت بیانبینیت. مرۆڤی باش زانیاری لەسەر چاکەش هەیە و لەسەر خراپەش؛ بەڵام مرۆڤی خراپ هیچیان نازانێت.
>
> - سی. ئێس. لویس

# پاشکۆی دووەم

## پوختەیەکی تیۆرییەکانی سەرکردایەتی

بۆ پۆلێنکردنی تیۆرییەکانی سەرکردایەتی پێنج ڕێبازی بنەڕەتیمان هەیە کە لە سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵدا بریتین لە سەرکردایەتیکردن بەهۆی خەسڵەتەکان (ئەو خەسڵەتانەی کە سەرکردەکەی پێ جیادەکرێتەوە) و سەرکردایەتیکردنی ڕەفتاریی، سەرکردایەتیکردن بە دەسەڵات و دەورو تەئسیر و سەرکردایەتیکردن بەهۆی بارودۆخەکەوە و سەرکردایەتیکردنی کارلێکی (تفاعلی Integrative). لەراستیدا تیۆرییەکانی پیاوی مەزن، سەبارەت بە سەرکردایەتیکردن، کە پێش سەدەی بیستەم باڵادەست بو بواری خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی ئەو تیۆریانەی کە پشت بە خەسڵەتەکانی سەرکردە دەبەستن. پاشان تیۆریستەکان دەستیان کرد بە فۆکەسکردنە سەر هۆکارە جۆرەکانی دەوروبەر و بارودۆخ. دواجار تیۆرییە تەواوکارییەکان دەرکەوتن، ئەو تیۆریانەی کە بارودۆخەکان و کەسەکان و شیتەڵکردنەوەی دەرونی و ڕۆڵ و گۆڕانکاری و ئامانج و دەستکەوت و بارودۆخە کتوپڕەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە. لە ساڵی (١٩٧٠)ەوە تیۆرییەکانی سەرکردایەتیکردن لەم تیۆرییە بنەڕەتییانەوە گەشەیان کرد.

### پوختەیەکی تیۆرییەکانی سەرکردایەتی

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| تیۆرییەکانی پیاوی مەزن | دۆود/ ١٩٣٦ | لەراستیدا کۆمەڵگاکان و مێژوو دروستکراوی کەسایەتییە مەزنەکانن بە پیاو و ژنەوە (وەك موسا و محەممەد و ژان دارك و جۆرج واشنتۆن و گاندی و چەرچل). دۆود پێی وایە شتێك نییە بەناوی "سەرکردایەتی |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | کۆمەڵانی خەڵکەوە. تاکەکان لە هەر کۆمەڵگایەکدا لە ئاستی جیاجیای زیرەکی و توانا و هێزی رەوشتیدان و گەلان هەر ئاراستەیەك بگرنە بەر، هەمیشە هەر لەلایەن ژمارەیەکی کەمی کەسایەتییە مەزنەکانیانەوە سەرکردایەتی دەکرێن. |
| تیۆرییەکانی تایبەت بە خەسڵەتەکانی سەرکردە | ئێل ئێل بارنارد (١٩٢٦)؛ بینگهام (١٩٢٧)؛ کیلّ بۆرن (١٩٣٥)، کیرکپاتریك و لۆك (١٩٩١)؛ کۆمس و ئایرلّ (١٩٢٠) بەیج (١٩٣٥)، تێد (١٩٢٧) | سەرکردە خەسڵەت و تایبەتمەندیی دیار و سەرکەوتوی وای هەیە کە لە شوێنکەوتووەکانی خۆی جیای دەکەنەوە. لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بەم تیۆرییانەوە هەوڵیان داوە وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەنەوە: ئەو خەسڵەتانە چین کە سەرکردەکان لە خەڵکی دیکە جیادەکەنەوە؟ بەهۆی ئەم خەسڵەتانەوە سەرکردەکان چەندێك لە خەڵکی دیکە جیاوازن؟ |
| تیۆرییە بارودۆخییەکان | بۆگاردۆس (١٩١٨)؛ هێرسی و بلانچارد (١٩٧٢)؛ هۆکینگ (١٩٢٤)؛ (پێرسۆن) (١٩٢٧)؛ ئێچپێنسەر | سەرکردایەتی بەرهەمی پێویستییەکانی بارودۆخە؛ هۆکارەکانی بارودۆخ بڕیار دەدات کێ وەکو سەرکردە دەردەکەوێت نەك خەسڵەتە کەسێتییەکانی. دەرکەوتنی سەرکردەی مەزن دەرەنجامی کات و شوێن و بارودۆخە |
| تیۆرییە کەسایەتییە بارودۆخییەکان | بارنارد (١٩٣٨)، باس (١٩٦٠)، جی. ئێف. براون (١٩٣٦)، سی. ئەی. جیب (١٩٤٧، ١٩٥٤)، کەیس (١٩٣٣)، | تیۆرییە کەسایەتییە/ بارودۆخییەکان بریتییە لە کۆکردنەوەی ئەو سەرکردایەتییەی کە پشت بە کەسایەتییە مەزنەکە دەبەستێت لەگەڵ |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | جینکیس ١٩٤٧)، لاپییەر (١٩٣٨)، مێرفی (١٩٤١)، وێست بێرگی (١٩٣١) | ئەو سەرکردایەتیەدا کە پشت بە خەسڵەت و سەرکردایەتیە بارودۆخیەکە دەبەستێت. توێژینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لێکۆڵینەوە لەسەر سەرکردایەتی پێویستە خەسڵەتە سۆزداری و ئەقڵی و پراکتیکیەکان بگرێتەوە کە ئەو سەرکردەیە هەڵیگرتون، هەروەها پێویستە بارودۆخە تایبەتەکەی دەوروبەری سەرکردەش بگرێتەوەو بریتین لە: ١) خەسڵەتە کەسێتیەکان ٢) سروشتی کۆمەڵ و تاکەکان ٣) ئەو رووداوانەی کە کۆمەڵەکە ئاراستە دەکەن. |
| تیۆرییەکانی شیتەڵکردنەوەی دەروونی | ئیدیکسۆن (١٩٦٤)، فرانك (١٩٣٩)، فرۆید (١٩١٣، ١٩٢٢)، فرۆم (١٩٤١)، نیچ. یفیزن (١٩٧٠) دۆڵمان (١٩٧١) | سەرکردە رۆڵی باوك دەگێرێت، سەرچاوەی ترس و خۆشەویستیە و وەك بەرجەستەکارێکی خودی باڵایە و وەکو هۆکارێکە لە رێگەیەوە شوێن کەوتوانی سەرکردەکە گوزارشت دەکەن لە هەستی شکستخواردن و دوژمنکارانەی وێرانکەر |
| تیۆرییە مرۆڤدۆستەکان | ئارگیرس (١٩٥٧، ١٩٦٢، ١٩٦٤)؛ بلەیك و ماوتۆن (١٩٦٤، ١٩٦٥) هێرسی و بلان چارد (١٩٦٩، ١٩٧٢)، لیرد (١٩٦١، ١٩٦٧)، ماسلۆ (١٩٦٥)، ماکیگۆر (١٩٦٠، ١٩٦٦) | تیۆرییە مرۆڤدۆستەکان بایەخ دەدات بە گەشەکردنی تاکەکان لە رێکخراوگەلی کاریگەر و یەکگرتودا .. لایەنگرانی ئەم تیۆرییە دەڵێن مرۆڤ بە سروشتی خۆی بونەوەرێکی بەهەڵپەیە بەڵام رێکخراوەکان بە سروشتی خۆیان کۆنترۆڵکەرن و |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | حەزیان لە سنوردارکردنە. ئەم تیۆرییانە دەڵێن سەرکردایەتیکردن ئەو کۆت و پێوەندانە. دەستکاری دەکات کە ڕێکخراوەکان دایان دەنێن بۆ ئەوەی ئازادی بۆ تاکەکان دەستەبەر بکات تا بتوانن هەمو تواناو وزەی خۆیان بخەنەگەڕ و هاوبەشی بکەن لە ڕێکخراوەکەدا. |
| تیۆری سەرکردە – ڕۆڵ | هۆمانس (١٩٥٠)، کان وکوین (١٩٧٠)، کەیدوجیندمایەر (١٩٧٨)، مینتس بێرگ (١٩٧٣)، ئۆس بۆرن و هەنت (١٩٧٥) | ئەم تیۆرییە دەڵێت خەسڵەتەکانی مرۆڤ و داواکارییەکانی بارودۆخەکە بەشێوەیەک کارلێک دەکەن کە تەنیا یەک کەس یان ژمارەیەکی کەمی خەڵك وەکو سەرکردە هەڵبکەون. کۆمەڵەکان لە ئەنجامی کارلێکی نێوان تاکەکاندا دروست دەبن، و کۆمەڵیش بەپێی ڕۆڵ و پۆستە جیاوازەکان دەبێتە پێکهاتەیەکی ڕێکخراو. سەرکردایەتیکردن یەکێکە لە ڕۆڵە دیاریکراوەکان و ئەو کەسەی ئەو پۆستە پڕدەکاتەوە وای لێ چاوەڕوان دەکرێت بە شێوازێکی جیاواز لە خەڵکی دیکە هەڵسوکەوت بکات. لەڕاستیدا سەرکردەکان بەپێی تێگەیشتنیان لە ڕۆڵی خۆیان و بەپێی چاوەڕوانی خەڵکەکە لێیان ڕەفتار دەکەن. مینتس بێرگ ئەم ڕۆڵانەی خوارەوەی سەرکردایەتی دیاری کردووە، نمونەیەك بێت خەڵك پەنجەی بۆ |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | بوختە |
|---|---|---|
| | | رابکێشێت، رابەر، سەرکردەیەك بێت پەیوەندی سۆزداری بەدی بهێنێت. راهێنەرێك بێت بیروباوەڕەکان بڵاوبکاتەوە، وتاربێژ، بزنسمان، بزانێت چۆن لەگەڵ نائارامییەکاندا هەڵسوکەوت بکات، سەرچاوە و دەستکەوتەکان دابەش بکات و دانوستانکارێکی باش بێت. |
| تیۆری رێباز – ئامانج | ئێم. جەی. ئیڤانس (١٩٧٠) جۆرجۆ پۆلۆس، ماهونس و جۆنز (١٩٥٧)، هاوس (١٩٧١) هاوس و دیزلەر (١٩٧٤) | سەرکردەکان لەرێگای نیشاندانی رەفتارەکانیانەوە دەتوانن گۆڕان لەلای شوێنکەوتوان بەرجەستە بکەن. رەفتار ئەو رێڕەوەیە کە لەئەنجامی پابەندبوون پێیەوە سەرکردە خەڵات دەکرێت. سەرکردەکان هەروەها ئامانجەکانیش بۆ شوێنکەوتوانی خۆیان روون دەکەنەوە و هاتیان دەدەن ئەرکەکە بە باشی ئەنجام بدەن. هۆکارەکانی پەیوەست بە بارودۆخ و دەوروبەرەوە ئەو شێوازە دیاری دەکەن کە سەرکردە لە رێگەیەوە دەتوانێت ئامانجەکانی بەدی بهێنێت لە مەسەلەی دیاریکردنی رێباز و مەبەستەکاندا |
| تیۆری وەڵامدانەوەی مەرجدار | فیدلەر (١٩٦٧)؛ فیدلەر و شیمێرز و ماهار (١٩٧٦) | کاریگەریی سەرکردە کە رەفتارەکانی خۆی بەپێی ئەرکێك یاخود پەیوەندییەکی دیاریکراو دەستنیشان دەکات پەیوەستە بە بارودۆخەکەی دەوروبەری. پرۆگرامەکانی مەشقکردن لەسەر سەرکردایەتیکردن |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | کە دوای ئەم تیۆرییە هەموارکرانەوە پارمەتی سەرکردە دەدات بۆ دیاریکردنی ئاراستەکەی و راستکردنەوەی ئەو ئاراستەیە بەرەو باشتر بەپێی بارودۆخەکەی کە پێیدا تێپەڕدەبێت. |
| سەرکردایەتی مەعریفی: پیاوە مەزنەکەی سەدەی بیستەم | نێج گاردنەر (١٩٩٥)؛ جەی کۆلینس (٢٠٠١). | سەرکردە (بریتییە لەو کەسەی کە کاریگەریی بەهێز دەخاتە سەر لایەنگرەکانی لەرێی گفتارەوە. یاخود لەرێی ئەوەی کە دەبێتە پێشەنگێکی نمونە. تێگەیشتن لە سروشتی ئەقڵی مرۆڤ جا هی سەرکردە بێت یان هی شوێنکەوتوان بواری زیاتر بۆ تێگەیشتنی سروشتی سەرکردایەتی دەرەخسێنێت .. لێکۆڵینەوەکانی کۆلینس گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کە جیاوازی لەنێوان ئەو دامەزراوانەی کە پارێزگاری لە ئەنجامە باشەکان دەکەن و ئەو دامەزراوانەی کە ناتوانن ئەنجامە باشەکان بپارێزن لەوەدایە کە دامەزراوە مەزنەکە خەڵکی وا سەرکردایەتیان دەکات کە (سەرکردەی ئاستی پێنجەم)ن. واتە ئەو سەرکردانەی کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر هەم بێ فیزن و هەم هێزی ویست و بڕیاردانیشیان هەیە. |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
| --- | --- | --- |
| تیۆرییەکان و نمونەی پرۆسە کارلێکارییەکان: نمونەی فرە پەیوەندیی، نمونەی فرمزێگر، پەیوەندی ستونیی دوولایەن، تیۆرییەکانی ئاڵوگۆڕ، تیۆرییە رەفتارییەکان، تیۆرییەکانی پەیوەندیکردن. | دەیڤس و لۆثانز (١٩٧٩) فیدلەر و لیستەر (١٩٧٧) فۆلك و ویندلەر (١٩٨٢)، گرەین (١٩٧٦)، گریین (١٩٧٥)، پوکی (١٩٧١). | سەرکردایەتیکردن پرۆسەیەکی کارلێکارییە، نمونەکان ئەو تیۆرییانە لەخۆدەگرن کە پەیوەستن بەو پێکهاتەیەی کە سەرکردەکان دروست دەکات و هەروەها پەیوەندی نێوان زیرەکیی سەرکردە و چۆنێتی راپەڕاندنی کارەکان لەلایەن کۆمەڵەکەیەوە و پەیوەندی نێوان سەرکردە و هەرکەسێکی دیکەی دەرەوەی کۆمەڵەکە هەیە و هەروەها پەیوەندیشی هەیە بە کارلێکی کۆمەلایەتی وەك پشتیوانی بۆ گواستنەوەی رەفتار و ئاڵوگۆڕ. |
| دەسەڵات – کاریگەریی: سەرکردایەتی بەشدار کە بنەماکانی بریتی بن لە لۆجیك و ئەنجامگیریی | کۆش و فرێنچ (١٩٤٨)، جی گاردنەر (١٩٩٠)، لیوین، لیبیت، وایت (١٩٣٩) فرۆم و بیتۆن (١٩٧٤) | لەراستیدا رێڕەوی "دەسەڵات – کاریگەریی" لە سەرکردایەتیدا سەرکردایەتی بەشداریکەر لەخۆ دەگرێت. توێژینەوەکان دەربارەی (دەسەڵات – کاریگەریی) بەدەوری بڕی ئەو دەسەڵاتەدا دەخولێنەوە کە سەرکردەکە هەیەتی و بەکاری دەهێنێت، هەروەها ئەم رێبازە بیرکردنەوە هۆکارییە یەك ناڕاستەکەش لەبەرچاو دەگرێت. لەراستیدا سەرکردایەتی بەشداریکەر دەسەڵات لەگەڵ ئەوانی دیکەدا بەش دەکات و تواناسازیی بۆ شوێنکەوتوان دابین دەکات. تیورییەکەی فرۆم وبیتۆن دەڵێت سەرکردەکان ناڕاستەکارن بەڵام |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | شوێنکەوتووەکان بەشێوەیەکی نەرێنی دوایان دەکەون. کاتێك کە شوێنکەوتووان زانیاری زیاتریان هەبێت پێویستە زیاتر بەشداریی بکەن. (گاردنەر) پێی وایە سەرکردایەتیکردن پرۆسەیەکە شوێنکەوتوانی تێدا قایل دەکرێت بەجۆرێك لە سەرکردەکە یاخود تیمی سەرکردایەتیەکە، سەرکردایەتی کۆمەڵەکە دەکات بۆ هەوڵی بەدەستهێنانی ئەو ئامانجەی کە سەرکردەکە دایناوە یان لەگەڵ شوێنەکەوتوەکاندا هاوبەشە تیایاندا. گاردنەر پێی وایە سەرکردایەتیی رۆڵێکە پێویستە بگێردرێت و سەرکردەکان لەو سیستەمەدا کە سەرۆکایەتی دەکەن رۆڵێکی تەواوکاریی دەگێرن. |
| خەسڵەت و پرۆسیسکردنی زانیارییەکان و سیستمە کراوەکان | برایۆن و کیلی (١٩٧٨)؛ کاتزو کاهان (١٩٦٦). لۆرد (١٩٧٦، ١٩٨٥)؛ لۆرد، باینین، رەش و پۆماس (١٩٧٨)؛ میجل، لارین و گرین (١٩٧٧)؛ نیویل و یەون (١٩٧٢)؛ | سەرکردایەتی راستییەکە کە بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دروست کراوە. بەپێی میجیل و ئەوانی دیکە، "خەسڵەتەکانی سەرکردایەتی لەلایەن چاودێران و ئەندامانی گروپەوە تێبینی دەکرێت دەکەوێتە ژێر کاریگەریی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییەی کە لێوەی هاتون". جگە لەوەش "گۆڕانکارییە کەسێتی و ژینگەیی و پێکهاتەیی و پرۆسەییەکان کاردەکەنە سەر یەکتری و ئەمەش وا دەکات جیاکردنەوەی |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | هۆکار لەئەنجام لەم گۆڕانکارییانەدا مەسەلەیەکی سەخت بێت |
| تەواوکاریی وەرچەرخێنی و پشتبەستو بە بنەماکانەوە | باس، بێنیس (١٩٨٤، ١٩٩٢، ١٩٩٣)؛ بێرنس (١٩٧٨)؛ داونتۆن (١٩٧٨). فەیرهۆڵم (١٩٩١) ئوتول (١٩٩٥) دی پری (١٩٩٢)؛ تابیکی و دیڤانا؛ رینشمی | بەپێی بێرنس سەرکردایەتی وەرچەرخێنی "بریتییە لەو سەرکردایەتییەی کە سەرکردە و شوێنکەوتوان یەکتری بەرز دەکەنەوە بۆ ئاستی بالآتری رەوشت و هاندان" ئەوەش لە شوێنکەوتوان پێشبینی دەکرێت کە بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیان تێبپەڕێنن و بایەخ بە بەرژەوەندیی کۆمەڵگە بدەن و بیر لە ئامانجە دوورەکان بکەنەوە و هوشیارییان هەبێت دەربارەی مەسەلە گرنگەکان. بەپێی (بینیس) سەرکردەی کاریگەر سێ ئەرک ئەنجام دەدات، گونجاندن و داهێنان و تواناسازیی. سەرکردە دەتوانێت دەزگاکە بگۆڕێت لەرێی گونجاندنی نێوان خەڵکەکە و سەرچاوەکانی دیکەدا و داهێنانی کەلتورێکی دامەزراوەیی کە ئازادی رادەربڕین بەرجەستە بکات و هەروەها لەرێی تواناسازیی خەڵکەکە بۆ بەشداریکردن لە دامەزراوەکە. (بینیس) بەوە بەناوبانگەکە جیاوازیی دەزانێت لەنێوان کارگێڕی و سەرکردایەتیدا و گۆشەنیگای خۆی لەم وشانەدا کورت کردۆتەوە، "سەرکردە ئەوکەسەیە کە کاری باش |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | ئەنجام دەدات، بەڵام بەڕێوەبەر ئەو کەسەیە کە کارەکە بەشێوەیەکی باش ئەنجام دەدات. |
| ئەو سەرکردایەتییەی کە پشت بە کەسایەتی سەرنجڕاکێش دەبەستێت (سەرکردایەتی کاریزماتیک) | کۆنگەر و کانونگو (١٩٨٧) هاوس (١٩٧٧) کیتس سوفرایس (١٩٨٨)؛ جەی. ماکسوێل (١٩٩٩) میندل (١٩٩٠)؛ شامیر، هاوس و ئارثەر (١٩٩٣)؛ ویبەر (١٩٤٧) | تیۆری سەرکردایەتی کاریزماتیکی (کاریزمایی)، واتە ئەوەی کە بایەخ بە هێزی کەسایەتی سەرکردەدات دەڵێت شوێنکەوتوانی پێیان وایە سەرکردەکە کۆمەڵە خەسڵەتێکی نائاسایی هەیە. لێرەدا کاریگەریی سەرکردە پەیوەست نییە بە پۆست و بە نەریتەکانەوە، بەڵکو کاریگەرییەکە پەیوەستە بەوەوە شوێنکەوتوان چۆن تەماشای سەرکردەکە دەکەن. لێکدانەوەی سەرکردایەتی پشتبەستوو بە کاریزمای کەسەکە ئەم مەسەلانە لەخۆدەگرێت: خەسڵەتەکانی سەرکردە، تیۆری چەمکی کەسیی، شیتاڵکردنەوەی دەروونی و پەتای کۆمەڵایەتی (ئەو شتانەی لە کۆمەڵگادا بڵاودەبنەوە و دەبن بە باو). |
| سەرکردایەتیی پشتبەستو بە لێهاتویی | بینیس (١٩٩٣) بویاتیزس، کامیرۆن کوین | مرۆڤ دەتوانێت ئەو شارەزاییە بنەڕەتییانە فێرببێت و گەشەیان پێبدات کە مرۆڤی لێهاتو لە مرۆڤی ئاسایی جیادەکەنەوە. |
| سەرکردایەتی ئیلهامبەخش و دروستکەری ئیروانین | بێرنس، کۆزس و پۆسنەر (١٩٩٥)؛ پیتەرز، واتەرمەن (١٩٩٠)؛ ریچاردس و ئینجل (١٩٨٦) | کۆزس و پۆسنەر دەڵێن سەرکردە جۆش‌وخرۆشی شوێنکەوتوان دەجوڵێنێت و وەکو ئەو قیبلەنامەیە وایە کە ڕێنماییان دەکات و ئەوان وا |

| پوختە | دانەر/ ساڵ | تیۆری |
| --- | --- | --- |
| پێناسەی سەرکردایەتی دەکەن کە "هونەری بزواندنی خەڵکییە تا خەبات بکەن لەپێناو ئامانجە نمونەییە ئیلهامبەخشە هاوبەشەکاندا" لێرەدا فۆکەس لەسەر ئارەزوی شوێنکەوتوان بۆ بەشداریکردن و هەروەها توانای سەرکردەیە بۆ هاندانی خەڵکەکە. سەرکردە وەڵامی کرپار دەداتەوە و تێڕوانین دەخوڵقێنێت و کارمەندەکان هان دەدات و لە ژینگە پەرێشانەکانیشدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت کە زوو زوو دەگۆڕێن. سەرکردایەتی بریتییە لە دەربڕینی دید و بەرجەستەکردنی بەهاکان و خوڵقاندنی ژینگەیەك کە بتوانرێت کاردانەوەکانی تێدا بگەیەنرێتە ئەنجام. | | |
| سەرکردایەتیکردن ئەوەیە هاوبەشەکانی دەرەوە و ناوەوە یەکتری تەواوبکەن. سەبارەت بەم تەواوکارییە دراکەر ڕۆشنایی دەخاتەسەر سێ پێکهێنەر: دارایی و شێوازی ئەنجامدان و پێکهێنەری کەسێتی. ئەو پێی وایە سەرکردەکان بەرپرسیارن لە شێوازی کارکردنی دەزگاکانی خۆیان و لە شێوازی کارکردنی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی گشتی. سەرکردەکان ڕۆڵەکان دەگێڕن و خاوەنی خەسڵەتی تایبەتن. (کۆتەر) دەڵێت سەرکردە | دراکەر (١٩٩٩)؛ پاکوبس و پاکوس (١٩٩٠)؛ پاکوس و کلیمێنت (١٩٩١)؛ کۆتەر (١٩٩٨، ١٩٩٩)؛ بەکینهام و کۆفمان (١٩٩٩)؛ بەکینهام و کلیفتۆن (٢٠٠١). | سەرکردایەتی بەڕێوەبردن و ستراتیجی |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | تێڕوانین و ئاڕاستەکە دەگەیەنێت بە شوێنکەوتوان و خەڵکەکە لەگەڵ یەکتریدا دەگونجێنێت و شوێنکەوتوان هان دەدات و ئیلهامیان پێدەبەخشێت و کارایان دەکات. جگە لەمەش سەرکردە هۆکاری گۆڕانکارییە و توانا بە شوێنکەوتوانی دەبەخشێت. سەرکردایەتیکردن بریتییە لەوەی ئامانجێك (ئاڕاستەیەکی واتادار) بە هەوڵە دەستەجەمعییەکە ببەخشێت. شوێنکەوتوان ئاڕاستە دەکات کە لەپێناوی گەیشتن بە ئامانجەکە هەوڵ بدەن. سەرباری ئەمانەش سەرکردایەتی بەڕێوەبەری چالاك کاری کارگێڕیی چالاك بڵاودەکاتەوە. ئەم نوسەرانە ئەو سەرکردایەتییە پێویستەیان بەلاوە باشترە کە پشت بە کات و شوێن و بارودۆخ و کەسەکە دەبەستێت. |
| سەرکردایەتیی پشتبەستو بە ئەنجامەکانەوە | ئۆلریخ، زینگەر و سمۆڵدوو (١٩٩٩)؛ ئۆهریا و جۆیس و رۆبرتسۆن (٢٠٠٣) | ئۆلریخ و هاوکارەکانی سەرکردایەتییەك پێشنیار دەکەن کە "ئەو ئامانجە دیاریکراوانە وصف دەکات کە سەرکردەکان بەدی دەهێنن". و ئەنجامەکان گرێ دەدەن بە کەسایەتی سەرکردەوە. سەرکردە خاوەنی رەوشت و سەرڕاستی و وزەیە، جگە لەوەی کە خاوەنی زانیاری تەکنیکی و بیرکردنەوەی ستراتیجییە. سەرباری ئەمەش ئەو |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | ڕەفتارە کاریگەرانە دیاری دەکات کە سەرکەوتنی دەزگاکە زیاتر دەکات. جا لەبەرئەوەی ئەنجامەکانی سەرکردایەتی شتێکە قابیلی پێوانەکردنە، کەواتە دەتوانین فێری ببین و فێری خەڵکیش بکەین. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە ناوی لێ نرا (پرۆژەی هەمیشە سەوز) و خاتوو نۆهریا و هاوکارەکانی لێکۆڵینەوەیان کرد لەسەر (٢٠٠) چالاکیی کاری ئیداری لەماوەی (١٠) ساڵدا. بەمەبەستی دیاریکردنی ئەو ڕەفتارانەی کە ئەنجامگەلی سەرکەوتو بەدەست دەهێنن. لێکۆڵینەوەکە دەریخست کە (٤) ڕەفتارە بنەڕەتییەکە بریتین لە: ستراتیجی و جێبەجێکاری و کەلتور و پێکهاتە. ئەو کۆمپانیایانەی کە ئەنجامی چاک بەدەست دەهێنن لانی کەم دوان لەم چوار ڕەفتارە لاوەکییانەش پەیڕەو دەکەن: بەهرە، داهێنان، سەرکردایەتی، تێکەڵکردن و لێکدان و لەخۆگرتنی کۆمپانیاکان. |
| سەرکردە وەکو مامۆستا | دۆبری (١٩٩٢) تیکای (١٩٩٨). | سەرکردە مامۆستایە. سەرکردە ئەو بیروبۆچونە پێشکەش دەکات کە قابیلی ئەوەبێت خەڵک فێری ببێت. سەرکردایەتی بریتییە لە هاندانی خەڵک بەوەی کە چیرۆکیان فێر بکەیت. (تیکای) باوەڕی وایە سەرکردایەتی چاک بریتییە لە پەروەردەی چاک. |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
| --- | --- | --- |
| سەرکردایەتیکردن وەك هونەرێکی ئەنجامدان | ڕیەری (١٩٩٢)؛ مینتزبێرگ (١٩٩٨) ڤەیل (١٩٨٩) | سەرکردایەتیکردن کارێکی نائاشکرایە لەو ڕوانگەیەوە کە بەئاشکرا چالاکییەکانی سەرکردایەتیکردن ئەنجام نادات (بۆ نموونە هاندان و مەشقپێکردن). بەڵام سەرکردایەتیکردن کۆمەڵە کارێك لەخۆ دەگرێت بەو ئەرکانەشەوە کە سەرکردە یاخود بەڕێوەبەر ئەنجامیان دەدات. جوانترێکی باو کە سەرکردایەتیکردنی پێ‌بشوبهێنرێت وەکو هونەری ئەنجامدان بریتییە لە کاری سەرکردەی ئۆرکێسترا، یاخود تیمی مۆسیقای جاز |
| سەرکردایەتی گشتگیر و کەلتوریی | فەیرهۆڵم (١٩٩٤) سینگ (١٩٩٠) شاین (١٩٩٢) ویتلی (١٩٩٢) | سەرکردایەتی ئەوەیە کە بچیتە ئەودیوی کەلتورەوە بەمەبەستی دەستکردن بە گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانەی وا کە باشتر لەگەڵ واقیعەکەدا بگونجێت. سەرکردایەتی ئەوە بتوانێت خەڵك گرنگی پەیوەندیدار بهێنێتە ناو دەزگاکەوە و شوێنکەوتووەکان هان بدەیت و خەڵکەکەی دیکەش بەهێز بکەیت و توانایان پێ‌ببەخشیت. ڕێبازە گشتگیرەکەی ویتلی پێی وایە سەرکردایەتی کارێکی مەنهەجییە. سەرکردەکان پەیوەندی تەواوکاریی دەخوڵقێنن لەنێوان تاکەکان و دامودەزگاکان و دەوروبەردا. سەرکردە هانی دەزگاکە دەدات لەڕێی پابەندبون بە پێنج پاساکەوە فێرببێت. (سینگ) دەڵێت سەرکردە |

| تیۆری | دانەر/ ساڵ | پوختە |
|---|---|---|
| | | سێ رۆڵ دەبینێت، رۆڵی دارێژەر و رۆڵی مامۆستا و رۆڵی خزمەتگوزار |
| سەرکردایەتی خزمەتکار | گرینلیف (١٩٩٦)، سپێرس و فریك (١٩٩٢) | ئەم تیۆرییەی سەرکردایەتی خزمەتکار دەڵێت لە بنەڕەتدا سەرکردە بە خزمەتکردنی خەڵکی سەرکردایەتی دەکات - خزمەتکردنی کارمەند و کڕیار و کۆمەڵگا. خەسڵەتەکانی سەرکردەی خزمەتکار بریتییە لە گوێگرتن و هاوسۆزیی و هۆشیاریی و قایلکردن و خزمەتکردن و دروستکردنی چەمك و پابەندبوون بە گەشەکردنی بەرامبەرەوە و هەروەها دروستکردنی کۆمەڵگا. |
| سەرکردایەتی رۆحی | دوبری (١٩٨٩)؛ ئیتزیۆنی (١٩٩٣)؛ فەیرهۆڵم (١٩٩٧)؛ گریتلیف (١٩٧٧)؛ هاولی (١٩٩٣)؛ کایفەر (١٩٩٢)؛ جەی ماکسوێل؛ فەیل (١٩٨٩) | سەرکردایەتی بریتییە لە کارکردنە سەر رۆحی خەڵکەکە نەك کۆنترۆڵکردنی ئیش و کارەکان. فەیرهۆڵم پێی وایە سەرکردایەتیکردن بریتییە لە پەیوەندیکردن بە خەڵکەکەوە. جگە لەوەش "مادام سەرکردەکان پابەندن بە بایەخدان بە مرۆڤی کامڵ، پێویستە بایەخدان بە رۆحی خەڵکەکە بەشێك بێت لە کردەوەکانیان. سەرکردەکانی سەدەی نوێ پێویستە بە جددی هەوڵ بدەن خۆیان پەیوەندی دروست بکەن و پاشان یارمەتی شوێنکەوتووەکانیان بدەن ئەو پەیوەندییانە دروست بکەن. دەسەڵاتی سەرکردە زادەی ئەو زانیارییەیە کە هەیەتی دەربارەی نەریت و کەلتور و بەها و خووەکانی دەزگاکە. |

# پاشکۆی ژمارە (٣)

## چەند پێناسەیەکی سەرکردایەتی و کارگێڕیی

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت: کارگێڕی بەرامبەر سەرکردایەتی |
|---|---|
| وارن بینیس<br>بینیس دەلیو. جی (١٩٩٤) (سەرکردایەتیکردنی گۆڕان: سەرکردە وەکو بەرپرسیارێکی بنەڕەتی لە وەرچەرخان) جەی رینیج (سەرکردایەتیکردن لە قۆناغێکی نوێدا: کۆمەڵە رێبازێکی بەرچاوروون بۆ قەیرانە هەرە گەورەکانی سەردەمەکەمان) لاپەڕەکانی ١٠٢ – ١١٠. سان فرانسیسکۆ: نیولیدەرس پرێس | کارگێڕی ئەوەیە خەڵکەکە وا لێ بکەین ئەو کارە ئەنجام بدات کە پێویستە ئەنجامی بدات. سەرکردایەتیکردن ئەوەیە وا لە خەڵکەکە بکەیت ئارەزوویان لە ئەنجامدانی ئەرکەکە هەبێت. بەڕێوەبەر پاڵ دەنێت. سەرکردە رادەکێشێت، بەڕێوەبەر فەرمان دەکات، سەرکردە پەیوەندیی دروست دەکات. |
| بینیس دەبلیو. جی (١٩٩٣) (ژیانێکی داهێنراو: رامان لە سەرکردایەتی و گۆڕین) ئەدیسۆن – ویبلیی | سەرکردە ئەو کەسەیە کە کاری باش ئەنجام دەدات. بەڕێوەبەر ئەو کەسەیە کە کارەکان بە باشی ئەنجام دەدات. |
| کارتەر – سکۆت سی (١٩٩٤) "جیاوازیی نێوان کارگێڕیی و سەرکردایەتی". | سەرکردە زاڵ دەبێت بەسەر دۆخەکەدا، واتە مەسەلە بەرێشانە ئاڵۆزە بزێوەکەی دەوروبەرمان کە پیلانمان لێ دەگێڕێت و ئەگەر وازی لێ بهێنین بێگومان دەمانخنکێنێت، بەڵام بەڕێوەبەر تەسلیمی دۆخەکە دەبێت.<br>بەڕێوەبەر جێبەجێ دەکات، بەڵام سەرکردە داهێنان دەکات. بەڕێوەبەر فۆتۆکۆپییە، بەڵام سەرکردە رەسەنە. |

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت، کارگێری بەرامبەر سەرکردایەتی |
|---|---|
| | بەڕێوەبەر جەخت دەکاتە سەر سیستم و پێکهاتەکان، بەڵام سەرکردە جەخت دەکاتە سەر خەڵکەکە.<br>بەڕێوەبەر پشت بە دەسەڵات و حوکمکردن دەبەستێت بەڵام سەرکردە متمانە بە خەڵکەکە دەبەخشێت.<br>بەڕێوەبەر تێڕوانینێکی کورتمەودای هەیە، بەڵام سەرکردە تەماشای دوور دەکات. بەڕێوەبەر دەپرسێت چۆن و کەی؟ بەڕێوەبەر لایەنی کەمی بەلاوە گرنگە، سەرکردە تەماشای ئاسۆ دەکات. بەڕێوەبەر لاسایی دەکاتەوە، سەرکردە داهێنان دەکات.<br>بەڕێوەبەر بارودۆخی ئێستای بەدڵە، سەرکردە تەحەدای بارودۆخەکە دەکات.<br>بەڕێوەبەر سەرکردەیەکی تەقلیدی باشە، سەرکردە کەسێکی سەربەخۆیە.<br>بەڕێوەبەر کارەکان بەشێوەیەکی باش ئەنجام دەدات، سەرکردە کارە باشەکان ئەنجام دەدات. |
| جۆن دەبلیو. گاردنەر<br>گاردنەر جەی. دەبلیو (١٩٩٠)<br>دەربارەی سەرکردایەتی. نیویۆرک<br>کۆیلێر ماکمیلان | سەرکردە و سەرکردەی/ بەڕێوەبەر لانی کەم لە شەش بواردا لە بەڕێوەبەر جیاوازە:<br>١. بیر لە مەودای دوور دەکاتەوە<br>٢. کاتێک بیر لەو دەزگایە دەکاتەوە کە بەڕێوەی دەبات لە پەیوەندییەکانی ئەو دەزگایەش تێدەگات کە لەگەڵ واقیعە گەورەکاندا هەیەتی.<br>٣. دەگاتە ئەو کۆمەڵانەی کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەمدان و کاریان تێدەکات.<br>٤. جەخت دەکاتە سەر دیدە و بەهاو هاندان و هەر بە سەلیقە لە پێکهێنەرە ناهوشیارو نالۆجیکییەکان تێدەگات کە لە کارلێکی نێوان سەرکردە و دەزگاکەدا هەن.<br>٥. شارەزایی سیاسیی گونجاوی هەیە بۆ گەنجان لەگەڵ پێویستییە دژبەیەکەکانی کۆمەڵە جیاجیاکان. |

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت: کارگێڕی بەرامبەر سەرکردایەتی |
|---|---|
| | ٦. بیر لە تازەکردنەوە دەکاتەوە. بەڕێوەبەر لە سەرکردە زیاتر پەیوەستە بە دەزگاکەوە. لەڕاستیدا ڕەنگە سەرکردە خاوەنی هیچ دەزگایەك نەبێت. |
| جێمس کۆزس و باری پۆسنەر کۆزس، جی. ئێم و پۆسنەر بی. زێد (١٩٩٥)<br>تەحەداکانی سەرکردایەتی: (چۆن بەدەستهێنانی شتە نائاساییەکان لە دەزگاکاندا دەپارێزێت)<br>سانفرانسیسکۆ: جۆسی – باس | لە زمانی ئینگلیزیدا ڕەگی وشەی lead (کە بە کوردی سەرکردایەتیکردن دەگەیەنێت) واتە (دەڕوات، گەشت دەکات، ڕێنمایی دەکات، سەرکردایەتیکردن واتە جوڵە. سەرکردە بەدوای سیستەمێکی نوێدا دەگەڕێت. بوارگەل وا دەدۆزێتەوە کە پێشتر کەس نەیدۆزیوەتەوە و ڕێنماییمان دەکەن بۆ ئاراستەگەل تازەو پەی پێنەبراو. لەبەرامبەردا وشەی Manage (کە بە کوردی بەڕێوەبردن دەگرێتەوە) واتە چارەسەرکردن، کەواتە بەڕێوەبردن چارەسەرکردنی کێشەکان و پاراستنی سیستەمەکەیە، ڕێکخستن و حوکمکردنە. جیاوازی گەورەی نێوان کارگێڕی و سەرکردایەتی لە جیاوازی نێوان ڕەگی دوو وشەکەدا دەردەکەوێت و جیاوازی نێوان چارەسەری کێشەکان و ڕۆیشتن بۆ شوێنگەل تازە. |
| کارتەر – سکۆت، سی (١٩٩٤) (جیاوازی نێوان کارگێڕی و سەرکردایەتی). | کۆزس: "جیاوازییەکی گەورەی نێوان کارگێڕی و سەرکردایەتی لە جیاوازی نێوان ڕەگی ئەو دوو وشەیەدا دەدۆزینەوە، جیاوازیی نێوان واتای چارەسەرکردنی کێشەکان و واتای ڕۆیشتن بۆ شوێنی تازە. |
| ئابراهام زالیزینك<br>زالیزینك، ئەی ١٩٧٧ (ئایا بەڕێوەبەر و سەرکردە لەیەکتری جیاوازن؟) | بەڕێوەبەر گرنگی دەدات بە شێوازی ئەنجامدانی مەسەلەکان، بەڵام سەرکردە ئەوەی بەلاوە گرنگە کە ئەو مەسەلانە چی دەگەیەنن لەلای خەڵکی.<br>سەرکردە و بەڕێوەبەر لە تێڕوانینیاندا بۆ مەسەلەکان جیاوازن. بەڕێوەبەر وا تەماشای کار دەکات کە پرۆسەیەکی تواناسازییە تێکەڵەیەك لە خەڵك و |

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت، كارگێڕی بەرامبەر سەركردایەتی |
| --- | --- |
| | بیروبۆچون لەخۆ دەگرێت كە كارلێك دەكەن بۆ دیاریكردنی ستراتیج و بڕیاردان لەكاتێكدا كە بەڕێوەبەر كار بۆ دیاریكردنی توانا و هەڵبژاردنەكان دەكات، سەركردە بە ئاراستە پێچەوانەكە كار دەكات. ڕێبازی تازە گەشە پێدەدات بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشانەی كە ماوەیەكی زۆرە دروست بون و هەوڵ دەدەن بڕیاری تازەیان لەبارەوە بدەن. سەركردە لە ژینگەی كارەكەدا كەشوهەوایەكی وروژێنەر دروست دەكات. |
| جۆن كۆتەر<br>كۆتەرجی (١٩٩٩) (ئەوەی سەركردەكان بەراستی دەیكەن)<br>هارفارد بزنس ریڤیو | كارگێڕیی هەوڵ دەدات لەگەڵ ئاڵۆزییەكاندا خۆی بگونجێنێت .. ڕەفتار و چالاكییەكانی كارگێڕیی لە پلەی یەكەمدا وەڵامدانەوەیەكە بۆ یەكێك لە گرنگترین پێشكەوتنەكانی سەدەی بیستەم. بەبێ كارگێڕییەكی باش دەزگاكان پڕ دەبن لە بێسەروبەرەیی و مانەوەیان دەكەوێتە ژێر هەڕەشەوە. كارگێڕیی باش ئاستێك لە سیستم و بەردەوامی بەدی دەهێنێت بۆ ڕەهەندە بنەڕەتییەكانی دەزگاكە وەك چۆنایەتی باشی بەرهەم و قازانجكردنی. لەبەرامبەردا سەركردە هەوڵ دەدات خۆی لەگەڵ گۆڕانكارییەكاندا بگونجێنێت. یەكێك لەو هۆكارانەی كە وای كردووە سەركردایەتی لەم ساڵانەی دواییدا زۆر گرنگ بێت ئەوەیە كە جیهانی بازرگانی لە جاران زیاتر كێبڕكێ و جوڵەی تێدایە. گۆڕانكارییە تەكنەلۆجییە خێراكان و زیادبوونی كێبڕكێی جیهانی و نەمانی سیستم لە بازاڕەكاندا و قەبارەی گەورەی دامەزراوە پیشەسازییەكان و ناجێگیربوونی نرخی نەوت و گۆڕانی دیموگرافیای كار و ئەوانەی كە بە كاڵای هەرزان و خراپەوە پەلامار دەدەن بەشێكن لە هۆكارەكانی ئەم گۆڕانە. ئەنجامەكەشی ئەوەیە كە ئەو |

| گوزارشت: کارگێڕی بەرامبەر سەرکردایەتی | نوسەر و سەرچاوە |
|---|---|
| کارانەی جاران دەمانکرد بۆ باشکردنی شێوازی ئەنجامدان بە ڕێژەی ٥٪ ئیتر بەس نییە بۆ دەستەبەرکردنی سەرکەوتن. گۆڕانکارییە گەورەکان ئەمڕۆ پێویستترن بۆ مانەوە و کێبڕکێکردنی چالاک لەم ژینگە نوێیەدا. گۆڕانی زیاتر هەمیشە سەرکردایەتی زیاتری دەوێت. | |
| گواستنەوە (کارگێڕی) بەرامبەر وەرچەرخان (سەرکردایەتی) سەرکردایەتی گواستنەوەیی: ئەم جۆرە سەرکردایەتییە کاتێک ڕوودەدات کە کەسێک دەستپێشخەریی دەکات و لەپێناوی ئاڵوگۆڕی چەند شتێکی بەنرخدا پەیوەندی بە خەڵکی دیکەوە دەکات. سەرکردایەتی وەرچەرخێن: ئەم سەرکردایەتییە کاتێک ڕوودەدات کە کەسێک یان کۆمەڵە کەسێک پەیوەندی دەکەن بەوانی دیکەوە بەجۆرێك کە سەرکردە و شوێنکەوتوانی، یەکتری ببەنە ئاستی باڵاتری هاندان و ڕەوشت. ئەو ئامانجانەی کە لەسەرەتادا جیاواز دەست پێدەکەن – بەڵام پەیوەستن بەیەکترییەوە – لە کۆتاییدا دەبنە یەك ئامانج | جێمس ئێم. بێرنس<br>بێرنس جەی. ئێم. (١٩٧٨)، سەرکردەیەتی<br>نیویۆرك: هاوپەردورۆ |
| هەڵسەنگاندنی سەرکردە بەوە ناکرێت چی بەدەست هێناوە بەڵکو بەوە دەکرێت کە ئەگەر گۆڕەپانەکە جێبهێڵێت چی ڕوودەدات. گرنگ ئەوەیە پاش خۆی چی ڕوودەدات. ئەگەر پاش ڕۆیشتنی ئەو سەرکردە دڵڕفێنانە دەزگاکە هەرەسی هێناو ڕوخا، ئەمە سەرکردایەتی نییە. بەڵکو فێڵەو خەڵەتاندنێکی ئاشکرایە.<br>"هەمیشە جەختم لەوە کردۆتەوە کە سەرکردایەتی بەرپرسیارێتی و ڕاستگۆیی و بەدەستهێنانە."<br>"جیاکردنەوەی کارگێڕیی لە سەرکردایەتی شتێکی | پیتەر دراکەر<br>گالاگان، پێنسلڤانیا (١٩٩٨)<br>پیتەر دراکەر: مشق و گەشەپێدان |

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت: کارگێڕی بەرامبەر سەرکردایەتی |
|---|---|
| | بێمانایە، رێك وەکو جیاکردنەوەی کارگێڕیی وایە لە دامەزراندنی کارێك، هەمویان یەك کار پێك دەهێنن و هەریەکەیان بەشێکێتی. دیارە لەیەکتری جیاوازن، بەڵام وەکو جیاوازی نێوان دەستی چەپ و دەستی راست یاخود جیاوازی لەنێوان لووت و دەمە. هەمویان هی جەستەیەکن. |
| ریچارد پاسکاڵ<br>جۆنسۆن ئێم (١٩٩٦). روماڵکردنی سەرکردایەتی (لابردنی سەرقاپەکە لەرووی سەرکردایەتی)<br>چەند چاوخشاندنەوەیەك بە کارگێڕیدا. | کارگێڕیی بریتییە لە بەکارهێنانی دەسەڵات و کارتێکردن لەپێناوی گەیشتن بەئاستی ئەنجامدانی وا کە بگونجێن لەگەڵ ئەو ئاستانەی کە پێشتر دیاریکراون. بەڵام سەرکردایەتیکردن بەدیهێنانی ئەو مەسەلانەیە کە بەبێ ئەم هەرگیز بەدەست نەدەهاتن و هەمیشە جۆرێك سەرکێشی تێدایە (رێکردن بە قەراخ هێڵە سورەکەدا). |
| جۆرج وێزەرسبای<br>وێزەرسبای. جی. بی (١٩٩٩)<br>(سەرکردایەتی بەرامبەر کارگێڕیی)<br>چەند چاوخشاندنەوەیەك بە کارگێڕیی | کارگێڕیی: بەکارهێنانی سەرچاوە سنوردارەکانە لەپێناوی بەدیهێنانی ئامانجی دەزگاکە. دیاریکردنی مەسەلە هەرە لەپێشەکان و رەنگرێژکردنی کارەکە و گەیشتنە بە ئەنجامەکان. لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە کارگێڕیی گرنگی دەدات بە حوکمکرن. لەبەرامبەردا، سەرکردایەتی بایەخ دەدات بە داهێنانی تێڕوانینێکی هاوبەش. سەرکردایەتی واتە هاندانی خەڵکەکە بۆ ئەوەی بە دید و بۆچونی خۆیان بەشداریی بکەن و هان بدرێن. بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆیان و بەرژەوەندی دەزگاکە لەگەڵ یەکتریدا بگونجێنێت. سەرکردایەتی واتا قایلکردن و قەناعەت پێهێنان نەك فەرمان دەرکردن. |
| جۆن ماریۆتی<br>ماریۆتی، جی. (١٩٩٨)<br>(مەسەلەکانی سەرکردایەتی) | رەنگە ئەو کەسەی کە بەرێوە دەبرێت ئەگەر سەرکردەیەکی باشی نەبێت رەنگە هێندە ئارەزوی نەبێت هەوڵی پێویست بخاتەگەڕ بۆ بەدەستهێنانی |

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت، کارگێری بەرامبەر سەرکردایەتی |
|---|---|
| ئیندەستری ویك | سەرکەوتن سەرکردەی مەزن دەتوانێت لە خەڵکی ئاسایی ئەنجامگەل مەزن بەدەست بهێنێت. بەڕێوەبەری مەزن دەتوانێت ئەو ئەنجامانە بەدەست بهێنێت کە نەخشەیان بۆ کێشراوە و بەباشی ئەنجام دراون. بەڵام سەرکەوتنی گەورە لەسایەی ئەو عیشق و جۆش‌وخرۆش و پابەندبونەوە دەستەبەر دەبێت کە سەرکردایەتی راستەقینە ئیلهامەکەی دەبەخشێت. سەرکردە وەکو ئەندازیارەو بەڕێوەبەریش بەنناکەیە - هەردوکیان پێویستن، بەڵام بەبێ ئەندازیار ناتوانرێت هیچ شتێکی هەڵکەوتو دەستنیشان و دروست بکەیت. |
| رۆزابێث مۆس کانتەر کانتەر، ئار، ئێم (١٩٨٩) (کاری بەڕێوەبەرایەتی باش) هارفارد بزنس ریڤیو | یاسا کۆنەکانی کارگێڕیی دەپوکێنەوە و کەرەسەکانی سەرکردایەتی نوێ شوێنیان دەگرنەوە. ئەو بەڕێوەبەرەی کە سەرچاوەی دەسەڵاتەکەی بریتییە لەو پێگەیەی کە لە هەرەمی دەزگاکەدا هەیەتی و ئەوەی کە راهاتووە دەسەڵاتی تایبەتی خۆی بەشێوەیەکی سنوردار بەکاربهێنێت ئەمرۆ فێربووە چۆن دید و بۆچوونەکانی خۆی بگۆڕێت و ئاسۆکانی فراوان بکات. کاری بەڕێوەبردنی باش بریتییە لەوەی کە تەماشای دەرەوەی ناوچە سنووردارەکەی دەسەڵات بکەیت و دەرفەتەکان هەست پێبکەیت و تیمی وا دروست بکەیت بتوانێت خۆی گورپداتە خۆی. بریتییە لە پەیوەندیکردن و هاوکاری نێوان یەکە و بەش و کۆمپانیا جیاجیاکانی کە چالاکی و سەرچاوەکانیان بەریەکتری دەکەون. لەبەرئەوە ئێستا لە کاری کارگێڕیدا دیاریکردنی پلەی کارمەندێتی بایەخی کەمترە لە جاران و گرنگتر هەبونی زانیاریی و شارەزایی و هەستیارییە کە پێویستن بۆ هاندان و وروژاندنی خەڵکەکە تا ئەوپەڕی تواناکانیان بخەنەکار. |

| نوسەر و سەرچاوە | گوزارشت، کارگێڕی بەرامبەر سەرکردایەتی |
| --- | --- |
| تۆم پیتەرپس<br>پیتەرس، تی. (١٩٩٤)<br>(گەشەکردن لە بێسەروبەریدا)<br>نیویۆرک: ئەلفرێد ئەی نۆپف | پیتەرس دید و بۆچونی خۆی لە چەمکەکانی بینیس و کۆزس و پوستەرس وەرگرتووە دەربارەی سەرکردایەتی و کارگێڕی کە لەسەرتاوە باسمان کردن. پیتەرس باوەڕی وایە "گەشەپێدانی و بۆچوون – لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە مرۆڤەکە بەڕاستی تیایدا بژی – بەشێکی بنەڕەتی سەرکردایەتییە.<br>تێڕوانین (دید) پێگەیەکی یەکسانی گرنگی هەیە لە جیهانی چاودێرانیش و جیهانی بەڕێوەبەرە ئاست ناوەندییەکانیشدا. |

لەم پرۆژەیەدا وەبیریان هێنامەوە کە بەراوردکاریی ڕێگەیەکی باشی فێربوونە.
لە خوارەوە پوختەیەکت پێشکەش دەکەم دەربارەی جیاوازییـەکانی نێـوان کـارگێڕی و سەرکردایەتی.

| سەرکردایەتی | | کارگێڕی |
|---|---|---|
| خەڵک | ← | شتەکان |
| خۆڕسکی، ڕێکەوت | ← | پێکهاتە |
| ئازادکردن، تواناسازی | ← | حوکمکردن |
| چالاکی | ← | لێهاتوویی |
| دارێژەری بەرنامە | ← | بەرنامە |
| سەرمایەگوزاری | ← | تێچوون |
| پرنسیپەکان | ← | تەکنیکەکان |
| وەرچەرخان | ← | گواستنەوە |
| دەسەڵاتی پشتبەستو بە پرنسیپ | ← | سود |
| زیرەکیی | ← | پێوانە |
| ئەنجامدانی کاری باش | ← | ئەنجامدانی کار بە باشی |
| ئاڕاستە | ← | خێرایی |
| ئەوپەڕی | ← | لانی کەم |
| ئامانج | ← | ڕێگا |
| پرنسیپ | ← | ڕەفتار |
| کارکردن لەسەر سیستم | ← | کارکردن لەرێگای سیستم |
| ئایا پەیژەکە بەو دیوارەوەیە کە مەبەستمانە | ← | سەرکەوتنی خێرا بەسەر پەیژەکەدا |

شێوەی ٢١ — ١

## پاشکۆی چوارەم

## زیانی زۆری متمانەی کەم

ماهان خالسا Mahan Khalsaی راوێژکار و نوسەر و هاوکار رێگەیەکی کاریگەری دارشتوە بۆ هاندانی تیمێک لە بەرێوەبەرە گشتییەکانی هەر کۆمپانیایەک کە گۆرانکاریی بکەن.

ئەگەر ویستت دامەزراوێک تا ئەو ئەندازەیە هەست بە بێفیزیی بکات کە دەست بداتە گۆرانکاریی و پارێزگاریکردن لەو گۆرانکارییە، پێویستە خەڵکەکە وا لێ بکەیت هەست بە گوشاری بارودۆخەکەی دەوروبەریان بکەن. لەم روانگەیەوە دەتوانیت چەند کۆمەڵە پرسیارێک بەکاربهێنیت کە بەرامبەرەکەت وا لێ بکەیت هەست بە هێزی گوشارەکەی دەوروبەریان بکەن بۆ ئەوەی مێشکیان ئامادە بکەیت بۆ گۆرانکاریی.

پرۆسەکە دوو جۆر پرسیار لەخۆدەگرێت کە کرۆکی کێشەکەت بۆ دەستنیشان دەکەن: ١) پرسیارەکانی بەڵگە (چۆن، چی، لەکوێ، کام، کێ، کەی ..) ٢) پرسیارەکانی کاریگەریی کە کرۆکی مەسەلەکە دەپێکن. یەکێک لە پرسیارە هەرە بەهێزەکانی ئەم کۆمەڵەیەش ئەوەیە بپرسیت "ئەی پاش ئەوە چی روودەدات؟"

بۆ فێربونی چۆنێتی بەکارهێنانی ئەم ئامرازی دەستنیشانکردنە بەمەبەستی تێگەیشتن لە زیانی زۆری بێمتمانەیی، ئەم گفتوگۆ گریمانەییە لەنێوان تۆ و هاوکارێکتدا نمونەیەکی باشە (بۆ هەمو پۆستێک دەگونجێت بەمەرجێك خەڵکەکە زانیاری پێویستیان لەلا هەبێت).

**هاوکارەکە:** لەم دەزگایەی ئێمەدا خەڵکەکە متمانە بە یەکتری ناکەن. لێرەدا دەتوانیت زۆر پرسیار بکەیت، بۆ نمونە: "رێك ئەو کەسانە کێن کە متمانە بە یەکتریی ناکەن؟ ئەو بێمتمانەییە کەی بەراستی خۆی نمایش دەکات؟ چۆن دەزانیت متمانەکە نزمە؟ دواجاریش ئەگەر ویستت کاریگەریی بێمتمانەییت بۆ دەربکەوێت لەسەر دەزگاکە، پێویستە تۆ پرسیارێك لە پرسیارەکانی کاریگەریی بکەیت.

**تۆ:** کاتێك کە خەڵکەکە متمانە بەیەکتری ناکەن چی ڕوودەدات؟

**هاوکارەکە:** خەڵکەکە زانیارییەکان بۆ یەکتری ئاشکرا ناکەن.

دیسانەوە دەتوانیت کۆمەڵێك پرسیاری دیکەی بەڵگە بکەیت، وەك: ڕێك ئەو کەسانە کێن کە ئاڵوگۆڕی زانیارییەکان ناکەن؟ ئەو زانیارییانە چین کە بۆ یەکتری ئاشکرا ناکەن؟ چۆن دەزانیت زانیارییەکان بۆ یەکتری باس ناکەن؟ ئینجا لە خاڵێکی دیاریکراودا حەزدەکەیت لە کاریگەرییەکە نزیك ببیتەوە، بۆیە دەپرسیت:

**تۆ:** کاتێك کە خەڵکەکە ئاڵوگۆڕی زانیارییەکان لەگەڵ یەکتریدا ناکەن چی ڕوودەدات؟

**هاوکارەکە:** پرۆژە و چالاکییەکانیان ناگونجێن لەگەڵ پرۆژەکانی کۆمپانیادا.

دیسانەوە دەتوانیت کۆمەڵێك پرسیاری دیکەی سەر بە پرسیارەکانی بەڵگە بکەیت، بۆ نمونە: "ڕێك کام ئامانجانە گونجاو نابن لەگەڵ یەکتریدا؟ بە دیاریکراوی کام پرۆژە و چالاکیانە؟ چۆن دەزانیت لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێن؟ پاشان پرسیارێکی دیکەی سەر بە پرسیارەکانی کاریگەری دەکەیت.

**تۆ:** کاتێك کە خەڵکەکە گونجاو نابن لەگەڵ ئامانجەکانی کۆمپانیادا چی ڕوودەدات؟

**هاوکارەکە:** کرێی تێچوونی بەرهەمی تازە بەرز دەبێتەوە.

بەمەش کەواتە هاوکارەکەت شتێکی پێ داویت قابیلی پێوانەکردن بێت و پەیوەندی هەبێت بە بێمتمانەییەوە. بەرزبونەوەی کرێی گەشەپێدانی بەرهەمێکی نوێ. دیارە تۆیش کاتێك شتێکی وا دەبینیت یان دەیبیستیت کە قابیلی پێوانەکردن بێت ئەم پێنج پرسیارە دەکەیت:

١. چۆن دەیپێویت؟
٢. ئێستا بڕەکەی چەندە؟
٣. دەتەوێت چەند بێت؟
٤. جیاوازییەکە چەندە؟
٥. بەدیهێنانی جیاوازییەکە ماوەی چەند دەخایەنێت؟

لەبەرئەوە ئەگەر هاوکارەکەت وتی: "ئەم کارە نرخی تێچوونی گەشەپێدانی بەرهەمە نوێیەکە بەرز دەکاتەوە، "تۆ دەتوانیت ئەم پێنج پرسیارە بکەیت.

**تۆ:** چۆن نرخی تێچوونەکە دەپێویت؟

**هاوکارەکە:** ئەو بڕە پارەیەی کە لە دەستپێکی پرۆسەی گەشەپێدانی بەرهەمە نوێیەکەوە تا ماوەی ساڵێك خەرجی دەکەیت"

**تۆ:** تێچوونەکە ئائێستا چەندە؟

**هاوکارەکە:** ٢٠٠ هەزار دۆلار

**تۆ:** دەتەوێت بگاتە چەند؟

**هاوکارەکە:** پێم وایە پێویستە لەدەوروبەری ٣٥٠ هەزار دۆلاردا بێت.

**تۆ:** کەواتە جیاوازییەکە (١٥٠) هەزار دۆلارە. ئێوە لە ساڵێکدا چەند بەرهەمی نوێ بەرهەم دەهێنن؟

**هاوکارەکە:** بیست بەرهەم. ئێستا لەگەڵ هاوکارەکەت یاخود لەگەڵ تیمەکەدا کۆی ژمارەکە دەردەهێنن

**تۆ:** ١٥٠ هەزار دۆلار ئەگەر کەرەتی بیستی بکەیت ساڵی سێ ملیۆن دۆلار دەکات. وایە؟

**هاوکارەکە:** بەڵێ

**تۆ:** کەواتە ئەگەر لەماوەی سێ ساڵی داهاتودا تێچوونەکان چاك نەبن یاخود خراپتر ببن. ئەوا کێشەیەکی نۆ ملیۆن دۆلارییمان دێتە رێ.

**هاوکارەکە:** پێم وایە بەڵێ. مەسەلەکە بەوجۆرەیە.

سەرنج بدە بزانە چۆن بە ئاراستەکردنی پرسیارەکانی کاریگەریی بۆت دەرکەوت کە تەنیا هەر "یەك" رەهەند لە رەهەندەکانی "بێمتمانەیی" رەنگە لەماوەی سێ ساڵدا نۆ ملیۆن دۆلار لەسەر کۆمپانیاکە بکەوێت، بۆ گۆڕینی ئەو ژمارەیە پێویستت بە هەوڵ و تەقەلای زیاتر دەبێت، بەڵام لانی کەم ئێستا شتێکی دیاریکراوت لایە بتوانیت بیبێویت و کاری لەسەر بکەیت کاتێکیش کە هاوکارەکانت تێدەگەن کێشەکە بە پارە هێندە دەکەوێت لەسەرتان، خێرا دەگەنە ئەو باوەڕەی کە پێویستە گۆڕانکاریی بکەن.

سەرنج بدە بزانە چۆن ئاراستەکردنی تێکەڵەیەك لە پرسیارگەلی بەڵگەو کاریگەریی دووکەسی گەیاندە کرۆکی کێشەکە. دواتر پرسیارگەلی دیکەی کاریگەری بەکاربهێنە.

هەمیشە پێویستە هاوکارەکەت یاخود ماباقی تیمەکە هێزی زیرەکیی بن، بەڵام تۆ ڕۆڵی هێزی ئاراستەکەر و ڕێنمایکەر ببینە. لەئەنجامی ئەمەدا سیستەمێکی فێرکردنی ئاراستەکراوی وا بۆ هاوکارەکانت دەستەبەر دەبێت کە نەبێتە مایەی هەڕەشە لەسەریان. ئەم کۆمەڵە پرسیارە زۆر بەهێز و کاریگەرن کە توانامان پێدەبەخشن بابەتییانە بگەینە خەرجییە کەسێتی و دامەزراوەییەکان و هاوشانی ئەو تەحادایانە دێن کە ڕووبەرووی دەزگاکە دەبنەوەو نیگەرانییەکی گەورەمان بۆ دروست دەکەن.

لەمەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەم پرۆسەیە لەناو تیمەکەت و دەزگاکەتدا کەلتوری کرانەوەو ڕاشکاویی دادەمەزرێنێت و متمانەی نێوان ئەندامانی تیمەکە پتەوتر دەکات.

بۆ زانیاریی زیاتر سەردانی ئەم پێگەیە بکە:

www.franklincovey.com/letsgetreal